زنجیرەی کتێبی گۆڤاری هەنار: ژمارە (٢٧)

# زمان ئاسۆیەکە لەنێوان ئاسمان و زەویدا


- وەرگێڕان: جەلیل کاکەوەیس
- بابەت: رۆمان
- پیتچنی: نووسەر
- هەڵەچنی: سنەوبەر کەریم
- نەخشەسازیی بەرگ: پەیام ئەحمەد قادر
- نەخشەسازیی ناوەوە: نەورۆز جەمال ئەمین
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵلا
- قەبارەی کتێب: ٢٥x٣٥
- ژمارەی لاپەڕە: ٤٦٨
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (٧٨٨)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی کەمال
- نرخ: (٤٠٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (١٨٩٣)ی ساڵی ٢٠١١ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران- بەرامبەر کوردستانی نوێ
ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩

# سەردەمی دوای سابڵاخ

# ١٩٨١ – ١٩٨٥

## ڕەمات کان

## ١٩٨٥

ئەم وشەی (ستۆپی ئۆتۆمبیل)ە، جوانە، بەڵێ، ئەوە پەیوەندی بە سەردەمەکەی تۆوە هەیە، لێ من لە سەرەتای لاوێتدا لێی بێ بەش بووم، کەچی بۆی خەنیمەوە و تەزوویەکی وام پێدا هات، لەوە بوو ئەندامەکانم وشك بن و دوا وزەم تێدا نەهێڵن، بە دەنگ و هۆگرییەك، کە لە ڕاستیدا پێداگری ڕابردوومی دەنواند، لاواندمەوە. ئینجا بەدەستێکی لەرزۆکەوە لەو قاپەی دەنیشتم، مۆزێکم پێدایت، کە لەگەڵ مۆزدا پرتەقاڵ و هەندێك سێوی تێدابوو.

بیرت نەچووبوو، هاتیت و داوەتی زەماوەندەکەی خۆتت کردم، بە چاوێك تەماشام کردیت کە ساڵگارەکان خرفی نەکردبێت، بینیم تۆش تەماشام دەکەیت. من ئەو سەوڵ لێدەرەم کە ملم ناوەتە هەڵدێر و مەترسییەوە و ڕۆژگار بەرقامچی داوم. من تۆپەڵێکم تەمەنم سەد ساڵە و لەسەر جێ کەوتووم و ئەمێستا لە چرکەساتی سەرسامیدا وێك دێمەوە، سەرسامی تۆ، لێ من وەك لە دێر زەمانەوە زەردەخەنە هێمنەکەم ڕووخسارم بەرنادات، زەردەم هاتێ و بێدەنگ بووم. تۆ لەم بێدەنگییەم و زەردەخەنە کاڵەکەم وەڵامەکەمت ژنەوت و پرسیت:

ــ ئەرێ بە ڕاستی بڕیارت دا پێ لە ستۆپی ئۆتۆمبێلەکە هەڵبگریت؟

پێکەنیم و تەنانەت خەریك بوو بەڵێنەکەم بۆ ئەم ڕۆژگارە نەهێنمە دی و بمرم، بەڵام هەستم بەجێبەجێکردنی ئەم بەڵێنە کرد. ساتەکە گونجاو نییە و ئەرکی منیش ئەوەیە، کە زاراوەکانی سەردەمەکەی خۆی بۆ ڕاست بکەمەوە، قسەکەم پێ بڕی:

ـــ باوکی سەلمان، بەڵکو بڵێ جڵەوی ئەسپەکەت گرت.

ئەسپەکەم! لێرە رامگرت، ئاخر لە ژیانمدا لەجیاتی هەموو هۆیەکانی گواستنەوە هەڵیگرتم، لێ من رۆژێك چییە، ئۆتۆمبیلم نەهاژووتووە، ئەی رۆژگار، من هێشتا شلۆمۆ کوردەم! بەدرێژایی تەمەنم لە دووجار پتر نەگریاوم، جارێکیان ئەو رۆژەی ئەسمەریان کوشت، جارێکی دیکەش ئەو رۆژەی ئیستێری بچووك و ئیستێر و ناحومیان کوشت.

بە هەناسەی گەرمم تەڕ و وشکم بەسەر دوژمنی باوە کوشتەمدا سووتاند، بەڵام ئەی رۆژگار تۆ نەتتوانی وردەم برووخێنیت، هەموو ئەم سەد ساڵەت بە مەترسی بارگاوی کردو لە دەوانی ئەوەدا بوویت، کە خۆڕاگرییەکەم لێ زەوت بکەیت، هۆ رۆژگاری بێ بەقا، من زات و خۆراگرییەکەم لەدەست نەدا.

تا ئەم چرکەساتە من هەر شلۆمۆ کوردەم و وەك بینیوتم هەروەکو خۆم ماوم و دێ تۆڵەت لێ بکەمەوە. ئەوسا ئەو ئەمانەتییەی خودا پێی سپاردووم، رادەستی دەکەمەوە. ئەمەش لە کاتێکدا رەنگە زۆر دوور نەبێت، بەوپەڕی سوپاس و پێزانینەوە، پێشکەشی دەکەمەوە.

دوا وێستگەم لێرە، لە (رامات کان)ە! هۆ لاوۆ، بیرت بێتەوە، بیرت بێتەوە! مۆزێکی دیکە، یان پرتەقاڵێك بخۆ، هێشتا هەر وڵاتی پرتەقاڵە، لە سابڵاغ بەم زۆرییە نەبوو.

سابڵاغ شاخاوی و دۆڵە و بادەم و بەڕوو و کاژی لێ دەڕوێن. سەرەڕای بەغدای پڕ فەڕ و بۆمبای سەرچاوەی خێر و بێر و تارانی دالدەگا، سابڵاخی لەبەر دڵان و نەفرەت لێکراو لە یاد ناکەم، نا. لێرە ئەسپەکە لە رەوت کەوت و زەردەپەڕ دەرکەوت و هەستی تۆڵەسەندنەوەی خۆش و تێکشکێنەرم لە گۆڕنا.

ئەمێستا، وا ئەمێستا چارەت کرژ دەکەیت و هەوڵ دەدەیت پەندەکانی سلێمان پێغەمبەر و فەلسەفەکەی شلۆمۆ کوردە بەراورد بکەیت؟ لەسەرخۆبە و دامەچڵەکێ، چونکە تۆپێکی قورقۆشمین دەکەوێتە نێوانمانەوە، ئەوە هەموو دنیایە و لەسەر پشتی خۆی هەڵیگرتم و لەسەر پشتی خۆم هەڵمگرت و نەنوشتامەوە. من ئەو گایە زەبەللاحەم دنیام لەم قۆچەمەوە بۆ ئەو قۆچەکەی دیکەم گواستەوە و هەموو دنیا

لەرزییەوە و هەردوو قۆچەکەش لەرینەوە. سەولەکە بە لایەکیدا کەوت و هەڵدەلـەرزی و هەرەسی نەهێنا، بەڵکو دووبارە راست بـووەوە و رێگـەی دوور و قـووڵایی مەترسـی گرتە بەر.

ئاخۆ دەکرێت لیّم خۆش بیت، رۆڵەکەم یان بە راستی لیّم خۆش بوویت.

من دەزانم وا لە تارانم، هەندێکجار خراپەم لەگەڵ دەکردیت و لە رۆژانـی شـەممەدا جنێوم پێدەدایت. خۆت دەزانیت من کوردێکم و لەسەر ئایینی خۆم سوورم، لە رۆژانـی شەممەدا کە ئاگرێکم دەکردەوە، تۆ ئاگری تووڕە بوونمت دادەگیرساند، بەڵام ئایـا رۆژێـك لە رۆژان کەسێك بە جنێو مردووە! ئەوانە وشەگەلێك بوون، تـەنها بلّـق بـوون و سـەر تووڕەبوون و هەڵچوون دەکەوتن و جگە لە هەوا چیتریان تێدا نەبوو. هەرگیز لە نـاخی دڵێکـی رەشـەوە هەڵنـەدەقولێن. ئەوسـا و ئەمیـستاش دڵەکـە ترژییـە لـە پـەیڤی راستەقینەی دیکە. ئەمیش و هەموو ئەم دنیا بە شارستانی هەڵاوسـاو و سـەڵیتەیەی ئەمیستای نێوانمان، چونیەکن. ئەوە سەد ساڵی خشتە، شیلەی تەمەنـە، کاسـەیەکە و دڵۆپ دڵۆپ پەیڤی لیّ دەتکێت. زمانم دانیـشتنە درێـژەکانی ئـەوێمانی لـەبار بـرد، لەبیری تۆش چوونەوە، لیّ لەبیری من ناچنەوە. وشەکان.... ناسڕێنەوە، بەڵکو هـەزاران دەنگدانەوەیان لیّ پەیدا دەبێت، بەڵام رەسەن هەر رەسەنە و بە رەسەنایەتی دەمێنێتەوە، هیچ گەواهیدەرێك نابێتە ئەو کەسەی کە خۆی شتەکەی بیستووە، هـیچ گێڕەرەوەیـەك نابێتە ئەو کەسەی کە خۆی شتەکەی بینیوە و هەستی پێکردووە.

لە یادتە؟! یان من بیرتی بخەمەوە؟! یـان هـەردووکمان پێکـەوە لەگـەڵ رۆژگـاردا وەیادی خۆمـانی بخەینەوە؟!

بەڵیّ: وەك جاری جاران بە عارەبییە شڕەکەت بمدوێنە، ئەم زمانە ناوازەیەی لەگـەڵ ئەوەی تەتەڵەی دەکرد، تۆ رووداوەکانی سەدەی گەورەت پیّ گێڕایەوە. پەیڤەکانت چـون گوللە تۆپێك لە هەموو لاوە بەسەر مندا دەکەوتن، مێژوویەکە و لەگەڵ هەموو دنیادا بە ئارامی چیایی و فارسی و رووسیایی و ئازەری و بە زمانە عیبرییـە تەوراتییەکـەت تۆمارت دەکرد و ئینجا بەم زمانە عارەبییە و بە سەنگینی کەسێکی خـاوەن شـوێن و ریّ و رەسەنایەتییە کوردانەکەتەوە، لە تاریکی نەتهێشتەوە. ئەمەت لە کاتێکـدا پـیّ

وتم وەك ئەوە بوو لە ژێی چێژداری قیسارەیەك بدەیت و شادی و ستانی هەموو دنیا گاڵتەت پیّ بکەن. وشەگەلی زێڕینی (شلۆمۆ کوردە) لەسەر نووسینگەکەم لە بەغدا دەدرەوشانەوە، وەك تیشکی رووناکییەك بوون و شۆرەتی خانەوادەکەم (کەتانی)م پشت گوێخست، چونکە دەمهەویست خەلکی لە دوورو نزیکەوە بزانن کە کوردێکی پەناهەندە و ئاوارە، یەکەم کەسە کە جلوبەرگی لەنگەی هێناوەتە عیراقەوە "سەیرە! تۆ بلێیت گەر نووسیبات شلۆمۆ کەتانی کوردە، ئەمەیان نەزانیبا؟!".

دەستم خستە سەر دەستە گەورە و ئارەقاوییەکەی. کەواتە فیلێکە و بە گەردنی زەرافەدا شۆڕ بووەتەوە. لە کۆندا دەیان وت لەو مەرجانەی کە دەبێت لە سەرۆکی جالووتدا هەبێت، دەبێت دەستی بگاتە چۆکەکانی. تا قۆڵ و باسکی شلۆمۆ کوردەم نەدی بوو، لەو باوەڕەدا نەبووم، کە قۆڵ و باسکێکی ئاوها درێژ جۆرێکە لە نەکردەنییەکان. لەپە زەبەللاح و چرچ و پووکاوەکە لە نێو لەپێکی وردیلە و ناسك هەلپلکا و تەزوویەکم پێدا هات، کە بریتی بوو لە جۆرە گوشینێك و لە لەرینەوە هەلپلکانەکە و نائومێدی و کەسەر و خۆشەویستی و ترس و بالایی و هێز و مردن و ژیانەوە، سەرچاوەی گرت، دوای ئەمەش کۆتایی و عەدەمی تێکشکێنەر. هەموو شتەکان شی دەبوونەوە و دادەهێزران و لە ڤالاییەکەیدا دەکەوتن. شتی نەبوو هەموو شتێکی هەبووی دەسڕییەوە و وەك خۆی نەدەما ، تا ببێتە شتگەلێکی زۆر و رەق. هەرچی بوونەوەر هەیە! تا لێرەدا خەونەکان دەگەڕانەوە و دەنگە لەنێوچووەکان دەبیستران و هاژەیان دەهات. داروخانێك دەگەڕێتەوە دۆخی خۆی، ئەمانە ئێسك و پروسکی مرۆڤن و چێژ لە ژیان وەردەگرن. رۆژگارێکی دوورو درێژ لە حەشارگەکەی لە بوونێکی رێزلێنراودا دێنە دەرێ. کۆگایەکە تەنانەت گەردیلەی سووتووی جگەرەیەکی لێ ون نابێت.

ئاخۆ من لە یادمە؟ یان تۆ بیرم دەخەیتەوە، یان هەردووکمان پێکەوە بیری خۆمانی بێنینەوە؟

بەلێ، با پێکەوە بیری خۆمانی بێنینەوە، رۆژگار و تۆ و من، با رابردووی لەنێوچوو بگەڕێتەوە، یادەوەرییەکی ئامادەیە و لێوان لێوە لە شت.

# بەغدا ــ بۆمبای
# ١٩٢٤

(ئەسمەر)، هۆ دایکی منداڵان، چۆن ئەو دوا رازەی خۆمت بۆ بدرکێنم؟! جاران، رازەکانم وەك سەگەلێکی برسی بوون و هەناو و ویژدانیان هەڵدەکۆڵیم و لە تۆم دەشاردنەوە، لە ترسی ئەو و لە ترسی من لە تۆ، تۆ وەك لێزانێکی شارەزا لە نادیار، یان وەك خوێنەرەوەیەکی رووخسار و چاوم بۆ لام دەهاتیت، ئیدی خۆشەویستییە بێگەردەکەت لەبەرچاوت کردبوونی بە کتێبێکی والا. لە رووخسارمدا خوێندتەوە، کە من بەزەییم بە دڵی ناسك و چۆلەکەئاسات نایەتەوە و دای دەخورپێنم. ئەوە تۆ بوویت رازەکانی خۆمت بۆ دەگێڕامەوە، ئینجا چاوەکانت بە فرمێسکێکی روونی ئەڵماس ئاسا هەڵدەهێنا، دەستت بە قژمدا دەهێنا و وەك منداڵێك بە خۆوەت دەنووساندم و ئازارەکانی منیش و خۆتیش دەلاواندەوە. بەسەر خودی خۆتدا سەردەکەوتیت و هیچ خۆپەرستییەکی تێدا نەبوو. سەگەلی هارت لێ پاس دەکردم و برینەکانت بە مەرهەمی شیفا بەخش چەور دەکرد.

دایکی منداڵان! خۆشەویست و پشتیوان و کۆڵەگەکەم، چون چاوی نە نووستووی خودا لەم سەر زەوییە لەسەرمی پشت و پەنام لە ئاستەنگان، بە درێژایی چەند دەیەیەك هاوبەشی ژیانم، تاڵی و شیرینی، خۆشی و ناخۆشی. کاتێك بەرەو بارەگای خودا چۆوە سوێندم خوارد دوا دڵۆپی عەسری بۆ برێژم و دوای ئەو دڵۆپە عەسرێك بە هیچ شتێك نەبەخشم. چاکم بە خراپ گۆڕییەوە، لە دوای ئەسمەر (دایکی عەزیزە)م خواست، خۆڵەمێشی دوای پشکۆ، قەیرەیەکی زمان درێژ و زۆر بڵێ. هێنام تا خزمەتم بکات، لێ

رۆژێ دڵم بە دایکی عەزیزە نەدا. ئەو دەمەی هاوجێییم لەگەڵیدا دەکرد، بەرانبەر روحی دایکی منداڵان بە چۆکدا دەهاتم و لێی دەپاڕامەوە، تا بێت و خۆی بکات بەم زمان درێژەی کە لەژێرمدا پاڵ کەوتووە، لێ مخابن من لەنێو پێچەکانی خەیاڵدا ون دەبووم، بۆگەنی دەگەیشتە لووتم. عەنبەرەکە ون بوو، لە دەست چوو! من فریشتە نەبووم، من بنیادەمم، شلۆمۆ کوردەم! ئاگری تووڕەییم دەئایسێت و خەمەکانم گڕ دەگرن.... غایەنەتیم لە ئەمەری دایکی منداڵان کرد و هەرزان فرۆشم کرد.... لێ من قەت لە دوای ئەو هەستم نەکردووە لەسەر جێی ژن و پیاوەتیدا نووستبم. لەگەڵ دایکی عەزیزەدا دەنوستم وەك ئەوە بوو لەگەڵ سۆزانییەکدا راکشابم.

پیرێژنەی زمان درێژ و هەڵەوەر و بە نێرەیی، ئیدی ئەم خەسێتانەی نەمان، چونکە خوێنی مەژگی بەربوو و زمانی بەسترا و چاوەکانی کوێر بوون، ئیدی چون پاشماوەی بۆگەن و بەسەریەکدا کەوتوو لە ژوورەکەی دیکە فرێدرا.

بۆ چرکەساتێك لە دایکی عەزیزە نەترسام، نەخێر، تۆ بێژە من خۆم لە زمان درێژییەکەی لادەدا. ئیدی پێویست ناکات ئەو زمانە قامچی ئاسایەت بێنمەوە یاد، ئاخر هەر ئەوەندە دەکەوتە کار، ریزێك نەفرەت و جنێوی بەرەڵلا دەکرد. ئەرێ سوورە ماسییەکەت لەبیرە، کە لە بازاڕی (لالەزار) لە تاران بە چوار تمەن کڕیم؟ تۆش لەگەڵمدا بوویت، درۆم لەگەڵدا کرد و پێموت بە دوو تمەن کڕیومە، بڕوای نەکرد و لە پاشملەی من پرسیاری لێ کردبوویت و تۆش بە دڵپاکی و راستگۆیی خۆتەوە وتبووت بە (چوار تمەن)، ئیدی کاتێك قامچییەکە کەوتە کار و زمانی کەوتە بۆڵەبۆڵ، پەشۆکاویت و بەرەو ژوورەکەی خۆت هەڵاتیت "کەی رەوایە چوار تمەن بە ماسییەك بدات؟! با هەر خۆی بە تەنها بیخوات، بەڵکو ببێتە ژەهر و جەستەی تلۆ تلۆ بکات و بیکوژێت!".

بۆ لای دایکی کوڕان هاتم و بیرۆکەیەك لە مەژگمدا گەڵاڵە بووبوو، کیسەکەم پڕ بوو، زرینگەی لیرەی زێڕی لێوە دەهات، بەڵام دڵم لێی دەدا و دوودڵ بووم. ئەو رۆژە بۆ سەر پەتی سێدارە سەرکەوتبام هێشتا ئاسانتر بوو. لێی نەدەترسام، بەڵکو ئەوە چڕبوونەوەی خۆشەویستییەکی مەزن بوو. ئەرێ ئازارێکی تریش بخەمە سەر

ئازارەکانی؟ ئەی دەبێت کاریگەری بڕیارەکەم لەسەری چۆن بێت؟ بڕیارێك واتا مل پێوەنان و نادیار و لێك دابڕان. رووندکە بێگەرد و روونەکەی دەگەڕێتەوە و لە چاوە هۆگرەکانیدا دەبریسکێتەوە. دێ بڵێت، بێگومان دەڵێت "ئیدی ئەوەی بەسەرماندا هات بەس نەبێت؟!" دێ بڵێت "ئایا بە بێ رووناکی مۆمە داگیرساوەکەت لە غەریبی جێم دەهێڵیت؟!". نەخێر! بەڵکو من پێشبینی دەکەم و ئەم خۆشەویستییەم بەوەوە دەلکێنم و ئەو رۆژێك گازاندەی لە ئازارچەشتن نەکردووە. بێگومان دەڵێت "جێم دەهێڵیت؟" نەخێر، بەڵکو دێ بێژێت "دڵم پێتەوەیە! ئەرێ لە غەریبییەکەوە بۆ غەریبییەکی دی؟! ئەرێ مەترسی دوێنێ بەس نەبێت؟! دڵم لە دووریت و ئەو دیوارە نادیارە هەر ترپە ترپ دەکات و لە هەواڵت دەپرسێت؟!

ئەو لەنێو نەبوواندایە و توانای بینینی منی نییە و نازانێت چیم بەسەر دێت و هەر قسەکردنی بۆ دەمێنێتەوە و هەر دەگری. تا ئەمەش ترسی لەنێوچوونە، ترسی من لە ئەسمەری دایکی منداڵان!

لێ من شلۆمۆ کوردەی لامل و سەرسەختم، کەچی سەرەڕای ئەمە ئەو و منداڵەکان دەستێکیان لە بڕیارەکانم هەیە، ئەوان هاوبەشی سەرکێشییە تازەکانم و گرەوەکانمن. گەر بەختم یار بێت و بیهێنێت، بێگومان وەك لەمەوبەر چۆن لە لێواری مەرگی جۆراوجۆر کە لەوەبووە لە هەناوی خۆی وەك نەهەنگێکی لالغاوەکراوە قووتم بدات، دەیان جار بۆم هاتووە، هەر بۆشم دێت. گەر لەم دوا هەوڵەمدا بەختم بیهێنێت، ئەوە دەگەڕێمەوە و بە بوونی راستەقینەی خۆم دەگەم و ئاواتەکانیان دێنمە دی و خێر و فەڕەکەی جارانیان بۆ دەگێڕمەوە. لێ من ترسام، رەنگە ئەمەت لاسەیر نەبێت ــــ دوودڵ بووم. بڕیارمدا لە هەلێکدا قسەی لەگەڵدا بکەم و شانازی بە دایکی منداڵانەوە بکەم و هێزێکی بارگاوی وای پێ ببەخشم بۆ هەواڵەکە ئامادە بێت، یان کاریگەرییەکەی لەسەر روحی ناسکی کەم بکاتەوە. من دوودڵم. دوودڵییەکەمیش واتا ململانێ. رووخساری من لە چاوانی ئەودا ئاوێنەیەکە. تەنها رووخساری من و چاوانی ئەو، نەك چاوانی ئەو و رووخسارگەلی دیکە، نەك چاوانی دیکە و ئەم سیمایە. ئەمەش پەرچووی خۆشەویستی و لێزانینێکی راستگۆیانەیە.

لێرەدا ململانێکە لەو پەڕیدایە، ئارەزووی منیش چیایەکە لە چیاکانی کوردستان و هەموو نزمی و نشێوەکانی گەڕاوم.

ئەو هەر دەخوێنێتەوە و دەخوێنێتەوە، کەچی ئەمجارە پەیڤەکان لە حەناس تێگەیشتنی ئەودا نەبوون. ئەمسەر تێگەیشت وشەکان نهێنییەك دەشارنەوە، لێ نیوەڕۆیەك ئەم نهێنییەی نەدۆزییەوە من لە پاڵیدا راکشابووم و بە بێدەنگی بیرم دەکردەوە. هیچ نییە، تەنها خودی بیرۆکەکە خۆیەتی. زمان نیازمەندە کەچی وشەکان قووت دەداتەوە. ئەمێستا.... دوای سەعاتێك، بەڵکو کاتێك هەل رێك دەکەوێت. لێ ئەو لەناکاو رادەبێت و لەسەر تەختە خەوەکە دادەنیشێت. سیمای دەگۆڕێت و نیشانەی سەرسوڕمان، پەژارە، ترس، دەردەبڕێت و شتهایەکی زۆری تریش کە من هەڵم نەهێنجاوە. گەڕامەوە بۆ خودی خۆم و پرسیارم لەخۆکرد. ئەوە هەناسەت هەڵکێشا؟! بە دەنگی بەرز بیرت کردەوە؟! دەنگێك ئامادەگی تۆی قۆستەوە و بەرەو وی فڕی؟! تەنگەتاوی خافڵاندتی و هاوارەکە بەرز بووەوە؟! ئایا ئەوە هەر هەمان بیرۆکەیە؟ یان دوودڵییەکەتە؟!

ئەو بەسەرمدا دەچەمێتەوە و جارێکی دی لەخۆپەرستییەکەم دام دەماڵێت و ئازار چەشتنەکەی لە رووخسارم دەچەقێنێت "دایکی منداڵان، ئەوە چیتە؟!"، کەچی ئەوەندە نابا لە ویژدانەوە لە پرسیارەکە تێدەگات و بەرەو زمانی بازرقە دەدات و رەنگ دەداتەوە. ئەو هەمیشە (من) بۆ (تۆ) دەگۆڕێت و دەپرسێت. دەنگی ئەو، ریتم و ئاوازێکی فارسییە و بەرد دەهەژێنێت، بەڵام هەست کرد بە ترس تووشی شێتییەکی لاڵی خۆش دەبێت و لە پێچ و پەنای بێدەنگییەکەیدا سەر دەردێنێت، چاوانێکی تەڕ بە شتهایەك وەك هەستەوەری مەعشوقانە تێکی دەشکێنێت و بنیادەم هەر حەز دەکات لە ئامێزیدا بە دڵنیاییەوە بمرێت.

ـــ باوکی سەلمان، ئەوە چی روویداوە؟

منیش لەسەر تەختە خەوەکە دانیشتم و دەستیم گرت و خستمە نێو لەپەکانمەوە، نەرمێکی خاوی وەك ئاوریشم، ئاسکێکی وا کارکردنی بەردەوام زبری نەکردبوو، چکۆلە بە جۆرێك لەنێو لەپە نوقاوەکانمدا ون بووبوون، لەوە ترسام ئەو دەستانە لەنێو

لەپەکانمدا بخنکێن، بۆیە فشاری خۆشەویستی و سەرسامیم لەسەریان خاو کردەوە. ئاوەز و ویژدانم پێکداهاتن، لێ زمانم بەسترا.

ـــ باوکی سەلمان، پێم بڵێ، من تۆم وا نەبینیوە شتێك لە ئەسمەر بشاریتەوە.

رووخسارم لەبەر رووناکییە کزەکەدا هەڵبزرکا، نیگام لەسەر دیوارە تەڵخەکان گیربوو.

خانوویەکی بچکۆلە لە کوچەیەکی تەنگدا، رۆژی بەرناکەوێت و پیسی و بۆگەنی تێیدا نیشتەجێن، شنە و کزەبا بەسەریدا هەڵناکات، گەرەکێکە پتر خەڵکانی مرۆڤدۆست لە خۆدەگرێت. لێرە بۆنی زێراب و بۆگەنی ئاوەرۆ هێڵەدەکات، کۆڵانێك خودا و بەندەکانی لەبیریان کردووە و ئێمەو مانانی ئاوارە و نەفرەت لێکراو یەقمان تێدا داوەتەوە.

ـــ ئەرێ ئەسمەر، ئەم دۆخە قایلت دەکات؟

بە چپە وتی:

ـــ رۆژانی خراپترمان بەسەردا تێپەڕ بوون، وا خودای میهرەبان خێر و فەڕەکانی پێشووی سەر لە نوێ بیر دەخاتەوە.

لەناکاو بێدەنگی زمانم رەوییەوە و ئاگری ئاوەز و ویژدانی گەیشتێ.

ـــ بڕیارم داوە کە چارەسەرێکی یەکلاکەرەوە بدۆزمەوە.

ـــ ئێمە رێگەی ئەوەمان گرتۆتە بەر کە پێی بگەین، گەر دابکەویت و ئارامت هەبێت، چاوەڕوانییەکەمان درێژە ناکێشێت.

ـــ لە نێوان ئەوەی ئێستا تێیداین و هەبوونی جارانمان مەودایەکی دوورە.

ـــ کەواتە بڕیاری شتێکت داوە.

ـــ سەفەر دەکەم، لە هەموو جووڵەیەك فەڕێك، رەنگە بە دەروویەکی خێرەوە بگەڕێمەوە بۆ لاتان.

بە ترسەوە پرسی:

ـــ باوکی سەلمان، بەرەو کوێ؟!

ــ به سواری شەمەندەفەر بەرەو بەسرا دەڕۆم، لەوێشەوە بە پاپۆڕ بۆ بۆمبای دەڕۆم. دەڵێن ئینگلیزەکان لە هندستان دەرگای کارکردنێکی زۆریان کردووەتەوە، لەوێ بەختی خۆم تاقی دەکەمەوە.

وتی:

ــ هەروەها لێرە لە بەغداش کەمتەرخەمییان نەکردووە.

ــ ئەی بیرت چوو، لێرە لە سایەی ئەوانەوە چیم بەسەرهات؟

ــ چۆن بیرم دەچێت؟ خۆ ئەگەر نهێنییەکەم ئاشکرا نەکردایە، ئەوا تا ئێستا لە قێزەنترین و پیسترین کار، کارت دەکرد.

ــ هەر ئەمەشە وام لێدەکات سەفەر بکەم.

ــ بەڵام خودا ئاوڕێکی لێداوینەتەوە.... دەبا ئارام بگرین.

وتم:

ــ خۆ ئەگەر ئاوڕیشی لێ نەدابایەنەوە، ئەوا بە فەرمانی ئەو هەر قایل دەبووم و بە زاری کراوەوە بێدەنگ دەبووم، ئێ مادام سەرێکی پەتەکەی بۆ فڕێداوین گەرەکە ئێمەش تا کۆتایی پێیدا هەڵبگژێین. خەرجی سەفەرەکەش لەناو کیسەیەکە و بریتییە لە لیرەی زێڕ و لەژێر سەرینەکەیە.

وتی:

ــ لیرە زێڕەکان بە قوربانی تۆ بن، بەڵام هەموو جارێ گۆزە لە کانی بە ساغی ناگەڕێتەوە، خودا نەکات، گەر خراپەکارییەك بگاتە تاڵێ لە قژی سەرت، ئەوا بزانە ئەو دەمە کۆتایی من و کۆتایی منداڵەکانیشتە.

جارێك بە هەست دەربڕین، خۆی بە قوربانم کرد، جارێکی دی بە خشڵەکانی، ئەوێك لە روحەوە بۆم هەڵدەقوڵێت و دەیەوێت خۆی بە قوربانی تاڵێك لە قژی سەرم بکات، بەڵام ئاخۆ من لە بڕیاری خۆم ژێوان دەبمەوە؟ ئایا شلۆمۆ کوردە رۆژێك سڵی لە مل نانە مەترسی و شوێنە دوورو نادیارەکان کردووەتەوە؟! نەخێر، هۆ دایکی منداڵان، پەیمانت دەدەمێ کە شتی خراپ نایەتە رێی باوکی سەلمان. ئیدی ئێمە مەترسیمان لە دوای خۆمانەوە لە گۆڕی رابردوودا جێهێشت و بانەرۆژمان نومێد و خەباتە. دوورترین

شتێك کە رووبدات ئەوەیە، کە کیسەکەم ون بکەم و بگەڕێمەوە و دووبارە هەوڵێکی تر بدەمەوە. من دەزانم چۆن بگەمە کانە زێڕەکان، لەخۆڕاییینم دەگاتە گەنجینە شاردراوەکان. کەواتە هۆ دایکی منداڵان، بەزەییت بە ئەڵهاکانمدا بێتەوە.

ــ بێ سوودە، دەزانم ڕۆژێك بڕیارت لەسەر هەر شتێك دابێت. هەرگیز لێی پاشگەز نەبوویتەتەوە.

ــ ئەسمەر، من بازرگانم و ئێ لەو ڕۆژە ڕەشانەشدا سامان بە کەڵکمان هات.

ــ بەڵێ، بازرگانیت و بابی خۆت لە بەغدا هەتە، بەغداش پڕە لە بازرگانی و بازرگانان، دەی کاتی ئەوە هاتووە گۆچانی سەفەر بخەیتە لاوە و ئاسوودە بیت.

بە جەختەوە وتم:

ــ خەیاڵم ئاسوودە نابێت، تا ڕۆژانی فەڕ و هەبوویی لە گۆڕەکەیدا زیندوو نەکەمەوە، تا دووبارە بە پەنجە ئاماژەم بۆ نەکرێت.

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ــ کەواتە سەفەر بکە و خوات لەگەڵ.

***

جلوبەرگێکی شڕ و بێ کەڵك و هەگبەی کەرێك کە شتی پێویست و بڕێ خواردن و کیسەکەمی تێدا بوو. خۆم بۆ ئاوارەیی و دەربەدەری نەگۆڕی، ئەو ڕۆژگارەکەم بوو، کە بە ڕاستی کردمی بە ئاوارە و دەربەدەر. قرچۆکیش نییم، لە ڕابردوودا لە سابلاخ ماڵەکەم پێشوازی میوانانی دوورو نزیکی دەکرد. لە ساڵانی جەنگدا، سامانەکەم بۆ کۆمەکی براکانم و خەڵکی شارەکەم، خەرج کرد، بەڵکو هەر توانمەوە. ئەمێستا جگە لەم کیسەیە چیتر شك نابەم، ئەویش بە پیسایی پاککردنەوە و بە ڕەنج و قوربانیدانی ئەسمەر، بە زۆرەملێ کۆم کردەوە، بە ئارەقی نێوچەوان و زەلیل کردنی خۆم و ئابڕوومەندیم وشکی کردووەتەوە.

کەواتە مادام ناتوانم بە بێ سەربەرزی بژیم، ئیدی ئەوە ڕوحی منە، هەر لێرەوە دەست بە کۆکردنەوەی پارچە ورد و خاش بووەکانی نەفس بەرزییەکەم، دەکەم، دەست بە گیرسانەوە و گرتنەوەی ئێسك و درزەکان دەکەم. هەزار گرێ لە کیسەکەم دەدەم و

تاراوەیەکی رووالّەت شێواوم و دەڕۆم. نا، نازی خودی خۆم هەڵناگرم و چوون پاشایەك لەسەر ئەم کیسەیەم دادەنیشم. تەنانەت شوێنی پلە دووش شایانی دیمەنی من نییە. من لەوێ لەسەر پۆپەی (کەڵەشێرەکە)* لەگەڵ هەژاران و تاوارە و دەربەدەرەکان پاڵی لێدەدەمەوە، لەگەڵ ئەوانەی شتومەکی سەر و ژێری خۆیان فرۆشتووە تا بێن بۆ عێراق و زیارەتی کەربەلا و نەجەف و گۆڕی گەیلانی لە بەغدا بکەن، لەگەڵ ئەو هیندییانەی لە قسەکردندا هەر جریوە جریویان دێت و بلوجی شوانەوێڵە و عارەبی خێڵەکی و شێ و بۆگەنی و مشك و سیسارکە و منیش بازرگانێکم و لە کونێکی گەورەدا خۆم شاردووەتەوە، بازرگانێك بیرەوەری بازرگانێکی لە دوای خۆیەوە جێهێشتووە....، پەرژەی بازرگانێکی لەپێش خۆی داناوە و بیرۆکەکانم کە بێدەنگی نازانن، هەر خەریکی سازش و گۆڕینەوەن. ئا لێرەوە غەریبی و نامۆیی دەستی پێکرد، هۆ ئەسمەری راستگۆ، ئاخۆ بڕوات کرد؟ لێرە، لە گۆشەیەکی پیس و بۆگەن و تاریك تەنها گوێ لە من بگرە. سەرەوەم کۆگایەك یان گەورپی بیرەوەری گەلێکی کەڵەکە بوو، کە شان لە شانی ئەم دەریایە دەدات، کە بۆی دەچین، دەریای عارەب و رێژگەکەی، ئینجا وا ئێمە لە کەنداوین و هەر بە لێدانێکی سووکی داردەستە ئەفسووناوییەکەم کانیاوی چاو بە تەوژم بەرەو سەرێ دەتەقێت. پارچ و پورچەی یادەوەری و رووداوی ناڕێك و لەگەڵ ئەم دۆخەی ئەمێستامدا ناگونجێن و بێرەو بەرێوە دەلکێن. نوقمی نێو تەنهاییم، زیندان لە تاران و ئەو رۆژەی شای قاجاری پێش جەنگە نەفرەتییەکە لە زیندانی توند کردم، منی پشت هەلا بە هەلا کراو و خۆم و کیسەکەم و لەسەر خۆچوونم و ئێسکە وردوخاش بووەکانم و دوای وەئاگا هاتنەوە سەر لەنوێ ئازار سەری تێدەکردمەوە، لەگەڵ هەر جوولەیەکدا لەتاو ئازار شێت دەبووم. فرێی دامە زیندانەوە بۆ سەفەر لێیدا رۆیشت و منی لەبیر کرد. لەوێ بێدەنگییە و لێرە ژاوەژاو، من بە هەستەم بە زمانی عارەبی قسان دەکەم، دەبێ برێ جار بقووقێنم تا مەبەستێك بگەیەنم، لەم وتوویژە بریقەدارەی دەوروبەرم بە بلّقی سەر رۆنی خۆماڵی سەر ئاگر دەچێت، قسەکردنێکی گەرم و زبر

* لە دەقەکەدا هەر (کەڵەشێر ـ الدیك) بەکارهێنراوە کە مەبەستی پێشەوەی پاپۆرە ـ وەرگێڕ

هەر دەڵێیت کاری و بەهاراتی پێوەکراوە. بەهارات! دەبینیت لە تۆوە دەگەڕێمەوە و ئابڕوومەندی لە دەست چووی خۆم دەدۆزمەوە؟! غەریبی و نامۆیی لێرەوە دەستی پێکرد. هۆ ئەسمەری دایکی منداڵان، ئایا باوەڕت کرد؟!

لێرە، لەگەڵ ئەم هیندییانەدا زمانم براوە، لێ هەتا کەی؟ وتیان گەر بەخت یار و یاوەرمان بێت، ئەوە رێی بەرەو بۆمبای دوو هەفتەیە، دەبێت دوو هەفتە لە قسەکردن بەرۆژو بم؟ باوکی سەلمان مەگەر ئەوە هەر بە تۆ بکرێت، هەر بە تۆ!

بەڵێ! لەوێ، لە دەشت و چۆڵەوانی وشك، لەسەر لوتکەی چیاکان و لە شەوانی مەینەتی دووورودرێژ و رۆژەکانی قسەکردن لەوپەڕی شێتایەتی مرۆڤدا چکی کرد و تۆ هەر خۆت بوویت، بەفر بەسەریەکدا کەوتن و رێگاوبانی داپۆشی و زمان لە گۆکەوت، مەترسی هەر لە ژاوەژاودا بوو... رۆژووگرتن هەموو شتێکی گرتبووەوە، بەڵام.... ئەی چی؟ ئاخۆ کەسێك هەیە وەك تۆ خۆی ناسی بێت، هەر وەك چۆن تۆ خۆت ناسیوە؟! شتهایەکی دژیەك و لێك ئاوەژوو. خوێنی زۆر سووری مرۆڤت لەسەر بەفرە کەڵەکە بووەکە لەیادە؟! بەڵکو ئاخۆ هیچ شتێکی وردەکارییەکانی ژیانی خۆتت بیر چووەتەوە؟ بێدەنگی لەنێو بێدەنگیدا، لە خەم، لە قسەکردن، لەو ژاوەژاوەی دەورووبەرت، ئومێد و هەویا چون بێچووە کۆترێکی نێو هێلکە دێ بترووکێت، تۆ مرید و دەروێشێکی هیندی نییت لە خەڵوەتخانەکەیدا لە دنیا دابڕابێت و پشت لە شتەکان بکات "شلۆمۆ، بگەڕێ! بگەڕێ! یەکێك بدۆزەوە لێت تێبگات". لێرە قسەکردن لە نان و ئاو گرنگترە. قسەکردن پەیوەندییە، پەیوەندیش زانیارییە، زانیاری رێ دۆزینەوەیە. گەر رێگات دۆزییەوە بەسەر کۆسپەکاندا زاڵ دەبیت و دەگەیتە مەرامی خۆت. هەستە و پیاسەی نێو خەڵکی بکە و لە کوردێك....؟ ئەمە کاری نەکردەنییە! ئەرێ بیستووتە کوردێك لە بەسراوە بەرەو بۆمبای بە دەریادا سەفەری کردبێت؟! ئەوە تەنها منم، منی رەزا قورس لەسەر ئەم پاپۆڕە، هەر دەڵێیت لە هیندییەك دەگەڕێم چەفێ و عەگالی لەسەر بێت! ئەمانە عارەبی خێڵەکی کەنداون، بە گومان و ناحەزییەوە دیقەتم دەدەن و منیش بە پارێزەوە تێیان دەڕوانم. ئیدی هەر ئەوەندە دەمم کردەوە، شتەکان ئاڵۆز دەبن. زمان بەستراو و دیمەن رووتەڵە و دوورەگ و کوردێکی جوولەکە و فارسێکی ئازەربێجانی و

بەغدایی و کۆچبەرێك و بەرەو هیندستان. من! من هەموو ئەم شتانەم، کۆچبەر و دەربەدەر و بازرگان و سەرکێش. منم، تەنها من سندبیادی سەرەتای سەدەی بیستەمم. ئەریّ بە راستی من زەمانم براوە و ئەو زمانانەیشی کە دەمزانین بوو بە زیقەزیقی مەیموونێکی بیّ زمانی سەر ئەم پاپۆڕە؟!

پاشماوەی یادەوەری و پارچە و پورچەی زمانانی مردوو وەك شنەی بای ئەم ئۆقیانووسە بۆم دێت، وەك بەخشندەیی سەختی چیا. ئەسمەر وتی "دڵم لاتە و دەترسم". ئەسمەر وتی "ئیستیرت بۆ دەخوازم". کۆست کەوتووانە ئەمە بە ئەسمەر دەڵێم "ئیستیر مردوو دوو منداڵەکەش مردن". ئارامییەکی رەزا قورسی چیا؟ باوکم وتی "لەوساوە ئاشوورییەکان یەخسیر و سەبیان کردین، ئەمە زمانی جوولەکانە. "ئەی عیبری؟" زمانی تەوراتەکەمانە و قوتابخانە جێناهێڵێت تا هەمووی نەخوێنیت. "شالوم علیخم حاخام ناحوم ـــ حاخام ناحوم، سلاوتان لیّ بێت". لەویّ پالکەوتبوو، ریشی و بەفرە باریوەکە وەك یەك بوون. کوا ریشەکە و کوانیّ بەفرەکە؟ عیبری لەو سەردەمەدا چەقۆیەك لە دڵی درا و مرد. وەلامێکم چنگ نەکەوت. لە شەڕێك لە شەڕە بەراییەکان لە سابلاخ بە کوردی بە میر عەلیم وت "دڵنیابە! هەموو ماڵەکەم بۆت گواستەوە و شتێکی لیّ کەم نەبووەتەوە! تەنانەت ناڵە ئەسپێکیش لە ماڵەکەت نەدزراوە!". نزیکەی دە سەربازێك دەبوون و بە فڕی کەم کەم لە ڤۆدگا بەرەنگاری بەستەڵەکەیان دەکرد. بە زمانەکەی خۆیان پێم وتن "ئایا چەند شووشەیەکی زۆرتان لە شەرابی کۆن دەوێت؟! کەواتە بۆ گواستنەوەی کەلوپەلی ئەم ماڵە یارمەتیم بدەن! بیّ ئەوەی بڕوا بکەن، تێکرا راپەڕین، قاجارییەکە کە بە پاسەوان دەورە درابوو، شەرابی لە بادەیەکی زێڕیندا دەخواردەوە پێی وتم "لەنێوان پەنجا قامچی بە شوولی تەڕ یان دوو ئەوەندە بە داری وشك هەڵبژێرە". بە فارسی دەیدواندم و دەیویست لە نێوان دوو مەرگدا، یەکێکیان هەڵبژێرم، ئەوە بوو بە زمانی فارسی وەلامی ستەمکارییەکەیم دایەوە، ئەویش بەهەردوو هەڵبژاردنەکە سزای دام، لیّ من بەوپەڕی خۆڕاگرییەوە دانم بەخۆدا گرت. کیسەکە رزگاری کردم، بەڵکو ئەوە ئەو کیسەیەیە وا ئەمێستا ئابڕوومەندی خڵتان خوێن بووم بۆ دەگێڕێتەوە و لە بۆمبای فریام دەکەوێت، تا بۆ لای تۆ بگەڕێمەوە

هۆ دایکی منداڵان، هەر وەك چۆن لە رۆژگاری لەمەوبەر بە خۆشەویستی و سەربەرزییەوە بۆ لات دەگەڕامەوە، ئەو رۆژە دڵم دانەچڵەکی، وەك چیایەکی سەرکەش کە مێزەرێکی سپی لەسەر کردبێت خۆی راگرتبوو. کاتێك لە نزیك تەورێز بە زمانی ئازەری بانگم کرد "هێی جەعفەر و حسێن ئەکبەر، وەرنە دەرێ.... با لێك تێبگەین". بە گومان و دوو دڵییەوە لە پشت تاشەبەردێکەوە هاتنە دەرێ و هەریەکەیان تفەنگێکی پێ بوو.... داڵاشم بینی کە بەسەر سەرمانەوە دەسووڕانەوە، کەچی دڵم وەك چیاکانی ئازەربێجان خۆراگر بوو. ئەو دوو برایە لە هەر شوێنێك بان داڵاش و باڵندەی گۆشت خۆر لەوێ دەسووڕانەوە. پێموتن "شتی وا مەکەن، ئێوە هەردووکتان بەم دوو گەردنەتان قەرزاری باوکمن". یان رەنگە دانیان بە چاکەکەی باوکمدا نابێت. دوای ئەوەی بە ناچاری لە سابلاخ هەڵاتین، جوولەکەیەکی بەخشندەی بەغدایی پێی وتم "ئینگلیزەکان کاریان زۆرە، قایل دەبیت کاری پیسایی دەردان بکەیت؟!" وەڵامم دایەوە "کاردەکات! کاری گوو دەردان دەکات تا چاوی لە دەست گووی کوڕی گوو نەبێت". ئەمێستا قرتە قرت دەکەم "نا.... نا" یەك دەکەم و قاپلەمەکە دەدەمە دواوە. بەرانبەر خزمەتچییە هندییەکە وەك مریشکێك قرتە قرت دەکەم و دەستم دەخەمە سەر پاشەڵم، ئینجا دەستم بە نوشت کراوی و خڕییەوە دەگێڕمەوە و دوو ئەنگوستی پیشان دەدەم.... دوو هێلکەم دەوێ! ئاماژە بۆ نانەکەش دەکەم.... نانیش "گۆشت ناخۆم، لەنێو ئەم قاپلەمانە ناخۆم، من تەنها نانی وشك خۆرم و دەست بۆ قاپلەمەیەك نابەم، کە چەوری و گۆشتی تێدا بێت. "لە ئایینی ئێمەدا جیاوازی لە نێوان قاپلەمەی گۆشت و قاپلەی شیر و بەرهەمەکانیدا هەیە". ئەمەم لەبەر خۆوە وت، ئیدی هیندییەکە چۆن لێم حاڵی دەبێت؟ نەخێر، ئەو زیرەك و وریایە. تێگەیشت و سەری لەقاند و پێکەنی. بە پەلە رۆیشت تا نان و هێلکەم بۆ بهێنێت. هەروەها ماسی برژاویشم گەرەکە و لەسەر کاغەزێك یان لە توێی نانێکدا بیارەی...، هەروەها عەنبەش! بە ئاماژەی لالێك و بە پێکەنینی کەرێك و بە ئاماژەی مەیموونان و قرتەقرتی مریشکانەوە دەخزێمە سووچێکی پیس و بۆگەنەوە. ئاوارە و جێی گومانی خەڵك و جێی رق لێبوونەوە. دەخۆم و دەمم بەسەر دەستی قۆڵم دەسڕمەوە، ئینجا دەست بە وڕەوڕێکی درێژ دەکەم "خودا

نەی بڕێت" لێوەکانم دەجوولێن، چپەچپی خنکاو درێـژە دەکێـشن، خـەڵکێکی زۆر بـە دەورمدا دێن و دەچن، دەیان بینم لە نێـو خۆیانـدا قـسە دەکـەن "ئـەم پیاوەسـەیرە... سەیرا" بێگومان نازانم چی دەڵـێن، لـیٚ لـە سـیمایاندا دەیخوێنمـەوە، رووخـسارەکان سەراسیمەن و بە نیشانەی پرسیار تێم دەڕوانن. دەتوانم سوێند بخۆم دەموچاوەکان دەیـان پرسی "ئەمە کێیە؟ لەبەرچی لەبەرخۆوە ورەور دەکـات؟" بەسەرسـوڕمانەوە دیقـەتی توورەکەکەمیان دەدا. لە بەیانییەوە چـاویان لـە دەسـتم بـوو، کـە لـەناو توورەکەکـە کیسەیەکی بچووکم دەردەکرد، دەیکەمەوە چەشنی بایـەوان کلیمێـك بڵاودەکەمـەوە و خۆمی پێدادەپۆشم، ئینجا ئەم سیرە رەشەی بـە دەوردا دەئـاڵێنم، ئەوسـا نیـدی کـەس نابینم. لەنێو نزا و پاڕانەوەکانم نوقم دەبم و لەنێو هێزێکی بـاڵادا لـەنێو نزاکانمـدا ون دەبم " ئەی خودایە، ئەی ئەو کەسەی لە ئاستەنگترین ساتدا بە چاودێری خۆی خۆشـی ویستم و بەزەیی خۆی پیٚ بەخشیم، لە سەختترین کاتـدا هـەنگاوەکانمی جـێگیر کـرد و سەری خستم، ئەسمەری دایکی منداڵانم بۆ بپارێزە".

لە نان خواردن بوومەوە. نیگاکـان بـە دەورمـدا تـۆڕی راوکـەرن و دیـسان بـەرەو غوربەت و نامۆیی رام دەکێشن بـەرەو ئـەم لەوحـەدارە بۆگـەن و شـێدار و کلـۆرە رام دەکێشن، وا سەر لە نویٚ دەستیان بـە چپەچـپ کـردەوە. هەسـتدەکەم تۆڕەکـە لەسـەر جەستەم شەتەك دەدریٚ. ئەم (نادیارە)ی بەردەمم روحـم قـەتیس دەکـات. راسـتییەکی نادیار، کە راستی ئەوانە. دووبارە پرسیارەکە بە سووربوونەوە سـەرهەڵدەداتەوە "ئـەریٚ ئەسمەری دایکی منداڵان راستی وت؟!".

تۆ راوەستە، ئەم پیاوە رشەتالە و قەڵەوە لەگەڵ منێتی. ئا ئەوەی بـە پەشـتەماڵی هیندییەکان جێی شەرمی داپۆشیوە و تا حەناس ناوکی رووتە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا کەشوهەواساردە و تەنانەت بیرکردنەوەش لـە خـۆ رووتکردنـەوە تـەزوو بـە جەسـتەی بنیادەمدا دێنێت. ئەم پیاوە لە هەمووان خۆتێهەڵقورتێنەرترە، سیٚ رۆژ لەمەوبەر، واتا لەوەتەی خزاومەتە ئـەم سووچـەوە و زۆر پێویـست نـەبێت جێـی نـاهێڵم، چـاوم لـیٚ ناپرووکێنێت. ئێستا وا بۆ لام دێت و بە تەنیشتمەوە چنچك دەداتەوە، ئینجا... "شـالوم علیخم ــ سڵاوت لیٚ بێت".

سلاّو! لە سیمامانداو، رووخسار و جێی شەرمان دیارە، لە ژیان و مردندا یەکتر دەناسینەوە.

ــ خەڵکی بەغدایت؟

ــ کوردێکی ئێرانیم و پێش چەند ساڵێك بارودۆخ بەرەو بەغدا تووڕی دام.

هەردووکمان شڕە عارەبییەکی بەغدایی دەزانین، من هۆی لەنگی زمانەکەی خۆم دەزانم، بەلاّم هۆی لەنگی زمانی ئەم لە چییەوەیە؟

ــ بەر لە چەند گرێساڵێك کەسوکارم بەغدایان جێهێشت و بەرەو بۆمبای وەڕێکەوتن. من لێرە لەدایك بووم و لێرە دەژیم، لێ ئێمە چەند لە بەغدا دوور بین، هەر بەغدایین، کەسوکارم، مەبەستم خزمەکانمە، هێشتا وان لە عیراق.

ــ بۆ دیدەنی و زیارەت هاتوویت؟

ــ بۆ دیدەنی و بۆ حەجیش. حەسقێل پێغەمبەر، عەزرا سۆفێر، یەهوشواعی کاهین، یۆنا پێغەمبەر... بەڵێ ئێمە لەوێ دەژین، بەلاّم هەمیشە دلّمان لە عیراقە.

هەرچەندە زمانەکەمان لەنگ بوو، بەلاّم لێك حاڵی بوون پێکهات. ناوجەرگەی نامۆیی لە ئامێزی یەهودا دەریا یەقی دامەوە. وتی:

ــ بەتایبەتی بەناوی ئەم دەریایەوە، ناوبانگمان دەرکردووە، چونکە باپیرم بۆ یەکەمجار ئەم رێگەیەی بەرەو هندستان گرتووەتە بەر.

یەهوودا (دەریا) لەم دەریایە جیایە، ئەو هێمن و ناسك و سەنگینە، بەلاّم ئەم دەریایە دوورایی و مەوداکانی بێکۆتایین و دەم کاتە گەردیلە لێك و گوێ بە گوێی ئەم نادیارە بەرانبەر پاپۆڕی سەرکەشی چون چیاکانی ئێران و کوردستان، وێك دێمەوە و تووشی بالاّییەکی سەرچاوە ئالۆز دەبم. یەهوودا بە نەشارەزایی من لە دەریاکان پێکەنی و وتی:

ــ تۆ کاتێکی گونجاوت هەڵبژاردووە، ئەمێستا لە سەرەتای بەهاردایین و تارادەیەك دەریا هێمن و ئارامە. ئەی تۆ رۆژانی بەڵەکیت لە هاویندا نەبیستووە؟!

ئەوە رۆژی پەسلاّنی دەریا و هەڵچوونە گەورەکەیەتی لەم بەشەی دنیادا. هێمن و ئارام؟ دەشێت. ئەو رۆژەی لە سابلاّخ دە ژن و منداڵ دەکوژران، ئاسایی دەیان وت،

دۆخەکە بەو رادەیە خراپ نییە، بەلام عیزرائیل هەوادارانی خۆی خستبووەگەڕ و پێکەوە لەو جەنگە نەفرینەدا درۆینەی روحیان بە بێ هەمار دەکرد، بەلام دیاردەی رێژەیی قوت دەبێتەوە تا راستی شتەکان و دیاردەکانی سروشت روون بکاتەوە. ئەوە بوو کوشتن و کاولکاری زەقترین و راسترین شت بوون و دیارترین دیاردەی شەو و رۆژ بوون لە کاتی سەرما و گەرمادا، لە پایز و بەهاردا.

ئەوی دەریای هێمن و ئارام دەلێت! پێکگەیشتنیش هاتەدی. لە میانەی ئەوەوە تێگەیشتنم فراوان بوو. لە کاتێکدا وەك لێدانی دلّی من لەگەلّ یەهوودا دابووم، شتی زۆر فێر بووم. لەناکاو بووم بەو مندالّەی کە خۆی بە باوکییەوە دەگرێت و بۆ هەر شوێنێك بڕوات، دووی دەکەوێت، تەنانەت بۆ ئاودەستیش لەگەلّیدا دەڕوات. من لەگەلّیدام، ئەسمەر و مندالّەکان لەگەلّمدان، هەروەها توورەکە و کیسەکەم و ئومێدە گەورەکەمیش لەگەلّمدان. یەهوودا زانیاری زۆری پێ بەخشیم، بەلام بە ئومێدە گەورەکەی خۆمییەوە نەنووساندم. لەبارێکدا باسی چۆنێتی سەفەرەکەی خۆمم بۆ بۆمبای بۆ دەکرد، مەسەلەی کیسەکە و سەرکێشی خەون و ئاواتەکانی خۆمم لێی شاردەوە، تەنها وا خۆم پیشان دا کە بابایەکی دەربەدەرم و لەم دنیا فراوانەی خودادا بە دوای بژێودا وێلّم و بەس. باشتر وایە لەجیاتی ئەوەی باسی ئاییندەیەکی بۆ بکەم کە خودا هەر خۆی دەزانێت چۆنە، باسی رابردووی راستەقینەی بۆ بکەم. دەربەدەرێك دەربارەی شتهایەك قسە بۆ پیاوێکی (هەژار) دەکات، کە تەنانەت تووکی سینگی و سکە رووتەکەشی پیشان دەدات... بە رەتلّ قسەی بۆ دەکەم و بە میسقالّ لێی وەردەگرم. لە کاتی گونجاودا پرسیاری لێ دەکەم و بە ئەزموونی دوورودرێژی خۆم دایان دەڕێژم. بەرەو دەروازەکانی گومانی نابەم و بەو شتانەش نای شلّەژێنم، کە رەنگە لێیان بێ ئاگا بێت، ئەمێك لەگەلّ ژنەکەی و شەش مندالّەکەیدا لە ژوورێکی خانووە هاوبەشەکەیان نیشتەجێن، خانوویەك خۆری تێناکەوێت و بە درێژایی سالّیش حەوشەکەی پڕ لە زەلکاوە. باسی (نیکبارا)ی بۆ کردم لە بۆمبای، کە دالّدەگای کۆچبەرەکانی یەهوودی عێراقە. بێگومان لە کۆلانەکەی ئێمە و گەڕەکی کوردە ئاوارەکان دەچێت لە بەغدا. رەنگە لەوانەش پەرپووت تر و قێزەونتر بێت.

دوای دوو رۆژ لە یەکترناسینمان پێی وتم:

ــ چەندم پێ خۆشە لای خۆم میوانداریت بکەم، بەڵام... دوای ئەم (بەڵام)ە هەموو شتێك تێگەیشتم، ئینجا دوای ئەم نەختە زانیارییانە (بەڵام)ێکی دیکە سەریهەڵدا و نەختێك زانیاری روونتری لەگەڵ خۆدا هێنا.

ــ بەڵام (بنەماڵەی ساسۆنێك) هەیە وەچەی داودساسۆنی چاکەخواز و بەنێوبانگن، ئەوان ژوورێك بۆ نیشتەجێبوون بە هەموو لایەدەیەك دەدەن، ئەوەی روویان تێ بکات نائومێد نابێت و برسی و دەربەدەریش نابێت.

ئەوەتا لە بۆمبای خەرجیم دابین کرد. جاران من نانم بە میوان دەدا و ئاگام لێی دەبوو، لێ ئەمە پێویستییە و پێویستیش پاساوی خۆی هەیە. ئەوا خواردنم مسۆگەرکرد و ئیدی لەگەڵ هەزاران دەربەدەر و سوالکەردا لەسەر شۆستە نانووم، سەرباری هەموو ئەمانەش دەستی خەرجکردن بۆ کیسەکەم نابەم و ئەو ئامانجەش لە دەست نادەم، کە لە پێناویدا رێگای دەریام بۆی گرتەبەر. ئەم کیسەیە بۆ ئەوە هەڵگیراوە، تا شکۆمەندی بگێڕێتەوە و خەونەکە بێنێتە دی. هۆ دایکی منداڵان، بە چاوانی تۆ ئەمە هەر دەکەم!

ئەوەتا هێشتا لە ناوەندی دەریام و هاوڕێ و رێنیشاندەرێکم پەیدا کرد، کاتێکیش پاپۆڕەکە لە ساسۆن دۆك لەنگەر دەگرێت...

نا... نا، لەناکاو تارمایی رابردوو زیندوو دەبێتەوە، شەیتانەکانی ئەو رابردووە لەسەر لاشەی کەوتووی فریشتەکانی هەڵدەپەڕن. خۆت رابگرە، شتی کتوپڕ لە هەموو چرکەیەکدا بەڕێوەیە، جارێ بزانە ئەو چرکەیەی بەڕێوەیە، چۆن دەبێت؟ پێشهاتی کتوپڕ. نەفرەت لەو رابردووە و لە یادەوەریش.

پێشهاتی کتوپڕ... خۆت رابگرە! شلۆمۆ، پێش رووداوان مەکەوە! ئاخۆ دوای ئەوەی یەکەم هەنگاو لەسەر شۆستەی ساسۆن دۆك هەڵدێنم، چی روودەدات؟! پشتم بەو کەسە بەست، کە لە ئاستەنگترین کاتدا نائومێدی نەکردووم... خودایە، هەر تۆ پەناگا و بژێوەدەرمی.

***

ساسۆن دۆك! هەردووکمان شۆستەی (ساسۆن دۆك)مان دیوە. تۆ و من بە جیاوازی چل ساڵ دیومانە. "پێش مانگێك من لە بۆمبای گەڕاومەتەوە، ساڵیش (١٩٦٤)ە. ئێمە لە تارانین و تۆ باسی ساسۆن دۆکم بەر لە چل ساڵ بۆ دەکەیت و ئێمە لە ئێوارە شەممەیەکدا لەناو ژوورەکەی من، کە بە فەرش و پەردە و سۆبەی عەلادینی گڕشین پۆشتە کراوە. من لە سەرما هەڵدەلەرزم و تۆش لاقەکانت دەوری سۆبە عەلادینەکەیان داوە و لەو شەوی شەممەیەدا دەستەکانت داوەتە گڕی ئاگرەکەی. لە دەرێ ئاسمان بەفر دەبارێنێت، ڕەنگێکی شیری و سارد، شەوەکەشی شەوی شەممەیە و هێشتا عەزیزە و دایکی لە دەرەوەن و لە گەرما و خۆ دەشۆن، جلوبەرگیش دەشۆن، لە ساڵۆن پرچیان ڕێك دەخەن و تۆش ئاگرەکەت لە ئامێز گرتووە و ئاواتەخوازی مردنی منیت، چونکە من دووکەڵی ئاگرەکە هەڵدەمژم. لە شەوێکی شەممەدا لەنگەرگەی (ساسۆن دۆك) زیندوو دەبێتەوە".

بەر لە مانگێك (ساسۆن دۆك) شۆستەی بەندەرێکی چۆڵ کراو بوو لە سەرووی (بایکلا) لە شاری بۆمبای مت بووبوو. ئاسنی ژەنگاویی و لەوحەداری خۆراوی و ڕەش هەڵگەڕاو و پووکاوە. پیسی و بۆگەنی و جرج، شوێنەواری کوێرەوەبوو، تەنانەت ئاوی بەندەرەکەش گەڕاوە و قەوزاوی بوو. ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك شۆستەیەك ژیانی لێ دەتکایەوە، ئەمێستا ڕەنگی مردنی لێ نیشتبوو.

تۆ پێش چل ساڵ لەسەر ئەم شۆستە قەرەباڵغ و بەژاوەژاوە دابەزیت، کیسەکە لەنێو توورەکەکە بوو، توورەکەکەش جگەرگۆشەبوو، لەسەر دڵ هەڵگیرابوو، دڵیش لە خورپە خورپدابوو. ئاخۆ لەم دەریا پڕ لە جلی سپی و سەری ڕەشە، ونبووی خۆت دەدۆزیتەوە؟ لەم ژاوە ژاوە داگیرساوە و لێك حاڵی نەبوونە، لەم ترس و تۆقینە؟ ئەمە ڕۆژی پەسڵانە و هەستاوە، مەردم سەرەتا و کۆتاییان نییە، بنیادەم بچووك دەبنەوە و کەم دەبنەوە، ئینجا لەنێو قەرەباڵغیدا ون دەبن.

هۆ یەهوودا دەریا تۆ لە کوێیت؟ (باوکم!) دەستی گرتم، ئاخر وێڵ بووم! من لە سابڵاخ لە کاتی ئەوپەڕی مەترسیدا هەستم بە ترسێکی وا نەکردووە، لێ ئەم قەرەباڵغییە ترسناکە. لە دەریای خنکێنەری بنیادەمدا ون بووم، بۆ دەریایەکی دی

گێڕامییەوە. "دەریایەکی دی؟ لێرە کامیان ڕەسەنترە، ئەی بۆچی یەهوودا دەریا بۆم دەبێتە کەسێکی وەك باوکم و منیش خۆم باوکی تۆقیوان و کۆستکەوتووان و ئەوەی ترسێکی لەدڵدا بوو، بووم؟!". ئەمێستا تۆ لە شوێنێکی گەرموگوڕ دەگەڕێیت، کە لە گەرموگوڕی تەرس و شیاکەی گەوڕی ماڵە پڕ خێر و فەڕەکەی سابلاخت بچێت، ئەو ڕۆژەی پەنات بۆ گەوڕەکە برد، تا پێیە بەستوەکانتی پێ ڕزگار بکەیت. ئەو ڕۆژە نە حەوەجەت بە شارەزایی هەبوو، نە باوەڕ بە خۆبوونی گەورە. لێرە، لە (ساسۆن دۆك) لە تامێزی لالی وشە و کەڕیی پیتەکاندا دەریا بەناز و فیزەوە سەری بەرز دەکاتەوە. لەم دەریا بزواوەی بنیادەمدا کە لە بەرێخستنی بەشکۆی جەنازەیەك دەچێت، ترسێك دەنیشێتە سەر لایەد و غەوارەکان. هێی شلۆمۆ، جگە لە یەهوودا دەریا، کە چون ئاومالکەیەك لەم نوقمبوونە، کەسی تر ڕزگارت ناکات. بە هەموو دەنگتەوە کە لە هەناوی ژاوەژاوەکە ون دەبێت، بان دەکەیت "یەهودادەریا... یەهودا دەریا" سەرچاوەی ژاوەژاوەکەش ئەو تاڤگە دەنگییانەن، کە لە هەموو لاوە بڵاودەبنەوە. تاڤگەی دەنگی بە دەیان شێوە زمان و زمان، بە هیندی و ئەردی و میهراتی و ئینگلیزی و بە... لەپڕ:

ــ باوکی سەلمان! باوکی سەلمان!

گوێیەکانت فریای ونبوونەکەت کەوتن. تۆ لە چیاکانی کوردستان و دەشتەکانی ڕوسیا و نیهالەکانی تازەرێجان فێری دەست نیشانکردنی ئاراستەی دەنگەکان بوویت. ئێستا ئەم دیوارە مرۆییە سفتەت بڕی و بەسەر توورەکەکەتدا خۆت نوشتاندووەتەوە، خەڵکەکە فشار دەخەنە سەر سینگت و بە ئەستەم هەناسەت بۆ دەدرێ، بە جۆرێك هەر ئەوەتا ڕوحت دەرناچێت، بەڵکو فشارەکە هەر لەسەر جەستەتە. ئا ئەوەتا مل دەنێیتە شەپۆلی ونبوونتەوە، لەسەرخۆ، لێ بەرەو پێشەوە و بەرەو ئارامی و دۆزینەوەی خودە ون بووەکەت.

ئا ئەوە یەهوودا دەریایە! ئەوەتا لەوبەری شەقامەکە لەتەك گالیسکەی (گاری) وەستاوە و دەستت بۆ بەرز دەکاتەوە و بانگت دەکات! ئیدی بۆمبای بت پەرست بۆ کوردێکی بڕوادار نامۆ نییە، ئەوەتا بە هۆی ئەوەوە دەگەڕێتەوە و خودا دەدۆزێتەوە. لێرە، لە وڵاتی بتەکاندا یەهوودا دەریای دۆزییەوە... یەهوودای ڕزگارکەر... و دەستی نێردراوی خودا.

❊❊❊

تۆ ئارام بگرە، ئەمە حەکایەتە جوانەکەی منە و نەختە نەختەی جیاوازی کات و شوێن بەر بای گوێتم دا. لە شەوە سارد و بەفراوییەکانی تارانمان، شەوانی هەزار شەوەی ئێران، لە سەردەمی محەمەد رەزا شای پەهلەوی، لە سەردەمی سەرکردە تاقانەکەی بەغدا و "من ئەلهای گەڕانەوەم بۆ پایتەختەکەی رەشید. هێشتا لەیادمە چۆن لە ناخافڵدا لەگەڵ یەهوودە ئێرانییەکانی تردا لە بەغدا دەرکرام. لە نووسینگەکەم و سامانەکەم دایانبڕیم. من سامان و بازرگانیم دەویست، بەڵام ئێستا لە سەرەتای حکایەتەکەداین، وا من شۆستەی (ساسۆن دۆك) دەبڕم لە بۆمبای، وڵاتی سەیر و سەمەرە و قەرەباڵغی و جەنجاڵی، وڵاتی گەڕوگول و یەك ملیۆن سواڵکەر. دوای ساڵانێکی خێر و فەڕ و زەلیلی و مەترسی، وا بەرەو رێکەوتێکی نادیار شەقامەکە دەبڕم. دەتۆ ئارام بگرە! پێمخۆشە پێش ئەوەی مەرگ و بیرچوونەوە لەگەڵ خۆمدا بپێچنەوە، هەزار جار حکایەتەکە بگێڕمەوە".

یادەوەری لە سەرمدا نەمردووە، هێشتا پڕ لە وتەی ورشەدارە. لە هەزار کەللەسەردا لە یەکتر دووردەکەونەوە، هەر سەرێکیش زمانێکی هەس، دەیەوێت بێتە گۆ و ورەور بکات، لێ نەخۆشی و دەردەپیری زمانیان شەکەت کردووم و دەنگیان کز کردووم. ئیدی هەزار زمانەکە بۆ گوێچکە گەلێك زۆر بلێیی دەکەن، سرتەی چپەدووش وەرناگرن، ئەوسا تۆ خۆت تەرخان دەکەیت و لەجیاتی من لەسەر گێڕانەوەی سەربردەکە دەڕۆیت.

دوای ئەوەی لە ونبوون تێدەپەڕم و دەگەمە رووناکی و دنیایەکی نوێ، هەناسەیەکم وەبەر هاتەوە و گەرووم حەسایەوە و دووبارە ژیامەوە. دەنگی دەژنەوم و لەنێو شەپۆلی سەری بەیەکدا چوو، دەی بینم، چاوەکانم شتی ناهۆگر و تازە دەبینن، گوێچکەکانم دەنگی نامۆ دەژنەون... بەنێو دەیان گالیسکەی (گاری)و برێ ئۆتۆمبیل و بەنێو ریش و مێزەر و سدارەی سووری بەسەر تەوێڵدا پێچراو و بەنێو پەشتەماڵی پیاوان و پاوەنی ژناندا رادەکەم، بەرەو یەهوودا دەریا بە لۆقە دەڕۆم و گالیسکەوانەکە هەر پێنج پەنجەکەی خڕ کردووەتەوە و هاوڕێکەم بە دەنگێك دەیدوێنێت هەر لە دەنگی مەیموون دەچێت. لێوەکانی دادەخات و دەیانکاتەوە، لە بۆشایی نێوان لێوەکانییەوە هەندێك قسە

دەژنەم. وام بە خەیاڵدا دێت کە لەو هیندییانەم بیستووە کە لە بەغدا لەناو سوپای بەریتانیا بوون "پێنج بیسە!" ئەو دەمە یەهوودا ئاماژەم بۆ دەکات، کە سەر بکەوم، ئیدی توورەکەکەم هەڵدەگرم و سواری گالیسکەکە دەبم. یەهوودا پێویستییەکانی بۆ ناو گالیسکەکە بەرز دەکاتەوە، کە بریتین لە جلوبەرگ و دیاری و خورمای عێراقی (دایکی دەربەدەران). بە تەنیشتمەوە دادەنیشێت. گالیسکەوانەکە چەزە لە پشتی ئەسپەکان هەڵدەستێنێت و گالیسکەکە لە پانتایی خەونێکی دووروودرێژ و سەیردا تێی دەتەقێنێت. جۆرەها وێنەی بێ هەژمار، رووخساری جۆرەها کەسی لە ژمارە نەهاتوو، فێس و تەپلە و کڵاو و مێزەر و کڵاوی جۆربەجۆر. ئێرە دنیایەکی جیاوازە و واق ورماوییەکەم بیرۆکەکانم لاڵ دەکات. سەرسوڕمانم ترس و هەوریاکانم سڕ دەکات. ئەمە کاتی سەرسام بوونە و هەموو شتێکم لەبیر دەباتەوە، تەنانەت یەهوودامیش بیر دەباتەوە، کە لەتەکمەوە دانیشتووە، تەنها کیسەکەم نەبێت تا سەرسامیم پتر بێت، دەستەکانم پتر فشار دەخەنە سەری. شتێکی نهێنی هانم دەدات کە پارە بپارێزم. تا لە ژیاندا ماوم ئەوەم لەیاد ناچێت کە رۆژێك بە ناچاری مامەڵەم لەگەڵ پیسایی مرۆڤدا کرد و پاشەڕۆی ئینگلیز و کۆرکام لەپێناو ژیاندنی خێزانەکەم، هەڵدەگرت. من ئەو شلۆمۆ کەتانییەم کە لە سابلاخ بەدەم هاواری خەڵکەوە چووم و لە ماڵەکەی خۆمدا حەواندمنەوە و بە گوێرەی توانا لە برسێتی و مردن رزگارم کردن.

دوای دەوڵەمەندی و هەبوویی یەکەمم، بۆمبای سەرچاوەی هەبوویی و فەری دووەمە. لێرە، لە هەناوی خەونـدا ئافرەتی نیوە رووت دەبینم جلوبەرگ لەسەر شەقامەکان دەشۆن و بە گەلاکوتك* لێی دەدەن و پاکی دەکەنەوە، مۆزفرۆشی بە ساڵداچوو و برنج و پاقلەی سوودانی فرۆشی دەسگێڕ، بۆنی کاری و ئەفاوێ دەکەم. نیگام بەسەر دارخورمای نارگیلدا هەڵدەزنێت، هەروەك چۆن لە بەغدا بەرەو بۆلی دار خورما هەڵدەزنام خورمای گەیو بەسەر خەڵکی سەر شەقامەکان و فاڵگرەوە و دەروێش

* گەلاکوتك: دارێکی ئەستوور و دەم پانە، لە کۆندا دەیان کوتا بەسەر جلی تەڕدا تا پاك بێتەوە ـ وەرگێڕ

و سـوالكەردا بەردەدايـەوە، تەنانـەت مۆسـكۆى بـەهات و بـات لـەنێو گـەڕەك و گۆڕەپانەكانى بۆمبای ون دەبێت. يەهوودا، هۆ براكەم، ئەوەتا مـن لـە خەونـە پـەرت بووەكەم وەئاگا دێم و لێت دەپرسم:

ــ هاوڕێم، كەی دەگەینە نیكبارا؟

ڕێزی پەلەكردنەكەم دەگرێت و دەڵێت:

ــ پەلە مەكە، دوو هەفتە لەسەر پاپۆڕەكە ئارامت گرت، لێرە ناتوانیت ماوەیـەك دان بە خۆتدا بگریت؟

لە ناكاو دێو و درنجی گاڵتەجارِ هەستم پێدەكات و لەبەرخۆوە پێدەكەنم و دەڵێم:

ــ دەترسم رۆژی پەسڵان هەڵبستێت و ئێمە هێشتا هەر بەرێوەبین.

بزێوییە، بەڵێ، بەڵام پەلەكردن هەمیشە لە شەیتانەوە نییە، دنیام تەی كرد و ملم بە مەترسییەوەنا، بەخوازەیی هەر حەوت ئۆقیانوسەكەی دنیام بڕی، لـەبادەی هـەموو دنیام بەتاڵ و شیرینییەوە دلۆپ دلۆپ خواردەوە، زانیم كە تەمەن بەزەیی بە گاڵتـەكار و غافـڵ بـوودا نایـات، بڕیـار دان ئەوەیـە ئـەو سـاتە بقۆزێتـەوە كـە بـە كـەڵك و سوودبەخشە...، كات بەفیڕۆ نەدەم و بە پەلە بەری سەركەوتن بچنمەوە و بۆ لای دایكی منـداڵان بگەڕێمـەوە، ئینجـا دوای ئـەوەی دنیـا جێـدەهێڵم، لـە رۆژی لێپرسـینەوە دەفتەرەكانم واڵا دەبن، ئەوسا كۆشش و كردەوەكانم بۆم دەپارێنەوە و بەر لێبوردنی خودا دەكەوم.

ماوەیەك لێپرسینەوەی ناوگۆڕِ خەیاڵی بردم، لەپڕ وەئاگا هاتمەوە، یەهوودا دەریـا و گالیسكەوانەكە و من لەناو جەرگەی گەڕەكەكانی نیكبارا بووین، گوێم لە دەنگەكانی بەغـدا بـوو، بـۆنی خواردەمەنییـەكانیم دەكـرد، لـە گـەڕەكێكی جوولەكەنـشینی بەغداییەوە بۆ گـەڕەكێكی جوولەكەنـشینی بەغـدایی دیكـە دەچـووم. دوو گـەڕەكی جوولەكەنشینی بەغدا لێوان لێو لـە كلۆڵی و بەدبـەختی و هـەزاران میـل لێكیـان جیادەكاتەوە، بەڵام هەردووكیان بە روح و جەستە وەك یینا بەشان یەكەوەن.

یەهوودا دەریا بە باشترین شێوە پێشوازی كردم، هەرچەند لەناو پاپۆڕەكەدا تەوازۆی خواستەوە كە ناتوانێت میوانداریم بكات، كەچی لە ماڵەكـەی خۆیـدا، بـە تەنیـشت

ژوورەکەی خۆیانەوە، کە ژن و منداڵەکانی تێی خزابوون، ژوورێکی بچکۆلەی بۆ چۆڵ کردم. سێ ڕۆژ لەلایان مامەوە، هەر سەعاتێك کە تێدەپەڕی، لەبەرچاوی خۆم دەبوومە باگرانییەك و هەستم دەکرد من چیایەکم لە قوڕقوشم و بەسەر ئەم مرۆڤە چاکەخوازە و خێزانەکەیدا کەوتووم. لە چاوانی پیاوەکەدا ململانێیەکم لەنێوان ئەرك و بێ توانایدا دەخوێندەوە. هەوڵمدا زاتێك بخەمە بەری تا یارمەتیم بدات لە ماڵەکەم دەستەکەی و ناو خێزانەکەی بگوێزمەوە. بە دەنگێکی پێشوەختەی شەرمی قسەکردن وتی:

ــ بچیت لە ئوتێل دابەزیت، ئەمە شتێکە و بە دڵم نییە، ئاخر تۆ پێویستت بە (بیس ــ پارە)یە، بەڵام من قسە لەگەڵ (حای) بجێوری کەنیسە دەکەم، بەڵکو کلیلی کەنیسەکەت پێ بدات، تا لە ماڵی خودا نیشتەجێ بیت، تا ئەو دەمەی کاروبارەکانت ئاسان دەبن و بەرپێی خۆت دەبینیت، یەکێك لە کوڕەکانم لەکاتی خۆیدا خواردنت بۆ دێنێت، بەڵام من تا لە ژیاندا بم و تۆش هەتا میوانی ئێمە بیت، دەست بەردارت نابم.

باشترین پیاو و خاوەنی باشترین ئاکار، تەنها سوپاسیم کرد و لام سەیر نەبوو، چونکە لەوەتەی چاومان بەم دنیایە هەڵێناوە، ئەمە ڕەفتارمان بووە. خێر و فەڕ لە سابلاخ بە نەریت و سروشتەوە، تا دنیا تێکچوو، تەنانەت تا دوای شێت و هاربوونی دنیا، خراپەکاری بێگانان کاری نەکردە سەر چاکەخوازی ئێمە. ئەوەبوو بەرانبەر خراپەکاری ئەوان پشتمان دایە پشتی یەکترەوە و نەفرەتمان لێکردن. کەواتە سەیرەکە لەوەدا دەبوو، گەر یەهودا دەریا شتەکەی بە چاوی خۆی دیبا و ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ نەکردایە. کەنیسەش ڕۆژێك لە ڕۆژان بۆ من داڵدەگایەکی نامۆ نەبووە، هەر لە منداڵییەوە ماڵی من بووە، تا تایەفەکەمان لە سابلاخ گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە بمکەن بە بەرپرسی کەنیسەکە. کلیلەکەی لە گیرفانی مندا بوو، پێش وەئاگاهاتنەوەی باڵندان رووم تێدەکرد و ڕۆژێك دوانەکەوتم، تا داهاتنی تاریکی ڕووداوەکان، شەوانی تاریك و ئەنگوستەچاو بەسەر بەفری بەسەریەکدا کەوتوو و بە خوێن سووربوو تۆپباران... ڕێم دەبڕی و پەنام دەبردە بەر ماڵی خودا و چاوەڕێی نوێژکەرانم دەکرد، لەگەڵ زیادبوونی مەینەتی ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی نوێژکەران کەم دەبووەوە، تا پێش کۆچکردنمان لێ بڕاین لەبری نوێژی بە کۆمەڵ، نوێژی تاکە کەسیمان دەکرد.

ئەمێستا بۆمبایم سەرسام کرد بەوەی لە میوانداریتی یەهوودا دەریا بجەسێمەوە و لە کەنیسەی نیکبارا نیشتەجیٚ ببم. من بۆ ئەوە هاتووم لە هەلێك بگەرێم. بێگومان دەزانم لە کون و کەلەبەری ئەم کۆلانە لەبیرکراوانە و لە مالی خودا هەل بە دوای مندا ناگەرێت. کەوابوو چار نییە و گەرەکە پشت بە خۆ ببەستم و بچمە دەریٚ و چاوێك بە شوێنە نادیارەکانی ئەم شارە سەیرەدا بگێرم. سیٚ و چوار رۆژ پشوودان و پرسیارکردن بەسن. هۆ ئەسمەری چاوەروان لە بەغدای دوور، کاتی ئەوە هاتووە دەست بە کارکردن بکەم! هەر رۆیشتم و رۆیشتم، خودا و ئەسمەر و منداڵەکانم لەبیرە. ئیٚ منیش لە بازرگانیدا شارەزام و دەست و پەنجەم هەیە و لە کاتی پێویستدا جێگەی زمانم بۆ دەگرنەوە. ئیٚ مادام هەردوو وشەی (نیکبارا) و (مارکێت) دەزانم، ئیدی لە پێچ و پەناکانی ئەم شارە هەزار رووخسارە ون نابم. هۆ ئەسمەر، مزگێنی بێت بەم زووانە دەروویەکم لیٚ دەکرێتەوە. لێرە، ئەو شتانەی دەیان بینم، نە لە روسیا و نە لە ئێران و نە لە بەغدا چاوم پیٚ نەکەوتون. جاریٚ هەر ناوی خودا دێنم، ئینجا بە دیار کەلوپەلی سەیرەوە دەوەستم و گەشکە بردوو دەبم، دەم داچەقێنم و دیقەت دەدەم. ئێرە پرە لە ئالەت و عەتر، من لە ولاتی ئالەت و عەترم، ئەوە هێل و بیبەر، زەنجەفیل و عەنبەر و سەندەل و کافوور و تەلی بخوردی جاوەیی. ئەوەتا لێرە قاوە و چای و گوێزی هند و عەنبەیە. بازرگانانی بەغدا بۆ ئەم شتانە پێش کەوتن، سەد ساڵە بەغداییەکان لێرەن، سەد ساڵە لە نێوان هندستان و بەغدا بازرگانی پەرە دەسێنێت و هەمەجۆر دەبێت و گەشە دەکات. تەنانەت سابوونی رەقی و سابوونی شەماشیش لێرەوە بۆ بەغدا دێت. ئەریٚ من هەلەم کردووە کە بۆ ئێرە هاتووم و بەدووی بژێوی خۆمدا دەگەرێم؟ دیارە مەسەلەکەم وەك بازرگانە پیشەوەرەکان لێك نەدابووەوە؟! ئیٚ منی شلۆمۆ کوردە بە پیشە بازرگانم، کەوابوو بازرگان کامەیە و کێیە؟ ئاخۆ ترس و کارکردن لە ئاودەستی ئینگلیزەکان لە بەغدا کاری شەرەفمەندانەی پێشوویان بیربردمەوە؟ ئاخۆ رێم ویٚل کردووە، چونکە لایەکی بۆمبای کە ولاتی هەل و کارکردنە، بە ئاو داپۆشراوە؟ ئەی خودایە، ئەمە یەکەم رۆژمە کە لە بازار بەسەری دەبەم. لێرە کۆپییەکی تەواوی ئەو شتانە دەبینم، کە لە بەغدا بینیومن. بەبیٚ برستی و نك نائومێد بۆ نیکبارا

گەڕامەوە. مجێوری کەنیسە دیقەتی هەوری چاوانم و ڕووخسارمی دا، بە جووڵەیەکی بازنەیی لەپی لێی پرسیم:

ــ ئەوە چ باسە؟!

سەر بەرز دەکەمەوە و بە گازاندەوە لێی دەپرسم:

ــ وا بزانم لە بۆمبای هیچتان نەهێشتەوە و هەموویتان بۆ بەغدا گواستەوە؟

دڵی دامەوە و وتی:

ــ هەرچەندە من مجێورێکی داماوی کەنیسەم، بەڵام ئەوە دەزانم دڵی بازرگانی فراوان و گەورەیە، هەروەك جێگەی هەزارانی تێدا بووەتەوە، بەهەمان شێوە جێی تۆیشی تێدا دەبێتەوە.

ــ (حای)ی برام، بەڕاستی لەو باوەڕەدایەت؟

بە جەختەوە وتی:

ــ من دڵنیام، بازرگانە بەغداییەکان لە بۆمبای، برای بازرگانەکانن لە بەغدا، دروشمی بازرگانەکانمان و بەقاڵەکانمان و نانەواکانمان و تەنانەت قەسابەکانیشمان، ئەوەیە کە "بژی و بهێڵە با خەڵکی تریش بژین!".

ــ بەڵام رقم لەو جۆرە ژیانەیە، کە ببیتە بارگرانی بەسەر یەکێکی دیکەوە، یان پشت بەوە ببەستیت خێرت پێ بکەن.

وتی:

ــ هاوکاری کردن نەخێر پێکردن و نە چاکە کردنە، بەڵکو فەڕ و خێرێکە هەمووان دەگرێتەوە.

بازرگانانی بەغدا و بۆمبای، هەوڵەکانتان جێگای سوپاسە، لێ من بۆ ئەوە بۆ ئێرە نەهاتووم تا ببمە زیادە و بارگرانییەك، من لە بواری بازرگانیدا ئەسپێکی ڕەسەن و بەزم. ئاخر ئەو ڕۆژەی لە ڕێگای نەفس بەزری خۆمەوە بەرەو ئاودەستی سەربازێکی بەریتانی دابەزیم، بۆ ئەوە دابەزیم، تا ئەسمەر و منداڵەکان پارووە نانێك بخۆن، بەڵام من سازشم لەسەر پیشەیەك نەکردووە، کە تێیدا گەشەم کردووە. نەفرەت لە هەموو نێوان نێوانێك و ناوەندکارییەك! بە بڕوای من نێوەندکاری شتەکان سردڕاونەتەوە، ئیدی

یان هەرە نزمایی، یان ترۆپکی چیا، یان ئەوەتا ببمە منی (شلۆمۆ کوردە!)، یان هەر هیچ نەبم.

رۆژانی داهاتوو رووبەری گەڕانەکانم بەرینتر بوو، لاکانی دیکەی بازاڕەکانم دۆزییەوە، هەر دەڕۆم و دەڕۆم، دەڕۆم و دەوەستم. لە هەر هەنگاوێکدا دامانێک، لە دە هەنگاودا هزرگەلێك، بازاڕی وردەواڵە فرۆش و شتهای دەگمەن پشووی بنیادەم خۆش دەکەن و ئەفسوونی لێدەکەن، پەیکەرۆکەی عاج و ئەبەنۆس بە تەواوی شکۆیانەوە، مێز و کورسی لە ئەبەنۆس دروست کراو و لە فیلی رەش بارکراو، شمشێر و رم و چەقۆ، بتی لە عاج دروست کراو و سەماکەر. لەملایەوە بارکە و بەرەو بەغدا "نا...نا...نا" شلۆمۆن ئەوە چیتە؟ ناخۆ (جەرگ و هەناو) شایانی (خاوەن دوو شمشێرە؟!) ئایا ئەوەی هیچی نەبێت، هیچ دەخوات، ئەوەی جلێکی نەبێت، جل لەبەر دەکات، ئیێ ئیتر چیت لە شتی دەگمەن و پەیکەر داوە؟! لە بازاڕی پەلەوەران تووتی سەوزم دی. بیرم لە توتییەکان کردەوە و پێکەنیم. ئەمە بازرگانییەکی شاراوەی دیکەیە. ئەوەی ئورستوکراتی و دەولەمەند بووایە، تووتی هەبوو. ئەمە باڵندەیەکە بارگرانی بۆ هەژاران دروست دەکات، ئینجا ئەم باڵندەیەش خۆ کەلوپەل و پێویستییەکی رۆژانە نییە، ئەمە باڵندەیەکی وەك مرۆڤ تەمەن دەکات، ئەمەش وا دەگەیەنێت دوای ساڵێك رەواجی نامێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا بە نائومێدی و دەستی بەتاڵەوە بە خۆو کیسەکەتەوە بەرەو بەغدا بۆ لای ئەسمەر ناگەڕێیتەوە، شلۆمۆ، تۆ لە شارێکدایت هێشتا هەموو بستێکی هەلێکە بۆ کارکردن، راستە لاقەکانت ماندوو بوون، ئەوەندەش رێت کوتاوەتەوە پێڵاوت لەپێ نەماوە، بەڵام بۆ پەیداکردنی هەل، گومانم نییە و لە کووچەیەك لە کووچەکانی بۆمبای هەر هەیە.

شلۆمۆ، برۆ، رێی خۆت بگرە بەر، تەماشا بکە و ورد ببەوە. پێدا بچۆوە و بپشکنە. ئەمە شارێکە، مۆسکۆ لەنێو شەقامەکانیدا ون دەبێت، لەنێو بازاڕەکانیدا بەغدا و دەوروبەری جێگەیان دەبێتەوە.

فەردەلۆکە لە ناوەندی بازاڕ، ئەی بۆچی بە دەوری فەردەکانەوە کەپرۆکەیان کـردووە و بە چاوی کڕیارەوە تەماشای دەکەن و چـاوەڕێی دەکـەن؟! ئـاخۆ بـەکارهێنانی لۆکـە پەیوەندی بە سرووتی ئایینی هندۆسەوە هەس!؟ بۆ نموونە لای خۆمان دەکرێتە فتیلـەی قودیلە چرا؟ ئەمە جەماوەرێکە و تەنها خەڵکانی خۆتێهەڵقورتێنەر نیین. خـۆ ئەگـەر شای قاجاری لێرە بووایە، بێگومان دەیوت "ئەمە کۆبوونەوەیە و رێگـە بـۆ شـۆڕش و یاخی بوون خۆش دەکات"، بەڵام تۆ لە بۆمبایت، گەر لـە شـەقامێك وەسـتایت و بـە ئەنگوست ئاماژە بۆ چۆلەکەیەك، یان درەختێك، یان تەنانەت بۆ شتێکی خەیاڵکردە و نەبوو، ئاماژە بکەیت، دەتوانیت سەد پیاو لە دەوری خۆت کۆ بکەیتەوە، لـە کاتێکـدا لێرە خەڵکی دەوری بالەیەك، یان لەنگەیەك لۆکە دەدەن، سـڵ دەکەنـەوە، وەك ئـەوەی لەنێو فەردەکەدا دێو و درنج هەبێت و گەنجینەی سلێمانی پێ بێت! شـلۆمۆ، چـاوەڕێ بکە، تا دێوی ناو فەردەکە دەردەکەوێت، من لە فەردە لۆکە نەزان و سـەردەرنەکردووم، بەڵام ئەو ورە ورە وەك ژاوەژاوێکی بێ رەنگ هـەردوو گوێـچکەم دەسمـن، وشـەکان بـێ واتان، ئێ وشە چ پەیوەندییەکیان بە منەوە هەس؟ خودا ئەم دوو چاوەم لێ نەسـێنێت، وا مقەسـێك دەوری بالەکــە دەدات. قەیدەکــە دەپـسێت و دەکــەوێت، قەیـدی دووەم بەرەنگاریی زۆرتر دەکات، بەڵام سووربوون بەهێزترە و وا مەچـەکی رەشـتاڵە و ئـارەق کردوو خەریکە بە مەقەستەکە سەرسەختی قەیدەکە چارە دەکـات. لـە کۆتاییـدا مـل دەدات و بــە تەنیــشت براکەیــەوە لار دەبێتــەوە. ئەمێــستا نــۆرەی جیاکردنــەوەی کەلوپەلەکەیە، ئەی ئەو جۆش و خـرۆش و ژاوە ژاوەی خەڵکەکـە لـەپای چییە؟ دەبـا ئەسمەر بێت و ئەو شتانە ببینێت، کـە پیاوەکـەی بـە لۆکـەی دەزانـی... دەبـا دایکـی منداڵانم مزگێنی بدات و هەلهەلە لێ بدات!



ئایا لە کاتی چارەنووسازی وادا دەوەستیت، تا هەناسەیەکت وەبەر بێتـەوە؟!، بـەڵام تۆ ماندوویت و لەسەرخۆبە، ئەسپی رەسەن هەناسە بڕکێیەتی و ئەو رۆژە بـە جۆرێـك حیلاندی، حیلەکەی شادییەکی هەڵقوڵاو بوو. ئەوەی ناو بالەکە لۆکـە نـەبوو، بـەڵکو رەنگەکانی کۆڵکەزێڕینەیەك بوو، لەناو بالەکەدا رووناکییەکی دڵگیر هەڵهات.

ئەوەتا دەبینیت خەڵکەکە بەسەر باڵەکەدا کەپرۆکە دەکەن و دەیانەوێت بزانن چی لەناویدایە. جلوبەرگ و پاڵتاو و کراسی ئاودامان و کراس و فستان، جلوبەرگی هەمەرەنگ، هەر کەسە و دەستی تێدەخات و دەپشکنێت و هەڵدەبژێرێت، تۆش سەرسام بوویت، خەیاڵ دەتباتەوە و نیشانەی پرسیار و ئاڵۆزیی دەنیشتە سەر رووخسارت و لەنێو ژاوەژاودا نەشارەزا و سەردەرنەکردوویت.

وشە لە دەورندا چون شەپۆلی ئۆقیانووس پێکدا دەدەن. خەڵکی هەڵدەبژێرن و پارە دەدەن و پەرۆشی ئەوەن تا بزانن لەناو باڵەکەدا چی ماوە، کەچی لە چاوترووکانێکدا هیچی تێدا نامێنێت. ئەمە چییە؟ ئەم و ئەو رادەگریت و بە پەنجەکانی دەستت پرسیار دەکەیت. لەناکاو قسەی پچرپچڕ و ئاڵۆز لە کرکراگەی گوێت گیر دەبن، ییە... کییە... هییە! ئاخۆ خۆیان هەروا قسان دەکەن، یان تۆ بە هەڵەدا چوویت؟ نا... نا، هیچ سوودی نییە. ئەوە شوێنەکەت زانی دەی هەر کاتێك زمانت بەسترا و گوێیەکانت لەجیا کردنەوەی دەنگەکان، تەپ بوون، پەنا بۆ ئەو زمانە ببە، کە خودا پێی بەخشیویت.

ــ هۆ برام، ئەی هاورێم یەهوودا دەریا، فریام بکەوە! ئەمرۆ لەنگەی جلوبەرگم بینی، خەڵکی وەك نانی تازە لە تەنوور دەرچوو، فڕکان فڕکان دەیان برد.

پرسی:

ــ مەبەسەتت لە جلوبەرگی بەکارهێنراوە؟

ــ نپ و نوێن...، بەڵام بە نارێکی بەسەریەکدا کەڵەکە کراون.

ــ کەواتە ئەوانە جلوبەرگی بەکارهێنراون، لە وڵاتانی رۆژئاوا، کە جل لەبەر دەکەن هەر ئەوەندە پیس و چڵکن بوو، ئیدی نایشۆن تا لەبەری بکەنەوە، بەڵکو بە هەرزانترین نرخ بۆ ئێمەی دەنێرن.



هێز و توانا و پەرۆشم هاتەوەبەر. هەندێك کات هەیە لە جارێك زیاتر تێیدا دەژین، لە ژیانی منیشدا کاتی ئاوهای لە هەژمار نەهاتووی تێدایە. ئەوە چرکەساتێکی لەجۆرە بوو، یەکێکە لە وێستگەکانی ژیانم، یەهوودا دەریا قسەی دەکرد و منیش خەیاڵم دوور دەڕۆیشت، تا بگەمە چارەنووسی خۆم و دەربارەی مەسەلەکە دەمدواند.

وردەواڵەی دەگمەن و تووتی بەکەڵکی بەغدا نایەن، ئێ منیش لەگەڵ هێنەرانی چای و قاوە و هێل و بیبەردا ناچمە نێو ململانێیەکی نامسۆگەرەوە. من رووەکەمە هەژارانی بەغدا، بە پیری ڕەشورووتەوە دەچم، چونکە ئەوەی ئەوان گەرەکیانە جلوبەرگێکی ئادەمییانەیە بە نرخێکی هەرزان. من سوود بە خەڵکی بەغدا دەگەیەنم و هاوکات سوودیان لێ دەبینم. دەبێت (دارولسەلام ــ بەغدا) بە جۆرێك پڕ لە کاڵا بکەم لەمەوبەر شتی وای بە خۆیەوە نەدیبێت، لە مێژووی بازرگانی بەغدایشدا دەبمە نیشانە و ئاماژە بۆ شلۆمۆ کوردە دەکەن و دەبێژن "ئا ئەمە پێشەنگی بازرگانانی جلوبەرگی بەکارهێنراوە لە بەغدا و یەکەم کەسە ئەو کاڵایەی هێناوەتە بازاڕەکانەوە".

بە یەهوودا دەریام وت:

ــ لەگەڵ کەسێکی لایدە و غەریبی هاوڕەگەزی خۆت چاکەکەت ببەسەر.

بە سیمایەکی سەرسوڕمان و پرسیارەوە نیگایەکی کردم، پێیم وت:

ــ تۆ برامی، دەی هارون بۆ موسا چۆن بوو، تۆش بۆ من ئاوهابە و بە زمانی خۆم قسەیان لەگەڵدا بکە.

دەستبەجێ زانیم، کە دڵی یەهوودا پێش زمانی دێتەگۆ و دەڵێت:

ــ لە هەر شتێك تۆ پێویستت بێت، من بۆ تۆ وەك هارونم بۆ موسا.

هەڵوەستەیەکی کرد. بە پەرۆش و پەلەکردنەکەی جارانمەوە وتم:

ــ کەواتە دەی با بڕۆین.

نزیکەی سەعاتێك یەهوودا دەریا لەگەڵ بازرگانێکی جلوبەرگی لەنگەدا گفتوگۆی کرد، ئینجا وتی:

ــ با بەپەلە بگەینە بەندەرەکە!

لێیم پرسی:

ــ بۆچی بۆ بەندەرەکە؟

ــ ئەم پیاوە بازرگانێکە بە تاك دەفرۆشێت، پێی وتم ئەمڕۆ لە بەریتانیاوە بارێك دەگاتە جێ و خاوەنەکەی لە بەندەرەکە وەری دەگرێت.

ــ ئەمە دروستە! پێویستە ئێمە سەرەتای پەتەکە بگرین نەك کۆتاییەکەی، بەڵام مادامەکی شتەکە ئاوهایە، گەرەکە دەست بۆ سەرەتای ئەم پەتە لە بەریتانیا ببەین.

قسەکەمی پێخۆشە و بەدڵێتی، بەڵام یەهوودا دەریا یەکێکە لەوانەی ئارام گرتنی پێ باشە، پێدەکەنێت و دەڵێت:

ــ ئارام بگرە، هەموو شتێك کاتی خۆی هەیە، بیرت نەچێت شتێك هەیە پێی دەڵێن مۆنۆپۆل، پاشان نرخی تێچوون لە هندستان لە نرخی تێچوونی شوێنانی دیکە کەمترە. سەرچاوەی ناردە بەپێی بارودۆخی بازاڕ و دەرامەتی خەڵکی وڵاتی هاوردە نرخ دیاری دەکات. ئەوەشت لەیاد بێت کە هندستان بەشێکە لە بەریتانیا، ئەمەش وا دەکات لەو باجانەی خراونەتە سەر کاڵای بەریتانی لە هەد خۆش بێت.

هەڵکردنی (با) گونجاوە، وەرزەکەی بەهارە و یەهوودا دەریا بە زمانی هیندی بازرگانەکە دەدوێنێت، دڵی منیش بە هەموو بیر و هۆشێکەوە، بە هەموو زمانانی دنیا لە خودا دەپاڕێتەوە، لێ من خودام رازی نەکردووە، ویژدانی من جگە لە یاخی بوون و بەزەیی شتێکی تری بۆ خودا تێدا نییە. من وا خۆم بۆ دیداری رووخسارە بەخشندەکەی ئامادە دەکەم لە دەریای بەخشندەیی و چاکەی ئەو نوقم بووم و ئەویش پشتی بەر نەداوم و ئەز ژی چاو دەنووقێنم گەواهی بۆ یەکتایی ئەو دەدەم، لە کاتێکدا لە سابلاخ لە رۆخی مەرگدا بووم، ئەمێستا وا لە بۆمبای رووخساری یەهوودا دەریا وەك مانگێکی رەشتاڵە بە رووما هەڵهات و مزگێنیم دەداتێ:

ــ پیاوەکە ئامادەیە هەموو بارەکەت پێش گواستنەوەی لە بەندەرەکە، پێ بفرۆشێت!

لەو دەمەیدا، کە قسەکەم لە دەمی یەهوودا ژنەوت، لە سەرسامی و خۆشیدا، نرخی کەلوپەلەکە بازێکی بەرەو ئاسمان پێدام، بڕوام نەدەکرد، کە نرخی کەلوپەلەکە لە هەرزانیدا وەك خۆڵی دنیایە، تەنانەت گەر بە دوو ئەوەندەی نرخەکەی خۆی فرۆشتبام، ئەوا گیرفانی هەژارانی بەغدام ماندوو نەدەکرد، بەڵام ئەی پارە؟ کەلوپەلەکە زۆرە و نرخەکەیشی بە گوێرەی هەرزانییەکەیشی لە توانای تۆ و ئەوەی ناو کیسەکە گەورەترە، ساتێکی نائومێدانە بوو، بەڵام هەر زوو خۆرەکە هەورە تاریکەکەی

رووخسارمی ڕەواندەوە، ئەم وڵاتە و خەڵکەکەی چ سەیرن! لێ ئێمە هەموو بەغدایی و براین...، بۆیە ئەوەی ناو کیسەکە بەرانبەر نیوەی کەلوپەلەکەیە و نیوەکەی تری بـرا و هاوڕێم یەهوودا دەریا دەستەبەری دەکـات. غەریبەیـەکی هـەژار دەبێتـە دەستەبەری غەریبەیەکی نەناس. چۆن؟! بازرگانێکی هیندی ــ بەغدایی متمانــە بــە هــەژارێکی یەهوودی دانیشتووی نیکبارا دەدات و هەژارێکی یەهوودی نیکبـاراییش متمانــە بــە کوردێکی ئاوارە و دەربەدەر دەدات، کە وازی لە بازرگانییەکەی و ناوبانگە باشـەکەی و دوور لە سابلاخی خێر و فەڕ و هەبوون و سەربڕاو، هێنا. ئیدی بە تـەرحێ باوەشـم لـە یەهوودا دا و بە خۆمەوە گوشی و سوپاسی چاکەکەیم کـرد، هـەر وەخـت بـوو روحـی دەربێت. من لێرە لـە وڵاتـی سـەیر و سـەمەرە و ئەفسانەدام! گـەر هەسـت و سـۆزم بنووسرێنەوە، ئەوا دەستبەجێ کتێبێك پڕ دەکەنــەوە، کـە وشـەکانی بـریتی دەبـن لـە روونـاکی و دەبنە سترانێك بە باڵای چاکەخوازیدا هەڵـدەڵێن. ئـەو دەمــەی جـەنگ لـە سابلاخ بارگەی خست، دنیا بوو بە دەڵەدێوێکی ترسناك و هەر خەریکی تیژکردنـەوەی کەڵبە و چڕنۆکەکانی بوو. ئەمێستا لە بۆمبای لە رۆخی ئۆقیانووسەکەی دنیا لـەنێو ئاوەکانییەوە پەری دەریایەك بەرز دەکاتەوە، بووکە دەریایەك لە بووکە جوانەکانی بەرز دەکاتەوە. بە چپە بە یەهوودام وت:

ــ عانەیەك لە گیرفانمدا نەماوە، تا لە خۆمی خەرج بکەم، هـەموو پارەکـانم نایـە بان ئەم باڵانەوە و لە یەکەم پاپۆڕی بەرەو بەسرای بار دەکەم و خۆشم لەگەڵیدا دەڕۆم و چاکەی تۆش لەگەڵ خۆمدا دەبەم. مەرج بێـت بـە زووتـرین کـات قـەرزی پیاوەکـەش بدەمەوە و تۆش لەو کۆتە رزگار بکەم، کە لە پێناو خۆمدا هەردوو دەستتم پـێ کـۆت کرد.

بەناقایلییەوە وتی:

ــ ئایا جەژنی رۆژووشکاندن لەسەر پشتی پاپۆڕێکی هیندی دەکەیت؟

جەژنی لێبوردن! چۆن لەبیرت چوو؟ ئەوەتا بە خێرایی نزیك دەبێتــەوە، تـۆش ئـەی خودایە "هەروەك دروستت کردم" چۆن ئەرکـەکانت جێبـەجێ بکـەم، ئـاخر مـن ئـەو سامانەی لە دنیا هەم بوو، لەدەستم دا و شتێکم لێی نەهێشتەوە تا ئاهی دڵی خـۆمی

پێ بشكێنم؟ كەشەكە لەسەر روح و رووخسارم لە گۆڕاندایە و خۆرەكە هەور گەلێك دەڕەوێنێتەوە، ئەوەندەی نەبرد رووخسارم هەور بەری گرت و دەروونمی داپۆشی، منێك مەرگم پێ خۆشترە لەوەی یەكێك لەو ئەركانەم فەرامۆش بكەم كە خودا بۆی داناوم. بێدەنگی و بیركردنەوەم درێژە دەكێشێت و یەهوودا دەریا سەری لێم سووڕدەمێنێ، دڵنیام دەكاتەوە:

ــ لە كاتێكدا ماڵباتی ساسۆن لێرەن، ئیدی چی پەژارەت دەكات؟!

دەم و دەست وتم:

ــ مەحاڵە دەست لە كەسێك پان بكەمەوە، تەنانەت ئەو كەسە لە بنەماڵەی ساسۆنیش بێت.

ــ تۆ غەریبیت و یەهوودیت و لە بەغداوە هاتوویت، ئێ جەژنی لێبووردنیش وا بەڕێوەیە و لە دەرگا دەدات.

ــ ئەمانە هەموو راستن، بەڵام مەحاڵە من سواڵ بكەم!

برا و هاوڕێم یەهوودا دەریا پێكەنی:

ــ خانەوادەی ساسۆن نەریتێكیان هەیە، لە هەموو جەژنێكی رۆژووشكاندندا دەستبەرداری نابن! ئەوان هەموو كەرەسەیەكی جەژن بۆ ئەو یەهودییە عێراقییانەی كە لەم رۆژانەدا دەبنە میوانمان، ئامادە دەكەن.

ــ بەڵام نەك بۆ ئەو كەسەی بۆ بازرگانی هاتووە و هەموو پارەكەی خۆی بۆ ئاڵوویرێكی گەورەی وا خەرج كردووە، كە قازانجەكەی دوو ئەوەندەی نرخەكەیەتی.

دووبارە پێكەنی:

ــ لای ئێمە میوان هەر میوانە، ماڵباتی ساسۆنیش لەنێوان میوانێكی دەوڵەمەند و میوانێكی هەژار، جیاوازی ناكەن. تۆ میوانیت و لە بەغداوە هاتوویت، تەنانەت گەر بۆ لایانیش نەچیت، یارمەتییەكەیان هەر بۆت دێت، ئیتر بتەوێت، یان نەتەوێت.

چۆن رەتی بكەمەوە؟ منێك لە هەموو كەس باشتر دالّدەدان و رێزی میوان دەزانم؟! ئەی سابلاخ ئەو گەواهییەم بۆ نادات؟! كاتێك وا پێویستی كرد میر و خێزانەكەی

روویان لە ماڵەکەم کرد، ئەوە بوو لەگەڵماندا نیشتەجێ بوون... نێ مادام نەریتی میوانداری دەزانم، دەبا خۆم بۆ لایان بڕۆم، هەی شلۆمۆی قوڕبەسەر، ئەمێستا کاتی خۆ دەرخستن و پیشاندانی ئابڕوومەندی نییە و ئێستا وەك شمشێرە بە یاقووت زاخدراو و هەڵواسراوەکەم لە ژوورەکەمدا لە سابلاخ لە چاوەڕوانی میوانەکانمدا، هەڵی ناکێشم! ڕەنگە ڕێگای ماڵەکەم ون بکەن، ئەوسا لەگەڵ ونبوونی ئابڕوومدا، چاو و رووشم نامێنێت.

بەمجۆرە بەرانبەر بە بەخشندەترین خەڵك، دەستم پان کردەوە. سوپاسی خودام کرد کە لەنێو ریزی میوانە ریزبەستووەکان بەرانبەر ئازووقەخانەی میوانداری ماڵباتی ساسۆن ون بووم، ئینجا ئەوەندەم پێ نەچوو گالیسکە و ئەسپێکم بە کرێ گرت و بەرەو داڵدەگاکەم لە کەنیسەی نیکبارا، بردمی و لەگەڵ خۆمدا رۆن و دۆشاو و تەلانەنان و کیسە برنج و گوێز و هەموو کەرەسەیەکی جەژنی لێبووردەییم برد و گیرفانە بەتاڵەکەمیش بە دە رۆپیێ هەلاوسا. ئیدی وەك دار خورما بەژنم قیت کردەوە، سەری خۆمیش بە وێنەی ئەو دیارییانەوە قاڵ کرد، کە بۆ ئەسمەر و منداڵەکانی دەبەمەوە. من خێر و فەرێکی زۆری خانەوادەی ساسۆن لەگەڵ خۆمدا بۆ بەغدا دەبەمەوە، جوانترین شتی دەگمەن و نایاب کە لە بۆمبای هەیە، بۆ ئەسمەر و منداڵەکانی دەبەمەوە. ئەوەتا بازرگانییەکەم پێش خۆم کەوت و ئیدی هەر ئەوەندە رۆژەکانی جەژن بەسەر بچن، دەیگەیەنمە ئەو شارەی داڵدەی دام. لە بەغدا دەست بەو گەشتە بازاڕییەم دەکەم، کە دەمگەیەنێتە سامان و هەبوویی و ناوبانگی باش.

بەلام تۆ، ئەی یەهوودا دەریا، ئێوە ئەی خەڵکانی بۆمبای، ئەی ئەوانەی گەرمی مرۆڤانە و خۆشەویستیتان پێ بەخشیم و ئێستاش وا پێم دەبەخشن و تا ئەو دەمەی بە پیری لەناو جێدا رادەکشێم و چاوەڕێی دوژمنە گەورەکەم دەکەم، کە لەمەوبەر هەزار جار فێڵم لێکردووە و خۆم لە چرنۆکەکانی قوتار کردووە و رووبەڕووی دەستم بە پێکەنینی سەرکەوتنی یەکجاری کردووە. خودا پاداشتی ئەو چاکەیەتان بداتەوە، کە لەگەڵ مندا کردتان.

## بەغدا ١٩١٩

پێکەنین لە ویژدانتدا قیسارەیەکە پەنجەی یادەوەرییەکانت گەمە بە ژێیەکانی دەکەن، ئەوەش لە قووڵایی مەژگتەوە بە هەزار ڕەنگ هەڵدەقوڵێت.

برێ جار کە چیرۆکی تەنگژەکان دەگێڕیتەوە و پێدەکەنیت، مووی لەشی گوێگر ڕەپ دەبن، واش دەبێت عەسر لە چاوانی گوێگرەکەت قەتیس دەبێت، بەڵام تۆ هەر پێدەکەنیت، دەزانم ئەم پێکەنینە هەڵبژاردنێکە لەنێو ڕووداوەکان، پێکەنینێکە لە دوورەوە دێت، ئەوە دوورییەکە لەنێوان ئەزموون و بیرەوەری، ئەم دوورییە بۆشایی خەبات و خۆسەلماندنە، ئینجا تێکشکاندنی چارەنووس "نەخێر، مرۆڤ چارەنووسی من دیاری ناکات!".

ئەمە ڕاستە، شەپۆلەکە توند و خێرابوو، برینەکەش لە قووڵاییدا دەمی کردبووەوە و خوێنی لێ دەڕژیی. دنیا زامداری کردم ـــ دەڵە دێوی هاوپەیمانی مرۆڤ ـــ دێوە بە درێژایی چوار ساڵ لەنێو پەتی زۆرانبازی شەڕدا لە دەوراندا بوو. تای تەرازووی ئەم خراپەکارییە قورس بوو، منداڵەکان ورد بوون و ئەسمەر لە هەرەتی جحێڵیدا بوو، منیش پیاوێکی سەرقاڵ و چەوساوەی دەستی دەڵەدێوەکە بووم. لە ساڵانی تەمەنی خۆم ناپرسم، چونکە بە گڕی ئاگری ڕووداوەکان سووتا و چەمکی ڕۆژەکان بزر بوو، بەڵکو خودی چەمکی ڕۆژەکان بوو بەم دیار و نادیارە، نازانین چۆن دێت، گەر هاتیش چۆن دەبێت و چۆنی دەگوزەرێنین. من ئەمڕۆ پێدەکەنم، چونکە شەوە تاریکەکانی دەریای تاریکم بڕیوە و لە بەرهەمی تێکۆشانی ژیانی خۆم، کە تژییە لە سەرکەوتن و فەڕ، بەم لوتکەیەدا هەڵژنام. سەرباری زەبوونی ڕوح و دڵ برینداری، لەو ڕۆژانەدا نەگریام، پێموتیت لە ژیانمدا جگە لە جارێك و جارێکی تر نەگریاوم...، تۆ دەڵێیت "لەسەرخۆبە

شێخی من..."، ئینجا دەڵێیت "هەندێکجار دڵت ڕەقە و بڕێ جاریش تارمـایی کەللـە ڕەقی و لەخۆبایی بوونت تێدایە...". نا، بەڵکو خۆڕاگری ڕوح لەو چیا سەرکەشانە جیام دەکاتەوە کە لە دەوروبەری لەدایکبووم و گەورە بووم، ڕووداوە ترسناکەکانی سابڵاخیش ئەوەندەی تر بەرگریمیان پتر کرد، تا وای لێهـات مەینەتییـە کتوپڕەکـان، دوای ئـەوەی چەندین جار ئامێزانی مەرگ بووم، لە چاوانمدا بچووك بوونەوە، گەیشتمە ئەو بڕوایـەی کە لەو مەینەتییانە ون دەبم و دەگەمەوە بارەگای خودا، بەڵام خودا ڕزگاری کردم و لـە دنیا هێشتمییەوە و وا سەرکەوتنی تێدا بەدی دێـنم و بـەری ڕەنـج و تێکۆشـانی خـۆم دەچنمەوە، نەخێر هەروا بەخۆڕایی دڵم ڕەق نەبووە، ئەوەندەش لووت بەرز نەبووم کە تـۆ ناوی بنێیت لەخۆبایی بوون، وای دەبیـنم خۆڕاگرییـە و ئینجـا دروێنـە گەورەکەمـە، چونکە لە وڵاتی پەنادەردا وام لێهات بە هەند وەرگیرام، هەروەك چۆن لە وڵاتی خۆمـدا لەبەرچاوان بووم و...، بەڵکو زیاتریش.

ئەو ڕۆژە سابڵاخمان لێ تەنگ بوو بـوو و هـەر داوای ڕوحـی لێـدەکردین، سـاڵانی جەنگ و کوشتار و برسێتی و قات و قڕی و ئاژاوەی نێوان برا و برا بوو، مەرگ بۆمـان لە بۆسەدا بوو...، و شای تاران وەك تیرێـك بـۆی ڕەوانـە دەکـردین و بـەبێ هەڵـە دەی پێکاین و هەڕەشەی کوشتنی لێدەکردین کە گوایا بێگانەین. ماڵ و حاڵمان بە دۆستان و سابڵاخەوە جێهێشت. ئێمە پاشماوەی جەنگێکی دڕندەین، پاشماوەی ترس و تۆقاند نین، لە مەرگێ هەڵاتین کە ڕووی تێکردبووین، تا خۆمـان و منداڵمان ڕزگار بکەین، چونکە تەنانەت سێبەری مرۆڤیش مرد. ئێمـە بـە دووی ژیانێکـدا دەگـەڕاین، تەنانـەت لـە چۆنێتی و نیوەڕۆکیشمان نەدەپرسـی...، تەنانـەت هەڵبژاردنیـشمان لەدەسـت خۆمـان دەرچووبوو، کەسێك نەبوو لە نێوان مەرگ و زەبوونیـدا یـەکێکیمان بـۆ هەڵبـژێرێت، تەنها مەرگی ئێمەیان گەرەك بـوو، بۆیـە لـە مـەرگ هـەڵاتین تـا هەناسـەی خـەم و داماویمان بێتەوە بەر، تا ئەو هەناسەیان لەگەڵ لێدانی دڵدا بێت و بچێت. بەڵام ئەسمەر بیری نەچووبوو کە کیسە خشڵ و زێڕەکـان لەگـەڵ سـەیۆن و مەریەمـدا هـەڵبگرێت، منیش سەلمانم هەڵگرت و دوو لیرەشم هەڵگرت. سامانەکە لەپێناو ڕزگارکردنی ژیانی چەند کەسێك و قەشەنگ کە لەگەڵماندا بوو، تێداچوو. ماڵی سپی بـۆ ڕۆژی ڕەشـە و

هەندێ راستی هەڵگەڕانەوە و بەرەو خراپی گـۆڕان. دژ بـوو بـە دژ و ئـاوەژوو بـوو بـە ئاوەژوو. بازرگان بوو بە هەژار و دەست رۆیشتن بـوو بـە ملکەچـی و سـامان بـوو بـە نەداری و خانەدان لە وڵاتێکی دیکەدا بوو بە پەناهەندە. بێگومان فێری ئەمە دەبـین و لەگەڵیدا دەژێین و رادێین. رۆژگار دەجولێـت، پێبـەکانت لـەو شـوێنە سـڕمەکە، کـە لەدەستت چووە. وریابە بۆ ئەو سەردەمە مەژی کـە کفـن کـراوە و خراوەتـە گۆڕیـچەی یادەوەرییەوە.

هەندێ کەس هەن، کە لە جحێڵیدا خوو بە شتێکەوە دەگرن، ئیدی چـەند بـارودۆخ بگۆڕێت، ئەو هەر سوورە لە سەر ئەوەی لەگەڵ ئەو خووەدا پـیر بێـت. ئـەی ئەسمـەر و منداڵەکان؟ چۆن قایلیان دەکەیت کە لەبەرچاوی خەڵکی جگە لە رووتەڵەیەك هیـچی تر نین و دەوڵەمەندی کۆتایی هات و ئێمە تەنها پەناهەندەیەکی نیمچە هەژارین؟ ئاخر دۆخەکە لە هەموو چرکەساتێکدا وای پیشان دەدایت، ئافرەتەکە لەمە تێدەگات، بەڵام باوەڕ کردن بە رەوشەکە زەحمەتە و رەت کردنـەوەش وەلامدانەوەیـەکی یەکلاکەرەوەیـە، بەڵام منداڵەکان کە سەلمان گەورەکەیان بوو، گەیشتبووە تەمـەنێك بـۆ وەدی هێنـانی ئاواتەکانی. ئاوەزی بۆ سامان ختووکەی دەدا. ئەی خۆم؟ سامان رێگەیەك بوو بۆ منداڵ خستنەوە و گوزەرانی خۆش و هاوڕێ لە خۆ نزیك خستنەوە، کەچـی بـڕێ جـار راسـتی کوێرە و ناچارت دەکات کە چاوی عەقڵ کوێر بکەیت، تا بە چاوی سـۆزە گەرمـەکانت ببینیت، لەم بابەتەش زۆرە. من لەناو زەرفی چارەنووسـدام، چـوار بڕوانامـە هاوپێـچی نامەیەکن و هەر هەموویان ئاماژە بۆ من دەکەن و دەڵێن "تۆ لە ئێمە بەرپرسیاریت و خواردنمان بۆ دابین بکە!" بە پاشماوەی شـێتبوونی دنیـا و ئاکامـەکانی کـە تـژین لـە جۆرەها ئازار و مەینەت، تاوانبارم دەکەن. دەی شلۆمۆ دوو لیرەکە خـەرج بکـە! پـارەی سپی خەرج بکە! خەرجی بکە و ئەمە رۆژە رەشەکەیە! ئەوەی لـە گیرفاندایـە خـەرجی بکە و لە نادیارەوە بۆت دێت. ئەوەتا رۆژە رەشەکە درێژەی کێشا و ئەوەی لـە گیرفانـدا بوو نەما و لە نادیاریشەوە هیچ شتێك نەهات. من بازرگانێکم لەوە شـارەزام بـۆ هـەر شتێك قایمەکارییەك بکەم. دەربارەی پەندەکانی سەرزاریشەوە، دەشێت راست بن، دەکرێ هەڵەش بن، بێگومان ئەم جارەیان بە دڵنیاییەوە هەڵە بوون.

بەڵێ ئەوان نازانن! ئەو دڵۆپە کەمەی سامانەکە لەگەڵ دڵۆپەکانی رۆژگاردا و لە نێو گێژەگێژی رۆژەکاندا کەوت و ون بوو. ئەوان هەر دەیان خوارد و منیش بەخێرایی بە رێگەی هەژارییەکی رووتەن و سەختدا دەڕۆیشتم. دواجار هەروەك چۆن خانەدانەکانی سابلاخ لە بەرزاییەوە هاتنە خوارێ و بە ژیانی هەژاری و نەبوونی قایل بوون، منیش دەردەچم و رێگاکانی شارێك دەگرمە بەر، کە لە ئامێزی گرتین و شارەزای نیم، ئاخۆ ئەسمەر لێرەیە، بەڵام رەنگە توابنەوە یان ون بووبن... رەنگە تەرتە و وەرتە بووبێتن و هەریەکە و لە ماڵە دەوڵەمەندێکدا خزمەتکاری بکات. دەرچووم و لە کار دەگەڕام، زمانم بڕاوە و هەوڵ دەدەم بە کەتیرەی ئەو وشە عەرەبییانەی فێریان دەبم لەنێو دەمم دووبارە بیچێنمەوە. قورسە! قورسە! کارکردنیش بە بێ زمان و بێ دوو گوێچکە قورسترە!

گەرەکە تێبگەم و تێبگەیەنرێم، کاتیش بایی ئەوە دەکات تیماری دەردی لاڵییە کاتییەکەم بکەم و بێگومان کەڕییەکەمیش بۆی هەیە چاك بێت! پێویستی باشترین هاندەرە... پێویست بوون بەرەو بازدانێك پاڵت پێوە دەنێ، رەنگە هەندێ جار وەك کارێکی نەکردنی دیار بێت. ئەوەندەی نەبرد پێویست بوون وای لێکردم بلمە بلمێك بکەم، بەم ورتە ورتە تێگەیشتم کە لە سەربازگەکانی سوپای بەریتانیا کار زۆرە.

ـــ "کاری گوو دەردان دەکەیت؟!".

یەهودییەکی بەغدایی چاکەخواز ئەم پرسیارەی لێکردم. چاکەخواز بوو، چونکە پرسیاری لێکردم و فەرمانی پێنەدام و بلێت "بغۆ کاغی گوو دەغدان بکە ـ برۆ کاری کاری گوو دەردان بکە". زۆر کەس هەبوون وا راهاتبوون بە فەرمانەوە کوردی پەنا هەندەیان دەدواند و وا بیریان دەکردەوە، کە تەنها بۆ کاری پیسایی پاك کردنەوە و خزمەتکاری لە ماڵان بەکاردێت... ئەو پیاوە چاکەخوازە گومانی لە بیرکردنەوەی ئەوان هەبوو. بە شەرمەوە بە بەڵێ وەڵامیم دایەوە. رەنگە من خۆم ئامادە بکەم، ئینجا بە گوێرەی بیرکردنەوەی ئەو بێت، یان نا. جێمهێشت و لەبەرخۆوە پەندێکی بەغداییم دەوتەوە "کاری گوو دەردان بکە، تا حەوەجەت بە گووی کوڕی گوو نەبێت!". کەسانێکی زۆر لە یەهوودی سابلاخ وەکو من رابردووی خۆیان و ئابڕوومەندی خۆیان

لەبیرکرد و هەموو بەیانییەك لەگەڵ کۆمەڵێ لـە هـەژارانی بەغـدا دەڕۆیـشتن و ریـز دەبوون، تا مێجەرێکی ئینگلیز، یان بابۆیەکی هیندی بە ئۆتۆمبێلێکی جێب دەهات، کە لۆرییەکی بەدواوە بوو، ئیدی کرێکـاری هەڵدەبـژارد و بـۆ قێـزەونترین کـار جیـای دەکردنەوە. تەنانەت حاخـام میخائیـل بـرای حاخـام نـاحوم شـەهیدی سـابلاخ ریـشە سپییەکەی پیسی و بۆگەنی و قرێژی بەریتانییەکان و سیخ و گورگەی پێوە دەلکا، کـە دەیبینیم هانی دەدام و دەیوت:

ــــ بـاوکی سـەلمان، کـارکردن خـودا پەرسـتییە، منـیش کـاتێ ئاودەسـتێکی ئینگلیزەکانم پاك دەکردەوە و خۆم لەبەر قێز و دڵ هەڵشێوان رادەگرت، بـیرم دەکـردەوە، کە من بەرانبەر ئەم کارە چەند رووپێیەك وەردەگرم و ماڵ و منداڵەکـەم پێـی دەژیـن، دڵنیا دەبووم کە خودای گـەورە ئەمـەم بـە قوربانیـدان بـۆ دادەنێـت و دەچێتە سـەر چاکەکانی دیکەم و ئەمەش دەخاتە بەر لێخۆشبوونی ئـەو گوناهانـەی کـە بـە هەڵـە کردوومن، یان لەبەرئەوەی لێم خۆش دەبێت، کە من مرۆڤم و لە زەللە و زمان درێـژی بەدەر نیم.

لە سەرەتادا دوودڵ بووم، بەڵام ئەو پەندە بەنرخەم بۆ خۆم دووبارە کـردەوە، هـەروەك چۆن بەر بای گوێی چاکەخوازە بەغداییەکەم دا. تەماشام کرد ئەوانـەی لـە وڵاتەکـەی خۆمدا خانەدان بوون و ئەمێستا ریش و لەشیان ناوەتە نێو پیسایی، ئیدی نەرم بووم و مەترسی برسی بوونی ئەسمەر و منداڵەکان وەئاگای هێنامەوە. نەخێر، دوودڵی لاوازییە و منیش لەمەوبەر لاوازیم بە خۆمەوە نەدیوە. لە ئەنجامدا چوومە پێـشەوە، بـەڵام لـە نزیك بەلووعەکە هەڵوەستەم کرد و دوو دڵ بووم. بەرەنگاری رژانەوەم کرد، بـەرەنگاری دەرچوونی روحی خۆمم کرد، دەستم بە هەڵگرتنەوەی پاشـەڕۆی کەسـانێکی وەك خـۆم کرد، کە خودا وەکو یەك دروستی کردووین. هەستم کرد روحـم لـەخوار گـەرووم و لـە لووتمەوە هەڵدەپلکێت. دەم و لووتی خۆمم گرت تا روحم لە جەستەم دەرنەچێت. ئـاخر گەر ورحم دەربچێت کێ ئەسمەر و منداڵەکان دەژێنێت؟ ئایا من لەخوداپەرسـتیدا لـە سەرووی حاخام میخائیلەوەم، کە بۆ کارکردن هانم دەدات؟ گەڕامەوە و دەستم پێکـرد، بیرەوەرییەکانم هێنایەوە بەرچاوی خۆم تا لاواز نەبم. لەگەڵ مەترسییەکانی رابردوو ژیام،

کۆست کەوتنەکەم بە جگەرگۆشەکانم لەناو باخەکە، وشك بوونی پێیەکانم، خەوتنەکەم لە بن و بانی شیاکە و ڕیخی ئاژەڵەکان، چەند پەند و ئامۆژگاری و حەکایەتم وەبیر خۆم هێنایەوە. بازرگانە بەغدایییەکە، کە وەك من لێکەوتبوو، ڕۆژگاریش بەم دۆخەی گەیاندبوو، خودی خۆی دەدواند و دەیوت "دابەزە و وەرە خوارێ، تا بەرەو لەمە خراپتر دات نەگرم". تەریوەکەی قاڵەوە بووی تەنیشتی گوێی لێ بوو، سەری سوڕما و پێکەنی "ئایا شتێ هەیە لەمە خراپتر بێت؟!" بەڵێ هاوڕێم، دەست پان کردنەوە بۆ سواڵی لەمە خراپترە. دروودی خودا بۆ ئەو بازرگانە کە ڕۆژگار شکستی پێ هێنا، درورد بۆ حاخام، ئەم دووە بۆ خۆم دەکەمە پیشەنگ و بەرەو ناو چاڵەکە شۆڕ دەبمەوە تا منداڵەکانت و ئەمەر پارووە نانێك بخۆن. تۆ لە کوێ و دەست پان کردنەوە بۆ خێری خەڵکی لە کوێ؟ تۆی لەمەوبەر دەست بڵاو و بەخشندە. با ئەمە هەر لە نێوان خۆت و خوودی ئەم مردنە بێت!

❊❊❊

هەندێ بەخیلیم پێ دەبەن و بڕێکی تریش بە چاوی سەرسامی و ڕێزەوە تێم دەڕوانن. بە ڕاست! من ڕووناکی پێش تاریکی دەبینم و گوڵیش پێش دڕك، لێ من وەك ئەو کەسە نیم، کە شکستی خۆی بە سەرکەوتن دەزانێت و بە بوێری خۆیدا هەڵدەڵێت و سەرکەوتنی دەستکرد و درۆزنە بۆ خۆی ڕێکدەخات، کاتێ ئاودەستێکی ئینگلیزەکانم پاك دەکردەوە، لە خۆبایی بوونم لە خۆمدا دەکوشت و خودی خۆم باڵا دەکرد. ئا بەم جۆرە خۆم قایل دەکرد، تا خۆڕاگر بم.

خودای گەورە ویستی بە جۆرەها شێوە تاقیم بکاتەوە، منیش تاقیکردنەوەکانیم بە لێوەشاوەیی بڕی. لە کاتێکدا هەندێ کەس غایەنەتییان لەگەڵ زات وەبەرخۆنانی خۆیاندا کرد و ملکەچی بەرەو هەڵدێری نووچدان و نائومێدی بردن. کەواتە من مافی خۆم بوو شانازی بەخۆوە بکەم، چونکە بۆ دنیای دەسەلمێنم کە من بە دەست پاکی و ئابڕوومەندانە و بێ گزی یان پیسکردنی دەستم بەشتی ناڕەوا، لێهاتووم و دۆخی دنیا چۆنی بوێت، ئاوها بۆی دەژیم. ئەرێ بەڕاستی وا پێمخۆشە کە بە خۆمدا هەڵبڵێم؟! نەخێر، بەڵکو من کارێ دەکەم کە ویژدانم پێمدەڵێت، لە سایەی خودا شەوە ڕۆژێ

ویژدانم بە گلە و گازاندە ئازاری نەداوم! لەخۆبایی بـوونم خـستە ژێـر پێمـەوە و چـاوم لەرابردووی خۆم پۆشی و ئاوەدەستی خەڵکانێکی گاورم پاك کردەوە، کە خودای ئافرێنەر ناپەرستن، تا لە مەینەتی منداڵـەکانم و ئەسمـەر کـەم بکەمـەوە. بـە ناچـاری جـۆری کارکردنەکەم لە ئەسمەر شاردەوە و پەنام بۆ درۆی سپی برد. پێم وت گوایـا لـە (خـان دەللە) بریکاری یەکێك لە بازرگانە جوولەکەکانی بەغدام. ئەم درۆیـە سـاڵ و نیوێـك ئارامی پێ بەخشی. پاشان رۆژێ هەروەك ئـەوەی بـۆ بینـینی گریـان و شـین بـۆ مـاڵ گەڕابمەوە، ئەوە بوو بارانی فرمێسکەکانی ئەسمەر کۆست کەوتنەکـەمی بـۆ ئیـستێر و هەردوو کۆرپەکەی بیر خستەوە. لە برووسکەی چاوەکانیدا نیگای گلـەییم بـینی، وێـك دەهاتەوە و دەبوو بە گوللەیەکی پۆڵاین و گۆشتەکەمی دەسمی و لە دڵمدا جێگیر دەبوو. بە هەستەوەری خۆم زانیم کە خەمـەکەی منم و لافاوی روونـدك ئاماژەیـە بـۆ قورسـی تاوانەکەم و گەورەیی گوناهەکەم. پێش ئەوەی لە ئەسمەر بپرسم لەگەڵ ویژدانی خۆمـدا راوێژم کرد. ویژدانم چ ئازارێکی نەدام. جارێکی دی پەنام بردەوە بەر هەستەوەری خۆم و زانیم، بەڵێ ئەسمەر بە کارەکەمی زانیوە! زانیویەتی کە من ئەم ماڵە بە کـارکردن لـە پیسایی و پاشەڕۆ بەڕێوە دەبەم.

نانە تێگوشەکەم لە رۆنە خۆماڵییە تواوەکەی ناو تاوەی سەر ئاگرەکە نوقم کـرد و ورە وریکم کرد:

ــ چۆن زانیت؟ ئەسمەر چۆن زانیت؟

گریان و فرمێسکە بەخوڕەکەی دەناسمەوە کە وەك ناخوڕەکانی شەوانی بارانی بەغدا بە لێزمــە دێتــە خـوارێ. لـە هـەموو کۆسـتکەوتنێکدا کـە تارمـایی مـەرگی لـێ دەربکەوێت. دەیناسمەوە، لەهەموو مەینەتییەکی کلۆڵی هێنەر، لەوساوە کە دنیـا لـە سابلاخ هێنا ناسیومە. ئەمە هەمووی لە سۆنگەی کارەکەمەوەیە کە بە جـۆرێ رامـم کردووە لای من وەك گیاندارێکی ماڵی و کەوی ئازار نەدەری لێهاتووە؟

ــ چۆن زانیت؟

ئەوە زمانی ئەو نەبور کە راستی شتەکەی پێ وتم، ئەوە گریانەکەی بوو کە بـەناوی حاخام میخائیل هاتەگۆ. بۆ سـاتەوەختێك سـەرم سـوڕما، ئینجـا پیـاوە چـاکەخواز و

دۆستەکەم دواند و گلەییم لێی کرد، نەك لەبەرئەوەی نهێنییەکەمی ئاشکرا کردووە، چونکە دەمزانی، کە من نهێنی خۆم داوەتە دەست یەکێ لە خوداپەرستەکان، بەڵام گلەیی لە زەللەیەکی زمان دەکەم، کە ماڵەکەمی کرد بە شین و شەپۆڕ، بەڵام ئاخۆ ئەم کارەی من بە لای ئەسمەرەوە لەگەڵ مەرگدا وەك یەکن؟

وتی:

ـ بۆ من باشتر وابوو، پێش ئەوەی بتبینم پاشەڕۆ و پیسایی خەڵکی پاك بکەیتەوە، بمرم.

بێدەنگ بووم، هەزار بیرۆکە و یادەوەری بە خەیاڵمدا هات، بەڵام هەوڵمدا دڵی بدەمەوە.

ـ ئێمە لە حاخام میخائیل و سەدانی وەك ئەو باشتر و زیاتر نیین، کە لە سابلاخ و شوێنانی دیکە پاشایانە دەژیان.

نا... نا، من دەیناسم. من دەزانم چەند باسی خانەدانی تیرەکەی خۆمانی بکەم، کە لەگەڵ مندا سەرگەرمی پیسکردنی خۆیانن بە پیسایی و پاشەڕۆی ئینگلیزەکان، ناتوانم دڵی بدەمەوە. بەجۆرێك ئاودەستەکانیان لەناو سکیان پاکترە، کە لە شتی پیسی بە خودی پیسی پیسترە، ئاخنراوە، ئەوە نهێنییەکە ئاشکرابوو و خراپەکارییەکە دەرکەوت. ئەسمەریش تازیەبارییەکەی ناشکێنێت گەر من ژیوان نەبمەوە و بە رەنگ سوورفل و رەشتاڵەکان نەڵێم "سۆری نۆ مۆڕ و ۆرك...، نۆ مۆڕ دبلیوسی ـــ ببوورن کار زۆر نییە...، ئاودەست زۆر نییە".

ـ ئەسمەر، ئەی منداڵەکان چۆن بژین؟

لافاوی فرمێسك کەمەکێك هێور بووەوە، ئەسمەر بە تێکشکاوی و گەرووی پڕ لە گریانەوە وتی:

ـ باوکی سەلمان، زێڕ و ئەڵماس بە قوربانی تۆ بن، هەموو خشڵەکانم ببە و بیفرۆشە، بایی ئەوە دەکات ببێتە سەرمایەیەکی بچووك و بتکات بە خاوەنی سەروەری خۆت و ئابڕوومەندیت بپارێزێت، کە ئابڕوومەندی ئێمەیە و تۆ هەموو رۆژێ سەری دەبڕیت...

بە سووربوونەوە قسەکەم پێ بڕی:

ــ نەخێر، قوربانی بە خشڵەکانت نادەم.

ــ تۆ قوربانی بە ئابڕوومەندیت و بەخۆت دەدەیت، کەچی زێڕ تـەنها پەیکـەرێکی یادگاری رابردووە و هیچ سوودێکی نییە، ئەوەتا لە کیسەیەکدا لەناو دۆڵابێـك لـەگۆڕ نراون.

ــ ئەسمەر، ئەو رۆژە هەر دێت، لە گۆڕیچکەیان بێنە دەرەوە و دووبارە خۆتیـان پـێ برازێنیتەوە.

دووبارە پەنا دەباتەوە بەر دەریایەك فرمێسك رشتن و بە تکـا و پاڕانـەوەوە دەڵێـت: تکایە مەم کوژە، بیبە، بیبە و بە پارەکەی ئەو خێر و بیرە رزگار بکە کە لەنێو حەوزی پیساییدا نوقم بووە، ئەی بە نرخترین مێرد، خۆم و خشڵەکانم بەقوربانت بین.

ئەو دەمە هەستم بە چزەکە کرد. من لـە چـزە و کـسپەی ویـژدان دەگـەڕام و بـۆم نەدەدۆزرایەوە.

ئەمێستا تێگەیشتم، کە من بەم کارەم دڵ و هەستی ئەسمەر بـە زامێکـی بـەئێش بارگاوی دەکەم. من ئەسمەر دەناسم، ئەی هەر ئەو نەبوو بەدەستی خـۆی هەوێکـەی بـۆ سەر خۆی بۆ من هێنا؟! ئەی ئیستیری بۆ نەهێنام و پێی وتم "بیخـوازە". وا ئـەمڕۆش زێڕ و ئەڵماسم بۆ دێنێت و خەیاڵیشی ئاسوودە نابێت، تا ئەو زێڕ و ئەڵماسە نەفرۆشم.

مادام وای دەوێت، منیش بە گوێی دەکەم، رەنگە خودا دەرووی بژێویم لێ بکاتـەوە، لەو شتانەی کە دەیان فرۆشم و بە دوو ئەوەندە بۆی قەرەبوو دەکەمەوە.

ساخوایە!

# بەغدا ١٩٣٠

سەفەری یەکەم پێنج یان شەش سەفەری دیکەی بەدوادا هات. کاتێك لە سەفەری یەکەم بە بالەی لەنگەکانەوە گەڕامەوە، بەهۆی هەستەوەری بازرگانی راستگۆیانەمەوە لێزان بووم. زانیم کە ئەم بالانە خێر و فەڕی تاوا بۆ باوکی سەلمان، شلۆمۆکەتانی کوردە دەگێڕێتەوە. ئیدی هەر ئەوەندە لە بازاڕ یەکەم بالەم کردەوە، فرۆشیار و کڕیار سەریان قەرەبالغ کردم، برێ بازرگان هەولّیان دا بە پارەیەك وەك ئەوەی لە نێوان من و بازرگانە بەغداییی ــ هندییەکە لە بۆمبای لەسەری رێککەوتبووین، تەماحم وەبەر بنێن. پێیان وتم:

ــ بۆچی بە پارچە پارچە، یان بالە بالە، خۆت ماندوو دەکەیت؟ بەرانبەر هەموو کەلوپەلەکان لەجیاتی پشکێك دوو پشك وەربگرە و ئەوی دیکە لەسەر ئێمە.

قایل نەبووم، دوای راوێژکردن بە ئەسمەر پتر لەسەر قایل نەبوونەکەم سوور بووم، ئاخر هەر ئەو خاوەن چاکەیە و هەرکاتێکیش سەرم لە شتێك دەرنەکردبێت، بۆ لای ئەو گەڕاومەتەوە، ئەو "ئەو ئافرەتە چاکەخوازەیە"، کە هەموو ئێوارانی شەمەیەك باسی خەسێتەکانی دەکەین.

بەلّێ، ئافرەتی چاکەخواز زۆرن، لێ هۆ ئەسمەر، تۆ لە هەموویان چاکەخواز تریت! خانەدانی و چاکەخوازی لە دلّییەوە هەلّدەقوولا، سۆزەکەیشی تەنها بۆ کەسانی مالّەکە نەبوو، بەلّکو بە هەموو کەسێکی نەداری دەبەخشی. پێی وتم:

ــ جلوبەرگەکانی پارچە پارچە بە هەژاران بفرۆشە، ئەو کەسانەی پێ پۆشتە بکەوە، کە لە سەرمان هەلّدەلەرزێن و پێیان شەرمە جلی کۆن و دڕاو لەبەر بکەن.

ئاخر ئێمە بادە تاڵەکەمان نۆشی، با دامــاو و کڵۆڵـەکانیش بیخۆنــەوە، ئەمــەش لــە سایەی تۆوە بە شەکر شیرین کراوە.

هەروەها وتی:

ــ کارێکی وا نەکەیت بازرگانەکان بە پارە تەماحت وەبــەر بنــێن تـا چـۆنت بـویٚ ئاوها کەلوپەلەکانت بفرۆشیت، بەمە سەربەستی خۆت لە دەســت بـدەیت، ئەوەیــشت بیرنەچێت ئەم کاڵایەی تۆ لە بەغدا وێنەی نییــە، دەبـا خـەڵکی بەغـدا بـە نرخێکـی هەرزان ئەم جلوبەرگانە لەبەر بکەن، ئاوهاش ئەم دنیا و ئەو دنیـا پێکـەوە بـۆ خـۆت مسۆگەر دەکەیت!

ئەسمەر راستیکرد. سەفەرەکان بۆ بۆمبای یەك لەدوای یەك درێژەیان کێشا، ئیـدی ئەو دەربەدەرە نەمام کە لەگەڵ قرێژ و پیسی مت بم، بەو لاڵییەش نەمامــەوە کـە بـە ئاماژەی مەیموونان و قرتەقرتی مریشکان قسە بکەم، بەڵکو بە جلوبــەرگ و شـەپقەی ئەو رۆژاپییەوە سواری ئۆتۆمبێلە نایابەکەم دەبووم و سەربڕ و چێشت لێنەر و سندوقێك کە هەموو کەرەسەیەکی چێشتلێنانی تێدا بوو، لەگەڵ خۆمم دەبرد، تـا بـە درێـژایی سەفەرە هەفتەییەکەم هێلکەی کوڵاو نەخۆم. زمانم سەرەڕای ئارامی و کوردی و فارسی و رووسی، بەو زمانانەش کەوتەگۆ کە لە نێوان بەغدا و بۆمبای بە عەرەبی و هینـدی و ئینگلیزی قسەیان پێدەکرا.

لە دەریادا من بازرگانێکی دیار بووم، لە بەغداش ناوی خۆم نا (شـلۆمۆ کـوردە)و بە سووربوونە کوردانەکەم وام لە خەڵکی کرد، کە بەم ناوەوە بانگم بکەن و بـۆ خۆشـم کردم بە هێما و نیشانەیەك و بە نێوبانگی باشە برەوم پێدا. پەیمان شکێنییەکم نـەکرد و گریمیش لە کەس نەکرد، بە چاکەکردن مامەلەم لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد، سوودم لــە لێبــوردەیی بازرگانــانی یــەهوودیی بەغــدایی و لێوەشــاوەیی و ئـارامی و زیرەکـی بازرگانانی ئێران وەرگرت. بەخێرایی دەوڵەمەند بووم و بەخێراییش ناوم بـازاڕی داگـیر کرد. پێکەنین بۆ سەر لێوم گەڕایەوە، هەر وەك چۆن وا ئێـستا پێدەکـەنم. ئـەی بۆچـی پێنەکەنم، ئەوەتا مافی هەموو خاوەن مافێکم داوەتەوە، ئەسمەر دوو ئەوەندە و زیـاتریش خشڵی دەست کەوتووەتەوە، خەونی سەلمانی کوڕە گەورەم هێناوەتە دی و بەرەو ئـەودیوی

دەریاکانم ناردووە و گەیشتووەتە ئەمەریکا، ئەمێستا خاوەن سامان و خاوەن شارەزاییە و پشتی پێدەبەستم و نائومێدم ناکات. دوای سەفەرکردنی سەلمان، سەیونم هێنایە نێو بازاڕەوە، فێر دەبێت و یارمەتیم دەدات. یەهوودا دەریام لە بۆمبای بە بریکاری خۆم دامەزراند، خانوویەکم لە خان دەللە بە یەکێکی باشتر گۆڕی و جۆرە کەلوپەلێکم بۆی هەڵبژارد، کە ئارامی بەخش بێت، فەرش و قالی ئێرانیم تێدا راخست، تابلۆی ناونیشانی سەر نووسینگەکەم گۆڕی و (شلۆمۆ کوردە) بە پیتی زێڕین تێیدا دەدرەوشایەوە، بەڵێ شلۆمۆ کوردە نەك کەتانی! لەسەر سەرسەختییە کوردانەکەم سوور بووم. بە گرێی شانازی کردن بە (کورد بوون)ەوە، نەك بە گرێی دەربەدەر و پەناهەندەیەك، گرێی هەژاری و زەلیلی و هەموو خەسیەتێکی داگیرکاری.

شلۆمۆکوردە! بەم ناوەوە خەڵکی ناویان دەبرد و بە سەرسامییەوە ئاماژەیان بۆ دەکرد، چونکە لە هەندێك شتدا بووبوو بە خاوەنی هێما و سرووشتێك، هەوڵیان دەدا وەك نموونە و پێشەنگێك لاسایی بکەنەوە. تێکۆشان و سووربوون و سەرکەوتنم و ناوبانگی باش و دەست پاکی و ئابڕوومەندی هەموو ئەمانە وەك خەرمانەیەك دەوری (کوردە)یان دا و ئەو چەمکە سووك و خراپانەی کە لە ئاوەزی خەڵکیدا دەربارەی کورد کەڵکە بووبوون، سڕانەوە، ئەو تۆز و گەردی ناهەقی و هەڵبەستراوانە لە کەسێتی کورد هەڵوەرین.

ئایا هۆی سووربوون و پێداگرییەکەمت زانی؟ بەڵێ. گرێیەك کە لە سابلاخ هەستمان پێی نەکرد، لە گەڕەکێکی پیس و قێزەونی ئاوارەکان لە بەغدا لەدایك بوو و لە ئاوەدەستخانەکانی سەربازگەی ئینگلیزەکان و خزمەتکاری ماڵان، گەشەی کرد...، بەو وشانە ئاودرا کە لە هەموو شوێنێك دەمانبیست "کوردە خزمەتکارەکان". ئێمە کەسانێك بووین پۆشاکی هەبوویمان لەبەربوو، تا بەدەستی جەنگی نەگریس وئجر وئجر بوو. کەواتە نهێنی ئەم جەخت کردنەت لەسەر (شلۆمۆکوردە) بینی کە بە پیتی زێڕینی درەوشاوە لەسەر دەرگای نووسینگەکە لە خان دەللە نووسراوە؟

بینیت لەبەرچییە؟!

# بەغدا، سەرەتای حوزەیرانی

# ١٩٤١

... سەکینە دەگری. ئەو گیانە بێ گوناهانە دەلاوێنێتەوە کە دەرچوون، هەش بەسەرم بۆ ئەو خوێنە پاکانەی کە رژان! ماڵی کاولم بۆ پیرەمێرد و ئافرەت و منداڵ، داخی گرانم بۆ تۆ ئەسمەر، هۆ دایکی منداڵان.

دڵی خۆڕاگر لاواز بوو، بەردە رەقەکە نەرم بوو، دار خورما بەرزەکە چەمایەوە، وێنەی بیرەوەریگەلێك تارماییە، هەندێکیان تێکەڵی روح بوون، ئەوە دووبارە بوونەوەی ژیانێکە، کە رابردوو پێچابێتییەوە، بەڵام وا ئێستا زیندوو دەبێتەوە و لە داهێندەشدا هەر زیندوو دەبێتەوە و هەڵیدەگرین. لە پاشا تا ناوگۆڕ لەگەڵماندایە.

کۆست کەوتنی یەکەم و دووەم لە حوزەیراندا، کۆست کەوتنی یەهوودی بەغدا لە دوو رۆژی جەژندا، کۆست کەوتنی مەولا بەسەدان قوربانی. کۆست کەوتنەکەی من، دوو ئەوەندە، سێ ئەوەندە، چوار ئەوەندە و بێ پسانەوە لە هەموو ژیانمدا تا بە ئێستا دەگات. گەڕانەوە بۆ چرکەساتەکانی تەمەن تا دەگاتە ساتە شوومەکە. ژیانێکە لە توانای دڵێکی لاوازدا نییە بەرگەی بگرێت. ئایا ئێستا دووبارە بگەڕێمەوە تا بە دەنگ و رەنگەوە جارێکی دی تێیدا بژیمەوە، ئینجا دوا هەناسە بدەم و ئەو کۆست کەوتنانە لەگەڵ خۆمدا بۆ دوا ئارامگا و بۆ لای خودا ببەم؟! ئایا بگەڕێمەوە تا ئەسمەر هاوشانی لێدانەکانی دڵم زیندوو بکەمەوە. بۆ ئەو چرکەساتی جیاکەرەوەیەی نێوان خۆم و ئەو چرکەساتەی کە هەناسەی تێدا کپ بووەوە و هەموو شتەکان مردن و ناشتم. دڵنیام من

دەگەڕێمەوە و لەگەڵ ئەم پیرییە لە گۆڕدا دەینێژم، من و ئەو ناگەڕێینەوە، لێی دەردەچین؟

نەخێر، بەزەییەك، بەزەییت بێتەوە، تۆ ئەو خودایەی کە تۆی هەڵبژارد، تۆی (شلۆمۆکوردە)، ئەوەی لە بەردەممدا راکشاوە تۆپەڵێکی لەنێوچوو و وشکەوەبووی پێست و ئێسکە. تۆیەك بە درێژایی سەد ساڵ رووبەڕووی ناستەنگ و مەترسی بوویتەوە، ئایا لە کاتی یەکلاکەرەوەدا بەبێ مەرج خۆ بەدەستەوە دەدەیت؟ نا...، ئەمە خاڵی بەهێزی مرۆڤێنیتە، خاڵی لاوازیتە بەرانبەر چارەنووسە زۆرداره‌کە. خۆشەویستی و وەفاداریت، خەمت بۆ ئەو کە سەرەڕای تێپەڕبوونی چوار دەیە و زیاترە هێشا کاڵ نەبووەتەوە. ئیدی دڵت بەرگەی ئەم کۆستە نەفرینە ناگرێت و تۆش ئیدی نای گێڕیتەوە و منیش بەر بای گوێچکەتی نادەمەوە، با لێگەڕێین رۆژگاری گێڕەرەوەی شایەدحاڵ بە بێدەنگی و کڕنۆشەوە بیگێڕێتەوە، چونکە ئەو لە من و تۆ باشتر ئاگای لە وردەکاری رووداوەکانە. لە بەیانییەکی یەکەم رۆژانی جەژندا، لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ئەو ساڵە شوومەدا، لە گرێساڵەکانی سەدەی بیستەمدا، لە دەفری دنیا خوێنی جوولەکە رژا، لێگەڕێ با بە بێدەنگی بیگێڕێتەوە و گوێی خۆت بەو شتانە کەڕ مەکە، چونکە چیرۆکەکەت لەگەڵ هەناسەکانتدا هەڵمژیوە و فرمێسکەکانت لە ئامێزیان گرتووە، چونکە لە ژیانی خۆتدا بۆ دووەم جارە کارێژی دەکەیتەوە، ئینجا کاتێ ئەمجەر لەگەڵ کۆمەڵێك لەوانەی مەرگی زۆردار پەلاماری دان، ئیدی فرمێسك چکی کرد و جارێکی تر هەڵنەقولایەوە. ئەوانە لەوپەڕی خەو بینین و بەهاری ئومێددا بوون و ئەوانیش وەك خەڵکی تر ژیانیان لە ماڵە (ئاسوودەکان)ی خۆیاندا بەسەر دەبرد... و دانیشتبوون، ئینجا لە نکاو لە جەژندا مردن.

ئەی رۆژگاری گێڕەرەوە و شایەدحاڵی چیرۆکەکە قسە بکە. بە ئەمانەتە بێگەردەکەت لە هەر درۆ و بیرچوونەوەیەکی مرۆڤ، یان لە شێواندن و بە هەڵەدا چوونێك بیگێڕەرەوە.

هۆ رۆژگار، ئایا بەبێ دەنگی و ئەمانەتەوە دەیگێڕیتەوە؟! دە تۆش هۆ تەمەن سەد ساڵە، لەسەرخۆبە، ئەوەت بەسە نزیکەی نیو سەدە لەگەڵ کۆستەکانی ئەمجەردا

ژیایت، دڵی خۆت قایم بکە و لەنێو دار و پەردووی رابردوودا قارەمانێتییەکانی خۆت و شانازییەکانی خۆت لە کۆگانیدا بیر بێتەوە، ئەوانە سێبەرن و بەردەوام لەخۆتی دەکەیت، بەڵکو ئەوانە لە شوێنی خۆیاندا رووناکییەکن و هێزێکن، مشوورخۆرییەکی روحن و دەدرەوشێنەوە و جەستەیەك تێکیان ناشکێنێت، هەرچەندە پیریی شەکەتی بکات. ئەمانە بێنەوە یادی خۆت و با رۆژگار چیرۆکەکە بگێڕێتەوە.

❊ ❊ ❊

بۆنی دووکەڵێك ئاسمانی بەغدا دەخنکێنێت.

لە ئێوارەی جەژندا، لەنێو جوولەکەکانی بەغدا چپەچپێك چون ئاگر بڵاوبووەتەوە. مانگێك تێپەڕی و دنیا هەر بە ترس ئاوس بوو. هیتلەر پێشڕەوی دەکات و لە بەغدا هەرەشەیەك لەئارادایە "نابێت جوولەکەیەك لەسەر زەوی بمێنێت!" و وەك بەرخ لەژێر پێی قارەمانی سەرکەوتوو هیتلەر، سەردەبڕدرێن! لە ماڵی خێزانە ئاوارە و لە ریشە هەڵکێشراوەکەوە لە کەرادە دەنگی بۆمبا دەبیسترا، کە بە روونی دیار بوو لە فرۆکەیەکی بەریتانیاوە فڕێ دەدرایە نێو دیجلەوە. لەگەڵ دەنگی تەقینەوەکەدا ترسێکی کپ کراو و مت بوو رادەچەنی و چپە چپ و دەنگۆی لێدەکەوتەوە. شلۆمۆ زەردەخەنەیەك بۆ ئەسمەر دەکات و دەڵێت:

ــ سابلاخ لە بەغدا دووبارە دەبێتەوە؟ ئینگلیز چۆڵی دەکەن و بە نازی دەڵێن فەرموو؟!

ئەو دوورە! ئەمە قەت روونادات و تا دیجلە لەبری ئاو خوێنی پێدا بڕوات.

ئێوارەی جەژن هەرچەندە ترس و گومان هەبوون، تەنگژەکە کەمێك رەوییەوە. نازییەکان هەڵاتن و ئینگلیزەکان شوێنەکانی خۆیان گرتەوە، شلۆمۆ دووبارە بە ئەسمەر دەڵێت:

ــ ئەسمەر پێمنەوتیت؟ شەوی جەژن تەنانەت گەر ئاسمان گوللە و ئاگری بباراندایە، من دەستم لە (تەواوکردنی وێرد خوێندن) هەڵنەدەگرت، بەڵام رووی نەدا، هاوکات لەگەڵ جەژندا پەرجووی خودا هات و دۆخەکەی هێور کردەوە.

پیاوی ئایینی مەردخای حای کوردە زێوانی مەزارگای (ناحوم) پێغەمبەر لە ئەلقوش لە هەرە سەرووی باکووری عێراق، ئێوارەی جەژن لە دیاردەیەکی سەیر سەری سوڕما و هەرچەندی کرد، بۆی لێك نەدرایەوە. مەردخای چراکانی ڕێکخست و ئاو و زەیتی تێکردن، بە هەمان شێوە کتێبی وێردەکانی تایبەت بە جەژن لەسەر ڕیحلە درێژەکان دانا. وەك هەمیشە چاوێکی پێدا گێڕانەوە، ئینجا هەموویانی لە پای ڕوحی پاکی پێغەمبەر داگیرساند و وێردی جەژنی خوێند. دوای ئەمە داوای لێخۆشبوونی لە پێغەمبەر کرد، ئینجا دەستی بە ڕازاندنەوەی مەزارگەکە کرد. دوای چەند خولەکێك مەردخای حای گەڕایەوە لای چراکان و ڕیحلەی کتێبی وێردەکان، بینی هەر هەموویان کوژاونەتەوە. ڕاستە ئارامگای پێغەمبەری ئەلقوش لەسەر چیایەکی دیواراسا و سەرکەشە، کەش و هەواش لەگەڵ ئەوەی ئاخر و ئۆخری بەهارە، بەڵام هێشتا ساردە. لە دەرەوە هیچ نیشانەیەکی هەڵکردنی با نەبوو، زێوانی ئارامگاکە تەماشایەکی پەنجەرەکانی مەزارگەکەی کرد و بینی پەنجەرەیەك نیوە کراوەیە. چوو دای خست و لەبەرخۆوە ورە ورێکی کرد و دڵی پڕ لە ترس بوو "ئەی ناحوم پێغەمبەر، بم بەخشە، کە هێشتم بای سارد بگاتە چراکانت و بیانکوژێنێتەوە". مەردخای حای دووبارە چراکانی پێکردەوە و لە نزیکیانەوە لەسەر فەرشێکی ئێرانی بەرانبەر گۆڕی پێغەمبەر، کە بە مەخمەڵ و ئاوریشم داپۆشرابوو، هەڵاژیا. دوای چەند چرکەیەك مەردخای ئاوڕی لە چرا و ڕیحلەی کتێبی وێردەکان دایەوە، ئاوەزی پیاوەکە لە نێو کاسەی سەری بەرداسا وەستا. گێلانە و بە ترسێکی نادیارەوە ڕووانییە نێو مەزارگەکە. لەمەوبەر ڕووینەداوە چرایەك کوژابێتەوە، ئیدی چۆن هەموو چراکانی مەزارگەکە پێکەوە دەکوژێنەوە، بەتایبەتیش دووجار لە شەوی جەژندا؟ ئەی ناحوم پێغەمبەر، ئایا تۆ لە من تووڕەیت؟ ئەی ئەلقوشی، ئاخۆ بەرانبەرت هەڵەیەکم کردووە؟ ڕەنگە بیرم چووبێت خۆم بسمیل بکەم، ڕەنگە مرۆڤێکی پیس بم و بە کەڵکی خزمەتکردنی تۆ نەیەم ئەی پێغەمبەری خودا؟!

هەر ئێستا! هەر ئێستا خۆم پاك دەکەمەوە، خۆم بە ئاوی گەرم و سابوون دەشۆم! هەر لە تەوقی سەرمەوە تا بن پێیەکانم دەشۆم، هەرچەندە لەگەڵ تێپەڕبوونی شەمەدا

من ئەوەم کردووە، بەڵام جەژن کەوتـە نێـو تێپـەڕبوونی شـەممەوە. تـۆ بڵێیـت هەڵـەم کردبێت؟ نا... نا... لەکاتێکدا من لە شوێنێکی پیرۆزی وادا کار دەکـەم گەرەکـە خـۆم پاك رابگرم. ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی ناحوم ئەلقوشی، وا دەستبەجێ دێم! بۆ جـاری سێیەم مەردخای چراکانی ئارامگاکـەی پێکـرد، ریـشە بـەفرین و سـپییەکەی ئـاوی لێدەچۆڕا و بۆنی عەنبەری لێهەڵدەستا، دایگرساندن و چاوەڕێی کرد... دڵنیابـە، ئـەوە هـەموو چـراکان وەك جـاران بـە ئـارامی دەئایـسێن. دووبـارە بـە تەنیـشت گـۆڕی پێغەمبەرەکەوە راکشا. ئینجا دوای چەند چرکەیەك بۆی دەرکەوت کە دەبێت چاوێك بە چرا و ریحلەکاندا بگێڕێت، تا دڵنیا بێت. کە نیگای کەوتە سـەریان لـە شـوێن خـۆی وشك بوو، تەزووی ترسێکی گومـاناوی جەستەی هێنایە لـەرزین. هـەموو چـراکان بـە گەشی دەئایسان، بەڵام رەنگی ئـاو و زەیتەکـەی ناویـان بووبـوو بـە رەنگێکـی سـوور هەروەك خوێنێکی تـەواو...، هـەردوو چـاوی مـەردخای حـای پەڕینـە پـشت سـەری، ئەشکەوتی دەمی کرایەوە و بە لای راستدا چەوتەوەبوو، زمانی لـە قـوڕاوێکی قـووڵی سەرسامیدا گیر بوو. لە کاسەی سەریدا گـەرداوێکی شـێتانە هەسـتا و بیرکردنـەوەی پچڕاند و بە هەموو لایەکدا پەرت بوو. لەپڕ پیر مەردخای حای تـوانی گرێـی زمـانی بکاتەوە و بێتە گۆ و لەنێو گـەرداوی ئـەو شـێتییەدا کەوتـە ورە ور "خـوێن و لـەناو چـراکانی نـاحوم پێغەمبــەر! ئـای مــەردخای تێـدا چـوویت! بـە پـیرۆزی پـیرۆزان تێداچوویت!"، پاشان نوقمی نێو بێ ئاگایی و لەسەرخۆچـوونێکی قـووڵ بـوو، ئیـدی ئەوەی پەیوەندی بە چاوانی و زمانی و ئاوەزییەوە هەبوو، شوێن ئەم لەسەرخۆ چـوونەی کەوتن، لێ پیر مەردخای حای شتەکانی دەبیـست و دەی بیـنین و هەسـتی پێـدەکردن، بەڵام جێیەکەی خۆی بە تەنیشت ئارامگاکەوە جێنەهێشتبوو، پیرێکی دیکەی بە سام و شکۆ و سەنگین لەپڕ بەرانبەر مەردخای حای دەرکەوت...، زێوانی ئارامگەکە زانی کە ناحوم پێغەمبەر لە ئاسمانەوە ئەو مەودایەی بڕیوە و بۆ لای ئەم هاتووە. ئەم رووخسار و سیمایەی دەناسی، چونکە پێشتر لەو ساتانەی کە خەڵکی بێ ئاگان هاتووەتـە خـەونی زێوانەکەی. برێ جار دەستی بە ریش و سەری زێوانەکەیدا هێناوە و وەئاگا هاتووەتەوە و بینیوێتی هەرچی ئازاری پیرێتی هەیە، لـە جەسـتەی نـەماوە و تەندروسـتییەکی وای

پێداوە مەگەر لە ڕۆژانی هەرەتی لاوێتی تەندروستی وای بە خۆیەوە بینیبێت. ئەمێستا پێغەمبەری خودا لە ساتەوەختی تووڕەیی و پڕگوماندا بۆ لای دێت و زێوانیش هەوڵ دەدات، تا لە خزمەت کەسێکدا کە لە بەهەشتەکانی خوداوە بۆ لای هاتووە، ڕەشەبای شێتییەکەی کپ بکاتەوە. بێ سوودە! لەرزێك هەموو جەستەی گرتەوە، ئەوەندەی نەبرد ماسوولکە بەستەزمانەکەی نێو زارە کراوەکەی ڕەق کرد. خوێنەکە هێشتا لەناو چرا و کەمۆڵەکاندایە و مەردخای حای ئاماژەی بۆ دەکات، هەردوو ڕیزە دانەکانی بە ڕیتمی یەك لە دوای یەك شێتانە چیڕە چیڕ دەکەن و ناتوانێت کۆنترۆڵیان بکات. لە کۆتاییدا پیرەی تۆقیو و لەسەرخۆ و زمانی لە چنگی تێکناڵانی ترس و واقوڕمان ڕزگار دەکات و بە دەنگگەلێك کە مەودایەکی دوور لە یەکتریان جیا دەکاتەوە، دەڵێت:

ـــ هۆ ناحوم پێغەمبەر، بە قوربانت بم، ئایا کەمتەرخەمییەکم بەرانبەرت کردووە؟ ئاخۆ گوناهێکم کردووە، تا ڕۆنە بێگەردەکە ببێتە ئەم خوێنە؟

ئەمەی وت و چاوەڕێی بڕیارێك بوو لە ناحوم پێغەمبەرەوە! دڵنیا بوو کە تێداچوونی یان ڕزگار بوونی بەم بڕیارەوە بەندە...

ساتێك لە بێدەنگی تێپەڕی، پێغەمبەری خودا غەمگین بوو، مەردخای حای بۆ ئەوەی دڵنیا بێت، چاوەکانی هەڵگلۆفی. بینی ناحوم پێغەمبەر دەگری. پیری زێوان کەوتە نێو زۆر بڵێیی و شێتبوونێکی دیکەوە، ناحوم پێغەمبەر دەگری! ئەلقووشی ڕاستگۆ و نیتشەجێی بەهەشت عەسر دەڕێژێت؟! ئاسمانەکان دەبڕێت و بە خەمباری بۆ لای ئەم دێت؟! خوێن لەناو چراکانی و کەمۆڵەکانیدایە و بە خوێن دەئایسێن و ئارامگاکە ڕووناك دەکەنەوە! بە خوێن نەك بە ڕۆن، ڕووناکی دەکەنەوە؟!

ـــ هۆ گەورە و سەروەرم، بە قوربانت بم! ئاوەزم لەوەی ڕوودەدات کوڵ بووە. ئاخر ڕێی تێدەچێت، کە پێغەمبەری خودا بگری و ڕۆنیش لەنێو چراکاندا ببێتە خوێن؟

پیرەمەردخای حای لە بێ ئاگاییەکەیدا، ناحوم ئەلقوشیی سەروەری دی، بە کوڵ دەگریا، گوێی لە دەنگە غەمگینەکەی بوو، کە لە قووڵایی زیندە خەونەکەیدا دەنگی دەدایەوە.

ــ هەموو پێغەمبەران و راستگۆیان خەمبارن و بۆ ئەوە دەگرین، کە خودای مــن و تۆ بەسەر یەهوودی شاری بەغدایدا هێناوە.

مەردخای بە پەرۆش و ترسێکی زاڵەوە پرسی:

ــ کەواتە ئەم خوێنە ئەوەیە؟ ئەی گــەورە و ســەروەرم، ئایــا کەســوکارەکانمان لــە بەغدا بەم خوێنە دەکوژرێن؟

پێغەمبەرەکە بە دەنگێکی گریاناوی و خنکاوەوە، بــە چــاوی پــڕ لــە فرمێــسکەوە فەرمانی پێدا:

ــ ئەی زێوانی ئەمەکدارم، رووت وەرسووڕێنە، ئەی مەردخای، بەرەو بەغدا بڕوانە.

زێوانەکە نیگای ئاراستەی بەرەو لای بەغدا کرد و وتی:

ــ گەورە و سەروەرم، ئەوە وام کرد!

پێغەمبەرەکە وتی:

ـ ئەمێستا هــەردوو چــاوت توانایــان بەســەر هــەموو دوورییەکانــدا دەشــکێت و بەغدات لێ نزیك دەبێتەوە و بەجۆرێك دەیبینیت وەك ئــەوەی لــەنێو لەپــەکانت بێــت. مەردخای ئەوەی لە بەغدا روودەدات، دەیبینیت، دە تەماشا بکە!

ــ ئەی سەروەرم، من وا تەماشا دەکەم!

ــ مەردخای حای، چی دەبینیت؟

ــ ئافرەت و پیاوان و پیرەمێردان و منداڵان دەبیــنم چەشــنی مێگــەل ســەردەبڕێن، ماڵان دەبینم تاڵان دەکــرێن و دوکانــەکان گــسکیان لێــدەدرێ و لــە کەلوپــەل بــەتاڵ دەکرێنەوە و نامووس هەتك دەکرێت و خوێن وەك رووبار رێ دەکات، رووتەڵــە و چــەورە بــە خەنجــەر و شمــشێری هەڵکێــشراو و خوێناوییــەوە لەســەر لاشــەی قوربانییــان بــە شادمانییەوە هەڵدەپەڕن.

ناحوم پێغەمبەر وتی:

ــ ئا ئەمەیە لە دوو رۆژی جەژندا لە بەغدا لە کەسوکاری ئێمە روودەدات.

زێوانی ئارامگاکە هاواری کرد و پاڕایەوە:

ـ کەواتە با گەورە و سەروەرم لەگەڵ یارانی خۆی داوای بەزەیییەك لە خودای خۆیان بۆ ئەم داماو و بێ تاوانانە بکەن، بەڵکو بەزەیی پێیاندا بێتەوە و ئەم بەڵایەیان لەسەر لا ببات.

پێغەمبەرەکە بە دەنگێکی تێکشکاو، بەڵام یەکلاکەرەوە وتی:

ــ ئەی مەردخای، بێ سوودە! داوای بەزەییمان کرد و پاڕاینەوە، فەرمانی خودا جێبەجێکراوە و فەرمانی خودای گەورە گەڕانەوەی بۆ نییە.

مەردخای حای بە ترسەوە پرسی:

ــ ئەی گەورە و سەروەرم، ئایا جوولەکەی بەغدا قەڵاچۆ دەکرێن؟

ــ وەك پێم وتیت بە درێژایی دوو ڕۆژی جەژن خوێنیان دەڕژێت، پاشان کەسوکاری من و تۆ ژن و پیاوێکی خودناس و لە خودا ترس دەکەنە قوربانی، ئەی مجێورە وەفادارەکەم، بڕوانە!

پیرەمەردخای حای تەماشای کرد، پیرەمێردێکی بەغدایی ریش چەرمووی بینی لەسەر کورسییەك دانیشتووە و خەریکی خوێندنەوەی سروودەکانی داوودە، لەناکاو گیزەی گوللەیەك ئاوازە بە ریتم و خۆشەکەی بڕی، ئینجا بڵێسەی ئاگر و تەقینەوەیەك، دوا بە دوای ئەمەش ڕێچکەی خوێنێك لە نێوچەوانێکی چرچ و لۆچەوە ڕێچکە دەبەستێت، تا دەگاتە سەر کتێبی سروودەکان و بە خێرایی دەبێتە گۆمیلکەیەکی سوور و سەری پیرەی جوولەکەی بەغدایی بەسەر لاپەڕەی کتێبی سروودەکەیدا لار دەبێتەوە و ریشی نوقمی نێو گۆمە خوێنەکە دەبێت.

پێغەمبەری ئەلقووشی بە مەردخای حای زێوانی ئارامگەکەی، کە نوقمی نێو خەم و بێ ئاگایی و شێتی بووبوو، دەڵێت:

ـ ئەی مەردخای حای، دووبارە بڕوانە!

ئەمیش بە گوێی کرد، ژنێکی بە ساڵاچووی بینی، کە خۆی بە عەبایەکی ڕەش پێچابووەوە و تیرناسا شەقام دەبڕێت، وەك شێت بە ڕاست و چەپدا ئاوڕدەداتەوە، تۆقیو و شڵەژاو، بە هاوارەوە هەندێك شت دەڵێت و دەگاتە گوێچکەی ئەم و لێی تێناگات، ژنە لە ڕووی خۆی دەدات و دەی ڕنێتەوە، لەناکاو کۆمەڵێك دەوری دەدەن، کۆمەڵە خەڵکێك

چەقۆ و خەنجەر و شمشێر هەڵدەکێشن، کۆمەڵە خەڵکێکی هەڵچووی دیکە دروشم دەڵێنەوە، کۆمەڵە خەڵکەکە هاوار دەکەن و ژنەش هاوار دەکات. کۆمەڵەکە ژنە تەوق دەکەن، ئینجا بە چەقۆ دای دەبڕن، ژنەکە لە ناوەندی شەقامەکە دەکەوێت و نوقمی دەریای خوێنی خۆی دەبێت.

ئەلقوش، دیسان ئارامگاکە، مەردخای حای لە سەفەری ترس و تۆقین...، لە سەفەری بە خوێن رەنگ بوو دەگەڕێتەوە، هەرچەندە چیا بەرزەکە ساردە، بەڵام ئەم ئارەق دەکات، هەناسەبڕکێیەتی...، ئاحوم ئەلقوشی بەرانبەرێتی و پێیدەڵێت:

ــ ئەم دوو خواپەرستە، پیرەمێردە چاکەکە و ژنە چاکە خوازەکە کۆتایی بە کاروانی قوربانییانی یەهوودی بەغدا دێنن، بە روحی خۆیان قوربانی بە قەسابخانە گەورەکە دەدەن.

مەردخای حای هاتەوە سەر خۆی. جەستەی عارەقەی لێدەچۆڕێت... لە ترسان هەڵدەلەرزێت. لە سیمایدا غەمێکی زەبەللاحی دێواسا دیار بوو، چراکانیش دووبارە کوژانەوە، لە جیاتی رۆن و ئاو خوێنیان تێدایە، لێ کارەساتەکە لەوە گەورەتر بوو وەك بیری لێدەکردەوە. ئەوێك بەم جەستە سیسەمەرۆیەیەوە، پێشێل کراو لە ژێر قورسایی ساڵەکان رزگاری دەبێت، لەمەش پتر پیرەی زێوان بەرەو پلەی سەروەر و گەورەکەی هەڵدەکشێت، ئەوەتا ئەوەی ئەم دەیزانێت هێشتا جوولەکەکانی بەغدا نایزانن، بەر لەوەی ئەوان بۆ خۆیان بگرین، ئەم بۆیان دەگری. پیر مەردخای بە دەم تەڕکردنی ریشە چەرمووەکەیەوە بە رووندکی رووناکی مرواری ئاساوە، وتی "نێوان من و بەغدا سەدان فەرسەخە، هەروەها نێوان من و بەغدا فەرمانێکی بێگومانی خودایە." سەرباری ئەمە ئاواتی دەخواست ببێتە باڵندەیەك و دوورییەکان بپێچێتەوە و لە چاو تروکانێکدا بگاتە بەغدا و بە دەوری ئەو ماڵانەدا بسوورێتەوە کە نەگبەتی لە دەرگایان دەدات، بە زمانی ئەو چارەنوسەی بەڕێوەیە بانگیان بکات "لە گۆماوی خوێن هەڵێن، وریای قەسابخانە گەورەکە بن!"، بەڵام ئاخۆ دەبێت بەرەنگاری ویستی خودای خۆی ببێتەوە، ئاخر داوای بەزەیی پێغەمبەران و پیاوچاکانیش دادێکی نەدا؟! وەك گلەیی کردنێك هاواری بردە بەر گۆڕی پێغەمبەرەکەی "ئەی گەورە و سەروەرم، بۆچی

بەزانینی ئەو نادیارە شووم و پڕ مەترسییە سزام دەدەیت؟!". پیرەی مجێوری پێغەمبەر ئەلقوشی ئاواتی بەوە خواست، کە پێش کەمێك دەی ترساند و لێی دەترسا. لەپڕ مەرگی خۆی هاتە بەرچاوی، هۆگر و دۆستانە و نەرم و نیان، دەیەوێت دەست بخاتە سەر شانی و لەگەڵیدا بەرەو پێچ و قووڵایی نادیار بڕوات.

لەو ساتەدا چنگی ئەو ترسەی چەند ڕۆژێکی دووروودرێژ لە بینە قاقای یەهودییەکانی بەغدا گیر بووبوو، خاو دەبێتەوە و شوێنی خۆی بۆ شەوی جەژن و هاتنی خۆشی چۆڵ دەکات. تەنگژەکە لە بەغدا کۆتایی هات، یان خەریك بوو کۆتایی بێت، جەژنیش میوانێکە خۆشی بۆ خەڵکی دێنێت. لەنێو جوولەکەکانی بەغدادا کەسێك نەبوو پێشبینی بکات، وەك ناحوم ئەلقوشی زێوان پێشبینی کردبوو، مەردخای حای تەنها خۆی ئەمەی دەزانی. (باوکی سەلمان) شلۆمۆ کەتانی کوردە بە هەمان زمانی ئارامیی مەردخای حای دەدوا، لێ ئەوەی مەردخای حای دەربارەی پێشڕەویی خۆپیشاندانێك، کە بەم زووانە روو لە جوولەکەکانی بەغدا دەکات و پێشەنگیشیان عیزرائیلە و خۆی بۆ درووێنەکردنی روحێکی زۆر و بێ گوناه ئامادەکردووە، ئەم لێی بێ ئاگا بوو. خەیاڵی شلۆمۆ ئاسوودە بوو، وەك هەمیشەش خۆی تێك نەدابوو، ڕووداوە بەسەرچووەکانی سابلاخیش بەلایەوە مۆتەکەکەی جاران نەبوو، ساڵانی خێر و فەڕ بە دوای یەکدا هاتووەکان لە گۆڕیان نا و ڕۆیشتن و...، گەڕانەوەیان بۆ نەبوو. شلۆمۆ بڕوای وابوو کە کارەساتیش سنوورێکی هەیە، تەنگژەکە توند بوو، ئینجا ڕەوییەوە ئێ لۆجیکیش بە بەردەوامی ساڵانی ترس و نەگبەتی قایل نابێت.

دوای نوێژی (تێپەڕبوونی شەممە) و نوێژی جەژنی زیارەت لە کەنیسە (عەزرا داود) لە بەتاوین، گەڕایەوە. جەژنی زیارەتیش جەژنێکە دەکەوێتە دوای شەممەوە و ڕۆژانێکی پیرۆزن و دوای ڕۆژی (قودسی) دێن. وەك هەموو جارێك بۆ ئەسمەری دایکی منداڵان دیاری هەڵگرت و بۆ خۆشی پێویستی بە گۆڕینی جلەکانی نەبوو، جلە نایابەکانی شەممە بە کەڵکی جەژن دێن. کات پەلەی لێدەکات، ئەم شەو هیچ یەهوودییەك نانوێت، بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵی خوداپەرستان تا بەیانی شەوبێداری دەکەن، پێکەوە یەك دەگرن و نوێژ لە دوای نوێژ بۆ روحی مردووەکان دەکەن ـــ بە کڕنۆشەوە مۆم

دادەگیرسێت، تا ڕێگای بەرەو بەهەشت بۆ ئەو ڕوحانە ڕووناك بكەنەوە. شتێ لە زەینی شلۆمۆ كوردە دابوو، ڕیتمێكی پیرۆز و سازگار كە لە ژێی دڵنیایی دەدا و بۆنی شنەی سوپاسگۆیی بۆ پەروەرین لێ هەڵدەستا "قەڵا و جێی تەقەتیم، كە ڕزگاریكردم، هەروەك چۆن بەر لە من پیاوچاكانی ڕزگار كردووە، خستمی و دووبارە لە پاش كەوتنم ڕاستی كردمەوە، ئەوەتا بە چاكەیەك لە دوای یەكەكانی نوقمی دەكات. ئەوەتا ئەسمەری دایكی منداڵانم لەگەڵدایە و شان بە شانی من سوپاسی چاكە و فەڕەكانی خودا دەكات، هەر خودی ئەسمەر هۆیەكە لە هۆیەكانی و ڕێگەیەكە لە ڕێگە ناوازەكانی". هەموو شتێك ئاماژەیە بۆ دڵنیایی. لێرە، لە بەغدا دوور لە ئەلقووشی سارد و سەرما، كە خزاوەتە ئەوبەری باكووری شاخاوییەوە. لەوێ پێغەمبەری ئەلقووشی نهێنییەكەی بە زێوانە وەفادارەكەی وت، لەوێ تەنها كەسێك دەیزانێت و یەهودییەكانی بەغدا نایزانن كە ڕۆژی جەژنی پیرۆز چی لێ شاردوونەتەوە.

شلۆمۆ كەتانی لەسەرخۆ شامی كرد و بە ئەسمەری وت:

ــ من دەڕۆم.

دەیزانی كە ئەسمەر دەزانێت، بۆیە ڕوونی نەكردەوە بۆ كوێ دەچێت، بەڵام ئەسمەر هەر پرسی:

ــ بۆ ماڵی مەئیر بێرسی بازرگان، بۆ ئێرە لە كەرادە دەڕۆیت؟

سێبەری خەمۆكییەكی چاوەڕوان نەكراو نیشتە سەر ڕووخساری باوكی سەلمان و وتی:

ــ بەڵكو بۆ ناو بەغدا، بۆ لای برا (دەربەدەرەكان)م لە ماڵی حاخام میخائیل...

ئەسمەر نیگایەكی پرسیار ئامێزی كرد و ئەم لەسەری ڕۆیشت:

ــ دوێنێ خوالێخۆشبوو حاخام ناحوم هاتە خەونم و گلەیی لێكردم پێی وتم "شلۆمۆ، كەسوكارەكەت لەبیر كردووە!".

بێدەنگ بوو، لەگەڵ ئەوەی جەژن و شادی دیكە بوو، ڕووخساری پتر تاڵ بوو... ئینجا لەسەر قسەكانی ڕۆیشت:

ـ لە شەوە شوومەکەی سابلاخ هاتەوە یادم، کە لە ناوەراست رێگەکە لەسەر فەرشی سپی بەفرەکە کەوتبوو و شەلاڵی خوێنی خۆی بوو.

ئەسمەر بە سۆزەوە نیگایەکی کرد، ئینجا لەسەرخۆ و بە بێ دەنگی دەستی خستە سەر شانی، لەسەرخۆییەك پڕ لە هەست و بیرکردنەویەك کە وشە توانای پڕکردنەوەی نییە، ئیدی لەم بێدەنگییەدا دەستی بە تاڵەوەبووی لە دەربڕینی خاڵی بووەوە، وتی:

ـ باوکی سەلمان، ئاگات لە خۆ بێت، چونکە لەم رۆژانەدا ئارامی و ئەمان نییە.

ئارامی و ئامان نییە! هەموو ئەو ژیانەی لە رابردوودا بەسەریان بردبوو، ئارامی تێدا نەبوو، لێ دڵنیایە بۆ هەر شوێنێك بڕوات، رێگەیەك دەگرێتە بەر کە "خودای ئارامی بەخشی" لەگەڵدایە، ئاگا لە خۆبوونی مرۆڤ بە بێ خودا چ سوودی هەیە؟!

دوعا خوازی لێکرد و چووە دەرەوە. بەغدا بە ئالاّ و والاّی جەژن وا خۆی رازاندووەتەوە، لووت دەتۆزێنێتەوە. ئیدی بۆنی ئاگری بێ دووکەڵ ناکەیت کە لە هەموو گەردیلەیەکی هەوا بلاّو ببێتەوە و بت خنکێنێت، هەرچەندە رەشید عالی هەلاّتبوو، بەلاّم هەموو جیهان لە رۆژئاوا و رۆژهەلاّت دڕندانە یەکتری دەکوشت. فڕنەکانی گاز لە رادەبەدەر هێڵەی بە جوولەکەی ئەورووپا دەکرد، سووڕپای جوولەکە پێ پەتی و برسی، هەموو سێبەرێکی مرۆڤانەیان لێ سەندرابووەوە، وەك دەیان وت گوایا مرۆڤیش سێبەری خودایە لەسەر زەوی. بەرەو سەربازگەکانی ئەشکەنجەی نازییەکان دەبردران و لەوپەڕی سڤیلی و بێدەسەلاّتیدا چاوەڕوانی قەلاّچۆکردنی خۆیان دەکرد. بەلاّم بەغدا خەریکی جەژن بوو، شلۆمۆ کوردە و زۆر لەوانەی لەگەڵیدا بوون بە دڵێکی قایلەوە سوپاسی خودایان دەکرد، لە ئارامگای ناحوم پێغەمبەر لە ئەلقووشی دوور پیرەی پیاوچاك مەردخای دوای پێشبینییە خەیالاّوییەکەی دەچێتە پاڵ گەورە و سەروەری و پێغەمبەری خودا و بۆ کارەساتی بێ ئاگایی رووداوی زۆر نزیکی، دەگری. شلۆمۆ کەتانی دوای رۆشتنێکی خێر و بەردەوام گەیشتە ماڵی حاخام میخائیل، کە لە کووچەیەکی کەلاوە ئاسا و تاریك و لەنێو هەناوی گەرەکێکی کلۆڵ و ئاخنراو بە گفتوگۆ، بوو و بە درێژایی (شەقامی غازی) دەکشێت. کۆمەڵەکە لەوێ تەواو بوون و کەسیان کەم نەبوو، کۆمەڵە هاوڕێیەکی رۆژانی تێر و پڕی و هەرەتی تەمەن لە

سابلاخی شوێنی لەدایك بوون. کۆمەڵە هاوڕێیەکی بەش مەینەت و لە ناوەخت سەر سپی بوو، دوای ئەوەی هیچ چارەیەکیان بۆ خۆدزینەوە لە مردن نەما، پێکەوە بوون بە (دەربەدەر) و (پەنابەر). یەکە یەکە ئامێزی لێدان و دانیشت. بیرەوەری تێکەڵی پیرۆزیی جەژن بوو، شادی بوو بە خەم، خەمێکی لە مێژینە نینۆکی لە گۆشتی تازە و تەڕی جەژن گیر کرد، ئینجا نوێژ و نزا دەستی پێکرد، لە هەموو جێیەك هەر نزا و پاڕانەوە بوو، ئەرکە ئاینییەکان بە خۆشنوودییەوە جێبەجێ دەکران. خودا لە نهێنیدا بەڵێن بە بەندەکانی خۆی دەدات. لە قەسابخانەکە شتێکی ئەوتۆی لێ نەما! لێرە، ناوی پیرۆز دەکرێت و شکۆمەند دەکرێت، لەوێ لە ئاسمانەکانیدا هەوردای تاوانێکی بچکۆلە دەکرێت و دەچێتە پاڵ تاوانەکانی ئەورووپای شارستانی مەزن و کارەسات ــ جەژن بە بێ ئاگایی و غافڵانە دەڕوات و شتێك دەربارەی خودی خۆیشی نازانێت، جگە لە پیرەمێردێکی کوردی ئارامی لە ئەلقووشی دوور، کە لەلای خۆیەوە لە ئایندەدا ژیا ولەبەردەم خۆیەوە رووخساری بەدگۆڕاو و کەڵبەی بەدەرەوەبووی ئاشکرا کرد.

شەو لە هەناوی رابردوودا پێشڕەوی کرد، جوولەکەکانی بەغداش هێشتا بێدار بوون و هەر خەریکی ناوهێنانی خودا بوو، ئەوانە پیاو و لاو و پیرەمێرد بوون، بەڵام ئافرەتان دڵنیاییان دەلاواندەوە. رۆژی جەژن هەڵات و نهێنییە داپۆشراوەکە وردە وردە خۆی بۆ قوربانییەکانی ئاشکرا کرد.

بەرایی دڵۆپە خوێنی گەرم و لینج و سوور لە نزیك (بابولشێخ) رژایە سەر قیرێکی رەش و سیلاوی بەست. یەکەم روح دەرچوو، دیمەنی خوێنەکە بەرچاوی دڕندە تێکشکێنەرەکەی گرت، بۆنی خوێن لووتی بکوژانی پڕکرد، شلە مرۆییەکە حەزی بزرواند و لەم رۆژەدا بە خوێنی مرۆڤ جەژنێك ساز دەکەن و بە سوپاسگوزارییەوە لە رێی خودای خۆیاندا خێر و بەرات دەکەن، لێ خودا هێشتا فوو بە روحی ئەو کۆمەڵە خەڵکە گردەوەبوودا دەکات، ئارەزوویان دەخاتە سەر رشتنی خوێنی ئەوانەی کە گەورەیی ئەو لەسەر زاریانە. لەو بەرزاییەی خۆیەوە دەیڕوانی و دەیوت "ئەی گەلەکەم بۆیە هەڵم بژاردیت، تا بمریت و سەربازە بکوژەکانم بژین!".

کەژاوەکەیان بە ریگەی نەخشە بۆ کێشراوی خودادا رۆیشت! سەربڕ! کـاول بکـە! تالآن بکە! بدزە! پاکیزەکان هەتك بکە! ئافرەتانی بە ناو (گەلەکەم) قیژەیان گەیشتە ئاسمانی بەغدا و چون لافاوی روبار بـڵاو بـووەوە. شـلۆمۆ و کۆمـەڵێ لـە هاوڕێیـانی زەمانیان لە ناوهێنانی خودادا شلوکوت دەبێت، ئینجا لە بەرەبەیاندا لە ئەنجامی شـەو بێداری شەکەت دەبن و خەو دەیان باتەوە، تا تواناى خۆیان بۆ شـەوی دووەمـی جـەژن نویٚ بکەنەوە و گەورەیی خودا دووبارە بکەنەوە، کەچی بـە دەنگـی تەقـە وەئاگاهـاتن، ئەسمەریش لە کەراوە بیٚ ئەوەی گوێی لە تەقە بێت بێـدار بـووەوە. هێشتا هەواڵەکـە نەگەیـشتبوو، نـە رادیـۆ کرابـووەوە، نـە تەلـەفۆنیش بـەکار دەهێنـرا، ئەوانـە لـە قەدەغەکانی جەژن بوون. سەلمانی کوڕە گەورە لە ئەمریکا بوو، سەیون و مریەمیش لە ماڵ و حاڵی خۆیان بوون، سـەیون لـە سـەعدون و مریـەم لـە بـەتاوین. ئـەی پیـاوە خۆشەویستەکەی ماڵ؟ ئاخۆ ئەسمەر دەیزانی کە باوکی سەلمان لەگەڵ هاوڕێکانیدا خۆی بیر دەچێتەوە؟! پیاوە عاشقەکەی هاوڕێیانی و یادەوەری ئەمێـستا نووسـتوو، بێگومـان دوای شەو بێداری دەبینیت شەوی یەکەم دەداتە دەم شەوی دواییـەوە؟ ئـەی لـە یەکـەم رۆژی جەژن بۆ لای ناگەرێتەوە؟ ئەسمەر وای زەن کرد کە گوێی لـە دەنگـی تەقەیـەکی دوورە. باش گوێی هەڵخست، بەڵام شتەکە نەی شڵەژاند، چونکە بەم دواییە لە بەغـدا ئاژاوەگێڕی زۆر بووبوو، تا وای لێهات ببێتە سابڵاخی سەردەمی جەنگی یەکەم. دەی با وا بێت، ئەم چی لە کودەتایـەکی دیکـە، یـان شۆڕشـێکی دیکـە دژی ئینگلیـز داوە! گەرەکـە وەك نـەریتێك بـۆ ئـەم جەژنەیـە (کـاهی) دروسـت بکـات. هێـشتا خـۆی نهێنییەکـەی بـە ئەسمـەر نـەوتووە، تـەنها زێـوانی ئارامگەکـەی نـاحوم ئەلقوشـی نهێنییەکـەی دەزانـی و لـە هەنـدێك شـوێنی بەغـدا و دوور لـە ئەسمـەر نیـشانەی دەرکەوتبوو، ئەم نهێنییە لە هەندێك شوێنی تـری بەغـدا، لـە کۆڵانـە هەژارنـشین و بازاڕەکانی و ناوەندە بازرگانییـەکانی وەك پـەتا خـۆی دەردەخـست و گیـانی ئەوانـەی درووێنە دەکرد، کە بە هۆی جوولەکەبوونەوە پیس بوون و خودا لێیان تووڕە بوو!

شلۆمۆ لە تۆفانی خوێن و خراپەکارییەکەوە یەکجار نزیك بوو، بەڵام گیـان و دڵ و هزری لە دوور لە کەراوە و سەعدوون و بەتاوین بوو. ئەسمەر هۆ دایکی منداڵان، دەبـێ

ئێستا چی بکەیت؟! نەخێر. ئاخر دەکرێ بەتەنها لە ئامێزی تـرس و دڵەڕاوکێـدا وازی لێ بێنیت؟ گفتوگۆیەك لە نێوان هاوڕێیاندا کرا:

ـــ هێشتا ئەو شوێنانە ئارامن.

ـــ مریەم بۆ لای دێت، ڕەنگە سەیونیش بێت.

ـــ گەر بزانێت ئێمە لە ناو جەرگەی ڕووداوەکانین، شێت دەبێت.

ـــ بەڵام گەر سەرسەختی بکەیت و دەربچیت و بەڵایەکت تووش بوو، ئەوسا کۆست و کارەساتەکە ئەسمەر دەکوژێت. ئەوە هیچ گومانێکی تێدا نییە!

لە شەودا ڕووداوەکان ئاڵۆز بوون، بەڵام ئەسمەر نەیدەزانی ئەوەی بە لاوە سـەیر بـوو کە بە درێـژایی یەکـەم ڕۆژی جـەژن کەسـێك بـۆ لای نـەهات، نـە مێردەکـەی و نـە منداڵەکانی! نهێنی کەتنکەر هێشتا پەردەیەکی بەسەر هۆشی ئەسمەردا دابوو، ڕەنگـە تەنها ئەو لەوەی ڕووی دەدا، بێ ئاگا بوو، لێ ترسێکی منداڵانـە لـە سـەر و هۆشـیدا پەیدا دەبوو، پاشـان لـە دووەم شـەوی جەژنـدا پـەرەی سـەند و خـەوی زڕا و دەنگـی پێکدادان بەرز بووەوە، لە نزیکییەوە خوێن سێڵاوی دەبەست و خەڵك دەکـوژران، بـەڵام بارکی سەلمان و دەسـتە جەمعەکـەی دەسـتیان بـە ناوهێنـانی خـودا کـردەوە و داوای بەزەییان لێدەکرد، تا لەو مـەرگەی وا بەڕێوەیە، ڕزگاریان بکات. بکوژان بـە کووچـە و کۆڵاناندا تێدەپـەڕن، دەنگـی هـاوار و تەقەیـە، دەنگـی هۆسـەیە، دەنگـی ژاوە ژاو و زۆربلێیی مـەرگە، قوربانییان و جەلادان تێکەڵ بوون. هەژاری و بێ دەرامـەتی میـوانی ماڵە کـوردە دەربـەدەرەکان بـوو. دەنگـی خراپـەکاری و شـەڕ، گوللـە تـا دێـت دوور دەکەوێتەوە، شەوەکە دەنگی ئازیزە لەدەستچووەکان و دەنگدانەوەی ترسناك دەگێڕێتەوە. ئەسمەر! من هەوڵ دەدەم بەرەو لای تۆ مل بنێمە نادیارەوە، ئەو مەودایانە ببڕم تا دوێنێ ڕێگای ئاسایی خۆم بوون، کەچی لەناکاو بوون بـە ڕێگـای بـە مـەرگ چـێنراو. بریـا دەمتـوانی بـە بازدانێـك بگەمـە لات، تـا بتبینـم. دەزانم تـۆ و منداڵـەکان هێـشتا شوێنەکەتان ئارامە، بـەڵام ئـاخۆ ڕوحیـشت لـە شـوێنێکی ئارامدایـە؟ بێدەسـەڵاتی شەیتانە و نەزانین فریشتەیە. ئەرێ هێشتا ئاگـات لـەوە نییـە، چـی ڕوودەدات؟ ئـەوە دوورە، ئەمێستا تۆ بێگومـان ئاوەزت لەدەستداوە... من دوای ئەوە لە سابلاخەوە هـاتم،

ئێستا دان بەبێ دەسەڵاتی خۆمدا دەنێم، دان بەوەدا دەنێم کە شەڕ جۆری هەیە. شەڕ لە سابلاخ زەبەلاحێك بوو، بەڵام لێرە شێتێکی پاڵ پێوە نراو و کوێرە. من پیر بووم و ترسنۆك بووم، ئەو ئازایەتی و مل پێوەنانەی جارانم نەماوە. ئەسمەر گوێت لێمە؟ ئیدی من ئەو ئازا و بوێرەی جاران نییم کە لە پای تۆ و منداڵەکان بە دەوری مەرگی گەڕۆك و نزیك لە خۆم، بگەڕێم. ئەم هاواری بۆ دەبرد و ئەسمەریش لە چپەی دوودڵییەکی گەورە، هیچی تر ناژنەوێت، خەوی زڕا "نازانم بۆچی دڵم هەناوم دەخوات...، هەر ئەوەندە رۆژ ببێتەوە بۆ لای مریەم دەچم!". کەچی ئەو بەیانییە ترسی لێکەوتەوە، لەو شەوەدا ئەسمەر پێڵووی نەخستە سەر پێڵوو، دەمەوبەیان پەژارە و دوودڵی شەکەتیان کرد و خەوی لێکەوت. سەعاتێك نوست، بەڵام بە دەنگی لێدانی شێتانەی دەرگا راپەڕی. ئەمە مریەم بوو، تۆقیو و ئاوەز شێواو. ئەسمەر شڵەژا، هەستی بە گوشینێکی نادیاری روحی خۆی کرد. یەکەم جار کچە پرسیاری کرد:

ــ کوا باوکم؟

دڵی ئەسمەر خەبەری شتێکی ناجۆری دا. گێلانە رووانییە درێتەکەی و وتی:

ــ چی بووە؟! دڵم هاتە خوارەوە، دە بڵێ چی روویداوە؟

مریەم نە باوکی دیوە و نە گوێی لە دەنگیشی بووە، دووبارە بە ترسەوە دەستی بە پرسیارکردن کرد:

ــ باوکم لە کوێیە؟ باوکم لە کوێیە؟

ــ لە پێریێ ئێوارەوە لە ماڵی حاخام میخائیلە.

مریەم بە هەناسەبڕکێوە بەسەر کورسییەکەدا کەوت. دایکی نیشانەگەلێکی شوومی لە رووخساریدا خوێندەوە.

ــ چی بووە؟ مریەم، دڵمت هێنایە خوارەوە.

ــ بەغدا ژێرە و ژوور بووە. جولەکەی بەغدا وەك بەرخ سەردەبڕن و کەوڵیان دەکەن، تۆش تا ئێستا ئاگات لە هیچ نییە؟

تەڕایی لە گەرووی ئەسمەردا هاتە کوڵ، گاسنێکی تیژ دەستی بە کێڵانی ئاوەزی کرد. کەمێك تاس بردییەوە، ئینجا چون کۆست کەوتوویەك هاواری لێهەستا:

ـــ شلۆمۆ! هۆ باوکی سەلمان، بەقوربانت بم!

بە جلی نوستنەوە بەرەو دەرگــا تــەکانی دا، مریــەم خــۆی پێگەیانــد و بــە شــین و گریانەوە رایکێشا:

ـــ بۆ کوێ؟ بە پێی خۆت بەرەو پیری مـەرگ دەڕۆیت؟

***

لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا قەوارەی مـــەرگ گــەورەتر دەبــوو، رووبــەری رووخانــدن و وێرانکردن فراوانتر دەبــوو و نهێنییەکــەش بــۆ ئەسمــەر دەردەکــەوت، بــە جۆرێــك لــە خەیاڵدانیدا هەڵاوسا، تا وای لێهات لە قەوارەی خۆی گــەورەتر بــوو، پڕوپاگەنــدە لــە هەموو شوێنێك زاوزێی دەکرد و حەکایەتەکانی کارەساتەکە تا دەهات پەرەی دەسەند و راستی تێکەڵی خەیاڵی ئەو خەڵکە بووبوو، کە سەرچاوەکەی ترسێکی گەورە بوو. ئــەو کۆمەڵە خەڵکەی لە ماڵی حاخام میخائیل قەتیس بووبوون، بە پەرجوو رزگــار بــوون. لە هەموو لایەکی ئەم ماڵەوە هاوار هەڵدەســتا. شــلۆمۆ جەســتەیەکی لاڵ بــوو و بــە هەموو بوونێکییەوە بە دەوری کەڕادەی رۆژهەڵاتدا دەسووڕایەوە و هــاواری بــۆ ئەسمــەر دەکرد. شێتبوونەکەی ئەسمەر لە دووەم رۆژی جەژندا دەگۆڕێت بۆ شین و شەپۆڕ و خــۆی لە پەنای تەنها پیاوێکدا دەبینێت، کە رۆژانێکی لەمەوبەر عاشقی بوو. هــەموو ئــەو شتانەی دەزانی کە لە سابلاخ رووبــەڕووی شــووەکەی بووبوونــەوە، رووداو گــەلێك کــە منداڵیشیان پیروخەڕۆ دەکرد، راستە شووەکە نهــێنی پــۆش بــوو، بــەڵام بــە هەســت و نەستەوە لە هەموو ئەو رووداوانەدا هاوبەشی بوو. خودا لەگەڵیدا بوو و لە هەموو ئەو مەترسییانە رزگاریکرد و چەندین جار مردن لەبەری هەڵدەهات و شلۆمۆ ســەرکەوت، بەڵام هەموو ئەوانە دادی خەمە گەورەکەی ئێستای نەدا. هەستێکی وا پەلاماریدا، کە ئەمجارە لە هەموو جارەکان جیاوازە. شەیتان غایلەیــەکی خــستە دڵییــەوە و بــە چــاوی خەیاڵ کۆمەڵە لاشەیەکی لەتوپەت کراوی لە ماڵی حاخام میخائیــل دی. پارچــەکانی لاشەی مێردەکەی خۆی دی کە لەنێو پارچەی لاشــەکانی دی بــڵاو بووبــووەوە. نیــوەڕۆ تێپەڕی و عەسری بەدوادا هات. مریەم هەوڵ دەدات ئــەو شــڵەژانەی بەســەر دایکیــدا هاتبوو، نەهێڵێت، بەڵام کۆستەکەی خۆیشی لە هی ئەو کەمتر نەبوو. دەیزانــی ئــەوەی

لەناو جەرگەی بەغدا روو دەدات، مەگەر خودا ئەگینا لێ رزگاربوونی نییە، چونکە درندەییەتییەکە گەرداوێك بوو هەموو شتێکی لە رێگەی خۆیدا دەپێچایەوە و لوولی دەدا، جوولەکەکانی بەغداش وەك درەختی بەردەم هەلکردنی زریان و رەشەبا بوون و لەوپەڕی بێدەسەلاتیدا بوون و بێ چارە مابوونەوە. لەوپەڕی بێهێزیدا پەنایان بۆ خودایەك دەبرد کە پشتی بەردابوون، هەروەك پیرەی ئەلقووشی مەردخای حای زانی کە ئەم خودایە هەر خۆی خوێنی جوولەکەکانی بۆ خوێنرێژان حەلاڵ کردووە و سامان و مالێشیان بۆ تالان و سووتاندن و وێرانکردن، بەلام ئەسمەر چۆکی بۆ لۆژێك دانەدا، چونکە لۆژێك لە بەغدا و بەرلین و هەموو شوێنێکی جیهان مردبوو. فەرمانی خودا بە پێی ئەو نەخشەیەی بۆی دانرابوو، بەرێوەچوو. سەعات سێی دوای نیوەڕۆ مریەم لە هەموو شوێنێکی مالەکە و لە ژوورەکان لە دایکی گەڕا و نەیدۆزییەوە. هۆشی مریەم لە قوولایی ئاوەزدا لە کەمی دا. زانی دایکی لە ناخافلدا خیانەتی لێکردووە و لە مال دەرچووە. مریەم بە دوایدا رایکرد و لەمبەر و لەوبەری شەقامەکە لێی گەڕا و بانگیکرد، دەنگەکەی دەبوو بە دەنگدانەوەیەك و بەرەو خۆی گەڕایەوە. شەقامەکە چۆل و هۆل و شوێنەواری زیندەوەرێکی تێدا نەبوو. مریەم بۆ مالەوە گەڕایەوە. دەستی بە شین و شەپۆڕ کرد، ئەوەتا دایکیشی بە دەردی باوکی چوو. تۆ بلێیت دایك و باوکی پێکەوە لەدەست بدات؟ هۆ سەیون تۆ لە کوێیت؟ ئەی سەلمان تۆ لە کوێیت؟ دایکم و باوکم وا لە دەمی مەرگێکدان هەرگیز تێر ناخوات.

***

لەو سەعاتەدا ئەسمەر خۆی بە عەبایەکەوە پێچابوو و وەك شێت بەرەو بابولشەرقی رای دەکرد. پیرەمێردێکی جوولەکەی لە خواترس و چاکەخواز لە مالێکی هەژارانە و مت بوو لە گەڕەکێکی میللی لە گەڕەکە هەژارنشینەکانی بەغدا لەسەر کورسییەك دانیشتبوو. ریشە چەرمووەکەی لەوە بوو بگاتە حەناس کتێبی سروودەکانی بەردەمی، پیاوەکە نوقمی نێو خوێندنەوەی سروودەکان بووبوو، خۆی لە ئاسمانەکانی خودا ون کردبوو. دەیویست بە نوێژ و پارانەوە خۆی لە تووڕەیی خودا بپارێزێت. شلۆمۆ کەتانی لە مالی حاخام میخائیل بوو، لێ گیان و بیری لە مالەکەی خۆی لە کەڕادە بوو و لە

ئەسمەری دەپرسی، ئەسمەریش لە بابولشەرقی تێپەڕی بوو و بەرەو (چایخانەی عارەب)و لەوێوە بۆ بابولشێخ دەڕۆیشت. مریەم بە تەنها لە ماڵەباوان واق وڕماو و دڵشکاو و شڵەژاو پێشبینی کارەساتێکی مسۆگەر دەکات، سەیون لە ماڵەکەی خۆی لەنێو منداڵەکانی و ژنەکەیەتی و دوورە لە شانۆی ڕووداوەکان و دانی بە خۆدا گرتووە و ئومێدەواری پێشهاتی باشە، سەلمانیش لەوپەڕی ئۆقیانووسەوە کلکە هەواڵ وەردەگرێت و بایەخێکی ئەوتۆیان پێنادات. مەردخای حای لە ئارامگای ناحوم ئەلقووشی، لە ئەلقووشی دوورەوە دەپارێتەوە و چاودێری کۆتایی ڕووداوەکان دەکات بێ ئەوەی شتێك لە ئاکامەکانی بزانێت. پیرەمێردێکی خواپەرستیش لە ماڵێکی هەژارانەی بەغدا سروودەکانی داود دەخوێنێت، ژنێکی چاکەخوازیش لە شەقامە پڕ مەترسییەکانی بەغدا لە دەواندایە و بانگ دەکات "شلۆمۆ! شلۆمۆ!" " پیرەمێردە خواپەرستەکە و ژنە چاکەخوازەکە بە خوێنی خۆیان قوربانی دەدەن، خوێنی حەڵاڵ کراوی جوولەکەکانی بەغدا، قوربانی دەدەن و کۆتایی بە کارەساتەکە دەهێنن. کۆمەڵێ بکوژ گەمارۆی ماڵی پیرەمێردە خوارپەرستەکەیان دا، ژاوە ژاوەکە بێزاری نەکرد، ئەو هەر خەریکی خوێندنەوەی دوعاکانی بوو، لە ئاسمانەکانی خوادا خۆی ون کردبوو، تەقەکردنەکە بێزاری نەکرد، بەڵام هەستی بە نزیکبوونەوەی مەرگ کرد. خوێندنەوەی سرووده زەبوورییەکانی بڕی و شایەدمانی بە یەکتایی خودا دا، ئینجا بەسەر کتێبەکەیدا دارما و لە خوێنی خۆیدا گەوزا و گیانی سپارد. ئەسمەر بە عەباکەیەوە بابولشێخی بڕی و لە شەقامی غازی کە سیخناخ بوو لە بکوژان و کوژراوان، هەر ڕای دەکرد، تەواو هۆشی لەدەستدابوو، ڕای دەکرد و بانگی دەکرد "شلۆمۆ! خۆم بە قوربانت دەکەم شلۆمۆ!". ئەسمەر ئیدی گوێی بە ترس و مەرگ نەدەدا، هەوڵی نەدەدا کەسێتی خۆی بشارێتەوە، بەڵکو پەردەی لەسەر کەسێتی خۆی لادەدا و هاواری دەکرد "هاوارە جوولەکە، هاوارە شلۆمۆ!" بەجۆرە بانگی مەرگی لە خۆی دەکرد، بانگی بکوژانی دەکرد. ئەو ملی بۆ فەرمانی خودا کەچ کردبوو، تا لەگەڵ پیرەمێردە چاکەخوازەکەدا خۆی بکاتە قوربانی پاشماوەی جوولەکەکانی بەغدا.

لەناکاو خوێنڕێژان دەوریان دا "جوولەکەیە! جوولەکەیـە!" خەنجـەرەکانیان لەبـەر تیشکی خۆرەکەدا دەدرەوشایەوە، چاوەکانی ئەسمەریش بە فرمێسك دەدرەوشـانەوە. ئـەو نکۆڵی لە جوولەکە بوونی خۆی ناکـات، بـەڵکو بـە هـاوارێکی شـێتانەوە ئاشـکرای دەکات، یەکەم لێدانی خەنجەری بەرکـەوت و بـانگی کـرد "شـلۆمۆ"! دووەم لێـدانی بەرکەوت و قیژاندی "شلۆمۆ!"، سێیەم لێدان بەر دڵـی ئەسمـەر کـەوت و جریوانـدی "شلۆ..." بەر لەوەی تەواوی بکات لە هەناوی مـەرگدا ون بوو.

***

ئەی رۆژگار بەسـە! هـەواڵی مـەرگی هێـژا و خۆشەویـست "دایکـی منـداڵان"ت پێڕاگەیاندم. لێگەڕێ با یەکێکی لەپێشتر و شایانتر لە جیاتی تۆ گەرووی پڕ لە گریان بێت. هەمیشە و هەتا هەتایە فرمێسکی بۆ بڕێژێت و بـۆی بگـری. ئـەوەتا بـە چـاوی وشککردووی دێتەوە و فرمێسك دەڕێژێت، بەڵام ئەو ئەمە دووەم جارە و جاری سـێیەمی بەدوادا نایات. ئەوە کە خۆی دووبارە دەکاتەوە و خودی خـۆی لەگـەڵ یـادەوەری ئێـستا دێنێتەوە، ئەسمەری دایکی منداڵان، ئەسمەرێك هەر لـە منـداڵیدا قۆچـی قوربـانی بـە هەموو هەستییەوە خۆی بە قوربانم کرد، بە خشڵەکانی، ئینجـا ئەسمـەر بـەو هـەموو شتەی کە کردی نەوەستا، لە پێناو مندا گیانفیدایی بکات و فیداکارییەکەی کۆتـایی بێت، ئەسمەر تەنها لە پێناو منـدا فیـداکاری نـەکرد، بـەڵکو بـە خوێنـە پاکەکـەی قوربانی بۆ هەموو جولەکەی بەغدا دا. ئەمەشم لەوەوە زانی پاش سـاڵانێك چـاوم بـە مـەردخای حای پیر جێبوری ئارامگـای نـاحوم پێغەمبـەر لـە ئـەلقووش کـەوت، بـۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەرە سەروەرەکەی ئێوارەی جەژن و (تاڵان کردن) بۆی باسـکردووە و وتوویەتی پیرەمێردێکی خواناس و ژنێکی چاکەخواز بە فیداکاری خۆیان کۆتاییـان بـە کاروانی قوربانییان هێناوە. پیرەمێردە خواناسـەکەم نەناسـی، بـەڵام بێگومـان ژنەکـە ئەسمەر بوو.

کاتێك ئەسمەر لـە شـەقامەکە بـەر خەنجـەر درا هەسـتم بـە کـسپەی دڵـم کـرد. گەرداوەکە نیشتەوە، بەڵام دڵنیا بووم هەستەوەریم لە نادیـار بـەهێزتر بـوو. بڕیـارم دا بڕۆم، بەڵام حاخام میخایل و هاوڕێکانم ڕێیان نەدام. بە سرووشی هەستەوەری خۆم زانیم

کە من کاتەکەم لە دەست داوە و کاتە بە شوومی ئاوسەکە تێپەڕیوە. ئینجا برادەرێکی موسڵمانم عەباس قەرەغولی بە بنەچە کورد و یەکێك لە برایانی کاری بازاڕ لە دەرگای داین. دەستبەجێ زانیم بە دوای مندا هاتووە. هەر ئەو کاتە لە هەستەوەرییەکەی خۆم دڵنیابووم. عەباس تەماشای کردم، منیش لە سیمایدا هەموو شتێکم خوێندەوە بێدەنگییەکەی لە هەموو پەیڤی دنیا پڕ ماناتر بوو، ئەو عەسرەی لە چاوانیدا قەتیس بووبوو چڕ بوونەوەی شیلەی ڕوحێکی غەمگین بوو، کاتێك زمانی کرایەوە وتی:

ــ باوکی سەلمان، هەستە لەگەڵمدا وەرە.

کۆمەڵە خەڵکەکە تێکڕا لاڵ بوون. هەموو هەستیان کرد و تارمایی پێشهاتێکی خراپ هاتە بەرچاویان. پێشهات و کارەساتەکەش تەنها ئەمماڵەی نەدەگرتەوە، بە تەنها نە تێکڕای بەغدا و نە هەر عیراق بە تەنها، بەڵکو هەموو دنیای دەگرتەوە. ئەمە تووڕەیی خودا بوو لە هەموو جوولەکەی جیهان. هاوڕێکانم سەنگین و خەمبار بوون و بە بێدەنگی تەوازۆیان دەخواستەوە، بەڵام کارەساتە نادیارەکە هێشتا ئەوپەڕی قورسایی خستبووە سەریان. تەنها کەسێك من بووم دەمزانی لە عەباس قەرەغولیم پرسی:

ــ ئەسمەر؟!

سەری لەقاند و چاوی فرمێسکێکی تێزا کە ڕوحی غەمگینی هەموو دنیای لە خۆ دەگرت.

ــ هێشتا زیندووە؟

ــ بۆ ماڵ بردمانەوە و لە گیانەڵادایە. مریەم لەوێ بوو شوێنەکەتی پێ وتم. ئیدی یان بە دەنگیدا دەگەیت، یان...

بە ڕاکردن بۆی دەرچووم و چاوەڕێم نەکرد قسەکەی تەواو بکات. هیچ شتێکم بە هاوڕێکانم نەوت. قەرەغولی دوام کەوت و بانگی دەکردم، منیش بە کووچە و کۆڵاناندا هەر ڕام دەکرد. ئەسمەر، بە قوربانت بم چاوەڕێم بکە! با گوێم لە دەنگت بێت! قەرەغولی بە ئۆتۆمبیلەکەی دووم کەوتبوو. کاتێك هەستمکرد ئۆتۆمبێلەکە لە من

خێراتره، وەستام. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا سەرپێچیم لە ئەرکی جەژن کرد و سواری ئۆتۆمبێل بووم. لێ مەخابن پێش ئەوەی بگەمە ماڵەوە هەستم بە کۆستەکە کرد. هاواری مریەم دەگەیشتە ئاسمانەکانی خودا، ئەو خودایەی شەرەفی ئەوەی پێ بەخشیم ئەوە هەڵبژێرم کە لە هەموو شت لای من ئازیزترە، قۆچی قوربانی بۆ هەموو جوولەکەی بەغدا، تێکرای بەغدا لە پرسەی ماتەمینیدا بوو، شین و شەپۆڕێکی گەورە، لە هەموو بستە خاکێك هاوار و شین و شەپۆڕ بوو، لە هەموو مەترێکدا زایەڵەی مەرگ بوو. چەند حەزم دەکرد گوێم لە دوا وشەی ئەسمەر بێت؟! ئاواتەکەم نەهاتە دی. ئەسمەر شەلاڵی خوێن بوو، خوێنەکەی لەجیاتی خۆی دەدوا، هێشتا گەرموگوڕ بوو. کانیاوی فرمێسکەکانم تەقین و لە بەرانبەر لاوازی خۆم شەرمەزار بووم، چونکە فرمێسك رشتنەکەم بۆ ئەسمەر فرمێسکی هێز بوو. لە ژیانمدا لە جاریێ دووان پتر فرمێسکم نەبەخشیوە. نەك بۆ هەموو مردنێکیش، بەڵکو بۆ مەرگی ئازیزترین کەسم و لەویش بەولاوە کەسی ترم شك نەبردووە.

ئەمێستا من لە خراپترین تەمەندام، دڵم لاواز بووە و توانا و هێزی رۆژانی رابردووم نەماوە. بلاچە و خولانەوەیەك لە کاسەی سەرمدا دەگرمێنێت. هێشتا چاوەڕێی ئەم روحە کوردانەیەم کە بە سەرسەختییە کوردانەکەی مل نادات، بەڵام هۆ ئەسمەر، لەگەڵ ئەوەشدا منیش هەر بۆ لای تۆ دێم! راستە من لە دوای تۆ دایکی عەزیزەی نەفرینم خواست، بەڵام رۆژێك لە رۆژان خیانەتم لێ نەکردیت، ئیدی ئەوەی زانیت، زانیت. هۆ ئەسمەر لەو کاتەیدا روحت خەریك بوو لە شەقەی باڵی دەدا، ناوی من لەسەر زمانت بوو. دایکی عەزیزەش جگە لە نەفرەت بەرانبەر چاکە هیچ شتێکم لێ دەست ناکەوێت. ئاخر چۆن پیس لەگەڵ پاك و ئەڵماس لەگەڵ خەڵووزدا بەراورد بکەین؟!

پەنا بەخودا! پەنا بەخودا!

# بەغدا، کۆتایی ١٩٥١

دڵم چون بەغدای تاریك، سارد و سڕ و تەنهایی و چۆڵەوانییە، بڕێ جار خورپەی ئومێدێکی درەوشاوەی پێدا دێت، هەروەك خشەی پێچکەی (عارەبانەی شێلم) بەسەر زەوی قیرتاوکراوی بە باران شۆراوە لە هەناوی شەوەکەدا، دەخولێتەوە (مەشکەکەیان) ژەنیوە و پارچە کەرە چەورەکەیان لە دۆیەکە جیا کردووەتەوە. زۆربەی جوولەکەی بەغدا کۆچیان کرد. تەنانەت مریەم و سەیونیش بارگەیان پێچایەوە و بە سەلتی لەگەڵ منداڵ و هاوسەرەکانیان رۆیشتن و چارەنووسێکی دیکەیان لە ئیسرائیل هەڵبژارد و منیان لەگەڵ نەفرەتی و کچەکەیدا جێهێشت! (نووسینگەکەم) لە خان دەللەدا لە رووالەتدا هیچ نەگۆڕابوو، بەڵام کڕیارەکان گۆڕان و لەگەڵ خەڵکەکەماندا ئەوانەی بازرگانی بەغدا بوون، مامەڵەیان بە قەرز زیادی کرد. پارە لە خانەکەدا بەرەو کزی دەچوو، نائومێدی لە دەرووندا هێلانەی کرد،ماڵەکەش لەگەڵ (دایکی عەزیزە)دا بوو بە دۆزەخ. لێم مەپرسە چۆن ئەو ناجۆرییانە روویان دا، چونکە مرۆی زیرەك و تێگەیشتوو بۆ خۆی ئەوە دەدۆزێتەوە، ئیدی تەورەکە بەر سەرم کەوت و درزی پێ برد، درزێك بە درێژایی تەمەن ساڕێژ نابێتەوە. دەم شڕ و کرمێ و شەڕانگێز، من نوقمی نێو ناز و نیعمەتی دەکەم، ئەو نوقمی نێو نەفرەتم دەکات. من پەنجەکانی وەك مۆم بۆی دادەگیرسێنم و ئەو پەنجەکانی لە چاوم رادەکات و بە هەردوو دەستی رووخسارم دەکوتێتەوە و ئاواتەخوازی مردنمە. گلەییم لە خۆ کرد و وتم من پاداشتی خۆم وەردەگرم، چونکە لە دوای ئەسمەر لە ماڵەکەی خۆمدا ئافرەتێکم لە خۆگرتووە، بەڵام ئەسمەر تا لە مردنەکەیشیدا هەر بە وەفاداری مایەوە و گلەییەکی لێ نەکردم. هاتە خەونم و بۆم

دەگریا کە بە دەست (هەوێ) زیندووەکەیەوە ئازار دەچێژم و وتی "خۆزگە لە خەونەکەدا سوودت لێ دەبینم، تا لە دوای خۆم دەربارەی هاوسەری چاك راوێژێکم بۆ دەکردیت". وەناگا هاتمەوە و بەزەییم بە ئەسمەردا هاتەوە. بە چپە و لەبەر خۆوە بە هەموو بوونێکمەوە وتم "شمشێرەکە پێش خۆ سەر زەنشت کردنەکە کەوت! شمشێرەکە پێش خۆ سەرزەنشت کردنەکە کەوت!" لە ماڵەکەی خۆم هەڵدێم و بەرەو چایخانەی (حەیدەر خانە) دەڕۆم. خۆزگەم بە رابردوو! لە خانەکەدا سەرقاڵی کاری خۆم بووم و تا نیوەشەو لە نووسینگەکە دەمامەوە، لەنێو کاری تازە بووەوەدا خۆم ون دەکرد. لەوەتەی جوولەکە کۆچیان کردووە کار کز بووە و سامان و پارە چووەتە گیرفانی مامەڵەچییانەوە. هەر قەرز و هەر قەرز! ناوی ئەوانەی پێیان دەفرۆشم دەفتەری قەرزەکانی پڕ کردووەتەوە. هەزاران و هەزاران دینار! منیش لە چایخانە دووکەڵی نێرگەلە بە با دەدەم و گوێ لە قرخە قرخەکەی دەگرم. چاو دەبڕمە قەفەزی ئەو تووتییانەی کە بە بنمیچی چایخانەکەوە شۆڕ بووەتەوە. دەرگای قەفەزەکە کراوەتەوە و تووتییەکان لێوەی دێنە دەرەوە و بە زنجیرەکاندا هەڵدەزنێن. زنجیری ئاسنی ئەستوور و درێژ قەفەزەکە بە بنمیچەکەوە دەبەستێتەوە. لەمە رادەمێنم هەوڵ دەدەم پەند و مەبەستێك بدۆزمەوە، پەندیش لە هەموو جارێکدا دەگۆڕێت، ملم نایە بەر ئەم دنیایەوە و هەموو پەند و حیکمەتەکانی کۆتاییان هات. نەخێر، بەڵکو ئەمە هەڵەکە بوو، تۆیەك لەگەڵ ئەو هەموو پەندەی لەنێو سەردا کۆبووەتەوە، مادام دەژییت، هەر نەزانیت، سکی دنیاش مەشکەیەکی پڕە و لە هەموو چرکەیەکدا تووشی شتی نوێت دەکات. لە میانەی مەترسییەکانی رابردووەوە فێر بوویت، کە چارەنووس مرۆڤی تووڕ داوەتە نێو کێڵگەی مینەوە، گەرەکە مرۆڤ پێش ئەوەی هەنگاو هەڵێنیت، بزانیت چی لەژێر پێیدایە، رەنگە هەنگاوی دوایی تووشی کارەساتێکت بکات، ئێ مادام نازانیت هەنگاوی دوایی چ داوێکی بۆ ناویتەوە، گەرەکە یان لە شوێنی خۆت بمێنیتەوە، یان بێ گوێدانە مەترسی بەردەوام بەرەو پێشەوە بڕۆیت. هاوکێشەیەکە و هەردوولای ناهاوسەنگە و نێوانیان هاوسەنگ بکە. بڕوام بەو پەندە هەیە کە دەڵێت "ئەوەی لە چارەت نووسرابێت، هەر تووشت دەبێت!". کەچی راستی نەزانینت دەربارەی چارەنووسی

خۆت بە جێگیری دەمێنیتەوە، چونکە دنیا ئەو کڵاوی جادووەیە کە لە هەموو چرکەیەکدا جادووی لێ هەڵدەقوڵێت، سەرەڕای پەند و تیۆری و ئەزموون و ئەو فەلسەفەیەی بۆ ژیانت هەڵت بژاردووە، کەچی شتێك هەر لە خەیاڵتدا نییە، تووشی سەرسوڕمانت دەکات.

لەسەر تەختەیەکی چایخانەی حەیدەرخانە هەردوو پێم راکێشاوە و مارپێچی نێرگەلەکەم بە دەستەکانم گرتووە، زاریشم دووکەڵی نائومێدی و تایبەندەی نادیاری لێدەردەچێت. پارچە و پورچەی یادەوەرییەکانم رەنگی جۆراوجۆر دێننە بەرچاوم. چرکەساتەکانی لە خەون دەچن! ئا ئەمەیە پوختەی تەمەنی خەڵکی! چرکەساتەکانی خەوئاسا بە سۆزەوە یادیان دەکەیتەوە و بەزەییت پێیاندا دێتەوە، تا مەرگ دەتپێچێتەوە ئەوسا بەزەییان بە تۆدا دێتەوە و تۆ بەرەو بارەگای خودا دەڕۆیت و لەتەك ئەم خەونە داپۆشراوانەدا جەستەیەکی لەنێوچوو جێدەهێڵیت.

پوختەی هەموو ئەم شتانە لەو رۆژە شوومەدا و لە کاتێکدا لە چایخانەی حەیدەرخانە بووم لە پشت تەوێڵمەوە بلاچەیان دەدا. وا لە رابردوودا دەژیم و بێ ئاگام لە چرکەساتی داهاتووی مینرێژکراو. هەست بە سۆز و هاوکات ئێش و ئازار دەکەم، وەك ئەوەی لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا لەپ لە رێگە بکوتم، تاریکییەك تەنانەت لە گەرمەی جەنگە بێ ئامانەکەش لە سابلاخ وا نەبوو. یان لە کاتی (تالان و بڕۆکە)و ئەو کاتەی لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێیانم لە ماڵەکەی حاخام میخائیل بووم، هەروا نەبوو. لەم ساتانەدا بەرلەوەی بەزەییم بە تێکڕای شتە بەسەرچووەکاندا بێتەوە، بەزەییم بە ئەسمەردا دێتەوە، بەر لەوەی نەفرەت لە غەدر و زۆرداری دنیا بکەم، نەفرەت لە دایکی عەزیزە دەکەم. پووختەی هەموو ئەو ئەزموونانە دەهاڕمەوە و وەك گەردێك دەیبینم لەبەر (با)دا پەرش و بلاو بوویێتنەوە. بە نیمچە خەوتنێکەوە وەڵامی سڵاوی تارمایی مرۆڤێك دەدەمەوە، کە نازانم شێوەی چۆنە، ئینجا بە خێرایی هزر و شێتایەتی لە رۆخی رابردوو و داهاتوو لە خۆم دەتەکێنم و پۆلیسێك دەبینم بانگ دەکات، تووشی کتوپڕییەکی تازەی دیکە دەبم، کە لەناو زگی کڵاوە جادووییە نەفرینەکەی دنیاوە بۆم دەردەچێت.

ـــ تۆ شلۆمۆ کەتانی کوردەیت؟

من ئەوم و هەموو خەڵکی دەمناسن و ناوی خۆم بە ئاشکرا دەڵێم، هیچ شتێکیش رێم لێناگرێت کە بە شانازییەوە ناوی خۆم بڵێم، چونکە هەرگیز گوناهێکم نەکردووە، کەسێك لە بازرگانیکردن، یان پارە، یان ئابڕوو، هەڵنەخەڵەتاندووە، قەرزاریش نیم، بەڵکو خەڵکی پارەی من قەرزارن. سەرباری هەموو ئەمانە پۆلیسەکە تووشی سەرسوڕمانی کردم، چونکە بەزارێکی فەرماندارانەوە دواندمی:

ـــ خێرا هەستە و لەگەڵمدا وەرە!

دەربارەی بانگ کردنەکەم هیچ وەڵامێکم لێ دەست نەکەوت، لێ من بە خوێن ساردی ئاسایی خۆمەوە هەستام و بەگەڵی کەوتم. لە بنکەی ئاسایشی گشتی چاوم بە زۆربەی برا یەهودییە ئێرانییەکانم کەوت. زوو هەستمکرد، کە شتەکە تەنها پەیوەندی بە منەوە نییە، بەڵکو زۆر لەمە گرنگترە.

ئەوانەی لەوێ بوون هەموو لە پەژارەدا بوون. وتیان بڕیارێك بۆ راگواستنی جوولەکەکانی ئێران دەرچووە، کە بۆ ئێران رابگوازرێن. ئارامی خۆمم لەدەست دا و بەسەر ئەفسەرەکەدا هاوارم کرد:

ـــ من سی ساڵ پترە لێرەم.

بە ساردییەکەوە قسەکەی پێ بڕیم:

ـــ بەڵام تۆ دەستت لە رەگەزنامەی ئێرانی هەڵنەگرتووە، داوای رەگەزنامەی عێراقیشت نەکردووە.

ـــ منداڵەکانم عێراقین، ئایا منداڵ بەشتێکی وەکو رەگەزنامە پێش باوکی دەکەوێت؟

ـــ بۆ نا! ئیدی یان بە هۆی ژنهێنان و شووکردنیانەوە رەگەزنامەیان وەرگرتووە، یان خۆیان داوایان کردووە. ئەی ئێستا ئەوان لە کوێن؟

ـــ کۆچیان کرد، یەکێکیان بۆ ئەمریکا و دووانەکەی تر بۆ ئیسرائیل.

ئەفسەرەکە قیڕاندی:

ــ هەی ناپاکینە! ئێوە تا ئەمەن! ئەم وڵاتە باشە داڵدەی دان و ئێوەش لەقەتان لە خێر و بێرەکەی دا!

ــ بەڵام من لێرە، خزمەتی ئەم وڵاتەم کردووە کە داڵدەی داوم، بەشداری بووژانەوەی ئابووریم کردووە، دەربارەی من لە بازاڕ بۆ خۆت پرسیار بکە!

ئەفسەرەکە پتر تووڕە بوو و شیڕاندی:

ــ ئێوە لەو باوەڕەدان کە دەتوانن تێکڕای ئەم گەلە چاکەخوازە فریو بدەن؟ خێر و بێریتان خوارد و سەروەرت و سامانیتان و بۆ گەنجینەکانی خۆتان گواستەوە، ئینجا باسی ئابووری و یارمەتیدانی دەکەن؟!

سۆسەی شتێکی خراپم کرد. دەنگم نووسا... تووڕەییە کوردانەکەم قووت دایەوە.

ــ ئێ کە دەبێت هەر کۆچ بکەین، با مۆڵەتێکمان پێ بدرێ تا کارەکانمان جێبەجێ بکەین، ئەو پارانەمان کە لەلای کڕیار و بریکارەکانمانە کۆیان بکەینەوە.

قسەکەم نوکتەیەك بوو و تووڕەیی ئەفسەرەکەی ورووژاند و بە جەختەوە گوتی:

ــ هیچ شتێکتان لای ئێمە نییە. هەر ئەوەندە بەسە نزیکەی چل ساڵە داڵدەمان داون و بواری ژیانێکی تێر و تەسەلی ئەوتۆمان پێدان، کە باو و باپیرانتان لە گوندە کوردنشینە دواکەوتوو و پیسەکاندا خەونیشیان پێوە نەدی بوو.

قسەکە خەنجەرێك بوو لە دڵ درا! شتەکە هەر ئەوە نەبوو زمانی ژەهراوی و وەك شمشێر تیژ بوو، بەڵکو ئەمە رق و کینێکی رەش بوو، ئەم دووەش لە توانایاندایە هەموو دنیا بسووتێنن. خۆ ئەگەر شایانی ئەوە بووبام کە تووشیان بم، ئەوە شتەکە ئاسان بوو، بەڵام خودا شایەدە من رۆژێك بیرم لەوە نەکردووەتەوە کە بەردێك فڕێ بدەمە نێو ئەم کانییە روونەوە، کە تینوێتی شکاندووم. لەگەڵ ئەو تەنهاییەی دوای ئەسمەر، تەنانەت دوای ئەوەی زۆربەی جوولەکەکانی بەغدا کۆچیان کرد، من رۆژێ بیرم لە جێهێشتنی بەغدا نەکردووەتەوە، ئێرە وڵاتی دووەمە و لە رۆژە هەرە تاریکەکانمدا ئامێزی بۆ کردوومەتەوە و خێر و خۆشی لەدەستچووی بۆ گێڕامەوە و سەنگی پێ بەخشیومەتەوە، بەڵام ئازارەکەی من بۆ ئەسمەر جێگیرە و ئاوەزم جێناهێڵێت. ئەو لێرە

بە خاك سپێردراوە، ئیدی چۆن دەست لەو خۆشەویستییە هەڵبگرم، خۆشەویستی ئەو و هەموو ئەو شتانەی کە لەسەر ئەم خاکە پاکەدان؟

مەخابن! من لە هەوڵی خۆشەویستی و چاکەدام، کەچی زۆربەی تەمەنم لە بەگژداچوونەوەی رق و رەفتاری کێوییانەی مرۆڤدا بردەسەر، ئەو مرۆڤەی دوو جەنگی جیهانی هەڵگیرساند و بەغدای تالآن کرد و جولەکەکانی بەغدای پێش راگوێزان راوەدوونا، لە کۆتاییشدا ئەم خەنجەرە کوشندەیەی لە دڵ دا. درۆت لەگەڵدا دەکەم، گەر بڵێم خەمی سامانەکەم نییە، ئاخر رۆژگار فێری کردم سامان نرخێکی هەیە، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ئاودەستەکانی ئینگلیز و سیکە گورگە کارم کرد و ئەوەیشی بە رەنج و عارەقی بەردەوام بە دەستم هێنا... لەو ساتانەدا دڵم بۆ لە شتێك زیاتر لە بەغدا دەگریا، بۆ کارە جێگیرەکەم کە وەك درەختە گێوژە کورت و دڕکاوییەکەی ماڵەکەمان، بۆ خودی ماڵەکەمان لە کەڕادە پارەکانم، بۆ ئەو هاورێیانەی لە بەغدا مابوونەوە، دواجار گۆڕەکەی ئەسمەر، بە ئەمەکترین کەس کە لەم دنیایەدا بۆم بە ئەمەك بوون. لە ماڵەکەی خۆمدا پارەم بۆ کاتی پێویست کۆدەکردەوە، کە دەگەیشتە چارەکی ئەوەی کە لە بەغدا هەمبوو. دایکی عەزیزەش ئەسمەر نییە، چونکە لەسەر فلسێك هەزار ئاژاوە دروست دەکات، خشڵەکانی ئەسمەریش نابنە هی دایکی عەزیزە، من باش دەمزانی کە وەفاداریم بە غەدر و دڵپاکی بە خۆپەرستی و پاکیم بە پیسی گۆڕییەوە، هەرچی شتێکی دایکی منداڵان هەبوو، هەموویم لە دایکی عەزیزە شاردەوە، نزیکەی هەزار دینارم لێی شاردەوە، بۆ رۆژێکی ئاوهام دانابوو، بەڵێ لەم کاتەدا دڵ خوێنی لێ دەچۆڕا، بەڵام خامۆش نەبووەوە. من لەگەڵ ستەمی رۆژگار راهاتم، ئەوا بەرەو زێدی خۆم دەمگێڕنەوە. لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵگارێك بەسەر راگوێزانماندا، لەوێ هیوایەك هەیە و دڵ پێی خۆشە، هەرچەندە لەوێش هیچ شتێك وەك خۆی نەماوە، رۆژێکیش هەر دێت بەرەو ماڵی دووەمم، بۆ بەغدا بگەڕێمەوە، بەغدای سەرچاوەی هات و فەڕی دووەمم و داڵدەگام.

لە خەیاڵ رۆیشتنەکەم وەئاگا هاتم، نووسینگەکەم لە خان دەللە جێهێشتبوو، کەلوپەلەکانم و هاورێیانمان و ماڵەکەم و گۆڕی ئازیز و خۆشەویستەکەم لێ جێمابوون.

بواریان داین بچینە نێو ماڵەکانی خۆمان و چیمان گەرەکە بیبەین. پاسەکانمان لێ پڕ کرابوون. دایکی عەزیز کچەکەی بە باوەشەوە بوو، هەر ترمە و بۆڵەی بوو، زمانی چون هەڕە بەبێ وەستان هەر دەهات و دەچوو، جنێوی دەدا و نەفرەتی دەباراند، زمانێک لە داواکردنی خراپەکاری کول نەدەبوو، منیش تاقەکەسێکم بانگم دەکات، من سەرکەوتوو نەبووم و لە حەناس ڕەتکردنەوەی بڕیاری ڕاگواستن بێدەسەڵات بووم. لەو دەمەیدا کە سواری پاسەکە دەبووم دڵم پێی دەوتم کە گوێ بە سەروەت و سامانەکەم نەدەم. کەواتە ئاوهاش من لە بەرچاوی دایکی عەزیزە شایانی ژیان نەبووم. من لە چاوی ئەودا بە بێ سامانی زۆر تەنها مووررووی چاوەزار بووم و لە شەڕانگێزی دنیا دەم پاراست. بە پێی یاساکەی دایکی عەزیزە ئاوها من مەحکومی مەرگ بووم. سەرم دەخولایەوە و کاروانەکە بەرەو ئێرانی دەبردین. هەندێك کەس هەبوون بۆ ئێران و ئیسرائیل پێش ئێمە کەوتن، هەموو هەژارانی وەك حاخام میخائیل، پێش ئێمە کەوتن، هەروەها لاوانی بە پەرۆش بۆ بیرۆکەی دەوڵەتی ئیسرائیل، یان ئەو لاوانەی تا ئەو کاتە و ئێستاش برینی (تالان) لە دڵیاندا ساڕێژ نەبووبوو، پێش ئێمە کەوتن. ئەوانەی لەناو پاسەکەدا بووین بە زۆری بازرگان بووین. هەندێك لەو هاوڕێیانەم بینی لە دوای سابلاخ بۆ جاری دووەم هەموو شتێکی لەدەست دابوو. ئەوانە متمانەیان بە دنیا و بە دەسەڵاتداران هەبوو، ئەوانە پەندێکیان وەرنەگرتبوو، بەڵام من، منی شلۆمۆ کەتانی کوردە، سەرەڕای زەبری ئەو خەنجەرە کوشندەیە و ئەو خوێن بەربوونە بەردەوامەش هەر پێکەنیم، چونکە هیچ کۆست کەوتنێکم بە قەد کۆستی مردنی ئەسمەرم تووش نابێتەوە، هەروەها کۆستی وەك مردنی ئیستیر و هەردوو جگەرگۆشەکەمیش لە سابلاخ تووش نابێتەوە، ئەمێستا کانیاوی فرمێسکم ناتەقێتەوە، وەك چۆن لەو دوو کۆستکەوتنەدا تەقییەوە، ئیدی تا دنیا دنیایە دوای ئەو دوو کۆست کەوتنە ناتەقێتەوە.

ئێستا کاروانی دەرکراوان بەرەو ئێران ڕێگەی خۆی گرتووتە بەر و تا دێت لە زۆر شتی ئازیز دوور دەکەوێتەوە، لێ دایکی عەزیزەی منجە منج کەر تەنانەت لەنێو پاسە خێراکەشدا، تا لەناو ئێرانیشدا هەر دەگرمێنێت، ئەو دزێوترین شتێکە کە لە ژیانمدا

هەڵم بژاردووە. لەو شتانەی هەستی پێدەکەم بەربەستێك پێکەنینەکەم، غەمەکانم، سۆزم، بیری ئایندەی نادیارم، لێدەشێوێنێت. تەنانەت سەرباری هەموو ئەمانە و لەم (هەڵوێستە)دا، کە خۆم هەڵمنەبژاردووە، دۆخەکەم لێ ئاڵۆز دەکات، هەڵوێستێك کە تێی توورِدراوم، هەروەك چۆن لە رابردوودا توورِدراومەتە نێو لەمە ترسناکتر و ئاڵۆزتر. دایکی عەزیزە تەنانەت لەم هەڵوێستەشدا بێبەشم دەکات و بوارم نادات، کە تامی ئەم ئەزموونە نوێیەی تر بچێژم. گوێچکەکانم پڕ لە وڕێنەی گێلانە دەکات و تاجی زۆربڵێیی و وڕێنەکردن و جنێو و نەفرەت دەخاتە سەر سەرم.

دایکی عەزیز! نەفرەتی خودات لێ بێت هۆ دایکی عەزیزە! بەڵام تۆ ئەی ئەسمەر بەزەیی خودات بەسەردا ببارێت و خودا بە بەهەشتی بەرینت شاد بکات! با روحی ئەسمەر لەم دنیایەدا ببێتە پاڵپشتم... و دایکی عەزیزەش!

# تاران ١٩٦١

هۆ مامە (باوکی سەلمان) چ کـاتێکی کتـوپڕ و خۆشـە! وا بـە بـێ وادە بـە یـەك دەگەینەوە، ئەوە جاری سێیەمە لە تاران دەگەینەوە یەك. ساڵگار تێدەپـەڕن و لـەناکاو لە دەرگام ــ (دەرگای خۆت) دەدەیت، لە پێشدا دێیتە ژوورەوە و منـیش پرسـیار لـە گەروومدا قەتیس دەبێت، خۆشییەك تازای لەشم دەگرێتەوە، گرمە و خرمەی یـادەوەری لە نێو کاسەی سەرمدا پێکدا دەدەن. هاتنی تۆ قووڵ و پڕ مانا بوو، تۆ هەمیشە خۆت بەسەر کات و شوێندا سەپاندووە و چون ئەفسوونکارێکی شارەزا گەمـەت پێکـردوون. هەمو لای تۆ شلك و خۆشڕۆن، هەندێکجار کـە پـێم دەگـەیت رەفتـارت خـۆت ئاسـا کوردانەیە، ئەو دەمەی ململانێت لەگەڵ خـوادا دەکـرد، هـەر لـە ژوورەکـەی خـۆم و رووبەڕووی خۆم جنێوت پێدەدام، بە هۆی جگەرەکێشانەوە لـە رۆژی شـەممەدا، جنێـوت پێدەدام. رۆژەکە شەممە بوو، سەرما و بەستەڵەك بوو، خۆت بەسەر سـۆبا نەوتییەکـەدا دابوو، دایکەکەش لە گەرماوی بە پشکۆی دار گەرم کراو بـوو، کـچەش پرچـی وشـك دەکردەوە، گوێت بەوە نەدەدا کە عەزیزە و دایکی عەزیزە خەریکی چین! هـەر ئەمەشـە خەوشی تۆ، بەردەوام لە ئەڵهای فراوانخوازی خۆتدایت، بەڵام تۆ کاتێـك پـێش سـاڵێك خـۆت و عـەزیزە و دایکـی عـەزیزەت کـۆکردەوە و بـەرەو ئیـسرائیل کۆچـتان کـرد. هەستمکرد تۆم لەدەست داوە و تۆم کەمە. من تـۆم خـۆش ویـستووە، ئابڕوومەنـدی و نەفس بەرزییەکەتم خۆش ویستووە. کە بەسـەر ئەڵهاکانتـدا زاڵـت کـردووە، هـەر لـە سۆنگەی سەنگینیتەوە لێم بووریویت. لە راسـتیدا هەڵـچوون و تووڕەبـوون لـە کاتـە جیاجیاکاندا دەگمەنە و هەندێکجار وا دەکات خۆش بێت، کاتێکیش هێور دەبوویتـەوە وەك پیشەی هەمیشەییت داوای لێبوردنت دەکرد "هـیچ بوونـەوەرێکی زینـدوو نییـە تووڕە نەبێت، ئارامی و بێدەنگی خەسێتی مردووان و بەردن." هەروەها دەت وت "بیرت

نەچێت، من کوردێکی توندە تەبیاتم". ئینجا ئەوە بوو بەبێ وادە لە دەرگات دا و هاتیتە ژووریێ و وتت:

ــ ئەمجارە من میوانی تۆم!

بیرم کەوتەوە، پێش ساڵانێك لە خانووە هاکەزاییەکەت لە (کووچە بەهار) ژوورێکم لێ بە کرێ گرتیت، ئەو خانووە رۆژهەڵاتییەی کە حەوشەیەکی کراوەی هەبوو، حەوزەکەش لە ناوەندی حەوشەکەدا بوو. لەبەرئەوەی تازە تۆم دەناسی، ئەمەش وای کردبوو کە شێوازی مامەڵەکردنمان لەگەڵ یەکتر بە ویڵ و سەنگینانە بوو. وەك کەسێکی غەریبە و نامۆسڵ بکاتەوە پێویستی بە رووکردنەوە بێت، تۆ ئەو دەست پێشخەرییەت کرد، رەنگە هۆیەکەی جیاوازی تەمەنمان بووبێت، یان لەبەرئەوە بووبێت، کە تۆ خاوەن خانوو و من کرێچی بووم. تۆ هەر خۆت بە تەنها لە ژوورێکی نهۆمی خوارەوە بەرانبەر ژوورەکەی من دەنوستیت، ژوورەکە پەنجەرەیەکی هەبوو دەیڕوانییە شەقامەکە، دایکی عەزیزە و عەزیزەش لە ژوورێکی دی لە نهۆمی دووەم بوون. دەرگای ژوورەکەت بەرانبەر دەرگای ژوورەکەی من بوو. هەموو ئێوارەیەك دەهاتیتە لام و بە قسە خۆشەکانت مەودای نێوانمانت نەدەهێشت... ئیدی یەکترمان ناسی...

سابلاخ بۆ من دنیایەکی تر و لە ریزی نەبووان بوو، یان ئەو کونە تاریکەی نێو کاسەی سەرم بوو، کە نەزانین و بێ ئاگایی و بێ ئاوەزیی لە خۆگرتبوو، کەچی تۆ رەگ و ریشەی رووداوانت لەسەری خۆتدا حەشاردابوو، رووداوگەلێکی خنکێنەر، بێگومان لە هەلێك دەگەڕایت، تا بیانگێڕیتەوە، دەزانم ئەوە بۆ تۆ بارێکی گرانە، بەڵام هاوکات شانازی و قارەمانێتی و داستان و ئەفسانەو کارەساتیشە، ئەوە پوختەیەکی (رۆنە ساغەکە)یە لە تەمەنی تۆ، ئیدی هەر لە گوڵە رەشەکەیەوە تا دەگاتە درك و بۆنە خۆشەکەی، کۆمەڵی دژەکان و شوێنی یەکگرتنەوەی رەگەزەکانی کەسێتیت کە مامەڵە لەگەڵ ئەو رووداوانە دەکات و دەکەونە بەر بواری تاقیکردنەوە، من ئەوەش باس دەکەم، کە من خۆم تاقیکردنەوەیەکی سەخت و دژواری تۆم لە دەرێی شۆڕشی ئێرەییت بۆ ئاین، دیوە، ئەرێ تۆ "روتەڵە سەرخۆشەکە"ت لەیادە؟!

* * *

لەسەر نوێنی نەخۆشی و پیری لـە قاقـای پێکـەنین دەدەم، ئـەم هەسـتی خۆشـییە شێتانەیە ختووکەم دەدات. من هـیچ شـتێك لـە یـاد ناکـەم، مەگـەر ئەوانـەی هـیچ شوێنەوارێکیان لە ژیانمدا نەهێشتووە. ئـەم رووداوە لـە میانـەی هاوڕێیەتیمانـدا وەك خشتی نێو دیوار بوو کێ دەزانێت؟ رەنگە بە بێ ئەم هاوڕێیەتییە، تەنها لە چوارچێوەی (بەیانی باش) و (چۆنی؟) و (ئەمڕۆ رۆیشتم و هاتمەوە...) تێنەپەڕی با، رەنگە منـیش بێ ئـەوە لـەلای تـۆ ئـەم بارەگرانـەم هەڵنەرشـتبا، وەك خـۆت ناویـان لـێ دەنێـت، قارەمانێتی، ئەفسانە، مەرگەسات.

تۆ گەنجێکی بێ ئەزموون بوویت، بەڵکو تـەنها مێردمنـداڵێکی ئـەو رۆژ و کاتـە بوویت. لە نێو ناسیاوەکانتدا لە تاران پیاوێکی بەغـدایی گـشت رۆژێ رووتەڵەیـەکی تاوارەی لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵەوە دەهێنایـەوە و بـە ژنەکـەی دەوت "ئـەم دامـاوەم لـە شەقامەکە دۆزیوەتەوە، وا لە برسان دەمـەداڵان دەچـێت، هەرچـییەکمان لـە خـواردن هەیە، بۆی تێ بکە، با تێر بخوات و تارمایی مرۆڤـی بـۆ بگەڕێتـەوە". لـە کاتێکـدا ئەمەت دەوت دەربارەی رەفتـاری "رووتەڵـە سەرخۆشـەکە" داوای بەخـشینت دەکـرد. دیسان وتت "جارێکیان ویستم ئەوەی ئەو هاوڕێیەم دەیکات، منیش بیکەم! لەوەش پتر رووتەڵە سەرخۆشەکە تارادەیەك هەردووکمانی دەناسی.

* * *

بۆ بیستنی ئاهەنگی گۆرانییەکانی (ئەستێرەی رۆژهەڵات)[1] رادیۆیەکم کڕیبـوو، حەزم دەکرد خەڵکی بەشداری ئەو شتانەم بن کە چێژیان لـێ دەبیـنم، پـتر لـەوەی بـە خەیاڵتدا دێت، ئاشنای بووم، لە تورکیا چەندین مـانگمان پێکەوە لە هـەمان ئوتێلـە هاکەزاییەکەدا بەسەربرد، کاتێکیش بۆ تاران هاتم داوای لێکـردم کـە ڤیـزەی هاتنـە ئێرانی بۆ بنێرم.

لەو شەوەدا بە خۆی و شووشە عارەقەکەیەوە هات، من ئەمـەم پـێ خـۆش نـەبوو، بەڵام ئەو وتی "بە بێ خواردنەوە حەزم لە بیستی ستران نییە!". پاش نـان خـواردنێکی چەوری ئێوارە، میوەم دانا و بانگم کردیت، قسە و باسی رەوتەنیتان لە نێوان خۆتانـدا کرد، باس و خواسی هەمەجۆر، بەڵام لە قسە و باسی رۆژانە تێنەپەڕی، ئینجا مۆڵەتت

خواست تا بنویت، من بە تەنها لەگەڵ (رووتەڵەی سەرخۆش) مامەوە و لەتەك ئەستێرەی رۆژهەڵاتدا رۆچووینە ناخی شەو، شەویش لەسەر ریتم و گاگۆڵێی خۆی و سەرگەرمی (رووتەڵەی سەرخۆش) سەری دەهێنایە جۆش سەندن، خەوە کوتکێش فیتووی ئاگادارکردنەوەی بۆ جەستەم لێدەدا و باوێشکم دەدا. ئیدی ئاوازەکانی رادیۆکە لەگەڵ قسە وباسەکاندا پێچرایەوە و "باوکی سەلمانیش نوست. ئادەی (رووتەڵەی سەرخۆش) رێگەی خۆت بگرە بەر و برۆ!" بە زۆر لە خۆکردنەوە دەستی بە قسە بزرکان کرد، قایلم کرد کە لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە، ئینجا بە لارە لار لە دەرگای ژوورەکە دەرم کردە دەرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەی سەرخۆش بوو، هێشتا هەندێ شتی لێك جیا دەکردەوە، بەرانبەر پەنجەرەی ژوورەکەت وەستا و بەرپەڕی دەنگی مەستانەیەوە دەستی بە نەفرەت و جنێودانت کرد، لەگەڵ هەر جنێوێکدا ناویشی دەهێنایت، ئینجا لە شەقامەکە بەردی هەڵدەگرت و لە پەنجەرەکەتی دەگرت. لەو ساتەدا لە دۆخی من هەر مەپرسە، گەر زەوی درزی بردبا و قووتی دابام هێشتا هەر کەم بوو. ئەو گوێی بە شەرم و حەیسەتی من نەدەدا، بەڵام ئایا لە سەرخۆش و شێت دەگیرێت؟ هێشتا ئەو پرسیارە تا ئێستا بەرۆکی بەرنەداوم. وا دیار بوو ئەو سەرخۆشە تیرەکانی بە وردی بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو ئاراستە دەکات، لە نێوان ئێوەدا ناکۆکی بیروڕا هەبوو، لە ناخی منیشدا ناکۆکییەك لە جۆرێکی تر کەوتە پێکدادان، ئاخۆ داڵدەدانی رووتەڵە و لێقەوماوان ئەنجامێکی ئاوها گاڵتەجاڕی لێدەکەوێتەوە؟

لەوساوە تۆم باشتر ناسی، بەتایبەتی لەو رووداوەوە، تۆ تووڕە نەبوویت، بەڵکو برادەرایەتیمان پتر بوو، ئیدی لەو ساتەوە بۆ کات بەسەربردنی ئێواران دەستت بە خوێندنەوەی ئەو برە شیعرانە کرد، کە دەربارەی مێژووی دنیا و مێژووی خۆت بۆت دەخوێندمەوە.

***

بە شەوانی سارد و سەرمای زستانی تاران ناو بەناو بۆ لام دەهات، میوەی شەوچەرەمان چون ئاگر گەرم بوو، شەوانی هاوینی دووەم دانیشتنەکانمان نەما، هۆ کوڕەکەم کاتێك بۆ بۆمبای سەفەرم کرد، ئەو رۆژە باسی سەفەرەکە و باسی ساسۆن

دۆك و باسی وەچە و نەوەکانی داود ساسۆنم بۆ کردیت، ساڵێك خۆم ون کرد، ئینجا گەڕامەوە و خانووەکەم لە کووچە بەهار فرۆشت، بۆ ڕێ خۆشکردن بۆ کۆچکردنی خێزانەکە بەرەو ئیسرائیل، لە نهۆمی دووەمی ئەم باڵەخانەیە لە شەقامی شا بە کرێ نیشتەجێ بووم، هاتنی لەناکاوت بۆ لام وەك هاتنە لەناکاوەکەی من بوو بۆ لای تۆ، ئەوا ئێستا بەبێ ئاگادارکردنەوەیەکی پێشوەختە لە دەرگات دەدەم. بە دوای ئێمەدا گەڕانت نیشانەیەکە راستگۆیی و چۆنێتی پەیوەندیمان پیشان دەدات، بە بێ دوودڵی ئەم ژوورەم بۆ بەکرێ گرتیت و دانیشتنی شەوانەمان وەك جاری جاران گەڕایەوە دۆخی خۆی و پارچە و پورچەی ڕووداوەکان لێك دەدات کە لە نێو ئاژاوەکاندا پەرش و بڵاو بووبوونەوە... سابلاخ... مۆسکفا... تاران... بۆمبای...و بەغدا. پارچە و پورچەی یادەوەری لە ڕەگەوە هەڵکێشراون، ڕەنگە ئەوانەی لە شەو دانیشتنەکانی رابردوو باسیان کرابێت و ئێستا تەواویان بکەیت، یان لە دانیشتنی شەوانی داهاتوو ناویان بێنیتەوە، یان لە شەوی دواتر و لەم ژوورەی خۆتدا کە خۆمان بەم سۆبای (سەلاحەدین)ە گەرم دەکەینەوە، باسیان بکەیت، ڕەنگە هەروەك خۆیان لە پێچ و پەنای یادەوەری و لەبیرچوونەوەدا بمێننەوە...، ئینجا بە هۆی کۆچکردنمانەوە بەرەو ئیسرائیل ئەوەش نەما...

***

تۆ بە تەنها و بێ پێشینەی ئاگادارکردنەوە، وەك لەدایکبوونێکی کتوپڕ و مزگێنییەکی خۆش، دووبارە چی شتێك تۆی تووڕدایەوە ئەم تارانە، لێ ئەمە پرسیاری جۆراوجۆر هەڵدەگرێت، ڕەنگە ئەمە شتێك بێت لە ترس؟، بەڵام سیمای مزگێنی دەر، ئەم سیما گەش و خەنداوییەت وەك ڕۆژێکی خۆرەتاوی تاران، لە دوای زریانێکی بەفرەوە هەڵبێت. بەسەر ڕێگاوبان و درەخت و سەربانی بەفری سپی داپۆشراو هەندێك بزە دەت گرێت، ڕووخسارەکەت ترسی ڕەواندەوە و ئەمێستا تەنها سەرسوڕمان ماوەتەوە، ئا تۆ بەم پەلەیە، بە تامەزرۆیی و ئەڵهاوە بەرەو پێتەختی فارسان گەڕایتەوە؟

یان سەرباری خۆڕاگری و بەهێزی و ئارامی و سەرسەختی خۆتدا لەوێ بێزار بوویت؟ ئەی عەزیزە و دایکی عەزیزەت لەگەڵ خۆتدا نەهێناون... ئەوە لەبەرچییە؟

وەك هەمیشە پێکەنیت و لە پێکەنینەکەترا پرۆژەی سەرکەشییەکی وا دەرکەوت کە دوای ئەوەی پێت ناوەتە نێو دەرگای پیری و بە ساڵەوەچوونیشت هەر لێی وەڕس نەبوویت، ئینجا رووت تێکردم و مینێکی سەرسوڕمانت بەروومدا تەقاندەوە:

ــ بەرەو بەغدا دەگەڕێمەوە!

زێدی یەکەمم و زێدی دووەمت! ئێ کێ ئەڵهای زێدی خۆی ناکات؟ چەندین جار سەردانی زێدی یەکەمت کرد. وتت ئەو سابلاخی ئازیز ــ قێزەونە، گەورە و فراوانتر بووە، پەلی هاویشتووە و بڵاوبووەتەوە و جلە کۆن و دڕاوەکەی گۆڕیوە، شوێنەواری کارەساتە گێلانەکەی رابردووی پێوە دیار نییە، تەنانەت ناوەکەیشی گۆڕاوە و بووە بە مهاباد. شوێنەواری هەندێك لە برادەران و برایان ماوە، مندالانی برادەران و برایان هەندێکیان لێرەن، هەروەها بەغداش پەرەی سەندووە و گەورە بووە و گۆڕاوە و هەرچەندە ناو و پێست و سیما هەروەك خۆیان ماون، ئای بەغدا چەندین رۆڵەی خۆی وەدەرنا. وتت "ئێستا دۆخەکە گۆڕاوە و سەرکردەی تاقانەی بەغدا* ریزی مرۆڤ دەگرێت و مرۆڤی خۆش دەوێت و لەپای مرۆڤدا قوربانی دەدات". باسی ص. شیرازیت کرد، ئەوە بوو ئەویش وەك تۆ لەگەڵ کاروانی جوولەکە ئێرانییەکان دەرکرا و راگوێزرا. دە ساڵ گوزەرا و زەمانە بە شێوەیەکی سەیر وەرسوورا. لەسەر داواکاری (سەرکردەی تاقانە) ص. شیرازی گەڕایەوە، چونکە لەمەوبەر هاوڕێی یەکتر بوون. ئەوە بوو لە نێوان دوو هەڵبژاردندا سەرپشکی کرد، کە یەکێکیان هەڵبژێرێت، یان ئەوەتا سەروەت و سامانەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات و بڕوات، یان لە بەغدا بمێنێتەوە، دواجار سەرکردەی تاقانەی بەغدا ئامۆژگاری کردبوو، کە (باشتر وایە کۆچ بکەیت) بە هەستێکی ئەوپەڕی بە ئاگاییەوە ئەمەیشی پێ وتبوو "من راستە ئەمڕۆ لێرەم، بەڵام ناتوانم گرەنتی ئەوەت بدەمێ کە سبەینێ دوای من چ رووداو و پێشهاتێك بۆ من و رۆڵەکانی تایەفەکەت دێتە پێش و چی روودەدات".

* مەبەست لە سەرکردەی تاقانەی بەغدا (عەبدولکەریم قاسم)ە. (وەرگێڕ)

من دەربارەی شتەکە هیچ بۆچوونێکم دەرنەبڕی، منیش تۆ ئاسا پەرۆشم، بەلام لە هەناوی پەرۆشییە گوڵڕەنگی و بۆنە خۆشەکەیدا دڕکی ترس و بەزەیی دەڕوێت، چونکە دێوێك لە ئارادایە و لە دێوایەتی خۆی ناکەوێت، ئێ دۆخەکەش ئارام نییە! تۆ هەر ئەوە بوویت کە دەتوت "دنیا وەك حەوز و گەدەیەکە" ئەوەی تێیدایە کۆتایی نایات و هەموو سەرلەبەیانییەك شتێکی نوێمان پیشان دەدات، ئێ لە کاتێکدا سەرکردەی تاقانەی بەغدا لە غەدر و ستەمی بەغدا لە خۆی دڵنیا نەبێت، ئیدی چۆن دڵنیایی بەوانە دەدات کە رۆژێك لە رۆژان بە خراپترین دەرکردن لە بەغدا دەرکران؟ من بێدەنگ و تۆش سەرت سوڕماوە، تۆ بە بڕیاری خۆت هاتیتەوە و بڕیاریش لە دەست خۆتدایە، بەلام من ئەو گەواهییە دەدەم، ئەمەش یەکەم جارە تۆ لە پڕ لە بڕیارەکەت ژێوان دەبیتەوە، چونکە سەرسەختی (شلۆمۆ کوردە) بەرانبەر لۆژیك و بڕیاری دەستەجەمعی هاوڕێیان نەرم دەبێت، لە شەوەکەیدا، لە ژوورەکەم ــ ژوورەکەمان، یادەوەری زیندوو دەبنەوە و "شەهرەزادی سابلاخ" دەگەڕێتەوە و حەکایەتەکانی دەگێڕێتەوە، بەدەوری سۆپا سەلاحەدینەکەدا رووداوی رابردوو لە گۆڕیچەکانیان راست دەبنەوە و گرمەی تۆپەکان لە رابردوو لەگەڵ خرمەی تفەنگ بەرز دەبنەوەو تێکەڵی ژاوەژاوی دیکە دەبن و هاوکات تێکەڵی شڕە عارەبییەکەت دەبن، جگە لەوەش تێکەڵی زمانە کوردی و ئارامی فارسی و روسی و ئازەری و تورکی و ئەڵمانی و تەنانەت ئینگلیزیش دەبێت، خۆشەویستی ئاوێتەی رق و شێتایەتی دەستەجەمعی مرۆڤ و سەنگینی تاك و دڕندایەتی مرۆڤایەتی دەبێت، بەلام بۆنی باروت و خوێن سەر هەموو ئەمانە دەکەوێت و لووتت دەتۆزێنێتەوە.

رۆژەکان تێدەپەڕن و مانگێکی تەواوی پێدەچێت. گشت بڕیارەکانت لە چایخانەکانی تاران و یانەی بازرگانەکان لەق دەبن و دەتوێنەوە. پێیان وتیت "مادامەکی بڕوات بەرووداوەکانی سبەینێ نییە، کەواتە بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ بەغدا لەسەری خۆت دەربکە..." هەروەها وتیان "شلۆمۆ، پارە و سامان بە قوربانی سەری خۆت بێت، بەلام بۆ شەوق و ئەڵهاکەت، چاوەڕێ بکە، تا ئەو کاتەی بەغدا هۆشی دێتەوە بەر خۆی..."، بەلام ئەسمەر... وا لە بەهەشتەکانی خودایە و گۆڕەکەی لە ناو دڵتدا هەڵکۆڵراوە و

یادی ئەو لەناختدایە، ئیدی تۆ لە بەغدا نیشتەجێ بیت، یان لە تاران، ئەو هەر لەتەکتدایە. ئەوا دوای چەندین گریسالّی دابڕان سەردانی، سابلاّخیشت کرد، رەنگە رۆژێك بێت، سەردانی بەغدایش بکەیت.

بەلّێ، لەپڕ بۆ تاران بۆ لام هاتیت، تا لەوێوە بەرەو بەغدا بگەڕێیتەوە، بەلاّم تۆ لای من هەگبەی بیرەوەریت هەلّڕشت...، ئینجا بەرەو رەمات کان گەڕایتەوە!

# ڕەمات کان کۆتایی ١٩٥٨

لەم دڵە پشوو سوار و بێ بڕستەوە بەخێرهاتننت دەکەم! لەم دڵە جێگیر و خۆراگر و قایمەوە، لەم کۆگای مێژووەوە، کە مێژووی من و هەندێك لە مێژووی مرۆڤایەتییە و بەڵگەیەکی راستەقینەی گێلی مرۆڤ و پووچی شتەکانە "پووچی هەموو پووچەکان". زانکۆی پەندەکان شلۆمۆ وتی "هەموو شتێك پووچە"، دوای ئەویش زۆر کەس ئەمەیان وتەوە "شلۆمۆ کوردە" وا دەڵێت: سبەینێ دوای ئەوەی ئەم جەستە شەکەت و ماندووە بۆ دواجار دەپژمێت و کپ دەبێتەوە، ئەم روحە بۆ خودای خۆی دەگێڕێتەوە و خامۆش دەبێت، ئینجا بیرکردنەوە و یادەوەری بێدەنگ دەبێت، پاشان مێژوو کەڕ دەبێت، سەد ساڵ پترە کە ئەم روحە لەم جەستە وشکەڵاتوودا سەرسەختی دەکات، ئیتر لە خۆڵی زەوی و لە دنیای بیرچوونەوە، دەشاردرێتەوە، کرمیش رووداوی گەورە و خەسێتی مرۆڤانە و چاکە و خەوش هەڵدەلووشێت. روحم لەتەك ئاوەزمدا بەرەو دوور کۆچ دەکەن و من رووداوەکان بۆ ئەوانە دەگێڕمەوە، کە رووداویان دروستکردووە، خۆ ئەگەر لە نێوچەوانم نووسرابێت، کە هەر دەبێت بیانگێڕمەوە، ئەوا بۆ فریشتەکانی خودا و بەهەشتییەکان، یان بۆ دۆزەخییەکانی دەگێڕمەوە، لەوەیە لەوێ بگەمە هاوڕێیانێك کە دەستی دڕندەیی و شێتایەتی مرۆڤ تیرۆری کردن، رەنگە بگەمە کوڕەکە و کچەکە و ئیستیری دایکیان، ئەوانە هێشتا منداڵ بوون و دایکیشیان ژنێکی جحێڵ بوو، هێشتا جوانییەکەی نەژاکابوو، رەنگە بگەمە حاخام ناحوم و حاخام میخائیلی برای، رەنگە ئازیزترین کەسم ئەسمەری دایکی منداڵانم ببینم. لێرە رووداوەکان دەکوژێنەوە، یان تۆ دەبیتە پاژێك لە یادەوەرییەکانم، کە بەشێکیم لە تۆوە بۆ ماوەتەوە، رۆژگاریش ئەمەی

لیّ ماوەتەوە کە لەگەڵ برِستی بیرکردنەوەدا ماون و دەیان گێرِمەوە، بەڵکو ئەوانە دەگێرِمەوە کە لێیان تێگەیشتم، ئەوانەشی لە نێو جەنجاڵی رووداوەکاندا ون بوون.

رۆژگار ئەمە بەر بای گوێچکەگەلێکی کەرِدا دەدات، لە ئەنجامدا شتەکان لەنێو دەچن. "پووچی هەموو پووچەکان". هەموو شتەکان و ئەنجامیش هەر لای خودای من و خودای تۆیە. لێرەدا رۆژگار پەردەی خولێنی خۆی بەسەر مرۆڤێکدا دەدات هیچ شتێکی لیّ نامێنێتەوە تەنها کێلێکی داتاشراو لە پارچە مەرِمەرِێك نەبێت. وەچە و نەوە، درورد و نەفرەت بۆ کاتێك "هەموو شتێك پووچە"، کێل و نەوە نامێنن، درورد و نەفرەت بێدەنگ دەبن، چەرخ دەسوورِێتەوە و نەوە دوای نەوە دێن، فیرعەونێك دێت و یوسف ناناسێت، بیرچوونەوە دەچێتە پاڵ یادەوەرییەکانی رۆژگار، هیچ شتێك نامێنێت تەنها ئەو شتانە نەبێت کە دەستکردی یادەوەری مێژووی چەرخە کۆنەکانن. یوسف و شلۆمۆ و فیرعەون و هامان و زانایان و هونەرمەندان و ئەوانەی شتێکیان داهێنا و شوێن دەستیان بەسەر تەوێڵی دنیاوە جێهێشت، دەی تۆز و گەردی رۆژەکان و تەونی چنراوی جۆلاییکەرەی سەر کاتە کەڵەکەبووەکانی کۆن بدوێنە.

لێرەو لەویّ، ئارەزووی ئەویّ دەکەم و دەستەکانم بێرەوە گیر کردووە. ئەوەتا لەتەك مەترسییە ئەفسانەییەکاندا کە ئەوەندە تەرِ و تازەن و ئەمێستا لەگەڵیاندا دەژیم و هەر دەڵێیت لە ئێستای مێژوودا ئازاریان پێوە دەچێژم ـــ هەست دەکەم لەوەوە ژیانی خۆم دروست کردووە و بڵێسەی رووناکی تەمەنم وەرگرتووە، چون نۆرە ئازارێکی تیژی کاکیلە بەرچاوم تاریك دەکات، یان فرِێکی ئەکسیری بەلەزەتە و نازانم چییە و چۆنە. هەڵقوڵینی سۆزێکی بێ شنگ پەلاماری ئەم جەستە وشك و دارِماوەم دەدات، شەپۆلی ئارەزوویەکی تر بۆ دیداری خودا و خۆشەویستانم و ئەوانەی پێش من ماڵئاواییان کرد، هانم دەدات. وا ئێستا هەست دەکەم کە من خۆم داوەتە دەست چارەنووسەوە، وادە و پەیمانێکیش نەماوە، جێبەجێی بکەم، یان هەڵیبژێرم، ویستێکی خۆراگریش نەماوە، تا سووربوون و توانام جێبەجێی بکات، تەنانەت زمانیشم بۆ خوێندنەوەی لاپەرِە شاراوەکانی نێو سەر، بە دەنگمەوە نایات، هەروەها لاپەرِەکانیش زەرد هەڵگەرِاون و پیتەکانی سردراونەتەوە، چراکە لەویّ کوژاوەتەوە، رووناکییەکی زەردباو لەبەردەمم

دەدرەوشێتەوە. هەستدەکەم من نوقم دەبم و ئینجا ون دەبم، پاشان دەگەڕێمەوە و لەسەرێ مەلە دەکەم.

نزم دەبمەوە، ئینجا بە لەزەتێکی سووکەوە لەسەر باڵی تیشکێکی رووناك بەرز دەبمەوە. لەسەرخۆ لە هەموو رووداوێکی مەزن و هاوچەرخی جەستە بەرجەستەکەم دوور دەکەومەوە. لێی دوور دەکەومەوە و ئەو لە دوامەوەیە، ناشیرینە، ئابڕووبەرە، ترسناکە، زەبەللاحە، شیرینە، ماشووقەیە، نایابە، ناوی لەسەر زارانە، نزیکە، دوورە، لەبیرکراوە!

لەو و ئێوەش دوور دەکەومەوە، ماڵئاواییتان لێ دەکەم، لە خودام و لە مردووەکانم نزیك دەبمەوە، کە یەکەمیان ئەمەرە، ئەی خودایە! من شادمانم و خەمگینم، من کەیفسازم و کلۆڵم، ئیدی لە نێو رووناکی خودادا هەموو شتەکان دەسڕینەوە.

سابلاخ... تاران... مۆسکۆ... بەغدا... بۆمبای... رامات کان! وێستگە و جێهەڵوەستەکان، ئەوەتا من بەرەو ئامانجی ئامانجەکان هەموویان جێدەهێڵم!

دەی تا کاتی دیدار ماڵئاوا!

دایکی عەزیزە "هاواریکرد"، عەزیزە بە خوڕینەوە بانگی هەڵدا "وای باوکەڕۆ!".

من لەگەڵ رۆژگاردا لە پاڕانەوە و خەڵوەتدا بووم، بە بێدەنگی و لالی، بە کڕنۆشەوە بەرانبەر شتێکی خۆڕاگر، بە چۆکدا هاتبووین، شتێکی کوژاوە و مردوو کە رووداوەکانی رابردوو لەسەر پشتی هێڵەی کردبوو. مێژووداني منداڵیی لەسەر پشتی ئەو دەرهات. رۆژی پەسلانی مردووان نزیکەی شەست، حەفتا ساڵە لەم هەستاوە، بەلام ئەو بەرانبەر هەموو ئەمانە زەردەخەنەیەکی لەسەرخۆ و سەنگینی دەنواند و لە قاقایەکی نزمی دەدا و ئێستاش لە ڤالایی ژوورەکەدا دەنگ دەدەنەوە، کە بە شین و شەپۆری ژنان و هەناسەی مەرگ قورس بووە، هەروەها بە بیرۆکەی نێو جانتای پڕی مێژوو قورس بووە و بارگاوی بووە.

بە رۆژگارم وت: چیرۆکەکە کۆتایی هات.

رۆژگار وەلامی دامەوە: بەلکو ئێستا دەستی پێکرد.

پرسیم: چۆن؟

وتی: مریشك و هێلکە، پیاو و منداڵ، ئێستا تێگەیشتیت؟

ــ کەواتە بیگێڕەوە!

وتی:

ــ تۆ بیگێڕەوە!

ــ نەخێر، تۆ!

ــ هەر تۆ دەیگێڕیتەوە!

سەرم سوڕما، تا بە پەشۆکاوییەوە گوتم:

ــ کەواتە، لێگەڕێ با شتەکان چۆنیان پێ خۆشە ئاوها بڕوات.

دەنگی رۆژگار لەکاسەی سەرمدا دەنگی دایەوە:

ــ باشە، لێگەڕێ با شتەکان چۆنیان پێ خۆشە، با ئاوها بڕوات.

# سابلاخ

# ١٩١٤ - ١٩١٨

## (پێش زریانەکە): سابلاخ - ١٩١٤

لوتکەی چیاکان هێشتا بەفر داپۆشی بوو، کڵاوی سپی لەسەر کردووە، شنەبا لە لوتکە سەر کەشە مەیلە و سوورەکەی دا و بەسەر ماڵە گەورەدا تێپەڕی.

ئەسمەر لەبەر خۆرەتاوەکە دانیشتووە و بە نیمچە بێ ئاگاییەکەوە پرچەکانی دەهۆنێتەوە، شنەیەکی سارد لە لوتکەی شاخە سووربارەکە هەڵیکرد و بەسەر ئەمدا هات، تەزوویەکی سووکی پێدا هێنا و بوژاندییەوە و لە قووڵایی دەریای بیرکردنەوە دەریهێنا. سوارچاك و قارەمان و خۆشەویست ئەمڕۆ دەگاتەوە جێ، پێی وتبوو لە شانزەی مانگ، کە دەکاتە ڕۆژی یەکشەممە، گەر بیریشت چوو ئەوا شەوی شەممە کە (نوێژی مانگ) لە کەنیسە لەبەر ڕۆشنایی ئاسمان دەکرێت و مانگیش لە سەرەتای کەم بوونەوەدایە و ڕوو لە ناوەڕاستی ئاسمان دەکات، ئەو دەمە چاوەڕێ بکە. سبەینێ ڕۆژی یەك شەممەیە و بە یامەرتی و پەنای خودا لە نێوان نیوەڕۆ و بانگی شێوان دەگەمەوە، میرعەلی و بازرگانەکانی دیکەیشم لەگەڵدان.

ئەسمەر وەك چۆلەکەیەك دڵۆپە ئاو لە خۆی بتەکێنێت و ئینجا خۆی نوقم بکاتەوە، ئاوها ڕاپەڕی، بەڵام ئەو دووبارە خۆی لە دەریای بیرکردنەوە نوقم نەکرد، بەڵکو دەریایەك لە بەختەوەری ڕاپێچی قووڵایی خۆی کرد، ئەم سەعاتانە چۆن تێدەپەڕن و نیوەڕۆ بەسەر دەچێت و عەسر دێت! سەعاتەکانی ئەمڕۆ لە هەموو سەعاتەکانی

مانگی لێك دابڕانەکە درێژترن، هەر لەم سەفەرە بازرگانییانەی بۆ مۆسکفا، بەر لە حەوت ساڵ ئەو لە هەرەتی لاویدا بوو، کە لە یەکێك لەو سەفەرانە دەگەڕایەوە، چارەنوس وابوو لە نزیك کانییەکە چاویان بە یەکتر کەوت. ئەوسا ئەسمەر لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بوو، شەرواڵێکی گوڵ گوڵی لەبەردابوو، پرچە هۆنراوەکانی لە کاتی رۆیشتندا دەکەوتنە سەر هەردوو کەفەڵی و گۆزەکەی سەر شانی پڕ لە ئاوی سازگار بوو. شلۆمۆ ئەمی بینی، ئەمە یەکەم جار بوو، بیبینێت، ئەسمەر دوور بە دوور دەیناسی، لاوێکی شۆخ و باڵا بەرز بوو، تەمەنی خۆی لە بیست ساڵ دەدا، بەلام بەسەر چیای ناوبانگدا سەرکەوتبوو، بوو بە ناودارترین کەسی شارەکە، بازرگانی کوڕی بازرگان، خەلکی سابلاخ ئاماژەیان بۆ دەکرد و بە سەرسوڕمانەوە ناویان دەهێنا "ئەمە شلۆمۆی کوڕی کەتانی بازرگانە! خودا بیپارێزێت، تەماشای بکەن، مادام باوکی کوڕێکی وای لێکەوتووەتەوە، ئیدی نامرێت! ئەم کوڕەی لێکەوتەوە و رەنج بە خەسار نییە! کوڕێکەوەك بینایی چاوە، پیاوێکە لە هەموو پیاوانی سابلاخ هەڵکەوتوو ترە!". لە نزیك کانییەکە چاوانی ئەم و ئەسمەر یەکانگیر بوون. سەربردەکەیان پتر لە سەربردەکەی یەعقوب و راحیل دەچێت، دەستبەجێ لە چاوانی ئەسمەرەوە تیرەکە تێی تەقاند و دڵی ئەمی ئەنگاوت. شەوخوونییان بە فیڕۆ نەچوو، رۆژێك بۆ حەسرەت هەڵکێشان لەدەست نەچوو...، هەر رۆژی دوایی باوکی شلۆمۆ سەردانی باوکی ئەسمەری کرد و پێی وت "دەمەوێت ئەسمەری کچت بدەیتە شلۆمۆی کوڕم". چەند هەفتەیەکی بەسەردا رانەبرد، لە ماڵە گەورە مارەیان بڕدرا.

ئەمرۆ دەگەڕێتەوە، بەلام کات ناجوولێت، ئەڵها جۆشی سەندووە و ئارامی و خۆشییەکە هەڵدەمژن. ماڵی رێکخست، نهۆمی سەرەوە و نهۆمی خوارەوە، ژوورەکان و سەرشۆرك و تەوالێت و حەوشەکەی رێکخست. لەگەڵ قەشەنگی کارەکەریدا روویان کردە گەوڕەکە. مانگاکانی دۆشی و قەشەنگ شیاکەی ناو گەوڕەکەی کۆکردەوە و ئالیکی بە ئاژەڵەکان دا، گوێرەکە و کار و بەرخەکان شیری دایکەکانیان دەمژی، لە پایزدا گوێرەکەکان سەر دەبڕدرێن و لە گۆشتەکەیان قاورمە دروست دەکرێت و دەخرێتە نێو کوپەوە و لەژێر زەوی هەڵدەگیرێت، بەلام بەروبوومی شیرەمەنی لە کۆگادا

شوێنی دیکەی هەس، ئەو دەفرانە پڕ لە رۆنەکەرە دەکرێن و ماستەکەش هەموو رۆژێك، یان هەموو هەفتەیەك لە مەشکەدا دەژەنرێت و لە پێویست زیاد دەبێت، زیادەکە بەسەر دۆست و خزماندا دابەش دەکرێت، بەڵام هەمووی نا، هەندێك زیادە هەڵدەگیرێت و هەندێکی دیکەی دەفرۆشرێت. خێر و فەڕ لە سایەی خوداو شلۆمۆوە زۆرە، ئاخۆ کەی ئەو کاتە دێت بە دیداری شاد دەبێت و گرێی سووتانەکەی دادەمرکێتەوە؟ رووی کردە کۆگای ئازووقە، لەوێ هەرچی خودا لە خێر و بێر داوێتی بە کیسە و فەردە لەسەر یەك دانرابوون، گەنمەکوتاو، ساوەر، نیسك، ماش، برنج، ئارد و رۆن و دۆشاو و جۆرەها مرەباو خۆشاو، ئیدی هەرچی خودا لە خێر و فەڕ بە شلۆمۆی باوکی سەلمانی داوە، لەوێ هەبوو. گەڕایەوەو کەوتەوە سەر دۆخی تەڵها و شەوقەکەی. لەبەرخۆوە بە چپە نزای کرد "هۆ باوکی سەلمان، یاخوا چاومان بە گەڕانەوە و سەلامەتیت رۆشن بێتەوە".

لە هەر جۆرێك لە گەنمە کوتاو و برنج و نیسك شتێکی برد، قەشەنگیش لە هەڵگرتنی زەخیرەکان بۆ چێشتخانە یارمەتی دا، ئەمرۆ داوەتێك ساز دەدات، خوانەکە پڕ لە جۆرەها خواردن و سەوزە و میوە دەبێت، لە بەیانی زووەوە قەشەنگی نارد تا لە باخەکە میوەی تازە بهێنێت، بۆ یارمەتیدان مریەمی لەگەڵ نارد، قەشەنگ دوو جار رۆیشت، جارێکیان بۆ میوەو جارێکی دیکە بۆ سەوزەی تازەی وەرز، لە کۆگای ماڵەوەشدا میوەی وشکەوەکراو بۆ وەرزێکی دی هەبوو، جۆرەها خواردنیان لێناو لە کوڵاندن و رێکخستن بوونەوە، لێ خۆرەکە وەك ئەوەی بە شوێنەکەی خۆیەوە نووسابێت، یان بزمارێکی لەسەر داکوترابێت، نەدەبزوا، گەرەکە خۆرەکە بە خێرایی بەرەو رۆژئاوابوون بڕوات، تا رووخساری شلۆمۆ دەربکەوێت و مانگ پێش نیوە مانگ بکەوێت و رووناکی پەخش بکات، بەڵام خۆرەکە لاوازە و نەخۆشە و چەشنی کیسەڵێکی پیر داهێزراوە.

سەلمان و سەیۆن لە حوجرەی خوێندنی، حاخام ناحوم دەیوت "ئەم سەلمانە وەك ئیسفەنجە وشە و پیت و سەر و بۆر هەڵدەمژێت، بەڵام سەیۆن هێشتا بچووکە و لە بری وانە خوێندن، پەنجەی خۆی دەمژێت، باشتر وایە ساڵێکی تر لە ماڵ بمێنێتەوە، تا لە

جیاتی پەنجە مژین، شیری دایکی بخوات". دەبا (پێش ئەوەی فێـری پیتـەکانی تـەورات ببێت، با فێر بێـت بـە رەوانـی بڵێـت: باوکـە، کاکـە". بـاوکی سـەلمان وەك پیـشەی هەمیشەیی پێکەنی و بە حاخام ناحومی گوت "با لە ئامێزی تـۆدا شـیری پیتـەکانی تەورات بمژێت و ئینجا فێری نوێژکردن ببێت و بە رەوانی بخوێنێـت، ئەوسـا دەبیینیـت هەردوو وشەی "باوە و دایە" بە رەوانی گۆ دەکات. هـەر ئـەو رۆژە بینیـت چـۆن دڵـی حاخام کرایەوە و شادمان بوو، لە سیمایدا بزەیەکی رەزامەندی و شـادمانی دەرکـەوت. دەستی خستە سەر شانی شلۆمۆ و دوعای خێر و فەڕی بۆ کرد و داوای لە خـودا کـرد کە خێر و خۆشی پتر بێت. مریەمی کیژی لـە سـەیون گـەورەترە، بـەڵام هێـشتا شـیر دەخوات و لە حەوشـەی ماڵەکـە وازی دەکـات. قەشـەنگ! ئـەریٚ بـەس نـەبێت کـە کچەکەت لەگەڵ خۆتدا بۆ باخەکە برد و میوە و سەوزەت پیٚ هەڵگرت، ئەوا ئێستا لە حەوشە وازی دەکات، بێگومـان خۆی پیس دەکات، دە بیهێنە با قوومـە شـیرێك بخـوات! قەشەنگ، تۆ ئەو خودایە پێم بڵیٚ، بۆچی ئـەمڕۆ کـات وەك ئـاوی کـانوون و شـوبات بەستوویەتی!؟ ئەی بۆچی دوای ئەوەی بووم بە دایکی سـیٚ منـداڵ، ئـەمڕۆ وا هەسـت دەکەم کە رۆژی بووکێنیمە؟! ئەی بۆچـی کاتێـك خـودان و گەورەکـەت لـە سـەفەری ئەستەموڵ، یان تاران، یان مۆسکۆ دەگەڕێتەوە، هەسـت بـەم غایلانـە دەکـەم؟! هـەر کاتێکیش رۆیشتبا، دڵە خورپەی پێکەوتووە و لـە خـودا پاڕاواتـەوە، کـە بیپارێزێـت، زۆریشی لێکردووە کە نابێت خوێندنی (دوعـای رێگـا)ی لەبیربـچێت تـا لـە هـەموو پێشهاتێکی خراپ بیپارێزێت. لە سەرەتادا لە رێگەی شاخاوی و دزڵ و پەلاماری دڕندە و جەردە و رێگر، لێی دەترسا و ئارامی لەبەر دەبـڕا، تـا نەگەڕابایەتـەوە، خـەوی لـیٚ نەدەکەوت. هەموو کاتێك دوعا و نزای بۆ دەکرد تا بە سەلامەتی و بـە دەسـتکەوتەوە بۆ لای بگەڕێتەوە و داوێك لە قژەکەی کەم نەکات، دواجار لەگـەڵ سـەفەرە زۆرەکـانی راهات، ئەم راهاتنەش ترسی لە دڵ دەرکرد، بەڵام سـەفەریش هەمیـشە لـە مەترسـی بەدەر نییە و دولبەر لە رۆیشتنی دڵـدار بـۆ سـەعاتێکیش ئاسـوودە نابێـت، ئـا بـەم ئاوهایە پەژارەیەکی شـاراوەی لـە دڵـی خۆیـدا حەشـاردابوو، تـا گەیـشتە متمانـە، متمانەکەیشی لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا پتر دەبوو، چونکە گەیشتە ئەو بڕوایەی کە

شووەکەی پیاوێکی وریاو لەسەر کاری خۆی سوور و بوێرە، ئەو دەمەی لە سەفەر دەگەڕایەوە لە سۆنگەی بازرگانییەکەیەوە هەستی دەکرد شادمانی پیاوەکەی لە ماندووبوونەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت، دیارە شادمانییەکەشی بەهۆی ئەو و منداڵەکانییەوەیە، پیاوەکەی ئەوەی بیر نەدەچوو کە هێسترێکی لە دیاری و شتی دەگمەن بۆ ئەو و منداڵەکان وماڵەوە و هاوڕێیانی بار دەکرد. ئەسمەر چاوی دەگێڕا و گوێی هەڵدەخست و بۆنی دەکرد، گەڕایەوە و ئاژەڵەکانی لە گەورەکە دی و گوێی لە بۆڕە و حیلە بوو، لە حەوشەکەش قرتەقرتی مامر و قوورقەی کەڵەشێری ڕەنگین بوو. لە باخچەی حەوشەی ماڵەکەش بۆنی نێرگز و گوڵ دەهات، شلۆمۆ بەدەر لە چاولێکەری لە نزیك حەوزە بە مەرمەڕی سەوز دروست کراوەکە بڕێك گوڵی چاندبوو. دەی وت: ئەو درەختەی لە زستاندا بەفر و بەستەڵەك دەیخنکێنێت، لە بەهاردا دەیروێنێتەوە، ئێ باخەکەش دوورە دەستە و بۆ داری بەری و سەوزە و پاقلەمەنی تەرخانکراوە، هەروەها درەختی بۆندار و کاڵەك و شەمامە و نەعنای تێدایە، جا بۆ ئەوەی لەبەردەستدا بن هەندێکی لێ گوێزراونەتەوە بۆ باخچەکەی ماڵەوە و ئەسمەر بۆ خواردەمەنی بەکاریان دێنێت و وەك شتێکی پیرۆز سوودیان لێ دەبینێت. بەڵێ گەرەکە گوڵ و درەختی بۆندار لەبەر دەستدا بن، تا چاو لە بینینیان تێر بێت و هەستی بۆن کردن چێژیان لێ وەربگرێت و کونە لووت پڕ بکات، بۆنی چێشتی کولاّو و پڕ بەهارات! خۆشەویستەکەی مانگێکی تەواوە تامی خواردنیکی وای نەکردووە و هەر بە ڕێگەی دووروودرێژ و تاقەت پڕووکێنەوە بووە و بە نان و میوەی وشکەوە کراوی نێو هەگبەکەی داکەوتووە. خۆ ئەگەر کاروانەکە لە شار و شارۆچکەی سەر ڕێگا بارگەی خستبا، کە خەڵکی هاوئایینی تایەفەکەی خۆی لێ نیشتەجێ بووایە، ئەوا خواردنی حەلاڵی وەك شیر و پێکهاتەکانی، یان گۆشتی (کاشیر)ی دەخوارد. ئەو لە هەموو شتێکدا وردەکار و کارتەقەتە، هاوکات توند و نەرمیشە، بەلاّم ئەڤین لە دڵیدا کانیاوێکە و هەڵدەقوڵێت ئەسمەر لەوە دەترسێت تێیدا نوقم ببێت. ئەی خودایە کەی ئەم کاتە بەسەر دەچێت و پێش قەرەوڵ و مزگێنیدەر دەردەکەوێت؟ لە دەرگا دەدرێ، ئاخۆ ئەوە کێیە لە دەرگا دەدات؟ دڵی چون چۆلەکەیەك لە تاوستان بە دڵۆپە ئاو خۆی فێنك بکاتەوە، ئاوها

باڵەفڕییەتی، باڵەفڕێی شادمانی و بەختەوەری. ئاخۆ دەگونجێت مزگێنی هێن پێش وادەی خۆی بکەوێت و ئەمێستا بێت؟ ئەی ئایا دەکرێ کاروانەکە پێش ڕەوتی ئاسایی خۆر بەرەو ڕۆژئاوابوون بکەوێت؟ بە قەشەنگی وت کە بەرەو دەرگاکە رایدەکرد:

ـــ قەشەنگ لە شوێن خۆت بووەستە، من دەرگاکە دەکەمەوە!

بەرەو شوێنی ئاوات و مەبەست کەوتەڕێ. لێرەوە خۆشەویستی دڵ دێتە ژوورەوە، باڵا زراڤ و ناوقەد باریك و گەنم ڕەنگ، پرچە هۆنراوەکانی دەگەنە حەناس هەردوو کەفەڵی و گوڵێکی نێرگز بووەتە تاجە گوڵینەی سەر پرچە ڕەشەکەی، ڕەش و پڕ و درێژی سەر رووخسارێکی گەشی گەنم ڕەنگی مەیلە و ئەسمەر. دەرگاکە کرایەوە، ئەسمەر نائومێدییەکەی خۆی شاردەوە و بە شادمان بۆ میوانەکە خۆی پیشان دا و وتی:

ـــ فاتمە، فەرموو! وەرە ژووری!

ژنە جوانەکەی دیکە، جوانییەکەی دڵڕفێن و لە رادەبەدەرە... سپیلکانەیەك گۆنا سوورەکانی سپێتی رووخساریان نەخشاندووە، پرچ ڕەش و دوو برۆی ڕەشی ڕەژووئاسا، پەنا بە خودای ئافرێنەر! جوانەکەی فاتمە بە ئارەزووی جوانییە هێمن و شاراوەکەی ئەسمەرەوە، بۆ پیاوان سەرنجڕاکێش بوو، فاتمە هاتە ژوورەوە و لە تەنیشت هەیوانەکە هەردوو ژنەکە لەسەر تەختێك رووە و دەرگاکە دانیشتن. فاتمەش چاوەڕێی میری مێردی دەکرد.

ئەمڕۆ چاوەکان نیگایان لە دەرگا بڕی بوو، ئەم دەرگا دارینە زەبەللاحە بە نزیك بوونەوەی هاتنەوەی پیاوانی خۆشەویست، بایەخی پتر دەبێت! فاتمە وتی:

ـــ ئەسمەر، ئەوە چییە وا خۆت رازاندووەتەوە و خۆت بۆنخۆش کردووە و ئامادەی ژووانیت!

رووخساری وەك نانی بە تەنوورەوە دراو سوورهەڵگەڕا و بە چپە وتی:

ـــ هەرچەند لە سەفەر بگەڕێتەوە، واهەست دەکەم تازە زەماوەند دەکەین.

زۆرتر دیقەتی فاتمەی دا و دەنگی پێکەنینەکەی بە هەموو حەوشەکەدا بڵاوبووەوە:

ـــ ئەی تۆ چەپەڵ؟ ئەوە نییە خۆت بۆ میری خۆشەویستی دڵ رازاندووەتەوە؟

فاتمە وەك ئەوەی بۆ خۆی بدوێت، بە چپەدوو وتی:

ــ کەی دێتەوە؟ کەی دێنەوە؟

ــ بەڵکو بڵێ هەردووکیان، ئەو دوو هاوڕێیە، ئەو دوو شەریکە، کەی دێنەوە!

فاتمە بۆ چرکەساتێك لەگەڵ بیرکردنەوەکانی خۆیدا، ئاگای لە خۆ بڕا، وتەکەی ئەسمەر گێڕایەوە سەر دۆخی خۆی، وتی:

ــ شووەکەی من و شووەکەی تۆ، دوو گیانن لە یەك جەستەدا، بەڵام ئەسمەر ئەوەی من تەنها شەوق و ئەڵها نییە.

ئەسمەر بە وردی دیقەتی دا، لەسەر سیما جوان و گەشەکەی غەم و پەژارەی ناسکێکی بەدیکرد، کە راوچی بە دوویەوە بێت، خەمەکەی تێکەڵەیەك بوو لە پەرۆش و تەنگەتاوی. بە رووخسارێکی پرسیار ئامێزەوە نیگایەکی کرد، ئینجا نیگاکردنەکەی کرد بە دەنگ:

ــ فاتمە ترساندمت، پێم بڵێ چی روویداوە؟

ــ ئەسمەر ئەمە شتێکی نهێنی و شاراوەیە، ئایا نهێنییەکەت پێ بڵێم؟

ــ ژن دڵی خۆی بۆ ژن دەکاتەوە، جگە لەوەش من و تۆ بۆ یەکتر وەك دوو خوشکین.

ــ ئەسمەر، بەڵێنم پێ بدە، ئەو نهێنییەی بۆت باس دەکەم، نەیگێڕیتەوە.

ــ بەڵێنت پێدەدەم، گەر زیانی بۆ پیاوە خۆشەویستەکەم نەبێت، تەنانەت لەویشی دەشارمەوە.

ــ ئەو شتە بەقەد دووری ئاسمان و زەوی لە پیاوەکەتەوە دوورە.

ئەسمەر بە پەرۆش و سووربوونەوە پرسی:

ــ فاتمە، چی روویداوە؟

ــ ترسگەلێکن، دەمەوێت لە خۆمیان دوور بخەمەوە، کەچی رۆژ لە دوای رۆژ زیاد دەکەن.

فاتمە توانی بۆ ساتێك ئەسمەر لە دەریای ئەڵها و شەوق بێنێتە دەرێ و بیخاتە ناو دەریای حەزی خۆتێهەڵقورتان، دەریایەك پڕ لە حەزی زانین و ئاڵۆزی و سەرسوڕمان، پرسی:

ــ فاتمە ئەو شتە چییە کە دەتترسێنێت؟

فاتمە بەسەر دوودڵییەکەی خۆیدا زاڵ بوو و رووخسارە سپیلکانەکەی سوور هەڵگەڕا و شڵەژا، بۆ ئەوەی شەرمەکەی بشارێتەوە، چاوی داخست. ساتەوەختێکی پشوو سواری و تف قوتدان، تێپەڕی و ئحمێکی کرد...، دواجار:

ــ نازانم، بەڵام رەزا برای شووەکەم. وا هەستدەکەم بە تەماشاکردن تەنگەتاوم دەکات و بە بێ تەقێ کردن تێم دەڕوانێت!

ئەسمەر پتر واقی وڕما، رەزا لاوێکی هەرزەکارە و وا تازە پێرادەگات! ئەی تەنهاییش غایلە دروست دەکات، خەیاڵی ژنانیش فراوانە و سەرچاوەی ترسیان هەیە و هەندێکجار لە کانیاوی هەڵقوڵاوەوە ئاو دەخۆنەوە، وتی:

ــ رەنگە شتەکە تەنها مەزەندە بێت، دەشێت تۆ غەدر لە رەزا بکەیت...

فاتمە بە جەخت کردنەوە وتی:

ــ نا... نا، رەزا هیچ و پوچ و نیاز خراپە، شتەکە هەر تەماشاکردن نییە، برێ جار بە ئەنقەست هەوڵ دەدات خۆیم لێ بدات، بەڵکو... بەڵکو...

پاشماوەی قسەکان لە گەرووی قەتیس بوون و فرمێسك زایە نێو چاوەکانی، ئەسمەر پرسی:

ــ دایکی محەمەد، بەڵکو ئیتر چی؟

دەموچاوە گەشەکە گەردی خەمۆکی لێهەڵوەری و پتر خوێنی تێزا و سوور هەڵگەڕا...، شەرم و تەقێ و تووڕەیی نیشتنە سەر سیما جوانەکە و وتی:

ــ دوێنێ... دەستی گرتم و گوشی!

پەنا بە خوا! پەتای ترس بەرە و ناخی ئەسمەر شۆڕ بووەوە، دڵی پەرژشی وشك بوو، وا هاتە بەرچاوی دەستی بە دەستی پیاوێکی نامۆوەیە، پیاوە نامۆکەش دڕندەیەکی بەدگۆڕاو و لە بنیادەم نەچوە، بەڵکو شەیتانێکە بۆ خۆی و ئەو دەستە پاکە دەگوشێت، دەستبەجێ شلۆمۆ هاتە بەرچاو و لە ئامێزی گرت و ئەمیش خۆی خستە باوەشییەوە و لە دالدەیدا خۆی لە هەموو خراپەکارییەکی دنیا پاراست. فاتمە چاوانی ئەم بۆ هەندێك شت ترسناك دەکاتەوە، کە لەوەوبەر بە خەیاڵیشیدا نەهاتووە، دووبارە خۆی دایەوە دالدەی خۆشەویستی دڵ و بیری بە لای سۆراغ کردنیدا چوو، کەی دێتەوە،

نەی کەی دەرگە دەکرێتەوە، تا زەردەخەنە ورشە دارەکەی ئەوی لێدەرکەوێت. تا هەموو خەم و نیگەرانی دنیا و خراپەکارییەکانی بڕەوێنێتەوە؟

وتی:

ــ فاتمە، کەواتە تا مێر دێتەوە، لێرە بمێنەوە، کە هاتەوە، ئەوەی روویداوە بۆی باس بکە.

دەموچاوە زۆر سپییەکەی فاتمە دەگۆڕێت و لەپڕ وەك ئەوەی تێکەڵی زەردێنەی هێلکە بووبێت، زەرد هەڵدەگەڕێت، زەرد و سوور و هەموو رەنگەکانی تێکەڵ دەبێت.

لە رووخسارە سپییەکەی فاتمەدا ترسێکی ئاڵوگۆڕی گەرداوەکە رەنگ دەداتەوە، گەرداوەکەی ناخی شێتانە هەڵدەکات و لەگەڵ خودی خۆیدا دەکەوێتە پێکدادان. ترسەکە تا دێت گەورە دەبێت...، لەمەدا تەنها ژنەکە زەرەرمەند دەبێت. رەزا بە سەیرکردن تەنگەتاوی دەکات، دەستی دەگرێت و دەیگوشێت، بەڵام ئابڕووچوونەکە هەر بۆ ئەمە. ژنێکی مێردار دەکەوێتە نێوان دژایەتی پیاوانەوە. ئەمە پەڵەیەکە بە ناو جەرگەی ئابڕووییەوە لکاوە و چەشنی گولی بە ئابڕووی مێری مێردییەوە دەلکێت و ناچار دەبێت تەڵاقی بدات. ئەوسا کۆمەڵیش نەفرەتی لێدەکات، چونکە سەرەڕای هەموو شتێك ئەم بەرپرسیارە، خەلکی لە ترسی پەتاکە لە گولی و ئەوانەیشی تووشی گولی بوون، هەڵدێن. فاتمە ئەم غایلانەی لە ئەسمەر شاردەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە وتی:

ــ مانەوەم لای تۆ رەنگە پرسیار بورووژێنێت، بەڵام بۆ ئەوەی کە راستییەکە بە مێر بڵێم، لەوەیە کوشتاری لێ بکەوێتەوە وماڵەکەمان دەبێتە گۆمی خوێن!

با کاتی بێت و کاروانەکە بگاتەجێ، تا گەیشتنی کاروانەکە بێدەنگی باشترین چارەسەرە.

ترسێك کە خۆیشی نەیدەزانی چییە، وەك پەردەیەکی رەش نیشتە سەری، دڵی بە فاتمە سووتا، بەڵام بیرو خەیاڵی نەختێك دوور رۆیشت، لەناکاو لە هەندێك شت وەتاگاهات، کە لێوەی دیار نەبوو، یان رەنگە لە کارەساتەکەی فاتمەوە ئەمەی بیر کەوتبێتەوە، بیری بە لای ئیستیری کچی مەتتیا هۆ گۆنەدا چوو، ئەو گولە نێرگزەی تازە لە باخی سابلاخ پشکوتوو. کیژەکە لە تەمەنی پانزە ساڵیدایە و لەگەڵ ناسکاندا

لە دەشت و دەر رادەکات و لە کێڵگە و باخەکاندا لەتەك پوولە و باڵنداندا دەشنێتەوە، خودایــە! شــلۆمۆی خۆشەویــستی دڵ هــەر کاتێــك ئیــستیر ببینێــت تێیــدەڕوانێت، سەیرکردنەکانی وەك ئەوەی راوەدووی پەپوولە بنێت، ئاوهــا دووی دەکــەفێت، هەناســە هەڵدەکێشێت، لە شوێنکات دادەبڕێت، گــەر لــە دۆخــی ئاخاوتنــدا بێــت، قــسەکەی دەبڕێت، گەر لە بــاری ژنەوتنــدا بێــت، گــوێی خــۆی کــەڕ دەکــات، گــەر لــە دۆخــی زەردەخەنەدا بێت، رووخساری دەگۆڕێت و غەمگین دەبێت. زیرەکانە رازێك دەشــارێتەوە، گەر زانیبات باش بوو.

ـــ ئەسمەر بیر لە چی دەکەیتەوە؟

دەنگی فاتمە بیرە رۆیشتووەکانی بەرەو شوێنی خۆی لە هــەیوانی بەرانبــەر دەرگــای ماڵەکە گێڕایەوە، ئەسمەر هەستی بە وشکی زاری کرد و تفەکەی قووت دایەوە. بــە دەم هەستانەوە وتی:

ـــ قسەکردن خافڵاندمانی و چایم نەخستە سەر سەماوەرەکە. وا سەماوەر و قۆری و خەڵوز و شەکردانەکە دێنم، ئینجا درێژە بە قسەکانمان دەدەین و چــایەکەش لەســەرخۆ دەم دەدات.

لە ناخی ناخەوەی پەرۆشی فاتمە بوو، لــێ تەمــاشــاکردنەکەی شــلۆمۆ بــۆ ئیــستیر کونێکی لە کاسەی سەری کردەوە، تا دەهات بە پانی و بە درێژی گەورەتر دەبووەوە، تــا بوو بە تونێلێك، بەڵکو بوو بە بیرێکی قووڵی بێ ئامــان.

***

سەعاتێك دوای نیوەڕۆ پێش قەرەوڵ هات.

ئەسمەر و فاتمە هەر قسەیان دەکرد و چاوەڕوان بوون، قۆری چایەکە لەسەر هــەڵمی ئاوە کوڵاوەکەی ناو سەماوەرەکە، قوڵتی دەدا، دوو ژنەکەش پیاڵــە لــە دوای پیاڵــەیان تێدەکرد...، چاوەڕوانی و ئەڵها دەبوونەوە پاژێك لە پەنگری ناو ئەم سەماوەرە، هاوکــات ترسیش لە بن خۆڵە کەوەکەدا بوو. ئارامی لە گەیشتنەوەی دوو شــووەکەدایە، ئــارامی لەگەڵ ترسدا لە ململانێدایە، بەڵام ئاخۆ ئارامی بەردەوام دەبێت؟ دەمودوویــان کــرد و چای لەدوای چایان خواردەوە. فاتمە هەر جگەرەی دەکێشا، تا قوتووە زیوینییەکــەی کــە

نە میناى ڕەنگاوڕەنگ چنێ کرابوو، وێنەى جوانی لەسەر نەخشێنرابوو، بەتاڵ بووەوە، چاوەڕێ کردن کات درێژ دەکاتەوە، بەڵام تەمەن کورت دەکاتەوە. ئاگرى کوانووەکان کوژانەوە، هەردوو کوڕەکەش دەستیان لە خوێندن بەردا، بەڵام کەسێك مەیلی بەلای خواردندا نەدەچوو. ئەمڕۆ هیچ کەسێك دەست بۆ خواردن نابات، تا پیاوان سەردەقی زیافەتەکە نەشکێنن، گرنگ نییە نیوەڕۆژە تا ئێوارێ دوا بکەوێت، بەڵام کاروانەکە دواى سەعات یەك دەگاتە دەروازەى شارۆچکەکە، منداڵان پۆل پۆل بەناو کۆڵانەکانی سابلاخدا دێن و دەچن و هاوار دەکەن، "بازرگانەکان لە مۆسکفا گەڕانەوە!" هاوار و قیژەى منداڵەکان لەدوورەوە دەگەیشتە گوێچکەى ئەسمەر. تەماشاى ئەو سەعاتەى دەکرد، کە شلۆمۆ لە یەکێك لە سەفەرەکانی لەمەوبەرى لە مۆسکۆ بۆى هێنابوو. بە درێژایی کاتەکە هەر سەیرى دەکرد، سەعات لە یەك تێپەڕى بوو، هەوڵی دا بگات بە دڵە بێ ئۆقرەکەى کە وەك چۆلەکەیەکی بێ ئارام، هەر باڵەفرێی بوو. لە چاوترووکانێکدا هەموو شتێکی لەبیر چوو "مریەم! ئەوە تۆ لە کوێی مریەم! سەلمان! سەیون"، بەڵام فاتمە هێشتا لێرە بوو، لەدواى هەڵچوونەکەى لە بوونی فاتمە وەئاگا هات و بە شەرم و شڵەژانەوە بە چپە وتی:

ــ فاتمە، لێم مەگرە و داواى لێبوردن دەکەم، لێك دابڕان گرانە و یەکێکی وەك تۆش ئەمە دەزانێت!

ئەو مافەى بە فاتمە دا کە ئەویش لە هەمان دۆخدایە، بەڵام فاتمە وەك ئەو جۆش و خرۆشی پێوە دیار نەبوو، تەنها وشەیەك دەتوانێت هەموو شتێك روون بکاتەوە، بەڵام شەرم کردن ڕێگە لە ئەسمەر دەگرێت کە تەنانەت بۆ خودى خۆیشی بیدرکێنێت، چونکە وشەیەکی یەکجار تایبەتمەندە و پیرۆزى خۆى هەیە و ناکرێت بیدرکێنێت و تووشی شوورەییت بکات، ڕەنگە بە درکاندنی پیرۆزییەکەى لەکەدار بکات، شوێنی ئەو وشەیە نێو دڵە و بە هەست و خورپە دەیدرکێنێت، بەڵام فاتمە پێدەکەنێت...، هەستی پێکرد و وتی عاشقان لە دۆخی عاشقانەدا دەردەکەون، ئەمە عەشق و شەوقێکە کە دواى دە ساڵی دووروودرێژ و خستنەوەى منداڵ دانەمرکاوەتەوە، فاتمە بیرى لە رووخسارى شەرمێونی ئەسمەر کردەوە، "دڵ جێگاى چەند خۆشەویستی تێدا دەبێتەوە؟!" بیرى لە

خۆی کردەوە کە چۆن شووبراکەی تەنگی پێ هەڵچنیوە و دنیای لـێ تـەنگ بووەتـەوە، هەستی بە پشوو سواری کرد و بیری کردەوە "دڵ و دەروون ئاوهایە، کاتێك هەسـت بـە خۆشەویستی بکەیت، فراوان دەبێت و بە قەد هەموو دنیای لێ دێت، کاتێکیش هەست بە رق بکەیت، تەنگەبەر دەبێت و تا وای لێ دێت وەك کونی دەرزی لێدێت!"، لەگـەڵ ئەمەردا رابوو، وتی "لە ماڵەوە منداڵەکان لای دایکـی مـێن." سـێ منداڵەکـەیان محەمەد و ئەحمەد و حەمیدی بچکۆلەی تەمەن دووساڵ و نیو، ئەحمەدی حەوت ساڵان، بەڵام محەمەد کە گەورەکەیانە، پێش دوو هەفتە بووەتە هەشت ساڵان.

ــ بێگومان (پیرێژنەکە) خواردنی داونەتێ و ئەوان لە پێشوازیکردنی کاروانەکەدا پێشمان کەوتن.

قەشەنگ سەیوانی هەڵگرت و بەدەستی راستی دەستی سەلمانی گرت و بـە دەسـتی چەپیـشی دەسـتی مریـەم. هـەموو بـەرەو کانییەکـە کەوتنـەرێ. کاروانەکـە لێـرەوە تێدەپـەرێت و کـاتی ئـەوە هـاتووە دوای دابڕانێکـی زۆر چـاوی ژنـەکان بـە دیـتنی شووەکانیان روون بێتەوە.

کاروانەکـە! گەنجینەیەکـە و لـە گالیـسکە و لەسـەر پـشتی هێـستر بـارکراوە، گەنجینەیەکی مرۆیی گەنجینە و شتومەکی جۆراوجۆری هەڵگرتووە. ئەم جارە کاروانەکە درێژە و لـە بەرزاییەکـەدا چەشـنی مـارێکی خـاڵ خـاڵاوی دیـارە و لـە تووڵـە رێـی لێژاییەکەدا پێچی خواردووە. هەر دەڕوات و بەرزاییەکەی داپۆشیوە. لەگەڵ ئەوەی خێرا دەڕوات، ماندووبوونی پێوە دیارە و دەیەوێت فریای گۆڕینەوەی ئەڵها و شەوق بکـەوێت و پاشماوەی کاتەکە کورت بکاتەوە، هەرچەندە شەکەتە، بە هـەنگاوی دڵنیـایی و بـڕوا بەخۆبوونەوە رێ دەکات، رێگایەکی دووری پێچاوەتەوە و لە دوای خۆیـەوە ئاسـتەنگ و مەترسی جێهێشتووە. کاروانەکە وا گەیشتەجێ و گەیشتە بـەری رەنـج و دەسـتکەوتی تێکۆشـان، گوێدرێـژی پاسـەوانە کرێگرتـەکان هاوکـات لـە دواوە و لـە پێـشەوەی کاروانەکە دەڕۆیشتن، لە ناوەڕاستیشەوە باروبنەی بازرگانـەکان و شـتوومەکەکان بـوو. ئەمەر لە ناوەڕاستی منداڵەکانی و قەشەنگ و فاتمەیش لە ناوەندی ئـاپۆرای خـەڵکی شارۆچکەکە بوون، کە هەمووان بـۆ پێـشوازی کاروانەکـە هـاتبوون، هەنـدێکجار وا

ڕوودەدات کاتێـك بازرگانـەکان دەگەڕێنـەوە، لـەناو کاروانەکـەدا گوێدرێـژێك لـە گوێدرێژەکان خاوەنەکەی دیار نابێت، ئێ ئەمەش شتێکی دەگمەن نییە، کە یەکێك لە کاروانچییەکان لە ڕێگە بمرێت، یان بە هۆی ڕووداوێکـەوە گیـان لەدەسـت بـدات. تـا بـەجۆرە خۆشـی گەیـشتنەوەی کاروانەکـە نابێتـە مایـەی شـادمانی گـەر هـەموو چاوەڕوانکاران بە دیداری خۆشەویستانیان شاد نەبنەوە. شلۆمۆ هەمیشە بـە ئەسمـەری دەوت "خودا لەگەڵمدایە و لە چوون و هاتنەوەم لە بەلاّ ڕزگارم دەکات، هـەروەك چـۆن پـێش مـن پیاوچـاکانی ڕزگـار کـردووە و دوای منـیش ڕزگاریـان دەکـات". ڕۆژێـك تورەکەی لە کتێب و دوعا خاڵی نەبوو، کە ناوی خـودای مـەزنیان لەسـەرە، ئەمـە جگە لە پێویستییەکانی نوێژ بە هەموو جۆرەکانییـەوە، هـەروەها بـە ئەسمـەری دەوت "بڕواداریی ئەوەیە کە ڕادەستی بەزەیی و داڵدەی خـودام بکـەیت، چـونکە هـەر ئـەوە دەمپارێزێت و دەمگەیەنێتە مەرامی خۆم و بـە سـەلامەتیش دەمگەڕێنێتـەوە". ئـەم قسانەی لـە کـاتی سـەفەرە دوورو پـڕ مەترسـییەکانی کـەم کـردەوە، بـەلاّم ئـەڵها و نارەزووەکەی هەر وەك خۆی بوو، خۆشەویستیش لەدووری ئەو ناوبەناو سێبەری پەژارەی لێدەکرد و دەیپرسی "باوکی سەلمان، ئاخۆ دەبێت ئێستا چی بکەیت؟ ئایا لەش سـاغ و سەلامەتیت؟ ئەی دەبێت ئاسوودە و تێروتەسـەل بیـت؟". ئیـدی پرسـیارەکانی قـووت دەدایەوە و گازاندەی نەدەکرد، کەچـی لـەم کـاتی دیـدارەدا هەسـتەکانی لـە ناخـەوە دەتەقینەوە. ئەمێستا لەم کاتی چاوگێڕانەدا بەوپەڕی خورتییەوە هەستەکانی سەری پێ بەرز دەکەنەوە و گەردنی کێل دەبێت و نیگایـشی ڕووخساری هـەموو چـاوەڕوانکاران دەسمێت کە بۆ بینینی (ئـەژدیها ـــ کـاروان)ە درێژەکـەدا لەگـەڵ تێپـەڕبوونی هـەر چرکەیەکدا، مژوولن. تا شێوە و ڕووخسارەکان ڕوونـتر بنـوێنن. تـا کاروانەکـە نـزیکتر ببێتەوە و وردەکارییەکانی پـتر دەربکـەون، ژاوە ژاو و غەڵبەغـەڵبی پێـشوازیکارانیش زیاتر دەبێت و دەنگی منداڵانیش بەرزتر دەبێتەوە، کە سروودی پێشوازی دەچڕن. ئەسمەر لە نێو دەنگەکانەوە دەنگێکی خۆش و سازگاری دەبیست، ئیدی بوو بە چـۆلەکەیەك و لەتەك کۆمەڵە زارۆکەکەدا کەوتە سروود چڕین، مەتتیا هـۆ گۆنـە یـەکێك بـوو لـە بازرگانانی کاروانەکە و گەڕابووەوە. هەورێکی هاوینە بـەری دڵـی ئەسمـەری داپۆشـی.

خۆشی لە فاتمە، چونکە مێر بە سەلامەتی گەڕاوەتەوە و ئارامی لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە، ئەی ئەمجارە من بە چی دڵی خۆم خۆش بکەم، هەرچەندە ئەوەتا شلۆمۆی خۆشەویستی دڵیش دەگەڕێتەوە؟ بۆ یەکەم جارە ئەم پرسیارە لە خۆی دەکات. ئاخر ئەوەتا ئیستیری بچکۆلە و جوان لە پێشەوەی پێشوازیکاران وەستاوە و لەگەڵ منداڵەکاندا گۆرانی بۆ گەڕاوەکان دەچڕێت، ئاخۆ تەنها بۆ پێشوازیکردنی باوکی هاتووە؟ یان ئەمە ئیرەییە و ئەم غایلانەم بۆ دەڕازێنێتەوە و خۆشییەکەم لێ دەشێوێنێت، کە جاران دوای دابڕانێکی زۆر چێژم لێ دەبینی؟ ئەسمەر ئەوە چییە؟ ئاخر ئەوەتا نزیك دەبنەوە. هەورەکە جگە لە هەورێکی هاوینە پتر نییە و خۆری بەختەوەری لەو بەتینترە و هێندە نابات دەڕەوێتەوە، ئا ئەوە شلۆمۆیە، ئەوە مێرە و ئەوە مەتتیا هۆ و هەموو بازرگانەکانن...، کانیاوی سۆز تەقییەوە و هەڵقوڵی...، خوڕە شاراوەکەی لە پێچ و پەناکاندا گوێ کەڕ دەکات. هەستەکان، جوانییە هەڵچووەکان لە جێگەی خۆیان ڕەها دەبن، غەڵبە غەڵب دەگاتە رادەی شێتایەتی، شێتایەتییەکی بە کۆمەڵی وا عەقڵ نایگرێت، ئەسمەر دەستی هەردوو کوڕەکەی بە توندی گرتووە تا لەنێو ئاپۆراکە ون نەبن، قەشەنگ ئەوە تۆ لە کوێیت؟ مریەم تۆ لە کوێیت؟ ئەی فاتمە، تۆ های لە کوێ؟ ئەمێستا پرسیارکردن بێ سوودە، هەندێك رووبار و دەریا هەن، هەر رووبارێك ڕێژگەی خۆی هەس و هەوڵدەدات تێی برژێت، لەوێ هەموو ئاوەکان تێکەڵی یەکتر دەبن، هەموو روحەکان لە یەك بۆتەدا دەتوێنەوە.

لە دەروازەی سابلاخ توندی گەرداوەکە هێور دەبێتەوە و سۆزەکانیش جێگیر و ئارام بوونەوە. کاروانەکە بەم لاو بەولای شارۆچکەکەدا دابەش بوو، وەك هەموو جارێك ولاخەکان و گالیسکەی بە شتومەکی بازرگانی بارکراو لەگەڵ کرێگرتەکانیان پێش بازرگانەکان کەوتن...، چارەوێکان تێر ئالیك دەبن و لە بارەکانیان ڕەها دەبن. ئێمەش بە دیداری خۆشەویستان و کۆتایی لێك دابڕان شاد دەبین و لە (ماڵی دنیا جوانی ژیانە) دڵنیا دەبین. سۆزی هەڵچوو بە زمانێکی پاراو چەنەبازی ناکات، زمانیش لە هزر و ئاوەزەوە سەرچاوە ناگرێت و لە واتادا کورتبڕی دەکات. لە سەرەتادا لە کورتی دەبڕێتەوە، درێژدادڕی و وردەکاری بۆ دوای ماندوو حەسانەوە هەڵدەگرن، بۆ ئەو کاتەی

ـگەکان تیژ دەبن و جەستەکان پاك و خاوێن دەبنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا شلۆمۆ هەمیشە
ـەم کاتەدا لەسەر پشتی گوێدرێژەکەی دادەبەزی و شان بە شانی خێزانەکەی بە پیادە
ـەرەو ماڵە گەورە دەڕۆیشت. یەکە یەکە منداڵەکانی لە هەمێز کرد و باسی دیاری و
خۆشەویستی و تامەزرۆیی دیدار و زۆر شتی بۆ کردن. پرسیاری ئەم و ئەوی کرد. لە
ـێگە کاتێك خێزانە شادمانەکە بە باخەکەی خۆیاندا تێپەڕین، شلۆمۆ سەیریکرد
باخەکە وەك خۆی ماوە و پانتاییەکی فراوانی گرتووەتەوە و درەختەکانیش گوڵیان
کردبوو. لەبەر خۆوە دەڵێت: من پیاوێکی بەختەوەرم! دیقەتی ئەوانەی دا، کە بە
دووریپەوە بوون پتر هەستی بە دڵنیایی کرد و هەستی بە رەوینەوەی شەکەتی سەفەر و
ناستەنگەکانی کرد، ئیدی لەگەڵ دیداردا هەموو هیلاکی دەرچوو. سامان و منداڵ و
ژنێکی باش. گەرموگوڕی و خۆشەویستی لە هەموو لاوە دەوریان داوم و ئێ زمانیش بە
درێژایی رێگەکە تا ماڵەوە هەر خەریکی سڵاو سەندنەوەیە و دەستەکانیشم لەگەڵ
خەڵکەکەدا لە تەوقەکردندان. هەمووان سڵاو و بەخێرهاتنەوەم دەکەن. ئەی ئەسمەر!
ئەی ئەم کۆترە جوانە! ئەی خودایە دەبێت بۆ پێشوازیکردنی باوکی، یان من هاتبێت؟
ئەی بۆچی لەپڕ چاوەکانم دادەگرت؟ ئەی بۆچی رێگەکەمان یەك رێگەیە، ئێ خۆ
ئەویش بەردەوام بە تیری چاوەکانی دەمبیژێت؟ بەڵێ چاوەکانی داگرت و هەزری پەرت
بوو. هێزێکی گەورە خەیاڵەکانی پەلکێش دەکات و سەری رووە و کیژە منداڵکارەکە
وەردەچەرخێنێت...، وریابە شلۆمۆ با رەفتارەکەت ئاشکرا نەبێت! ئەوسا دەڵێن: "ئەم
شێرە کە دڵی وەك تاشە بەردی چیاکانی کوردستان سەخت و قایمە، منداڵێك
داگیریکردووە، کە تا دوێنێ گاگۆڵکێی دەکرد و میزی بە خۆیدا دەکرد!"، هەروەها
دەڵێن: "شلۆمۆ خیانەتی لە دڵسۆزی و پێکەوە ژیان کرد و هاوبەشێکی بۆ ئەسمەری
خۆشەویستە مەزنەکەی پەیدا کرد، هاوبەشێکی منداڵ و گێل و کاڵفام...". ئەی
خودایە! ئاخۆ ئەمە خۆشەویستییە؟ شەرم و تەقێ رێگەیان نەدا دان بەمەدا بنێت
ئەمە مانای هەڵەشەیی و لاوازییە، واتا خیانەتییە، ئەو شلۆمۆ کەتانییە و ئەو
کەسەیە، کە خەڵکی ئاماژە بە هۆشمەندی و سەنگینی و پیاوەتی و خۆڕاگری ئەو
دەدەن، ئەو و بکەوێتە داوی منداڵێکەوە؟ ئینجا منداڵەکەش گێل و کاڵفام بێت؟ لە

مۆسکفا دڵنیا بوو کەرتووەتە نێو داوەکەوە. لە خەیاڵیدا ئیستیر ئازیزترین کەسی تەنگەتاو دەکرد، لەوکاتانەی لە گەرمەی بیرکردنەوە بوو لەبازرگانی و سامان، ئیستیر هۆش و بیری داگیر دەکرد، لەکاتی نوێژکردن و دوعا خوێندندا، لەکاتی ئالوویر و بەدەستهێنانی دەستکەوت و تەنانەت لە کاتی نوستنیش ئەسمەر لە خەیالی ئامادە دەبوو، ئەو دەمەی لە غەریبایەتی بوو بە خەیاڵ دەیبینی ئیستیر لەگەڵ منداڵەکانی و ئەسمەردایە، بڕێکجار وا دەهاتە بەرچاوی کە ئەم منداڵە هەوڵی دەرپەڕاندنیان دەدات!

ئەو دەمەی خەریك بوو بە دیداری خانەوادەکەی شادبێت، بەر لەوەی چاو لەوان بگێڕێت، چاوی لەو دەگێڕا، شڵەژان و خەم دوو جمکانەن و لێك جیانابنەوە، هۆ ئیستیر بۆچی ئێستا هاتیت، ئەی ئەگەر ئەسمەر گومانی کرد، چی پێ بڵێم؟ کاتێکیش پرسیاری هۆی خەمبارییەکەی لێکرد، نکوولی لێکرد و بیانووی ماندووبوون و سەرقاڵی بە کاروباری بازرگانی بۆ هێنایەوە. نزیك ماڵە گەورە (ئەلماس)ی کچی عەزریای دەوڵەمەند و زێڕنگەری دراوسێیانی دی. مەکربازانە و بە خڕخاڵ و بازنەکانی خۆی هەڵدەنا بسك و پەرچەمە زێڕینەکانی شۆڕ بووبوونەوە. بە ئاوەژووی هەموو ئەوانەی لە ڕێگە تووشیان بوو، ئەلماس وەك سووکایەتی پێکردن رووی خۆی داپۆشی. شلۆمۆ هەوڵیدا وێنەی هەڵکۆڵراوی ئیستیر لەنێو کاسەی سەری و مەژگی بشارێتەوە و هەڵی بکەنێت، ئینجا لە جێگەیدا بزمارێکی تر دابکوتێت، لەمەشدا مەبەستی ئەوە بوو گومانی ئەسمەر لە خۆیدا دوور بخاتەوە، بۆیە زەردەخەنەیەکی دەستکردی نواند و بانگی ئەلماسی کرد و پرسیاری تەندروستی باوکی لێکرد، بەلام ئەلماس وەڵامی نەدایەوە و پرسیارەکەی پشتگوێ خست، بە لەنجە و لار پێی هەڵگرت و وەك قەلەموون خۆی فش کردەوە و رۆیشت و ئاوڕی نەدایەوە. شلۆمی چاوی لە رەفتارەکەی ئەلماس پۆشی و وتی:

ــ ئەلماس، لە مۆسکۆ سەعاتێکی نایابم بۆ هێناویت، جۆرێکە هەموو کچانی سابلاخ ئێرەییت پێ دەبەن!

ئەلماس بە لووت بەرزییەوەسەری بەرز کردەوە و ئاوڕی دایەوە و وتی:

ـ حەوەجەی دیاری تۆ نییم و بیخە سەر حاڵی خۆت، یان گەر دەتەوێت بیدە بە قەشەنگی کارەکەرت.

ئەسمەر بە تەرحێ تووڕە بوو گەیشتە کونەلووتی، قەشەنگیش سەرێکی بادا و لەبەرخۆوە چپەچپێکی کرد، سووکایەتییەکە باوکی سەلمانیشی تەنگەتاو کرد، بە جۆرێك وێنەی ئیستیری لە خەیاڵیدا سڕییەوە و لەبەرخۆوە بۆڵەبۆڵێکی کرد.

ـ سوێند دەخۆم، کە ڕۆژێك دێت سەری ئەم هەرزەکارە لەخۆباییە لەقوڕ دەچەقێت.

***

تا ماندوویتی نەحەسایەوە و جەستە تێر نەبوو و پاك نەکرایەوە و تۆز و گەردی سەفەری لێ هەڵنەوەری، وردەکارییەکان دەستی پێنەکرد. تەنانەت چارەوێش ئالیکی خوارد و ئاوی خواردەوە و بارەکانیان لەسەر داگیرا. عارەبانەکان کەلوپەلەکانیان لە کۆگاکان لێ بەتاڵ کرایەوە، وەك سەماوەری رووسی و کوتاڵ و قاپ و قاچاغی چینی و شتی نایاب، بەڵام باوکی سەلمان وەك ئەوەی نهێنییەکی گرنگ بۆ ئەسمەر ئاشکرا بکات، بە چپە پێی وت:

ـ ئەمجارە لە هەموو شتێك نایاب و جلوبەرگیش گرنگترم هێناوە، چل دەمانچە و چل تفەنگم بە فیشەکەوە هێناوە. دەبینیت چۆن مێشەنگ لە هەلالە دەورووکێت، خەڵکی ئاوها روو دەکەنە چەکەکان.

وەك هەموو جارێك دیارییەکان باری هێسترێك بوون، منداڵەکان و قەشەنگ بە دیارییەکانیان دڵخۆش بوون، بەڵام ئەسمەر دڵخۆش نەبوو، چونکە ئەو لە هەست و نەستی پیاوەکەیەوە خۆشی و ناخۆشی وەردەگرێت، وەك هەستی مێردەکەی دەخوێنێتەوە بەم دیدارە شادمان نییە، بەڵکو وەك جاران دوای هەموو سەفەرێك بەخۆشییەوە باسی سەفەر و ئەزموونی نوێ ناکات، ئەوەی پێوەی دیارە درزی و خەم و خەیاڵ رژیشتنە، تەنانەت زەردەخەنەکەیشی دەستکردە و هەناسە هەڵکێشانەکەی ئاشکرای دەکات، نەخێر ئەوەی لە مێردەکەیدا دەیبینێت رووخسارێکی نوێ نییە، کە لە مۆسکۆوە هێنابێتی، ئەو بەر لەوەی سەفەر بکات و لە روسیا کەلوپەلی بازرگانی بێنێت، لەم چەشنە خەمۆکییەی پێوە دیار بوو. ئەوساش لێی دەپرسی، کەچی ئەو بیانووی مژوولی

کاری بازرگانی بۆ دەهێنایەوە. چەند ساویلکە بوو تا فاتمە لە ڕێیەکی ناراستەوخۆوە چاوانی کردەوە. ئیستیر، ئەم مندالە نەفام و گێلە، ئەری ڕێی تێدەچێت هەلۆ بکەوێتە ژێر پێ و پلی چۆلەکەیەکەوە، یان چیایەکی سەرکەش بە هەلکردنی بایەك، یان فوویەك بکەوێتە لەرزە!؟ یان ئەمە گەرداو وگێژاوی سۆزە و ژیرییێژی و ئاوەز لە ڕەگەوە دەردێنێت؟ هێشتا هەر دیقەتی دەدات و شوێنەواری زەردەخەنەکەی جارانی لێ بەدی ناکات، کە نیشانەی هێز و گاڵتەکردن بوو بە شتەکان. دوای ئەو سەفەرە دووروودرێژە قسەیەکی خۆشی لێ ناژنەوێت. کوا بەختەوەری و خۆشییەکەی جاران؟ ئەسمەر شتێکی تێدا دەبینێت و پەردەپۆشی دەکات و بە بێ دەنگی دەیخواتەوە و دەبێتە ئازارێك و سوورە لەسەر ئەوەی تەنها لە ناخی خۆیدا بیهێڵێتەوە.

بەڵام هۆکار هەرچییەك بێت، ئەم بەشێکە لە شلۆمۆ و هەستەکانی، ئەو بیرێکە و بە دەست ئاوی هەستەکانی لێ هەڵدەهێنجێنێت، ئەو ئازار دەکێشێت و ئەمیش لەگەڵیدا ئازار دەکێشێت، ئەسمەر لە توانایدایە ئەو ئازارەی کە ئەم پێوەی دەتلێتەوە لەگەڵیدا بەشی بکات، ئاواتەخواز بوو هەموو ئازارەکانی ئەو بۆ خۆی هەڵمژێت و بیچێژێت، تا خەیاڵی خۆشەویستەکەی ئاسوودە بێت و چێژ لەو ئاسوودەییە وەربگرێت، بەڵام هاوبەشێکردنی لە ئازار چەشتندا بەس نییە و تەنگژەکە چارەسەر ناکات...، بەڵام چۆن چارەسەری بکات؟!

پرسیارکردن ڕاوەدووی ئەسمەری دەنا، تا هەردووکیانی لەسەر جێگەی نوستن پێکەوە کۆکردەوە، ئەو لە سەفەر گەڕاوەتەوە، هەرچەند لە سەفەریش گەڕابایەوە، دەیبینی ئەسمەر وەك نۆبووك وایە، ئەمجارە هیچ شتێك لە ئەسمەردا نەگۆڕاوە، خۆی پاك کردووەتەوە، خۆی ڕازاندووەتەوە و بۆنخۆش کردووە، بەڵام بێگومان ئەو بووکە نییە کە بە هەموو بوون و هەستەوە خۆی ڕادەستی بکات، بیر و خەیاڵی دەڕژێشتن و لەنێو جێگەی ژن و مێردایەتی نەدەمان، شلۆمۆ بە تەنیشتییەوە ڕاکشاوە و ئەم هەر ئەوەتا دەیبینێت، تەنها جەستەیەتی بە تەکییەوە ڕاکشاوە، داچڵەکی. ئاخۆ ئەم بە تەنیشت لاشەی کەسێکەوە هەڵاژاوە کە ژیانی خۆی پێ بەخشیوە؟ شلۆمۆ و ئەسمەر هەریەکەیان لە دۆڵێکی دیکە بوون، هەرچی شلۆمۆیە بەرانبەری لاوازە و ئەمیش لە چارەسەرێك

ده‌گه‌ڕێت، تا قوربانی بۆ بدات، چۆن ئه‌و روحه‌ی جاران بۆ خۆشه‌ویسته پاڵکه‌وتووه‌که‌ی ته‌نیشتی بگێڕێته‌وه، که ئێستا ئه‌و روحه‌ی نییه؟ نه قسه‌یه‌ك ده‌کات، نه ده‌بزوێت...، نه‌رێ رای بووه‌شێنێت؟!... بانگی بکات؟!...، یان به چپه‌یه‌کی گه‌رمی خۆشه‌ویستییه‌که‌ی تکای لێ بکات؟

ــ شلۆمۆ، باوکی سه‌لمان!

چپه‌دوویه‌کی به ئاسته‌می کرد، ئه‌وه‌ی به ئه‌نقه‌ست کرد تا به ئاسته‌م ده‌نگی ببیسترێت، تا دانه‌چڵه‌کێت، یان روحی نه‌ڕووشێت، یان به توندی رای بووه‌شێنێت، دیاره ئاوها ئازاری ده‌دات، له راستیدا شلۆمۆ چپه‌که‌ی ئه‌سمه‌ری نه‌ژنه‌وت، به‌ڵام ئه‌سمه‌ر گوێی له ده‌نگدانه‌وه‌ی هه‌ناسه هه‌ڵکێشانێك بوو، وای به خه‌یاڵدا هات که گوێی له هه‌ناسه هه‌ڵکێشانێکی ئازار به‌خشه...، وای به خه‌یاڵدا هات که شلۆمۆ له‌نێو توونێکدا ده‌سووتێت، به‌زه‌یی پێدا هاته‌وه و راچڵه‌کی، ریتمی چپه‌که‌ی به‌رز بووه‌وه:

ــ شلۆمۆ، ئه‌ی ئازیزترین که‌س، پێم بێژه چی ئاڵۆزی کردوویت...

ئه‌مێستا شلۆمۆ له خۆی به ئاگاهاته‌وه، خۆی وه‌رگێڕا تا رووی تێ بکات، ئاوهاش ته‌خته‌خه‌وه‌که‌ی ژێری جیڕه‌ی لێهه‌ستا، هه‌ناسه‌یه‌کی دیکه‌ی هه‌ڵکێشا، ئه‌وه‌ش نیگه‌رانی کرد، چونکه نه‌یتوانی به‌سه‌ریدا زاڵ بێت، هه‌وڵیدا که به‌ره‌و هه‌ڵدێری لاوازی غلۆر نه‌بێته‌وه، ئیدی به ئاوه‌ز و سه‌رسه‌ختی خۆی به‌ره‌نگاری بووه‌وه. چۆن به‌ره‌و ئه‌و هه‌موو هه‌ڵدێره غلۆر بووه‌ته‌وه؟ ته‌واو وه‌ئاگاهاته‌وه و ترسا، له خۆی ترسا که چۆن ئه‌و لاوازی و بێده‌سه‌ڵاتییه وه‌ك په‌تایه‌ك په‌لاماریداوه، ئه‌ی خودایه؟ چۆن له ناکاو بێ ئه‌وه‌ی به‌خۆ بزانێت دزراوه؟ ئاخر چۆن منداڵێکی گێل و نه‌فام له په‌نای ئه‌سمه‌ری هه‌ڵبڕیوه، له خۆشه‌ویسته‌که‌ی و دایکی منداڵه‌کانی و په‌ناو پشتیوانه‌که‌ی، له هه‌موو ورد و درشتێك دایده‌بڕێت؟

ــ باوکی سه‌لمان، ئه‌و شته چییه سه‌غڵه‌تت ده‌کات؟

ته‌نگه‌تاوییه‌که‌ی تا ده‌هات زۆرتر ده‌بوو، ئێ خۆ له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا رای نه‌هێناوه درۆی له‌گه‌ڵدا بکات، له‌کاتێکدا ئه‌مه وا به‌ره‌و ئه‌م خه‌سیه‌ته دزێوه پاڵی پێوه ده‌نێت. گه‌ر

بلێت "ماندووم" درۆی لەگەڵدا دەکات، گەر لەسەر درۆکردنەکەی بەردەوام بێت و بلێت "هۆیەکەی سەرقاڵ بوونە بە کارو فرمانەوە" هەر درۆ دەکات، چونکە دوای دابڕانێکی زۆر ئەمڕۆ تازە گەڕاوەتەوە بۆ لای خۆشەویستان، بە سەلامەتی و دەستکەوتەوە گەڕاوەتەوە، خۆی شۆردووە و لەو خواردنە بەلەزەتانەی خواردووە، کە ئەسمەر بۆی ئامادە کردووە، هەمووان گوڵاوپرژێنیان کردووە و خۆشەویستی و ڕێزبارانیان کردووە. ئەی چی پێ بلێت؟ درۆ بکات، یان دانی پێدا بنێت، یان بێدەنگ بێت؟ هەموو ئەم هەڵبژاردنانە مایەپووچ و بێ دەسەڵاتانەن. کەواتە ئەی زەوی، پێش ئەوەی لاوازی و خیانەتی ژن و مێردایەتی دەربکەون و کەفوکوڵی هەرزەیی و منداڵانە بکەونەروو، هەڵم لووشە.

ـ ئایا ئیستێری کچی گۆنە وای لێکردوویت؟!

بە تووندا چوو...، دوو جار بروسکە و هەورە تریشقە لێی دا، گوێی لەناوی خۆشەویستەکەی تری بوو، ئەمەش لە کێ ببیستێت؟ کەواتە نهێنییەکە ئاشکرا بوو و جێی شەرمیش دەرکەوت، ئامێری هاڕین لە نێو کاسەی سەری کەوتە کار و بیرکردنەوەکانی پچڕاند، لە ناوەوە گێژاوێك پێکداهاتن. ئاخۆ نکۆڵی لێ بکات، یان دانی پێدا بنێت، یان بێدەنگ بێت؟ ئەمەش بازنەیەکی داخراوە، وای شلۆمۆ تێداچوویت! مردیت و بڕایەوە و خودا لێت خۆش بێت!

ـ شلۆمۆ، من هاوسەر و خۆشەویستی تۆم، دڵم بۆ خەمەکانت کراوە و واڵایە، دەی ئازیزترین مێرد، خەمەکانتی تێبڕێژە!

بەڵێ نهێنییەکە ئاشکرا بوو، ئیدی لەو نهێنییە دەرچوو کە لە دڵیدا پەنگی خواردبووەوە، ئەوەش نەما کە ماوەیەك کاری لێکردبوو و چەماندبوویەوە و هاوکات هەنگوین و ژەهری لێوە دەنۆشی.

نهێنییەکە وەك تەونی پچڕاوی جاڵجاڵۆکەی لێهات، خراپەکانی دەشاردەوە و بە ئاشکرابوونی خەوشەکەش دەرکەوت و تووشی ئەم بێ دەسەڵاتییە بوو. ئەوێك شانازی بەخۆوە دەکات و خەڵکیش ڕوویان لێیەتی، کەچی بەهەموو خۆڕاگرییەوە کەوتە پلەیەکی دیکەی شەرمەزارییەوە، بەڵام فرمێسکەکەی قەتیس کرد، ئەو هەرچەندە

ـگاته رادەی ئەو بێ دەسەڵاتییەش، بەڵام فرمێسکەکانی لای ئەو لە هەموو شتێك ئازیزترە، ئەو فرمێسکی بۆ کەسێك هەڵگرتووە کە شایانی رشتنی بێت. دواجار بە دەنگێکی جوینەوە ئاسا و بە شەرمکردنێك لە خۆی و لە ئەسمەر بە چپە وتی:

ــ نازانم ئەمە چۆن روویدا، بەڵام ئەسمەر، ئەمە چارەنووسە.

ــ باوکی سەلمان، ئەرێ بە راستی خۆشت دەوێت؟

وەك یەکێك تەوازۆ بۆ ئابڕووچوونێك بێنێتەوە، وتی:

ــ وا روودەدات کە بنیادەم پێی هەڵبکەوێت، یان بکەوێت و لاقێکی بشکێت، یان ورد و خاش بێت!

ــ هەر بە راستی خۆشت دەوێت؟

ــ گەر بڵێم "بەڵێ" شەرم دەکەم، گەر بڵێم "نەخێر" درۆ دەکەم، بەڵام من بەرامبەر بە تۆ بە ئازارەوە دان بە هەڵە ئابڕووبەرەکەی خۆم و دەردەکەمدا دەنێم!

ــ باوکی سەلمان، دەرد و ئازاری تۆ ئێش بە من دەگەیەنێت!

ــ ئەسمەر، تۆ باشترین هاوسەریت، لەو هەڵدێری ئازار چەشتنە رزگارم بکە.

ئەسمەر وتی:

ــ بە دڵنیاییەوە بنوو، خەیاڵی خۆت ئاسوودە بکە، خوا پشتیوانم بێت چییم لە تواناد بێت دەیکەم.

وەك سواڵکەرێك پرسی:

ــ بە راستی کارێکی وا دەکەیت، کە لەبیرم بچێتەوە؟

ــ ئەسمەر دووبارە وتی:

ــ پێم وتیت دڵنیابە و بە ئارامی بنوو، بە یارمەتی خودای هەردووکمان سنوورێك بۆ ئازار و دەردەکەت دادەنێم.

ئەوە ئەو چارەسەرە بوو کە ئەسمەر بە دوایدا دەگەڕا و ئەوا ئێستا دۆزییەوە، ئیدی بەوپەڕی بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوانی هاتنی بەیانی کرد.

***

دوای ئەوەی لە نوێژ گەڕایەوە، تەماشای کرد ئەسمەر جلەکانی لەبەر کردووە و ئامادەی چوونە دەرەوەیە، مۆڵەتی لێ وەرگرت و وتی نیازی وایە هەندێك پێوستی بکڕێت و سەرێکیش لە ماڵی مەتتیا هۆ گۆنە بدات، کاتێك ئەم ناوەی ژنەوت تەزوویەك بە جەستەیدا هات و وتی:

ـــ مەتتیا هۆ گۆنە؟

ـــ دەمێکە ژنەکەیم نەدیوە، دوێنێ لەناو بازرگانە گەڕاوەکاندا مەتتیا هۆم بینی، وام بە باش زانی سەردانێکیان بکەم.

گەرداوێك لە کاسەی سەریدا هەستا، لێ زمانی بەسترا، تەنها ئەوەندەی وت:

ـــ بەڵێ، بەڵێ.

ئاخۆ لە ماڵی ئیستیری خۆشەویست چی دەکات، ئێ خۆشەویستی بەڵێنی پێدا، کە دەربارەی ئیستیر کۆمەکی بکات، ئیستیر! باشتر وا نییە بەرانبەر ئەسمەر نەڕوانێتە هەلکۆڵینی ئەم گووفەکە؟ نەخێر. بەم دەربڕینە غەدر لە منداڵەکە دەکات، بەڵام هۆی وتنیشی لاوازی خۆی و غایەنەتیکردنە لە ئەسمەر! ئەی باشتر وا نییە هەوڵ بدات لەبیری خۆ دەری بکات؟ لێگەڕا ئەسمەر و قەشەنگ و مریەم لە ماڵ بچنە دەرەوە، خۆیشی بە پەلە بەرەو کارەکەی رۆیشت و روویکردە نووسینگەکەی، چونکە میری هاوکاری چاوەڕێی دەکرد، ئیدی هەموو هزری خۆی بە کارەکەوە مژوول کرد و بە خۆی وت "شلۆمۆ، ئەمە لەخەیاڵی خۆت دەربکە، ئەگینا ئابڕووی خۆت دەبەیت و کارەسات روودەکاتە نێو ماڵ و خێزانەکەت"، هەروەها گاڵتەی بە بیرکردنەوەکانی خۆی هات و وتی "ئەمە دەق وەك ئەوەیە هەوڵ لەگەڵ تلیاك کێشێك بدەیت کە واز لە تلیاك کێشان بێنێت"، دووبارە بە خۆی وتەوە "شتەکە کاری نەکردەنی نییە، راستە لە سەرەتادا بنیادەم بە هەستەمی دەبینێت، لێ گەر بە هێز بێت، ئەوا بەسەریدا زاڵ دەبێت، ئێ باوکی سەلمان، تۆش هەروا بوویت".

هاوسەرە بەوەفاکەی و منداڵەکانی هێنایە بەرچاوی خۆی، کەسێتی بەهێزی خۆی لە چاوی هەموو خەڵکی شارۆچکەکە هاتە بەرچاوی. هەموو ئامادەکارییەکی هێنایە بەرچاوی خۆی، تا رووبەڕووی تەنگژەکە ببێتەوەو بەسەریدا زاڵ بێت، بەڵام جارێك

سەبرێك بگرە، چونكە ساوێلكەییە نیازی ئەوەت هەبێت بە یەك گورز ئەو دەردە كوشندەیە لە نێو ببەیت.

لەناكاو وای بە خەیاڵدا هات، كە رازەكە بۆ ئەسمەر ئاشكرا بووە، بە هەموو بوونێكییەوە لە قووڵایی ناخەوە هەستی بە گوناهباری و تێدامان و شوورەیی كرد، لێ نیستیر بە هەموو ئامادەگی خۆشەویستییەوە هاتەوە بەرچاوی، ئیدی خۆی بە خوو پێوەگرێكی ئەفیون و تلیاك چوواند، كە هیچ چارەسەرێكی نییە، بە دەم رێگەی بەرەو ماڵەوە خەمێكی قووڵ و تێكشكێنەر دایگرت.

لە رێگە بیری لە زۆر شت كردەوە، خێزان، هاورێیان، بازرگانی، سەركەوتن، ئاژەڵەكان، ئەسپ و ماین و مانگاو مەڕوماڵات، باخی پڕ جۆرەها میوە و سەوزەمەنی، تاران، تەورێز، بەتلیس، مۆسكۆ، ئەنەدۆڵ، ئەنقەرە و ئەستانە، چیا و دۆڵ و دەشتایی، مازوو و بەڕوو. بەڵێ مازوو و بەڕوو هێمای هێز و توند و تۆڵی و خۆڕاگری، ئەو كە دارمازوویەكی باڵابەرز و پێگەیشتووە، ئیستیریش، ئیستیر لەگەڵ هەموو ئەوانەدا ئازارێكی كوشندەی كاكیلەیە، ئەو هێشتا دەروون بەتاڵكەر و كاریگەرە، ئەو رووناكییەكی خۆشی چاوكوێركەرە، سازگارێكی بەئێشە. كەوابوو كوا دارمازووە بەهێز و سەختەكە؟ دەی بە خۆت پێبكەنە، وا لە ماڵ نزیك دەبیتەوە، بە خۆت پێ بكەنە! درۆ لەگەڵ ئیستیر و ئەسمەر و هەموو دنیا بكە. تۆیەك ئاوها خۆت بە گوێ نەدەر پیشان دەدەیت، دەی بۆ ئەسمەری دایكی منداڵان و راستگۆ زەردەخەنە بنوێنە، بەڵام زەردەخەنەكەی ئەسمەر خۆشەویستییە و پێش زەردەخەنەكەی تۆ دەكەوێت و هەر لە دەرگاوە پێشوازیت دەكات، ئەوەتا بە نێوچەوانی رووناكی لە كانیاوی زوڵاڵی بەختەوەری مەلە دەكات و مزگێنی خۆشی و شادیم دەداتێ و بە سەرسوڕمانەوە دەپرسم:

ــ ئەسمەر، ئەوە چی روویداوە؟

دەستی كردەوە و بۆی درێژ كرد و وتی:

ــ باوكی سەلمان، شیرینی مزگێنیم بدەرێ!

سەرسوڕمان و حەزی زانین هەموو ئەو شتانەی لە ناخەوە دەیان پساند هەڵمژی:

ــ ئەسمەر ئەوە چی روویداوە؟ ئەوە باسی كام شیرینی و مزگێنی دەكەیت؟

به هەلهەلە لێدانەوە وتی:

ــ شلۆمۆ، هەزار جار پیرۆزە!

عەقڵی نەیگرت، ئایا ئەسمەر بەرانبەر خیانەتی دەیەوێت شێتی بکات؟

خێرا دووبارەی کردەوە:

ــ مزگێنی و پیرۆزە، هەروەها هەلهەلە لێدان، ئەسمەر خەریکە لە هیچ تێنەگەم.

ــ دوێنێ شەو بەڵێنم پێدایت، کە ئاسوودەت بکەم، ئێ شلۆمۆ بەڵێنی سەرڕاستانیش قەرزێکە!

ــ ئەسمەر چی روویداوە، پێش ئەوەی داخی دڵی خۆم بە هەموو ماڵەکە دەربکەم، دەی پێم بڵێ.

بەوپەڕی خۆشنوودییەوە هاواریکرد:

ــ مەتتیا هۆ گۆنە قایل بوو! شلۆمۆ، باوکی قایل بوو!

دڵی نوقمی نێو گۆمارێك بوو، کە ئاوەکەی تێکەڵەیەك بوو لە گومان و راستی، نەیشی دەزانی لەم دوو توخمە کامیان هەڵبژێرێت، بۆیە بە شڵەژاوییەوە دەنگی هەڵبڕی:

ــ ئەسمەر، یەکسەر بچۆ نێو بابەتەکەوە و پێچ و پەنا مەکە!

ئەسمەر چاوەڕێی کرد و هەڵچوونەکەی قووت دایەوە، بە هێمنییەکی دەستکردەوە وتی:

ــ مەتتیا هۆ گۆنە قایل بوو کە ئیستیری کچیت بداتێ!

تێنەگەیشت و هەورێك لە گێلی ئاوەزی گرتەوە. نازانم ئەسمەر شێت بووە، یان من شێت بووم؟ ئەرێ بیستووتە ژنێك بۆ مێردەکەی خۆی داخوازی ژنێکی دی بکات، سەرباری ئەوەش بزانێت هەوێیەکی تووش بووە، ئینجا هەلهەلە لێ بدات؟ ئەمە خەون و ئاواتێکی هەستەمە و هەر لە دەستی ئەسمەر دێت! هەر ئەوە دەتوانێت شێتایەتی شووەکەی بکاتە هۆشمەندی و بە بەخشندەیی خۆی قوربانی بدات و بەو قوربانیدانە نابەجێیەش خەوشی شووەکی داپۆشێت، کاتێك بینی شلۆمۆ دەمی داچەقاندووە و چاوکانی ئەبڵەق بوون، جەختی کردەوە:

ـــ باوکی سەلمان، بڕوام پێ بکە، بەیانی کە چوومە کن مەتتیا هۆگۆنە و داخوازی ئیستیرم بۆت لێکرد، قایل بوو.

شێتایەتی دەکەوێتە نێوان ئەم و ئەسمەرەوە، ئاخۆ ئەم شێتایەتییە لە کامیانەوە هەڵدەقوڵێت؟ بە سەرسامییەوە دەپرسێت:

ـــ ئەسمەر، تۆ داخوازی ئیستیرم بۆ دەکەیت؟ ئەرێ تۆ هۆشت لەدەست نەداوە؟

ـــ شلۆمۆ، بەڵکو ئەمە ئەوپەڕی هۆشمەندییە.

ـــ ئایا هۆشمەندی ئەوەیە کە هەورێیەك بەسەر خۆت بێنیت؟ ئینجا گێلیش بێت؟

ـــ ئەی ئازیزترین مێرد، هەموو شتێك بۆ من ئاسانە، تەنها ئێش و ئازاری تۆ نەبێت!

ـــ گەر ببینم تۆش خۆت ئازار دەدەیت، ئەوسا ئازار و ئێشەکە هەرگیز کۆتایی نایات.

بە بڕوایەکی پتەوەوە وتی:

ـــ شلۆمۆ، مادام بەختەوەری تۆ بەختەوەری منە، ئیدی هەرگیز ئەمە روونادات.

ـــ ئەسمەر، بیر لە ئەنجامەکەی بکەوە!

ـــ بیرم لێکردووەتەوە و لەم ماڵە شوێنێکم بۆ ئیستیر هەڵبژاردووە.

بێدەنگ بوو، لێکدانەوە و سۆزگەلێك وەك ئەوەی بە دیقەتەوە تێکەڵ کرابن، دڵیان پڕ کرد، نیگای وشکی بێ فرمێسکی تێکڕای هەستی گەرمی دنیای لە خۆ گرت. ئەو هەمیشە شانازی بە ئەسمەرەوە کردووە، بەڵام ئێستا لەبەرچاوی مەزنتر بوو، بە جۆرێك بووەتە زەبەلاحێك، کەچی ئیستیر بە چاو ئەوەوە ئەوەندە بچووکە وەك کورتە بنەیەك دێتە بەرچاو، وتی:

ـــ ئەسمەر سەرباری ڕێز و شوێن و ڕێی باوکی، ئەو لەم ماڵەدا بۆ تۆ دەبێتە کارەکەرێك.

بە جەخت کردنەوە وتی:

ـــ هیچمان نابینە کارەکەری ئەوی تر، ئەو منداڵێکی ساویلکەیە، فێری خۆشەویستی و ڕێزگرتنی دوو لایەنەی دەکەم.

ئا ئەمەیە گەوهەری بەخشندەیی و رەسەنایەتی، ئەو رۆژەی ئەسمەری هەڵبژارد، پێی وترا "هەڵبژاردنەکەت لەجێی خۆیەتی". بەڵام ئەوی تریان قوتوویەکی ئەفسووناوی داخراوە، بەوەش داخراوتر دەبێت، کە باوکی قایل بووە بیدات بە پیاوێکی ژندار. لەبەرچی؟ ئاخۆ بۆ ئەم قایل بوونە پاساوێك هەیە، هەر لەبەرئەوەی ناوبانگی هەیە، ئیدی دەبێت هەموو کۆسپێکی لەبەردەم تەخت بێت؟ لەنێوان سەرسوڕمان لە ئەسمەر و هاوکات بە گەورە زانینی و هاوکات خۆشی و شادمانی، هەستگەلێکی ئاڵۆز سەریان قوت کردەوە. ئایا ئەم ماڵە هەروا وەك لانەی خۆشەویستی دەمێنێتەوە، یان بە ناکۆکی نێوان هەردوو ژنەکە دەشێوێت، ئاخۆ دەکرێت هەردوو هەوێکە لەژێر یەك بنمیچدا کۆ ببنەوە؟ ئایا ئەم دەتوانێت نێوانیان رێك بخات و بە یەکسانی و ویژدانەوە مامەڵەیان بکات؟ ئایا بەر لەوەی ئەوی تر بێت، ئەم غەدری لە ئەسمەر نەکردووە؟ یان ئەسمەر خۆی غەدر لە خۆی دەکات؟! ئەفرەتی خودا لەسەرەڕۆیی گەنجێتی! ئەسمەر لە بەرانبەریدا سەرکەوتوو و بەختەوەر و هۆشمەندتر بوو. ئەو هەرچەندە ئافرەتێکە، بەڵام لەم ساتەوەختەدا لەو بەهێزتر بوو، لە وەفاداری و بەخشندەییدا لەو بەهێزتر بوو...، بە هەنگاوی مەردانە و پێشکەوتووانەی ناوبانگ و ناوی شلۆمۆی بە چاکە خستە سەر زاران، بەڵام لە ئێستا بەدواوە ئاخۆ داهاتوو چی دێنێتە رێی ئەم ماڵە؟ هەروا لە بیابانی بیرکردنەوەدا بوو، تا دەنگی ئەسمەر بێداری کردەوە:

ـ لەسەر ئەوە پێکهاتین تا رێورەسمی مارەبڕین تەواو دەبێت، دوای مانگێك بگوازرێتەوە.

کەمێك بێدەنگ بوو، ئینجا وتی:

ـ ئەی پیاوی دوو ژنە داوات لێ دەکەم کە خۆم بووکەت بۆ رێك بخەم!.

***

رۆژگار پشوویەکی دا، تا لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکە بەردەوام بێت، بە خۆشنوودییەوەخۆی قوت کردەوە و پرسی "لە گێڕانەوەی رووداوەکاندا چۆنم دەبینیت؟"

وتم "من خۆم چیرۆکەکەم لە شلۆمۆ کەتانی خۆیەوە ژنەوتووە". سۆزی خۆت دەمە زەرد کرد و هەستی خۆت ناسك کردەوە، تا درێژەت بە قسەکەت دا و بە ئاوەژووی

خووی هەمیشەییت لە بەکارهێنانی هێزی شاراوەی خۆت، لە ژێی ویژدانت دا، ئایا تۆ رێ گومکێ دەکەیت و پێچ و پەنا دەکەیت و رووداوەکان هەڵدەهێنجیت؟ تا پەلاماری داهاتووی دزێوی رووداوی چیرۆکەکەی پێ بدەیت؟

رۆژگار ـــ گێـڕەرەوە ـــ ی شـایەتحاڵ چـەنەبازی کـرد "مـن رابـردوو و ئێـستا و داهاتووم، من مێژوو و نادیـارم. یـادەوەریم وەك دەفتـەری کردەوەیـە و وشـەیەك، یـان وەستانێك، یان گەردیلەیەك لە رووداوی دنیام بیر ناچێت.

بە رۆژگاری خۆ بەزلزانم وت، "بەڵام شلۆمۆ کەتانی خۆی چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە، ئێم گەرێ با بە زمانی خۆیەوە بیگێڕمەوە".

وەك هەموو جارێك پێکەنینە گاڵتەجارییەکەی رۆژگار بەر گوێم کەوت و وتی:

ـــ من لە نێوان دوو یادەوەریدام، یادەوەری شلۆمۆ و یـادەوەری تـۆ، ئـێ مـرۆڤیش شتی بیر دەچێت و رووداوان چەواشە دەکات.

هەروەك یەکەم جار تێدامام، بەڵام وتم:

ـ ئەوەی گەرەکە لەبیر بکرێت، بنیادەم لـەبیری دەکـات، ئەوەیـشی پێویـستە بـیری نەکات، یادی دەکاتەوە، مرۆڤ ئەو شتانە چەواشە دەکات، کـە ئـاواتی نـەبووە لەسـەر هەمان چەواشەکاری بڕوات.

رۆژگار بێ دوو دڵی و بە ریتمێکی سەرکەوتووانەوە وتی:

ـــ کەواتە بینیت، من هەر خۆم دەتوانم چۆن رووداوەکان بە وردی و بێ دەسـتکاری بگێڕمەوە.

پرسیم:

ـــ یان بە لای تۆوە بیروڕای قارەمانی چیرۆکەکە و دیدگای بۆ رووداوەکـان نرخێکـی ئەوتۆیان نییە؟!

ئاماژەیەکی قایل بوون لە رۆژگارەوە دەرکەوت و ئاوهای دەربڕی:

ـــ ئەمە راستە.

وتم:

ــ کەواتە وەرە با بۆ پاشماوەی ڕووداوەکانی چیرۆکەکە هاوکاری یەکتر بکەین، من و تۆ و یەکەم گێڕەرەوەی و شلمۆ کەتانی کوردەی قارەمانی چیرۆکەکە.

سابلاخ دوای مانگێك لە ڕووداوەکانی ڕابردوو

لە یادەوەریمدا ڕووداوگەلێك هەن هەزار جار لەگەڵیاندا ژیاوم، وێنەی کتومتی خۆیانن، تەڕ و تازەن و ڕەنگیان کاڵ نەبووەتەوە و ڕۆژەکانیش بیری نەبردوونەتەوە. بۆ لای دەگەڕێمەوە و بەربەستە کەڵەکەبووەکان بە ڕۆژ و ساڵ و وێنەکانی دیکەیەوە دەسمم و دەگەڕێمەوە، ئەی ڕۆژگاری غەدر کردوو لە مرۆڤ، لافی ئەوە لێدەدا کە ڕاستگۆیی و دەستپاکی دوو خەسێتن و شانازییان پێوە دەکات و گوایا لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوودا پراکتیزەی کردوون. هۆ ڕۆڵەکەم، ئەو ڕۆژەت لەبیر نییە، کە ڕووداوە گەرموگوڕەکانم لە لاپەڕەی یادەوەرییەکان بۆ گێڕایتەوە؟

من لە دەریای ڕووداوەکاندا نوقم دەبم، نایگێڕمەوە، بەڵکو لە قووڵایی ئەو دەریایەدا نوقم دەبم، هەر بەرەو قووڵایی دەچم، بەرەو ڕابردوو، بەرەو وێنە ڕۆدەچم و زیندووی دەکەمەوە، جار لە دوای جار تێیدا ڕۆدەچم و شارەزای دەبم، تەنانەت لە بنەچەکەشی زیاتر شارەزای دەبم، ئەوەتا بەڵێنەکە لە وادە و ڕۆژی خۆیدا لە ماڵە گەورە و فراوانەکەی خۆم لە سابلاخی زێدم، ئەسمەری هاوسەر و هاوبەشی ژیانم هەوێکەی خۆیم بۆ دێنێت و بە دەستەکانی خۆی هەڵێدەگرێت، لەسەر تەختە خەوی هاوسەرێتی دایدەنێت، ژوور بە تەنیشت ژوورەوە، کەلوپەل تەواو هەمان کەلوپەلی ژوورەکەی خۆی، من خۆم هەڵمنەبژارد، بەڵکو ئەسمەر خۆی هەڵیبژاردن. ئەسمەر سەرکەوت و ئەو دڵەی بۆ خۆی داگیر کرد کە بە ئەڤینی ئیستیرەوە مژوول بوو، کە چوومە کن ئیستیر ئەسمەریشم لەگەڵدا بوو، گوێم لە دەنگی بوو کە لە دەرەوەی ژوورەکە هەلهەلەی لێدەدا، بەڵام من دەمبینی لەسەر تەختەنوستنی هاوسەرێتی لەگەڵماندا بوو، نەخێر بەڵکو ئەو لە ویژدانمدایە و پێی سەرسامم، ئەسمەر ترسێکە لە ویژدانمدایە و سەرکۆنەکەرێکی ویژدانە. ئەوە بۆ یەکەم جارە ئەو بە تەنها دەنوێت و منیش لە ماڵم و

لە پاڵ ژنێکی دیکەدام. ئیستێر منداڵێکی کاڵفام و گێلە، دەچمە نێو هەناوییەوە و ئەویش دێتە نێو کاسەی سەرمەوە. لێی دەترسم، ئاخۆ ئەڤین تەنها ئیشتیایەك بوو؟ دایکی منداڵانم ئەو ئارەزووە لێ بێ بەشبووەم و حەرام کراوەی بۆ هێنامە دی. گڕی عەشقی گێلانە دامرکایەوە "هۆ ئیستێر تۆ بوویت بە هاوسەرم". کێ بڕوای دەکرد؟ لەپڕ وەئاگا هاتمەوە، کە وەئاگاش هاتمەوە، بینیم زۆر شتم لە دەست داوە و کەوتوومەتە نێو قەپیلکی نادیارەوە. من بوومە مێردی دوو ژن و ئەمەی دواییان بە هەوای منداڵی دەشنێتەوە، لێ یەکەمیان، دایکی منداڵانم بە ئاوەز و وەفادارە، قوربانییەکی بۆ داوم هیچ ژنێك بۆ پیاوەکەی خۆی نایدات. ئەسمەرم بە جۆرێك دی لەوەو پێش ئاوها نەمدیبوو، نەخێر لەوەوپێش هیچ گومانێکم لە دڵسۆزی ئەو نەبوو، بەڵام ئەمێستا شتێکی تێدا دەبینم، کە لە دڵسۆزی باڵاترە، شتێك کە ئەو دڵسۆزییە نوقم دەکات و لە کاسەی سەرم سەرڕێژ دەبێت، شتێکی بەخشندانە و خۆنەویستانە، ئەو شتە دەگمەنە دروستی ئاوەزی ئەوە و بێگومان ئاوەز دروستی منی تێکشکاند! ئەو شەوەی مارەی ئیستێرم بڕی، ئەوم بە جەستەیەکی رووتەوە بینی، بەڵام ئەسمەرم بە روحەوە دەبینی! خۆ ئەگەر پێشبینی ئایندەم کردبا، هەر ئەو شەوە دەمزانی کە ئیستێر خەونێکی خۆش و کورتە و ئەسمەر راستییەکی جێگیرە و لە هەموو قۆناغە جیاجیاکانی تەمەندا مانای لێ هەڵدەقوڵێت، مۆمێکی داگیرساوە و رووناهی پەخش دەکات، درەختێکی بەردارە و کۆتایی نایات.

خودا لە ئەسمەر خۆش بێت...، خودا لە هەردوو ژنەکە و هەردوو منداڵەکە خۆش بێت!

❊❊❊

دوای تەنگانە شێنەییە پێکەنینێکی کورت و هێمنی بە دوادا دێت و گاڵتە بە گاڵتەجاڕی چارەنووس دەکات، وەك دەردەکەوێت لە شەوی یەکەمدا ئەی پیاوی دوو ژنە تۆوی منداڵەکەت لە منداڵدانی ئیستێردا چاند، بەیانییەکەی ئەسمەر هەستا و لە دەرگای ژووری بووك و زاوایی تەڕ و بڕی دایت و قاوەڵتی هێنا و پیرۆزبایی لێکردن و هەلهەلەی لێدا، تۆش بە هەزار هەست و بە سیمایەکی شادمان و بەختەوەرەوە

هەڵسایت و بینیت ئەسمەر خۆشنوود و شادمانە، بەڵام تۆ لەو ڕەفتارەی بێـزار بوویـت، ئیدی بە جۆرە توندییەکەوە بۆ دەرەوەی ژوورەکە پەلیت گرت و پێت وت:

ـ تۆ خانمی گەورەی ئەمماڵەیت، خانمی گەورەش خزمەتی هەوێکەی ناکات، ئەمە لێگەڕێ بۆ قەشەنگ، خوام لەو خوایەیە لەمەولا ئەمە دووبارە ببێتەوە.

سوپاسی خودام کرد کە نوستن پەردەیەکی ئەستووری لەنێوان ئیستێر و ڕەفتارەکەی ئەسمەردا هەڵدا، چونکە هەندێك کەس لە رازی بێ فیزی بنیادەم تێناگەن. ئیستێر کـە کچێکی گێل و تازە پێگەیشتووە هی ئەوەیە تووشی لەخۆبایی بوون ببێـت، گـەر ئـەو کارەی ئەسمەری دیبا، ڕەنگە ئەنجامەکەی باش نەبووایە. پێکەنینە گاڵتـە ئامێزەکـەت لە گاڵتە جاڕی چارەنووسەوە سەریهەڵدا، پێکەنینەکە لەبەر ئەوە نەبوو، کە ئەو شـتە رووی دابوو، لەبەرئەوەش نەبوو کە هەزاران لێکدانەوە وایان لێ کردبوویت، بتکەن بەو شاخە قورقوشم ئاسایە و پاشان بتکەن بە هەڵم و چون دووکەڵێك بـەرەو ئاسمانـەکانی خودا بەرزت بکەنەوە، لەبەر ئەوەنا...، لەبەرئەوە نا...،

لە دەرگا دەدرێ و قەشەنگ دێت و پێت دەڵێت:

ـ گەورەم! گەورەم! یەکێك لە دەرگا وەستاوە و تۆی گەرەکە گەورەم!

بەیانییەکی زووی رۆژی زاوایی بوونتە و هەموو سـابلاخ دەزانێـت و کەسـێك لـەم شارۆچکەیەدا و لەم کاتە زووەدا تەنانەت کەسوکاری ئەسمەریش بـە سـەردانی کـردن، بێزارت ناکات. هەستت بە تەنگەتاوییەك کرد و توورە بوویت، بە قەشەنگت وت:

ـ لێی بپرسە، بزانە کێیە و چی دەوێت؟

قەشەنگ ڕۆیشت و گەڕایەوە "کاتێك ئەمەت بۆ گێڕامـەوە نـوقمی نێـو پێکـەنین بوویت و پێت وتم..." قەشەنگ بە عاقڵی بەرەو دەرگا ڕۆیشت و بە شێتی گەڕایەوە، کە ڕۆیشت زمانی وەك زمانی باڵندەیەکی خۆشخوان بوو، کە گەڕایـەوە چـون مـەیموونێك فلتەفلتی بوو...، کە ڕۆیشت رووخساری وەك شیلەی هەنار سـوور بـوو، کـە گەڕایـەوە رووخساری زەرد هەڵگەڕا بوو. تۆش تەماشات دەکرد و بـە واق وڕماوییـەوە دیقـەتیت دەدا و دەتبینی شڵەژاوە و هەوڵ دەدات قسە بکات، بـەڵام قـسەکە لـە دەم و گـەرووی

کلیل دراوی قەتیس دەبوو، لەگەڵ ئەوەی سەرت سوڕمابوو بە روویەکی خۆشەوە بە کارەکەرەکەت وت:

ـــ ئێستا تێگەیشتم، جادووگەرێك لە دەرگا وەستاوە و هەموو بوونێکتی هەڵگێڕایەوە.

قەشەنگ کە هێشتا دەوانی دەدا دەنگی خۆی لە قووڵایی دەریاکە بێنێتە دەرەوە، بە ئاماژەیەکی سەر ئەوەی رەت کردەوە، درنجی گاڵتەکردنەکەت راپەڕی و دەستی بە زۆربڵێیی کرد:

ـ ئا...، ئێستا بە راستی تێگەیشتم، ئەوە دڕندەیەکی تێکشکێنەرە و مرۆڤ نییە، ئەریٚ ئەوە شێرە، یان بەورە؟!

لەپڕ دەنگە نوقم بووەکەی بن دەریاکەی دەرهێنا و هاتە دەرەوە و ئاوی لێدەچۆڕا و لەسەرمان هەڵدەلەرزی:

ـ دەڵێت...، گەورەم دەڵێت، گوایا ئەو نێردراوی شای سەروەرمانە بۆ لای تۆ!

نێردراوی شا بۆ لای من! ئینجا لە بەیانی رۆژی ژن گواستنەوەکەشم! بێگومان قەشەنگ شێت بووە، سابلاخیش شێت بووە، ئێران تێکڕا شێت بووە، گەر شتەکە راست بێت، ئەوا بێگومان شا خۆیشی شێت بووە! ئاخر منێك نە دەستوپێوەندم و نە لە دەرباری شام، لە پیاو ماقوڵانی دەوڵەتیش نییم، ئیٚ رۆژێکیش روونەداوە لەگەڵ شادا نانێکم خواردبێت، یان مەیم لەگەڵیدا خواردبێتەوە، ئیٚ نە هیچ سەرم لە سیاسەتی دەوڵەت دەردەچێت و نە لەکاروباری وڵاتیش دەزانم. من جوولەکەیەکی کوردم و بازرگانم، لە شارۆچکەیەکدام لە خەیاڵی کەسدا نییە و پیاوانی دەوڵەت مەگەر چۆنها سەرێکی لیٚ بدەن، ئیٚ ئیتر نێرراوی شا بۆچی بۆ لای من دێت؟ بەتایبەتیش لە رۆژی زەماوەند و ژن گواستنەوەم؟! ئایا شای قاجاری بۆ ئەوە نێردەی خۆی دەنێرێت تا پیرۆزبایی زەماوەندەکەم لیٚ بکات؟ یان رەنگە ئیمپراتۆر، دیاری زەماوەندی بۆ ناردبم؟!

نا... نا، ئەمە ناچێتە عەقڵمەوە، کچەکە شێت بووە و هەڵدەبزرکێنێت. بێگومان لەبەر دەرگا بەڵایەك رووخساری تێکداوە و ئاوهای لێکردووە، وای لێکردووە زمانی

ببەسترێت و ورێنە بکات، لێ من ئارامی خۆم لەدەست نەدا و بە پێکەنینەوە لە قەشەنگی بەستەزمانم پرسی:

ــ ماڵ وێران، تۆ چۆن دەزانیت ئەو بە راستی نێردراوی شایە و بەتایبەتی داوای من دەکات؟

بە ترسەوە وەڵامی دایەوە:

ــ سوێندت بۆ دەخۆم، وتی ئەو نێرراوی شایە، گەورەم ناوی خۆت و ناوی باوکی خوالێخۆشبووتیشی هێنا.

لێرەدا هەندێك دوودڵیم پەیدا کرد، رەنگە غەدرم لە کچە بەستەزمانەکە کردبێت، دەشێت شای قاجاری بە راستی شێت بووبێت، خۆم رۆیشتم و تاقیبی شتەکەم کرد. بەڵێ ئەوەی بەرانبەرم بە راستی نێرراوی شایە، قەشەنگی داماو تەنانەت لە دۆخی ورێنەکردنیشدا رۆژێك درۆی نەکردووە، ئەو وا لە ترساندا میز بە خۆیدا دەکات.

نێرراوی شا لە بەیانی رۆژی زەماوەندەکەمدا وا لە بەردەممدایە. فەرموو! وەرە ژووری من خزمەتکاری شای سەروەرمانم! لە شوێنی خۆی نەبزوا و نەهاتە ژوورەوە، بەڵکو نامەیەکی مۆرکراوی بە مۆری شاهنشاهی دایە دەستم و وتی:

ــ ئەمە فەرمانی سەروەرمان شای شاهانە بۆ تۆ، فەرمانت پێدەدات، کە دەستبەجێ بۆ دەرباری شاهنشاهی لە تاران برۆیت.

زاتم نەکرد بپرسم، بەڵام وتم:

ــ ملکەچی فەرمانی شای سەروەرمانم، بەڵام لێم مەگرە رەنگە بەرێزت ناونیشانەکەت هەڵە کردبێت.

نیگای ئاگرینی نێرراوەکە خەریك بوو هەڵم لوشێت، نیگای شێرێکی تێکشکێنەر کە خۆی بۆ پەلاماردانی نێچیرە داماوەکەی ئامادە بکات. بە چاوی خەیاڵ بینیم نێردەی شا دەستی بۆ کرکراگەم درێژ دەکات و لە ناقرگەم گیری دەکات، بەڵام دەستی درێژ نەکرد، بەڵکو دەنگی بوو لەگەڵ خۆیدا گرمەی هەور و لرفەی لافاو و نەرەی درندەی جەنگەڵی بۆ هێنام:

ـــ کوڕە هۆو، من هەڵە ناکەم، گـەر خوێنـدەواریت هـەبێت، تەماشـای فەرمانـە پیرۆزەکە بکە، ئەوەت ناوی تەواوی تۆی لەسەرە و ئەوەش ناونیشانەکەیە!

بە ڕاستی تۆ هەڵە ناکەیت، بەڵام بێگومـان شای سەروەرت هەڵـەی کـردووە! ئـاخر ئەو لەم ڕۆژی زەماوەندەمدا مـاندووم دەکات، کاتێکیش دەگەمـە دەربـاری شاهنـشاهی پێم دەڵێت "تۆ ئەو کەسە نیـت کـە مـن مەبەسـتمە، دەی کـوڕە، بـە شـوێن خۆتـدا بگەڕێوە!" بەڵام ئایا بە نێردەی شا بڵێم کە سـەروەرەکەی تـۆ هەڵـەی کـردووە؟! گـەر ئەمەی پێ بڵێم، ئەوا ئەسەر و ئیستێر بێوەژن دەخـەم و منداڵـەکانم هـەتیو دەکـەم و ئەسەریش بە درێژایی تەمەن بۆم دەگری، لێ ئیستێر مانگێك خەمبار دەبێـت، ئینجـا لە مێردێکی تر دەگەڕێت، لەوەشە لـە شـەوی بووکێنیـدا دووگیـان بووبێـت، ئەوسـا منداڵێکی بێ بـاوکی دەبێـت و بـاوکی خـۆی ناناسـێت و خـەڵکی غـەریب و نـامۆ پەروەردەی دەکەن. لە بەرانبەر نێردەی شای قاجاریدا هەموو ئەمانەم بە خەیاڵدا هات، لە کاتێکدا ئەو هەڵەی گەورەکەی خۆی جێبەجێ دەکات و لە نـاوادەدا بـۆ لام دێـت و فەرمانم پێدەدات، کە هەر ئێسا بە سەعاتێك بگەمە تاران، ئەویش نـەك بـە سـواری ئەسپەکەم، بەڵکو گەر بکرێت بەسەر باڵی باڵندەوە، شا دەیەوێت پێش ئەوەی گەشـتی هاوینەی بۆ سان پوترسبۆرگ بکات بۆ دیـدەنی ئیمپراتـۆری ڕوس نیکـۆلای دووەمـی هاوڕێی، چاوی بە من بکەوێت.

تکام لە نێردەی شا کرد، کە ماوەی هەفتەیەك مۆڵەتم بدات، تا مانگی هەنگوینم کورت بکەمەوە و چەند ڕۆژێکی کەم پێش ئەوەی چارەنووس لە کەسوکار دام بڕێت، بە بوونی خۆم بووکەکەم دڵخۆش بکەم، ئاخر لەوەیە چەند هەفتە و مانگ بمێنمەوە، یـان ساڵێکم پێ بچێت، ڕەنگە هەتا هەتایە هەر نەگەڕێمەوە، ئایا ئەوەی بچێتە نێو لانـەی شێرەوە، دڵنیایە لەوەی لێی دێتە دەرەوە؟ بەڵام توخوا، ئەی نێردە پێم ناڵێیت هۆی ئـەم داوەتە پیرۆز و لەناکاوە چییە؟!

بێگومان پاسوخم دەست نەکـەوت، کارەکـە وا دەخوازێـت بـە بـێ بـاس کردنـی هۆیەکەی ئامادە بم، ئەمەش لە تووڕەیی ڕووخساری نێـردەی جەنابـەوە دیـارە، بـەڵام بنیادەم ناتوانێت پێشبینی نهێنی تووڕەیی سـەر ڕووخـساری ئەمانـە بکـات، چـونکە

هەمیشە دەموچاویان تـوورەیی و رق و ئاگریـان لێـدەبارێت، وەك ئـەوە وایـە هـەموو خەڵکی سەرچاوەی بێزاری و نیگەرانی دەسەڵات بن، ئیّ هەرگیز ناتوانێت ئەوە بزانیـت ئاخۆ تۆ سەرچاوەی ئاگر و رقی ئەوانیت، یان تۆ بە وریایی و ماسـتاوکردن و مـەرایی کردن بۆیان، خەڵاتی شاهانەت دەست دەکەوێت و ئیدی جەستەی خۆت بـە سـەلامەتی دەپارێزیت و بە سەری نێوان هەردوو شانتەوە بەرەو ماڵی خۆت دەگەڕێیتەوە، نیـشانەی توورەیی ئاشکرای سەر رووخساریان لە رواڵەتی لەخۆبایی بـوون بـە تـاجی دەسـەڵات تێناپەڕێت، توورەیی سـەر رووخـساریان دەمـامکی تۆقانـدن و ترسـاندنە، تـا هـەر کەسێکی ئەم گەلە کاتیّ دەیان بینێت، وەك ئەوەی شمشێری مەرگی دەسـتی ئیزراعیـل بەرانبەری و لەسەر گەردەنی راگیرابێت، زەندەقیان بچێت.

کەواتە دەڕۆم، دەشتوودەری تازەربێجان بە دۆڵ و بەرز و نزمییەوە لـەبارەی ئەگـەری زۆرەوە دەم دوێنن، ئەمە جگـە لـە هـەڵۆی دوو دڵـی و گومـان، لـە گوینـە پرسـیار گەلێکیش بکرێن، بە بیّ خۆ وەخراندن دەڕۆم، چونکە فەرمانی شـاهانە سەرچـاوەکەی ویستی خودایە، ئیّ مادامەکی خودی شا سێبەری خودایە لەسەر زەوی، بۆیە ملم کەچ کرد و بە نێردەکەیم وت:

ــ کەواتە هەمووی دوو رۆژە، بەم دوو رۆژە خـۆم کـۆ دەکەمـەوە و مـاڵئـاوایی لـە هاوڕێیان و کەسوکارم دەکەم.

نێردەی شا وتی:

ــ بەڵکو تەنها رۆژێکت بەسە، تا ماڵئاوایی لەهەموو خەڵکی دنیا بکەیت.

ماڵئاوایی لە هەموو خەڵکی دنیا بکەم؟ ئەی نێرراوی شا، ئەوە چی قـەوماوە؟ زاتم نەکرد پرسیاری تری لیّ بکەم، دڵم داخوڕپا، ئاخۆ من بووم بە خەڵکی ئـەو دنیـا، تـا ماڵئاوایی لە هەموو خەڵکی ئەم دنیا بکەم؟ ئیدی چارەنووسی خۆم دایە دەسـتی ئـەو کەسەی کە لەوەوبەر رزگاری کردووم و تا دوا قۆناغیش هەر رزگارم دەکات، بـڕوام بـە خودای خۆم وەك چیایەك بوو نەدەلەرزی، دیارە خـوداش رەنـج بـە خەسـار و نائومێـدم ناکات. ئەم رووداوە پێش لەدایکبوونی تۆ بە سـاڵانێکی زۆر بـوو، ئـەوەتا تـۆ ئێـستا پیاوێکی لەبەرچاوانیت و باسی رووداوگەلێکی ترسـناکی رۆژانێکـی لەمـەوبـەرت بـۆ

دەکەم، کە چۆن خودای میهرەبان لەو هەموو مەترسییە پاراستمی، لێ کاتێک بە نێردەی شام وت گەرووم وشک بووبوو:

ــ بەرانبەر شای سەروەرمان لە کات و ساتی خۆیدا چۆک دادەدەم. سبەنێ بەرێدەکەوم، خۆ ئەگەر پێشهاتی چاوەڕوان نەکراو نەیاتە ڕێم، ئەوا لە هەمان ڕۆژدا دەگەمە تاران.

بە گرمەگرمێکەوە وتی:

ــ بەڵکو دوای من بە ڕۆژێک دەگەیت، چونکە من ئێستا بەرەو تاران دەگەڕێمەوە، ئێستا بە ماڵ و منداڵەکانت بڵێ، با توێشوویەکم بۆ ئامادە بکەن، کە بەشی سەفەری نێوان سابلاخ و تارانی پارێزراوم بکات.

***

ئەسمەر شڵەژا، ئیستیریش لە سەلای گریانی دا، بەراستی زانیم منداڵێکە و خۆی بە منەوە هەڵواسیوە، ئەوە بوو دەستی بە گریان و هاوار کرد:

ــ مەڕۆ، مەڕۆ و جێم مەهێڵە!

بە هیچ جۆرێک لە واتای (فەرمانی شاهانە) تێنەدەگەیشت، ئەوەشی بە گوێدا نەچوو، کە من بە بێ خوایشتی خۆم جێی دەهێڵم و سەفەر دەکەم، پێیم وت:

ــ هیچ کەسێک بە ئارەزووی خۆی و بە پێی خۆی بەرەو چارەنووسێکی نادیار ناڕوات، کە ڕەنگە گەڕانەوەی لەدوا نەبێت، ئەسمەر بە نیگەرانییەوە گریا و داوای سەلامەتی و گەڕانەوەی بۆ کردم، بەڵام ئیستیر لە هات و هاواری خۆی بەردەوام بوو، بە سووربوونیشەوە دەیوت:

ــ مەڕۆ! ئاخر چۆن دڵت ڕێگەت دەدات لە بەیانی زاوایی و بووکێنیماندا، بە تەنها جێم بهێڵیت.

زانییم تێگەیاندنی بێ سوودە و سەفەرەکەش بە سەرمدا سەپێندراوە، خۆ ئەو لە ترسی ئەوە ناگرێت کە من تووشی کارەساتێک ببم، بەڵکو ترسەکەی ئەوە بوو بە تەنها بمێنێتەوە، بۆیە پێم وت:

ــ هەموو چاکەیەك هی ئەسمەرە، هەر ئەو تۆی بۆ ئەم ماڵــە هێنــا، بــە خوشــکی خۆتی بزانە، تیٚ ئەو ماڵەی دوێنیٚ لێوەی هاتی، دوور نییە.

بە دەموچاوێکی گریاناوییەوە وتی:

ــ کەواتە شتوومەکەکانم بپێچمەوە و بۆ ماڵی باوکم بگەڕێمەوە!

هەناسەیەکی پەنگەوە خواردووم هەڵکێشا! دووبارە فوویەکم لــە (مەشــکە) کــون بووەکەی ئیستیریش کرد و هەوڵم دا کونەکانی بگرم، ئێمە بەڵکو لە شتەکە تێبگــات، ئەوێك لە دوێنێوە بووەتە هاوسەر و لەوەتەی بە بووکی هاتووە بووەتە پاژێك لەم ماڵە، هەر چییەکیش لەم ماڵەدا هەس بووەتە بەشێك لەو، ئەو لە ماڵە مێردە و ماڵە بــاوان هی کاتی کچێنییەتی و ئێستا بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە تا تێیدا ژیان بەسەر ببات، بــەڵکو بۆ سەردان دەچێت...، ئینجا دەگەڕێتەوە.

ئافرەت و بازرگانی گەرەکە ئاگاداری هەردووکیان بیت و لێیان دڵنیا بیت، ماڵەکە خۆم و بەختی باشم ئەسمەر ئاگای لێیەتی، پشتم بە خودا و بەو ئەستوورە، بــەر لــەوەی رای بسپێرم تا ئاگای لیٚ بێت، ئەو مشووری دەخوات و لە منداڵەکان و ئیستیر دڵنیام دەکات! لە وڵسات و زەخیرەی هاوین و باخ و کرێگرتەکان بیٚ خەمم دەکات...، کاروباری بازرگانییەکەمانم داوەتە دەستی میر عــەلی هاوبــەش و خۆشەویــستم و رام ســپاردووە. ئیدی خۆم بۆ سەفەرێك ئامادە کرد، کە ئاکامەکەی نازانم چۆنە و هاوکــات مردنیــشم لە خەیاڵی خۆم دانابوو، بــەڵام خــۆم بــۆ نادیارێــك ئامــادە کــرد و بــە دەم ئایینــدەوە پێکەنییم، تەمەنێکم لەبەرچاو بوو وەك تەمەنی هەڵۆ بوو، بە هەمان پێوانــەش کــارم بۆ ئەم دنیا و ئەو دنیام دەکرد، لیٚ سروشتی خۆم و باوەڕم بەردەوام بــەرەو ژیــان رایــان دەکێشام. من هێشتا لەســەرەتا و هــەرەتی تەمەنــدام، کەواتــە مــافی خۆمــە شــیلەی رۆژەکانی دنیام بچنمەوە، مافی خۆمە بناغەی چاکە کردن دابمەزرێنم، تا دوای نــەمانی توێشووی ژیانی خۆمی تێدا قایم بکەم، ئەو دەمەی رووبــەرووی خــودای خــۆم دەبمــەوە، خــۆمی پــیٚ بپــارێزم، لــەم دنیایــەدا بەرپرســیارێتیم بــە ئەســتۆوەیە و ئــەوا بەرپرسیارێتییەکی تریشم بۆ زیادبوو، کە هێشتا شەو و رۆژێکی بەسەردا تێنەپەڕیوە، لە ناخی ناخمەوە دەنگی بەرپرسیارێتی و باوەڕ بانگیان کردم و مزگێنی ئەوەیان دامــیٚ،

کە من دەگەڕێمەوە، لە تەرازووی هەستیشمدا تای بەخت و ئومێدم لە تای نەگبەتی و نائومێدیم قورستر بوو. دوای چەند چرکەساتێك ئەجیندای هیمەت هات، کە کاتەکانی هاندان و بڕوا بە خۆبوون بوو. بیرم لە بژێوی خۆم کردەوە، سەر و بنی ئەو قازانجەم کرد، کە لەم سەفەرەدا دەستم دەکەوێت، لە ئازووقەی ئـاو پێـستە بـاری سـێ هێـسترم لـە خواردن و خواردنەوە دیاریکرد، هەروەها تەفلیم و کتێبی نوێژ و دوعاکانیشم هەڵگرت و گەڕامەوە و دوعاخوازیم لە هەموو ئەندامانی خێزانەکەم کردو ناوی خودام لێهێنا.

لەنێوان چیاکان و دۆڵ و دەشتەکاندا تەنها خۆمم و لەسەر پشتی ئەسپەکەم بووم و هێسترەکانم پێش خۆم دابوو. ئەوەی بەرانبەرم دۆڵی بەفرە و بنەماڵەی بوزورگ دەستیان بەسەردا گرتووە و بەفری زسـتانی تێـدا کۆکردوونەتـەوە، پەسـتاویانەتەوە و بـووە بـە سەهۆڵ، بۆ هاوین پارچـە پارچـەی دەکـەن و بـە دانیـشتووانی سـابلاخ و دەوروبـەری دەیفرۆشن. تەنها خۆم بەسەر پشتی ئەسپەکەمەوە و خودا لە بان سەرم و دەوروپـشتم و لەناو ئاوەز و دڵمدایە، ناوی لەسەر زارمە و کاریگەری لەسەر هەموو دەنگەکانە. ناوی لە پەراوێزی سەیید و لەناو تـەفلیم و کتێبـی نوێـژ و دوعاکانمدایـە. ئـاو و خـۆراکی تەواوم پێیـە، وا بـەرەو تـەورێز هەڵدەکـشێم، تـا جەوتەکـەم بفرۆشـم و بـەرەو تـاران بگەڕێمەوە، تـا لـە تـەورێزی پایتـەختی ئازەربێجـان تـاوی تـازەی دیکـە هـەڵبگرم، ئەندامانی خێزانەکەشم لەگەڵمدان، هەروەها ئەو پرسیارانەشم پێیە، کە لـە خۆمیـان دەکەم و بەربای گوێی دنیا و سەردەمەکەی دەدەم و لە حەناس هەر وەڵامێکدا بێـدەنگ دەبم کـە ڕۆژگـار دەیانزانێـت، بـەڵام بـۆ بێـدەنگی هـانم دەدات، دنیـاش بـە دیمەنـە دڵڕفێنەکانی خۆی بۆ من بەخشندەیە، لێ لە وەڵامدانەوەی پرسـیارەکاندا ڕژدە ئـەوەتا هـاوین هـەتاو و گـەرمی و کـاتی تـەاوومان پێدەبەخـشێت، تـا خۆمـان بـۆ بـەفر و سەهۆڵبەندانی زستان ئامادە بکەین. تەورێز! وا بەرەو تـۆ دێـم تـا بازرگـانی بکـەم و بگەڕێمەوە، بەیانی زوو سابلاخم جێهێـشت و بـێ دواکـەوتن دەگەمـە تـۆ ، ئەسـپ و قاترەکـانم ڕەوهـانن و منـیش پـێچ و پـەناکانی ئازەربێجـان بەڵـەدم، هـەموو چـیا سـەرکەشەکان و گشت کانیاو و درەختێك شارەزام. ڕێگەی خـۆم لـە دۆڵـە سـەوزەکاندا دەبڕم و خۆم دەدەمە سێبەری درەختە خۆڕسکەکان و ئاشنای بەرزاییـەکانم. دەڕۆم و لای

هیچ شتێك لانادەم، بە بێ وەستان بەیانی دەدەمە دەم چێشتەنگاوەوە، بەرەبەری نیوەڕۆ گەیشتمە نزیك كانیاوێك كە بازرگانەكان ناویان نابوو كانی پاشا. وەك پیشەی هەمیشەییم لە هەموو سەفەرەكانمدا بۆ تەوریز بارگەم خست و ئەسپەكەم و قاترەكانم لە كانییەكە ئاودا و لە بن دارێك دانیشتم و توێشووبەرەكەم دەرهێنا و لە ئاوی كانییەكە دەستەكانم شت و ناوی خودام لێ هێنا " بەناوی تۆ خودایە"...، هێشتا نزاكەم تەواو نەكردبوو، پاشماوەی نزاكە لەسەر زمانم قەتیس بوو و دەماری بیركردنەوەمی بڕی، ئەوە تەقەی تفەنگێك بوو بە تەنیشتمەوە ئاوی كانییەكەی هەژاند، ئەسپەكەم راپەڕی و هێسترەكانم دەستیان بە سمكۆڵان كرد. من لە بەرانبەر درەختەكە بووم و ئاوڕێكی دواوەم دایەوە و تەماشایەكی نێو تاشەبەردەكانم كرد، بە درەختەكاندا هەڵم روانی و كەسێكم نەدی، بە دەنگێكی بەرز بانگم كرد:

ــ ئەوە كێیە؟!

دەنگێك كە شەڕانگێزی لێ دەتكا وەڵامی دایەوە:

ــ واز لە ئەسپەكەت و قاترەكانت بێنە و هەڵێ...، دەی گیانی خۆت رزگار بكە.

هەڵنەلەرزیم و هێشتا دڵم بە بەرییەوە مابوو، بەڵام ناوی خودام هێنا و پرسیم:

ــ كوڕە تۆ كێیت؟

دەنگەكە بەلەز و دڕندانە وەڵامی دایەوە:

ــ من هەڵۆی بریندارکەرم، جەعفەر ئەكبەرم...، حسینی برامیش لەگەڵمدایە...، ئێمە ئەو كەسانەین، كە چیاكانی كوردستان لە حەژمەتان لەبەرمان هەڵدەلەرزێن، گەر جەربەزەترین پیاوی ئازەربێجان تووشمان ببێت، لە ترسان خۆی پیس دەكات!

ئەو دەمە هەستم بە ئارامییەك كرد و وتم:

ــ من نە ئەشقیا و جەربەزەم و نە شەڕانگێزیشم، من شلۆمۆ كوڕی یەهودا كەتانییم. جەعفەر وەرە دەرەوە، با حسێنی براشت لەگەڵتدا بێتە دەرەوە، با لە یەكتر تێبگەین.

هەردوو خوێنڕێژەكە لە پشت تاشە بەردێكەوە بە گومان و دەموچاوی هەڵپێچراوەوە هاتنە دەرەوە، هەردوو براكە سەر و تفەنگیان بە دەستەوە بوو و روویان لە من كردبوو،

تا نزیکتر دەبوونەوە، پتر ترسم لێ دەنیشت، ئەوان ناسیمیانەوە، تۆ بڵێیت ئەم خوێنڕێژانە تەوە بکەن؟! بە چاوی خەیاڵ باڵندەی گۆشتخۆرم دەبینی کە لە نزیک کانییەکە کۆ دەبوونەوە، چونکە جەعفەر و حوسێنی برای روویان بکردایەتە هەر شوێنێك، ئەوا هەڵۆ و داڵە کەرخۆری لێ کۆ دەبووەوە، لێم نزیك بوونەوە، لوولەی دوو تفەنگەکەش لێم نزیکتر بوونەوە، نەمهێشت ترس زمانم لاڵ بکات، دەنگم لێ هەڵبڕین:

ـــ نا! ئێوە هەردووکتان لەوە ئابڕوومەندترن، کە ئەوەم لەگەڵدا بکەن، چونکە ئێوە هەردووکتان بەو دوو گەردنەتان قەرزاری باوکی منن!

کپییەك باڵی بەسەر شوێنەکەدا کێشا، تەنها خشەی گەڵای درەخت و خورەی ئاو دەبیسترا، باڵندە ترساو و هەڵاتووەکان گەڕانەوە نێو هێلانەکانیان، لەسەر درەختێکەوە چۆلەکەیەك جریواندی، لێ قەلەڕەشێك نەی قغاند. دەنگی چۆلەکەکە نوقڵانەیەکی خۆشی پێدام، بینیم لوولەی هەردوو تفەنگەکە رووم لێ وەردەگێڕن و هەردوو خوێنڕێژەکەش لەنێو خۆیان چپە چپ و راوێژ دەکەن. دەی وا ئێستا من لە تاوانی کوشتنێکی دیکە رزگاریان دەکەم...، باوکیشم لە پەتی سێدارەیەك رزگاریکردن، کە لێی هەڵاتبوون. باوکم دۆستی دەسەڵاتداری هەرێمەکە و پیاوانی دەسەڵات بوو، ئەوە بوو جەعفەر و حسێنی برای دەستگیر کران و سزای لە سێدارەدانیان بەسەردا درا. باوکیان هاتە لای باوکم تا رزگاریان بکات، لەبەردەم باوکمدا بە چۆکدا هات و خاکی بەرپێی ماچکرد و بە گریانەوە پاڕایەوە "یەهودا، تۆ دەستت دەڕوات، تەنانەت دەسەڵاتدارانی تارانیش گوێت لێ دەگرن، لای ئەوان کارێکی وا بکە، بەڵکو لە جەعفەر و حسێن خۆش بن و لە پەتی سێدارە بیان هێنە خوارێ، ئەوسا بیان بە و بیانکە بە دوو کۆیلەی خۆت".

جەعفەر وتی:

ـــ کەواتە تۆ شلۆمۆی کوڕی یەهودا کەتانیت!

یادەوەرییە نزیکەکە هێزێکی وەبەرهێنامەوە و بە جەعفەرم وت:

ـــ گەر باوکم نەبووایە، ئەمێستا تۆ و براکەت لەنێو زیندوواندا نەبوون.

باوکم لە کەس نەدەپاڕایەوە، بەڵکو وەك فەرمانێك داوای دەکرد. بە دۆستەکانی وت "گەردەنی ئەو دوو برایەم پێ ببەخشنەوە". دەسەڵاتدارانیش پێیان وتبوو "با داواکارییەك بنووسن و داوای بەزەیی بکەن و بەڵێنی تۆبەکردنیش بدەن، ئیدی پاشماوەی کارەکە لەسەر ئێمەیە".

حوسێن بە داوای لێبوردنەوە وتی:

ـ لە ناسینەوەت بە هەڵەدا چووین، ئێ هەر خودا هەڵە ناکات. بە دەنگێك کە دۆڵ و کانیاو و درەخت و زیندەوەران ژنەوتیان، وتم:

ـ لە سایەی باوکی منەوە فەرمانی لێخۆشبوونتان بۆ دەرچوو.

جەعفەر وتی:

ـ ئێمە بەسەرمان قەرزاری باوکی تۆین، هەرچییەك دڵت دەیخوازێت فەرمان بدە، هەر ئێستا دەست بەجێ جێبەجێی دەکەین.

ـ ڕێگەی من بەرەو دەرباری شایە، بەڵام من یەکەم جار بەرەو تەورێز سەردەکەوم، تا باری هێسترەکانم بفرۆشم و کارەکانمی پێ ڕایی بکەم و ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ پێویستی ئەم سەفەرەم بەشم بکات.

جەعفەر و حسێن پاڵ بەردەکەیان بەردا و ماوەیەکی زۆر گەشانەوە. هەستم کرد هێزم وەبەر هاتەوە و دڵیشم وەك تاشەبەردەکە قایم بووەوە، نازانم بۆچی نوقلانەی باشم لێدا، بەڵام سەوزایی دۆڵەکە لەبەرچاوم فراوانتر بوو، دەنگی پەلەوەرەکانیش لە گوێچکەمدا بوو بە ئاوازێکی ئەفسووناوی، ئینجا تەماشام کرد وا هەردوو براکە لێم نزیك دەبنەوە، گوێم لێ بوو جەعفەری برا گەورە پێم دەڵێت:

ـ خەرجی سەفەری تەورێزت بۆ دابین دەکەین و بارە جەوتەکە و هێسترەکانت پێکەوە لێدەکڕین، هەر ئێستا ئەو نرخەی داوای دەکەیت دەستبەجێ دەتدەینێ.

ئەی خودایە! تۆ لەگەڵ شلۆمۆی بەندەت چەند بەخشندەیت! ئا...، سەوزایی دۆڵەکە و چریکەی بولبولان سەرەتای نوقلانەکەمە. خەم و ناخۆشی بوو بە خۆشی و ئەرکی هەندێك ڕێگەشم لە کۆڵ بووەوە و بێ ماندووبوون کەلوپەلەکانم فرۆشت! لە

کاتێکدا شادمانی لە دڵمەوە بەرەو دەموچاو و دەنگ و هەڵسوکەوتم هەڵدەقوڵی، بە هەردوو براکەم وت:

ــ ئەوەی لە دەستتان دەردەچێت بمدەنێ، من سازش بە کەلوپەل و ماڵەوە ناکەم!

بەڵێ ئەی باوکی سەلمان، رەنگە ئەو رۆژە خۆشی و شادمانی خۆتت لە جەعفەری برا گەورە و براکەی شاردبێتەوە، بەڵام بۆ من شتێکی شارراوە نییە، بەوپەڕی باوەڕ بە خۆبوون و سەرکەوتووانە پێکەنیت و لەگەڵ گێڕانەوەکەدا تام و بۆنی سەرکەوتنێکی خۆشی لێدەهات. ئەو رۆژە جەعفەر کیسەیەکی بۆ تورِ دایت و حوسێنی برایشی کیسەیەکی وەك ئەوەی ئەوی بۆ فڕێدایت، وەك ئەوەی باسی نهێنییەکم بۆ بکەیت کە دەیان ساڵی بەسەردا تێپەڕی بێت، پێت وتم "تەنانەت لە خۆشترین خەونمدا، خەونم بە دەیەکی ئەوەوە نەدەبینی کە پێیان دام، نرخەکەیان دوو هێندە بۆ زیاد کردم، ئەمە گوایا ویستیان بەرانبەر چاکەکەی باوکم پاداشتم بدەنەوە".

بەهۆی چاکەی دوو خوێنڕێژەکەوە بە شوێن خۆمدا گەڕامەوە، هەر لە سۆنگەی چاکەی ئەوانەوە گەیشتمە گوندێك و تا بەیانی لە خانەکەیدا مامەوە، ئینجا رێگەی خۆم بەرەو تاران و دەرباری شاهانە گرتە بەر.

لەخودا بەزیاد بێت، هەر کاتێك کەوتبێتمە نێو تەنگژەیەکەوە، ئەوە رزگاریکردووم و خستوومییە ئامێزی خۆشییەوە.

***

تاران بەو جەنجاڵییەی خۆیەوە بنیادەمی تێدا ون دەبێت و ناسنامەی تێدا دەسڕدرێتەوە، بە ئەسپێك و توورەکەیەکەوە کە ئامرازی نوێژ و نزای یەهودییانە و دوو کیسە پارە و پاشماوەی خواردنی تێدایە، بەسەر پشتی ئەسپەکەشەوە پیاوێکی باڵابەرز فەرمانێکی شاهانەی پێیە و بەرەو کۆشکی ئیمپراتۆرێتی لە تۆپخانە، دەچێت. لە نێو سەریشیدا بیرۆکەی زۆر کەڵەکە بووە. ئاپۆرەی خەڵك لە بەرچاوانی بزر دەبێت و ژاوە ژاو کپ دەبێت و هەر ئەسمەر و ئیستیر و منداڵەکان لەبەرچاوی دەمێننەوە، ئاخۆ ئێستا دەبێت خۆشەویستانم چی بکەن؟، هەروەها شەکەتی سەفەر و ئارەزوویەکی زۆری خۆشتن و بڕێ پشوودانیش دەمێننەوە. نەختێکی دی رووبەڕووی قاجاری زۆردار و

کەللەرەق دەبێتەوە، نەختێکی تر شا ئەحمەد دەیبینێت، ئا دەیبینێت، ئەی چی پێدەڵێت و بۆچی بانگیکردووە و فەرمانی پێداوە کە ئامادە بێت؟

ئەوە تۆپخانەیە و بە تەنیشتیشیەوە کۆشکە، پارکە، بازاڕیش لە دەستی ئەو بەرەوەیە، دەمێکە چاوی بە خێر و فەڕی ئەم بازاڕە نەگەشاوەتەوە، لە توورەکەکەدا دوو کیسە هەیە، گەر خودا کردی و بە زیندوویتی لە لانەی شێر هاتە دەرەوە، ئەوا بە خێر و فەڕی تاران و شتی نایابەوە بەرەو سابلاخ دەگەڕێتەوە، کەواتە هەم زیارەت و هەم تیجارەت. لە سابلاخ خەڵکی دەڵێن: شلۆمۆ کەتانی لە دەرباری شاهانە گەڕایەوە و شتوومەکی تارانیی هێناوە!، بەڵام تۆ راوەستە و ئەوەندە لە گەشبینی زێدەڕۆیی مەکە، چونکە تۆ لەبەر دەرگایەکدایت، رەنگە بە چوونە ژوورەوەی تووشی کارەساتێك بیت، ئەحمەد شا! ئاخۆ چیت لە جوولەکەیەکی کوردی داماو گەرەکە؟ پرسی ئایا بە راستی داماوە؟ لە نزیك دەروازەی شایانە لە ترسان دڵی کەوتە لێدان و وتی "بەڵێ من داماوم، چونکە بەبێ ویستی خۆم چارەنوس بەرەو پێشهاتێکی هێناوم، کە هیچی لێ نازانم، ئاخر بێ ئەوەی لە ژیانمدا دەرهەق کەسێك تاوانێکم کردبێت"، بەڵام ئەی ئیستیر؟ ئەی ئەوە گوناهێك نییە بەرانبەر ئەسمەر کردی؟! لەو دەمەیدا فەرمانی شاهانەکەی دایە پاسەوانەکە، لەبەرخۆیەوە وتی "نەخێر، من نیازم وابوو ئیستیر لەبیر بکەم، بەڵام ئەسمەر سوور بوو لەسەر ئەوەی بۆم بخوازێت". فەرمانەکەیان دایەوە دەستی و مۆڵەتیان دا کە بۆ لای شا بچێتە ژوورەوە، ئەسپەکەی بە لقی یەکێك لە درەختەکانی کۆشکەوە بەستەوەو توورکەکەی لەگەڵ خۆیدا برد. دنیا و ئاین لەنێو ئەم توورەکە کۆنەدایە، رزگاربوونی بڕوادار و بێ باوەڕی تێدایە، توورەکەکەی بە سینگییەوە نووساند، بۆ ئەسپەکەشی ئاماژەی بۆ ئەو دەستوپێوەندانە کرد، کە لەدەرەوەی دەرگا رەق راوەستابوون، رای سپاردن کە ئاگایان لێی بێت، داوای لە خودا کرد کە لە شەڕی ناگەهان بیپارێزێت...، ئینجا ئازایانە بەرەو رووی نادیارەکە چووە ژوورەوە.

* * *

ئەمە زەردەخەنەی سەرکەوتوویەکی لەخۆ دڵنیایە، کە هەمیشە لەسەر ئەم رووخسارە نەخش بووە. ئەمێستا تۆ ئاوێنەی منیت، بەڵام وا من لەبەر دەرگای کۆشکی شاهانەم و ئاوێنەکە نابینم. ئەم رووخسار و سیمایە ئەو کاتەی بۆ لای قاجاری دەچمە ژوورەوە، هەروا وەك خۆی دەمێنێتەوە و دەبێتە جۆرێك لە پێشبینی و خەملاندن. ئەرێ ترسایت؟ نازانم، بەڵام بێگومان کارێکی پڕ لە نادیار و مەترسی بوو، ئەو ساتە بە خۆڕاگری و پشتیوانی بڕوا سوودمەند بووم، سەرم بۆ لاف لێدەران و لەخۆبایی بووان بەرز دەکردەوە و جگە لە خودای خۆم بۆ کەسی دیکەی دانانەوێنم. باوەڕپێکراوی خاوەن شکۆ رای گرتم و فەرمانی پێدام کە جلەکانم لەبەرم داکەنم، دەستی لەناو توورەکەکەدا گێڕا و پشکنی، بینیم و ئێستاش لە یادمە، چاوەکانی بە ئارەزوومەندی و سەرسامییەوە درەوشانەوە، ئارەزووی پارە و سەرسامی بەرانبەر جزدانێکی چەرمینی رەش کە بە شەش پاڵوویەکی چون سندووق دەورە درابوو، هەروەها بەرانبەر پارچە قوماشێکی میل میل کە لە هەردوو لاوە بە هەودای ئاوریشم چنرابوو، پێم وت:

ـ بە ناوی خاوەن شکۆی منیش و تۆش، کەمێ لەسەرخۆ بە و دەستت لە پشکنینی ناوی خودا دوور بخەوە، تا خودای من و تۆ سزات نەدات و دەستەکانت ئیفلیج نەکات!

بە راستی لە هەردوو چاوییەوە تیرێکی ئاگرینی ئاراستە کردم، بەڵام دەستی لەرزی و لە کەرەستەی نوێژ و دوعاکانم کشاندییەوە و هەموو شتەکانی بۆ ناو توورەکەکە گێڕایەوە و وتی:

ـ تا دێیتە دەرەوە ئەمە لێرە دابنێ.

نا... نا، پارەکە لەناودەچێت، کەرەسەی نوێژ و دوعاکانیشم بەکاردێنم، ئینجا کێ وتوویەتی من بە پێی خۆم لەم کونە دێمە دەرەوە؟ دەبێت توورەکەکەم پێ بێت و هەر لەگەڵ خۆمدا لە کۆشك بێتە دەرەوە، ئیتر بەرەو سابلاخ بێت، یان بەرەو گۆڕ.

ـ گەر لە ملم بدەیت توورەکەکە لێرە جێناهێڵم.

توورەکەکەم لە دەستی وەرگرت، ئیدی وەك ئەوەی ئاواتەخواز بێت لە ملم بدرێت، وتی:

ــ ئومێدەوارم ئەمە بە راستی لە خزمەت شای خاوەن شکۆمان بێتەدی!

نەفرەت لە دەرباری شا! ئەم نەفام و گەوجە (شای شاکانی دنیا)یە.

نەفرەتی لێ بێت، ئەوێك یاری بە چارەنووسی خەڵك بکات و دەوروپشتیشی دەستوپێوەندێکن دەستەبژێری ئێرانن و بە بادەی زێڕ شەرابیان لەگەڵدا نۆش بکات! ئاخۆ پیران و ماقووڵانی تاران لەم رووەوە چی پێ بڵێن؟ ئەو ساتەوەختە، ساتەوەختی شەیتان بوو، بێگومان ساتی گەمە و خۆشی و چێژ وەرگرتن بوو، نازانم ئایا نوقڵانەی گەشبینی لێ بدەم، یان رەشبینی؟ راوێژکارەکەی چەپەیەکی بە گوێچکەی شادا دا و ئاماژەی بۆ من کرد ــ فەرمانەکەی دووبارە لێ وەرگرتم و دای بە شا ــ شا چاوێکی بە فەرمانەکەدا گێڕا، من هەستم بە جۆرە ئاڵۆزییەك کرد.

ــ وەرە پێشەوە.

فەرمانی شایە...

پێیەکانم تێك ئالان...، منجەمنجێکی تێکەڵ لە گاڵتە پێکردن و نارەزاییم بیست، چەند دەستێك لە پشتەوە گرتیانم و بەرەو فەرشە سوورەکەی سەر زەوییەکە پاڵیان پێوە نام.

ــ چۆك دابدە!

ــ وەرە پێشەوە!

ــ چۆك دابدە!

ــ وەرە پێشەوە!

ئەی خودایە، تەنها بۆ تۆ بە چۆکدا دێم، بەڵام لەنێو گەرداوی پێکەنین و نارەزاییدا بە زەویدا کەوتم، بەرەو پێشەوە بە زگە خشکێ کشام، چون منداڵێکی یەك ساڵان گاگۆلکێم کرد...، لەگەڵ ئەوەشدا بەختەوەر بووم، چونکە نێوان من و کەسوکارم و دۆستانم مەودایەکی یەکجار زۆر و فراوان بوو، خۆ ئەگەر یەکێك لەوان بینیبای وا من بە زگەخشکێ دەڕۆم، دەمردم! وا ئەم دەستەبژێرانەش گاڵتەم پێدەکەن و پێدەکەنن وەك ئەوەی من (لیبۆکی) شا بم، یان مەیموونێك بم سەما بکەم.

ــ راوەستە.

وەستام و توورەکەکەم هەر بە دەستەوە بوو، لە کاتێکدا زمانم و ئاوەزم هەر خەریکی پیرۆزی و ناوهێنانی خودای ئەفرێنەری ئەم زۆرداره بوون!

ــ ئەو توورەکەیە چی تێدایە؟

کەمەکێك دامام، ئینجا زاتێکم وەبەرهاتەوە:

ــ کەرەسەی نوێژ و دوعاکانم و برێ پارەی تێدایە...

دەنگی نارەزایی بەرز بووەوە و فەرمانیان پێدام:

ــ بێژە ئەی سەروەرم، بێژە ئەی سەروەرم!

هزری خۆم بەرەو خودا ئاراستە کرد و بە هێواشی وتم:

ــ ئەی سەروەرم!

بادەی زێڕین لەبەردەمی دانراو شادمانی و لەخۆبایی بوون تێکەڵی لیکاو بوون و بە دەمیدا چۆڕانەوە.

ــ تۆ شلۆمۆی کوڕی یەهوودا کوردەی جوولەکەی سابلاخیت؟

ــ من ئەوم...

دووبارە دەنگ بەرز بووەوە:

ــ بێژە ئەی سەروەرم، بێژە ئەی سەروەرم!

جارێکی تر بیری خۆم بەرەو خودا ئاراستە کرد و وتم:

ــ ئەی سەروەرم!

سەنگینییەك کەوتە سەر رووخساری قاجاری و وتی:

ــ هەواڵم پێگەیشتووە، کە تۆ لە کوردستان خەڵکی بۆ شۆڕش و یاخی بوون هان دەدەیت!

خۆم پێ نەگیرا و پێکەنیم، شیراندی و دەستوپێوەندەکەیشی لە دوایەوە وەك دەنگدانەوەی شیرەکەی ئەو شیراندیان:

ــ بێدەنگ و بە وێڵ بە...

بێدەنگ بووم و وێڵم نواند. ئاکاری من هەر ئەوە بووە کە خۆم لە بەندە بەدرەفتارەکانی خودا بەرزتر ببینم، نا، ئەوە شتێکی ترە، کاتێك لە رۆژی شەممەدا

جنێوت پێدەدەم، ئەز ئەوە لە کاتێکدا دەکەم کە تۆ بەرەنگاریی راسپاردەکانی خـودای گەورە دەبیتەوە، بەڵام قاجاری سووکایەتی بە کەسێتی مـن دەکات، ئەم دەوڵە بەتاڵە بە خۆ فشکردنەوەوە بێدەنگ بوو، لەو ساتەدا کەسوکارم و دۆستانم و سابڵاخم بیر چووەوە، جا بۆ ئەوەی خۆم لە درێژدادڕی ئەو بەرزتر رابگرم، زمانی خۆم گرت، بەڵام دووبارە بـە شێوەیەکی کێوییانە بە توندی لە دەوڵەکەی دایەوە و گوێی کەڕ کردم:

ــ دەی قسە بکە! دەربارەی ئەوەی بیستت چی دەڵێیت، ئـەی بۆچـی وا لـە پـڕ لاڵ بوویت؟

ــ داوات لێکردم کە لاڵ بم، بۆیە مـنیش لاڵ بووم.

دەنگ بەرز بووەوە:

ــ بێژە ئەی سەروەرم! بڵێ ئەی سەروەرم!

وتم و وتنەکەم رووە و خودا بوو، دووبارە وتی:

ــ تۆ کوردان بۆ شۆڕش و یاخیبوون لە دەوڵەت هان دەدەیت...

ــ من... ئەی... (سەروەرم)، من جوولەکەیەکی بازرگانم و پەیوەندیم بـە کاروبـاری وڵات و دەسەڵاتەوە نییە.

ــ کوڕە ئەوە لە خزمەت سەروەرتدا درۆ دەکەیت؟

کتێبی نزا و تەفلیمەکەم لەناو توورەکەکە دەرهێنا، تا لەم بەڵایە خۆم قوتار بکەم.

ــ ئەی (سەروەرم) ئەمە ناوی خودایە و سوێندی پێ دەخۆم، کەسـم هـان نـەداوە، بەڵکو رۆژێك لە رۆژان دەربارەی کاروباری دەوڵـەتیش قـسەم لەگـەڵ هـیچ کەسـێکدا نەکردووە و...

بە تووڕەییەوە قسەکەی پێ بڕیم:

ــ سوێند مەخۆ، کوڕە تۆ بە درۆ سوێند بە نـاوی خـودا دەخۆیـت! نکـوڵی لـەوە دەکەیت، کە چەکت لە رووسیاوە هێناوە و بە کوردانی دەفرۆشیت؟

ــ من بازرگانم...

دووبارە قسەکەی پێ بڕیم و لـە ناخیـدا گـەرداوێك هـەڵیکرد و لەسـەر کورسـی دەسەڵاتەکەی کەوتە خۆ لەنگاندن:

ـــ هەی کوڕی سۆزانی، بازرگانی دەکەیت! سەد دەمانـچە و تفـەنگی جۆراوجـۆر، خۆت دەزانیت چل پارچە چەك بۆ بەرپابوونی یاخی بوون بەسە؟

ـــ ئەی...، سەروەرم هەرگیز ئەمەم بە خەیاڵدا نەهاتووە.

شای کەللە پووچ لەوەی وتم ساتێك راما و بە سەوڵە جانەکەی ئاماژەی بۆ من کرد:

ـــ رەنگە لەمەدا راست بکەیت، لەبەرئەوە نەبووایە کە جوولەکەیت و بیرکردنەوەت تەنها لای پارە و سامانە، ئەوا هەر ئێستا فـەرمانم دەدا لەسـەر شـەقامە گـشتییەکە هەڵت بواسن، بەڵام من دەست لە تەمێکردنت هەڵناگرم، تا لەمـەولا پـارە و سـامان کوێرت نەکەن. کەواتە لەنێوان پەنجا جەڵدە بە داری تەڕ و سەد جەڵدە بـە داری وشـك یەکێکیان هەڵبژێرە.

کەواتە ئەمە مردنە و دەستی لێهەڵناگرێت، لێ بە چەشنێك دیاریکرد، گەلێ لـە هەڵواسینەکە بـە سـوێترە، ئـێ منێکـی کـورد و سەرسـەخت، باڵابـەرز و پتەوەکـەم دارکاژێکی بەپێوە وەستاوە و لەسەر خاکی کوردستان گەشەی کـردووە، داربەڕوویەکـە بەزەبرترین باو بۆرانی دنیا هەڵیناکێشێت، دڵیشم بەشێکە لە تاشەبەردی وڵاتێـك کـە لە ئامێزیدا پەروەردە بووم. دڵم نالەرزێت و لە ترسان لێ نـادات، بـەڵکو لـەم زۆرداره ملهوڕە تووڕەیە، کە لەسـەر کورسـی دەسـەڵاتەکەی دانیـشتووە، گەمـە بـە گـەردنی گەلەکەی دەکات و بەناڕەوایی دایان دەپلۆسێت، ئەو لە کەسێتی منـدا سووکایەتی بـە داد پەروەری دەکات و زۆرداری و ستەمی خۆی لە جەستەی منـدا بەرجەسـتە دەکـات، هەردوو هەڵبژاردنەکەیم لا قـورس نییـە، تـەنها ئـەوەم لەبەرچـاو بـوو کـە مـن بـە بەرەنگاربوونەوەی ئەم مەرگە سەپێنراوە، بەرەنگاری شای قاجاری دەبمەوە، ئیدی ئاوهـا جوامێری و تووڕەیی کوردانەم تێدا راپەڕی:

ـــ نەخێر، ئەو مەرگەی تـۆ خـۆت بـۆت ئامـادە کـردووم، بـۆمی هەڵبـژێرە، بـە پشتیوانی خودا بە زیندوویتی لێی رزگار دەبم.

شا شێت و هار بـوو، پریـشکی ئـاگری چـاوەکانی چـزەی لێهەسـتاندم، ژاوە ژاوی ناڕەزایی پڕاو پڕی هۆڵەکە بەرز بووەوە، هەستم بە جـۆرە پاشەکـشێیەك کـرد، وام بـە

خەیاڵدا هات، کە باجی بەرەنگاربوونەوەکەم بە ژیانی خۆم دەدەمەوە، قاجاری بەدەم هەڵقوڕاندنی شەرابەوە وەك ئەوەی خوێنی من هەڵقوڕێنێت، قیڕاندی:

ــ بەم دارە تەڕە پەنجا جەڵدەی لێدەن و بە وشکەکەیش سەد جەڵدە، تا هەر ئێستا بە بەرچاوی خۆمەوە ئەمە بکەن.

کەسوکارم و ماڵەکەی خۆم هاتنە بەرچاوم، سابلاخ بە خانووبەرە و باخ و کانیاوی و ئاسمانی شینی و دەشت و دۆڵییەوە هاتە بەرچاوم، ئەمانە هەموو پێکەوە هاتنە نێو کۆشکی شاوە و لەبەرچاوم قوت بوونەوە، تاشەبەردەکە کەمەکێك لە هەردوو لامەوە لەقی و ئینجا ئارام بووەوە، خودا لە پێش و دواوەم بوو، لە بان سەرم و دەوروپشتم بوو، بە پەردەیەکی پارێزەری سێبەری خودا دەورە درابووم، متمانەم بەو خۆڕاگرییەم هەبوو، کە لە بڕوا و وەستانم بەرانبەر زۆرداری و ستەم سەرچاوەی گرتبوو، جلی سەرەوەم لەبەر داکەندرا، بەڵام کەرەسەی نوێژ و نزاکانم بە توندی گرتبوو، دەستم لێگیر کردبوون، کە ناوی خودایان لەسەر بوو، وازم لە پارەی ناو توورەکەکە هێنا، کە لە نزیك خۆمەوە و لە ناوەڕاست هۆڵی دەربارەی شا کەوتبوو. ئەمێستا شا چێژی لە ئەشکەنجەدانم وەردەگرت و شەرابەکەی ئارێتەی ئەو خوێنە دەبوو کە لە پشتم بەردەبوو. کاتێکیش بە زەبری لێدان لە هۆش خۆم دەچم، ئیدی لەزەتی قاقای پێکەنینی شا بە ئەشکەنجەدانم، ناژنەوم. تا ئەوەتا یەکەم لێدانی دارە وشکەکەم بەردەکەوێت، کە بەسەر پشتمدا وژەی دێت، ئەوە هاواری ئێش و ئازارە و لە هەموو بوونمەوە هەڵدەستێت، هاوارەکەم قووت دایەوە، یەکێکی تر... یەکێکی تر و... یەکێکی تر... هۆ ئیستیر، بە چاوانی تۆ من خۆم ڕاگرتووە، نا، بە گیانی ئازیزی تۆ ئەسمەر، هۆ دایکی منداڵان، شتێك لە پشتمەوە ورد و خاش دەبێت، ئاخۆ ئەوە دارەکەی دەستی جەلادەکەیە، یان پشتی منە؟! شتەکەم لێ تێکچوو. پشتم دەریایەك بوو لە ئازاری خوێنێکی هەڵقوڵاو... نەخێر، ئەوە دارەکە بوو شکا، دارە وشکەکەی شا، ئۆخەی! دارەکەی لەسەر پشتە بەستەزمانەکەم شکا! من هەناسەبڕکێمە، هێشتا ئاگام لە خۆمە، لە دەریای ئازارەکانمدا نوقم بووم. لەگەڵ هاواری جەستەی هەلاهەلا بووم دەنگێکی دیکەی شێتانە دەژنەوم و هاوار دەکات:

ــ دارە تەڕەکە بێنن! هەر ئێستا دارە تەڕەکە بێنن.

داره تەڕەکە، بە جۆرێ تەڕ و شێداره ئاوی لێ دەتکێتەوە و بەسەر پشتمدا ئازار و خوێن دەتفێنێتەوە. هەوا ئازار بەخشە و ئێش بە پشتی من دەگەیەنێت، شا پێدەکەنێت، دەستوپێوەندەکەی پێدەکەنن، شەیتان پێدەکەنێت، زۆرداری پێدەکەنێت، ستەم پێدەکەنێت، پشتی منیش ئازار دەکێشێت. دڵم، هزرم، هەناسەم سواره، گەرووم ئاهەکانم قەتیس دەکات، گریانی پشتم خوێنە، بیرم تەمومژه. شا پێدەکەنێت، شا تووڕە دەبێت، ئەی من بۆچی هاوار ناکەم؟ بۆ ناپاڕێمەوە؟ ئەی بۆ ناکەوم؟ بۆ ناڕووخێم؟ لێدە! دارکاری بکە، کێوییانە لێدە. هاواری یەکەمین ئازار! ئەی ئێش و ئازار نەفرەتتان لێ بێت، ئەی ئازار تۆ بەهێزترین شێتیت. ئەی قاجاری نەفرەتت لێ بێت، تۆ بێ هێزیی زۆرداریت! تۆ تووڕەهات و جەبەروتیت! تۆ خودی خۆت نەفرەتیت! ئاخ! من لێدانەکان ناژمێرم، بەڵام لەگەڵیاندا بەرەو تونێلێکی تاریک دەڕۆم.

تاریکی تا دێت خەستتر دەبێت، هەور دەوری سەرم دەدات، هەورگەلێکی تەڵخ و ڕەش، ئینجا هیچ! هیچ شتێك! من لە کوێم؟ چاوانم کردەوە، هەوڵم دا ببزوێم، ئازارێکی زۆرم بۆ هات، پشتم پارچەیەکە لەو شتەی پێی دەوترێت (ئێشی کوشندە). لەسەر دەم کەوتووم، چاوم هەڵبڕی و شیشبەندم بینی، دەستم درێژ کرد و لەسەر زەوییەکە هەستم بە پەتۆیەك کرد، تووره‌کەکە! توورکەکەم بیرکەوتەوە! سەسید و تفلیم و کتێبی نوێژ و نزاکانم! کیسەیەك و کیسەیەکی تر ئەو گێل و کۆیلانە دەستکاری ئاین و پارەکەمیان نەکردووە، لەگەڵ شێتی ئازارەکانمدا هەستم بە جۆرە حەوانەوەیەك کرد. سەرباری وەڕینی پشتە هاربووەکەم، لە زارمەوە ئاماژەیەکم بۆ هات، وشکی گەرووم، تاڵی نێو دەمم، تینوێتی درزی بە لێوەکانم بردبوو. ئایا کەسێك هەیە گوێی لێم بێت؟ دڵۆپە ئاوێکم فریا بخەن! نەخێر، باشتر وایە بە سوپاس کردنی خودای میهرەبانم دەست پێ بکەم...، هەر خودا بوو ڕزگاریکردم و بە زیندوێتی هێشتمییەوە، سوپاس بۆ خودا! سوپاس بۆ خودا! ئەی ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ ئەی لە کەیەوە ئەرك و نوێژەکانم بەجێ نەگەیاندووە؟ پشتم! دەمم! ئازارەکەم! تینوێتییەکەم! ئەسمەر! ئیستیر! منداڵەکانم! کەسوکار و دۆستانم! ئەرێ کەسێك هەیە گوێی لێم بێت؟! چۆڕێك ئاوم بۆ بهێنن! های هوو، من هەر ئەوەتا دەنگی خۆم دەژنەوم! لەگەڵ ئەوەشدا وا هەستدەکەم دەنگی پێ دەبیستم،

بەڵکو هەڵسوڕاندنی کلیلی قفڵی دەرگای زیندانەکەش دەژنەوم، ئەوە جیڕەی دەرگاکەیە، بە وریاییەوە سەرم هەڵبڕی، ئەوە شەربەیەك ئاوە بە دەستی پاسەوانەوەکەوە، ئەوە یەکێکی تری لەگەڵدایە و جانتایەکی پێیە، پاسەوانەکە لەبەردەممدا چنچك دەداتەوە و پیاوەکەی دیکەش لە پشتمەوە چنچك دەداتەوە، پاسەوانەکە ئاوم دەداتێ و ئەوی تر پشتم دەپشکنێت و تەماشای پشتم دەکات، پشتم سەگێکی هار بووە، گەرمییەکە لە ئاگر...، ئینجا هەست بە شتهایەکی سارد دەکەم وا دەپرژێتە سەر ئەم ئاگرە، ئاگرەکە کەمەکێك دادەمرکێتەوە، سەگە هار بووەکە دەنگی نزم دەکاتەوە، پزیشك! پزیشك... ئەمە پزیشکە...، پزیشکیان بۆ هێناوم تا چارەسەرم بکات! ئاخۆ لەوە دەترسێن گیان لەدەست بدەم!؟ یان خودا بەزەییەکی خستۆتە دڵیانەوە تا بێنم؟!

ئاه... ئاوم خواردەوە...، ئێشەکەم سووك بوو...، بە دەنگێکی کزەوە پرسیم:

ــ من لەکەیەوە لێرەم؟

پاسەوانەکە وتی:

ــ تۆ لە دوێنێوە لێرەیت.

گوێم لێ بوو پزیشکەکە بە خۆشییەوە دەڵێت:

ــ ئەوەتا تۆ قسە دەکەیت! پێیان دەڵێم خواردنێکی سووکت بۆ بهێنن، تا هێزت وەبەر بێتەوە.

هاوارم کرد:

ــ نا! جگە لە (کاشیر) هیچ خواردنێکی تر ناخۆم.

بە پێکەنینەوە وتی:

ــ ئەوە دەزانین، بۆتی جێبەجێ دەکەین.

ــ چۆن؟! چۆن؟!

ــ پیاوێکی ئایینی جوولەکە خواردن و قاپ و قاچاخی خواردنەکەت لە ئەستۆ دەگرێت، بە تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە بانگمان کردووە.

ئایا بڕوایان پێ بکەم؟! ئێ خۆ کارەکە گران نییە، دەتوانین یەکتر بناسین، بە زمانی عیبری دەی دوێنم "شەماع یسرائیل" نیشانەمانە و شایەتمان و بڕوامانە و بە یەکتایی

خودا، ئاوهاش شتەکە دەبڕێنینەوە، چونکە هەر لەناو بێشکەوە فێری ئەمەمان دەکەن و هەتا دەچینە ناو گۆڕەوە هەر دەیلێینەوە، واقم وڕما، نەك لەبەرئەمە، بەڵکو لە کردەوەی ئەم جەلادانە واقم وڕما، ئایا ئەوەندە بە تەنگەوەن تا ئەو رادەیەی خواردنی (کاشیر)م بۆ بهێنن؟! قاجاری ستەمکار لە سابلاخەوە بانگی کردووم بۆ تاران تا تینوێتی دوژمنکارانەی خۆی بە رشتنی خوێنی من بشکێنێت...، کەچی پزیشك و خواردنی کاشیرم بۆ دەنێرێت؟! سەیر و سەمەرەیەکە و لێی تێناگەم، رەفتارێکە و مێشکم ئالۆز دەکات، ئاکامی بەرەنجام و زیرەك و سەرسامیم ئەوەیە کە شا و دەست و پێوەندەکەی پێیان وایە خۆیان نزیکترین کەسن لە خوداوە، خەڵکیش لە روانگەی ئەوانەوە لەوە کەمترن تا هەست و هۆشیان تێدا بورووژێنرێ، ئینجا ئەو کەسەش کوردێکی جولەکە بێت و بە هاندانی خەڵك و لە ترسی دەسەڵاتە پەرستراوەکەیان تۆمەتباری بکەن؟! شتێکە و عەقڵ نایگرێت، ئاوها بیرم دەکردەوە، ئیدی وەك ئەوەی هزرم ئاسنێك بێت، نە بشکێت و نە نەرم بێتەوە، لەپڕ خواردنەکەم بۆ هات و دەرکەوت کە راستیان کرد. لەو جوولەکەیەی کە سەرپەرشتی خواردنەکەمی دەکرد پرسیم، تا راستی شتەکەم پێ بڵێت، وتی:

ــ یەکێك لە دەستوپێوەندی سەروەرمان بۆ لام هات و پارەی دامی و فەرمانی پێدام کە کاری خواردنی تۆ لە ئەستۆ بگرم و فەرمان و شەریعەتی مووسا و هارون رەچاو بکەم! بیرم پتر ئالۆز بوو و هۆشم وەستا، دەڵێت: "لە دەستوپێوەندی شاوە" ئاخۆ ئەوە کێ بێت؟ ئەی لەبەرچی؟ زۆری نەبرد دیسان ئاوەزم رووبەڕووی نابەجێیی کارەکە بووەوە، لە کاتێکدا لە راڤەکردن و دۆزینەوەی پاساو دەستەوسان بووم و تەنانەت بڕواداریيەکەشم لێرەدا نەیتوانی شتەکە یەکلایی بکاتەوە...، هەروا بە سەرسوڕماوی مامەوە، لێ دواجار بڕوام بە خۆم هێنا، کە خودا دەستی لە کارەکەدا هەیە، هەر خودایە لە دڵی کەسێکی ناوە کە بەزەیی پێمدا بێتەوە، بەڵام ئەو کەسە کێیە "یەکێك لەدەستوپێوەندی شا؟!" لەتەك هەزار ئامرازی پرسیاری دیکە چەند رۆژێك بەرەنگاری شەپۆلی سەرسوڕمان بوومەوە، لە کاتێکدا هێشتا لە زیندانەکەمدا بووم و ئێش و ئازارەکەمیش هێور بووبووەوە و نەختێك کۆتی جووڵاندنەوەشم پچڕاند، لەناکاو بینیم

پیاوێکی بەساڵدا چووی سەرو ریش سپی و باڵا بەرز و سەنگین لە پشت شیشبەندەکەوە زەردەخەنەم بە روودا دەدات و پێم دەڵێت:

ـــ سڵاو لە کوڕی خوالێخۆشبووی برام یەهوودا کەتانی!

بەد هەرەسی لە گەدەی سەرمدا پتر بوو، شەپۆلی سەرسوڕمان سەری کرد تا رادەی ئەوەی تێیدا نوقم بووم، ئاخر من نەمزانیوە مامێکم لە دەستوپێوەندی شا هەبێت.

ـــ کوڕی برات؟

ـــ من جەلال رافزیم و یەکێکم لە دەستوپێوەندی شاهانە خوالێخۆشبووی باوکت وەك برام وابوو، رۆژێك لە تەنگژەیەکی دارایی و بێ پارەیی رزگاریکردم، کە خەریك بوو تێیدا بچم، تا مردن ئەو چاکەیەی لەبیر ناکەم!

سەرسامییەکە لە ناخمدا بوو بە دوو بەشەوە، بەختەکەم لەوەدا بوو کە نیوەی سەرسوڕمانەکە پرسیار بوو لە (پیاوی دەربار)ی بە هۆڵەوە بووی من و وا ئەوە یەکلابووەوە. نیوەکەی تر بە هەزاران پرسیار ئاوسە، ئایا دەکرێت رێکەوت بەو شێوەیە بێت کە لە پەرجوویەك دەچێت، ئاوها پێکەوە هاوئاهەنگ بن؟ چاکەی باوکی خوالێخۆشبووم بەم شێوەیە دوو جار لە یەك سەفەردا فریام بکەوێت؟ من هەردوو خوێنرێژەکە جەعفەر و حوسێن ئەکبەر و حەکایەتەکانیان دەزانم، بەڵام ئەم پیاوە؟ شتێکم لە باوکمەوە دەربارەی پیاوێك بە ناوی جەلال رافزی نەبیستووە، تۆ بڵێیت بە راستی قەرزاری باوکم بێت؟ ئەی بۆچی ئەم بایەخەم پێدەدات؟ جەلال ئاغا لە غایلەکانم رزگاریکردم و وتی:

ـــ خەمی پزیشك و خواردنی کاشیرم بۆ خواردیت، خەمی دەرچوونیشت لێرە بۆ دەخۆم.

هەزار و یەك شەو دەژیت و ئەمێستا لێرە لەبەردەم مندا زیندوو دەبێتەوە، ئەرێ بە راستی ئێستا من لە پێچ و پەناکانی ئەفسانەیەکدا دەژیم؟

ـــ چۆن و کەی؟

ـ شا تۆی فرێدایە ئێرە، ئینجا تارانی بەجێهێشت و بەرەو سان پوترسبۆرگ سەفەری کرد، تا هەندێ لە هاوینەکە لەگەڵ قەیسەری روس نیکۆلای رۆمانوف ـ ی هاوڕێی بەسەر ببات.

ـ ئەی چۆن لێرە دەرم دەکەیت؟

ـ بووەستە با قسەکەم تەواو بکەم، شا نزیکەی دوو مانگ لە روسیا دەمێنێتەوە، کاتێك دەگەڕێتەوە تۆی هەر لەبیر نامێنێت.

ـ بەڵام تۆ لێرە دەرم دەکەیت وا نییە؟

ـ خودا منی بۆ تۆ رەخساندووە، تا لێرە رزگارت بکەم و قەرزەکەی باوکی خوالێخۆشبووت بدەمەوە!

پرسیم:

ـ ئەی کەی لێرە دەرم دەکەیت؟

وەك ئەوەی بە دوای شتێکدا چاو بگێڕێت، نیگای بە نێو شیشبەندەکەدا دزەی دەکرد، هەستمکرد چاو لە توورەکەکەم ـ دین و دنیا ـ دەگێڕێت. توورەکەکە لە سووچێکی زیندانەکەدا گرمۆڵە بووبوو، نیگای جەلال رافزیش مێشێك بوو لەوێ دەسووڕایەوە، بە جۆرێك خەریك بوو گوێم لە ویزە ویزی بێت، لە کۆتاییدا بە تف قوتدانەوە وتی:

ـ گوێ بگرە! من چاکەیەك دەدەمەوە و بۆ خۆم چاوم لە هیچ شتێك نییە.

بە تکاکردن تەنگەتاوم کرد و بە دەنگی بەرز وتم:

ـ گەر تۆ بە راستی دەرم دەکەیت، ئەی بۆچی پێمنالێیت چۆن و کەی؟

بەرپرسیارەکەم سەغڵەت نەبوو، بەڵکو وتی:

ـ کرێ دەستی پزیشکم داوە، هەروەها هەقی حاخامی جولەکەمیش داوە، گەرەکە کرێی بێدەنگ کردنی پاسەوانەکانیش مسۆگەر بکەم و بیانکڕم، هەندێك پارەش بدەمە لایەنی پەیوەندیدار، بۆ ئەوەی هەتا هەتایە لەبیرت بکەن، لە بنەوە پێکەنیم، من بازرگانم و زیرەکم. ئەوا نیوەی دووەمی سەرسامییە هەڵاوساوەکەی دەور سەریشم

ئاشکرا بوو و ئێستا تێگەیشتم، کەواتە ئەوە ئەفسانە نەبوو، ئــێ کەواتــە منیــك لــە توانامدا بێت خۆم بکڕمەوە، ئیتر خەمی چیمە؟!

ــ چەند؟

جەلال فارزی کەمەکێك زمانی گیرا، ئینجا وتی:

ــ بڕوام پێ بکە من چاکەیەك دەدەمەوە، بەڵام ئایا خۆت بــەوە قایــل دەبیــت، کــە بەشی هەموو ئەمانە لە گیرفانی خۆم بدەم؟!

لێم پرسیت چەندت دەوێت؟

ــ تۆ دوو کیسە پارەت هەیە وا نییە؟

ئا ئەوەتا تۆش وەك کوڕەکانی ئەکبــەریت، بــەڵام کــوڕانی ئەکبــەر درۆیــان بــەدەم مێژووەوە نەکرد...، چ گوێم لێیە؟ تۆ بە دووی ئاینی مندا ناگەڕێیت، بــەڵکو بــە دووی دنیامدا دەگەڕێیت، کوڕانی ئەکبەر بەم دوو کیسە زێڕە چاکەی باوکمیان دایەوە، تۆش گەرەکتە بەرانبەر (چاکەیەك) بۆ خۆت بیانبەیت. وتت:

ــ بەڵێ، دوو کیسە پارەن.

ــ رەنگە بەشی کرێی پزیــشکەکە و خــواردنی کاشــیر و هــەقی بێــدەنگ کردنــی پاسەوانەکان و کەسانی پەیوەندیدار بکات.

بەو خودایە ئێوە دزن! بۆی هەبوو پێش ئەوەی بگەمــە ئەم زیندانە هەردوو کیسەکە لەنێو بچن، بەڵام ئەی رافزی ئەوەت پێ باشتر بوو کە خۆت دەستیان بەســەردا بگریــت بە هۆیانەوە کاریگەر ببیت، لێرە گورگ زۆرن. کۆمەڵێ چەتەی هەڵبژاردە لە دەربــاری شا هەن و لەو گەنجینەیەی کە لە عارەقە و رەنجی گەلانی ئێران دەی دزن، سەرپەرشتی پڕکردنی خەزێنەکانی شا دەکەن! گەر باوکمت ناسی بێت یان نەت ناســی بێــت، گــەر وەك خۆت باسی دەکەیت چاکەیەکی لەگەڵدا کردبێت، یــان ئەمــە تــەنها قــسەیەکی تووڕەهاتی هەڵبەستراو بێت، ئەوا تۆ بەزیرەکی خۆت زانیت پارێزگاری پارەکانم بکەیت و بە بەستراوی جگە لە یەك پارچە زیو کەسێك دەستی بۆ نەبات و بۆمی بهێڵیتەوە تــا دوایی لێمی بسەنیتەوە. لەوە دڵگران بووم کە من بازرگانێکم و درۆ دەکــەم گــەر بڵــێم سەفەرەکانم و ئەو رێگە سەخت و دژوارانەی بڕیومن تەنها بۆ حەزی سەرکەشــی بــووە.

نەخێر، من سامانم خۆش دەوێت، چونکە ئەو سامانە پایەی بەرز کردمەوە و بەهۆی خێر و فەڕی ژیانەوە کەسوکارم خۆشیان ویستم، ئێ ڕۆژانێکیش دێن تەڕ و وشك پێکڤە دەسووتێن و هەموو دنیا چك دەکات و خەڵکی لە برسان دەمرن، ئەو دەمە بۆ رزگارکردنی خەڵکانێکی بەکاردێنم کە لە دەمی شمشێر و گوللەی تۆپ رزگاریان دەبێت. نیگەران بووم، بەڵام بیرم لە رزگاربوونی خۆم کردەوە، بە جەلال رافزیم وت:

ــ پارەکانم لە ژێر فەرمانتدان، بەڵام داوای دوو شتت لێدەکەم.

رووخساری پیرەمێردە گەشایەوە، کە نەیتوانی منەتی چاودێری کردنەکەی بشارێتەوە وتی:

ــ ئەی برازام بڵێ، من لە سایەی چاکەی باوکی خوالێخشبووتەوە قەرزاری تۆم.

ــ هەوڵ بدەیت ئازادم بکەیت، لەو پارەیەش بایی ئەوەم بۆ بهێڵیتەو تا بەشی گەڕانەوەم بۆ لای کەسوکارم لە سابلاخ بکات.

ــ بە پشتیوانی خودا ئەوەت بۆ دەکەم.

چاوەکانی بریسکانەوە و وتی:

ــ ئێستا دوو کیسەکەم بدەیێ تا دەست بکەم بە چاکەدانەوەکەی باوکی خوالێخۆشبووت.

شادی یان دڵگوشران؟ پارەکە لەدەستچوو، بەڵام من هێشتا دەست بەسەری ئەو شایەم کە ئێستا لەگەڵ زۆردارەکەی روسیا لە سان پترسبۆرگ دانیشتووە، تۆ بڵێیت ئێستا گەیشتبێتە ئەوێ، ئاخۆ جەلال بەڵێنەکەی دەباتە سەر؟ ئایا وەك کەسێك سواڵی لێ بکات بە پاشماوەیەکی کەمی پارەکەم منەتبارم دەکات؟ ئاخۆ ئەی ئاران جارێکی دی لە بازاڕەکانت دەگەڕێم و بە بینینی خێر و فەڕت ئاو دەزێتە نێو دەمم؟ چونکە ئێستا لە سۆنگەی ئەو نابووتییەی بەسەرمدا سەپێنراوە ناتوانم بەم خێر و فەڕەوە شاگەشکە ببم؟! ئاهێکم هەڵکێشا، بەڵام ئەسمەر لە بەردەمم قوت بووەوە، وەك ئەوەی ئاخی دڵی پەرۆشی هەڵبکێشێت، وتی:

ــ سامانی هەموو دنیا بە قوربانی خۆت بێت، بگەڕێوە بۆ لامان، ئێمە هەر خۆتمان گەرەکە!

بەڵێ، ژیانم و خۆشەویستانم و دنیا و هەموو ئەمانە لە کوێ و ئەو دوو کیسەیە لەکوێ؟ کە خەونیشم پێوە نەدەبینین. بە راستی شلۆمۆ چەند دەبەنگیت! سوپاسی خودای خۆت بکە و چاوەڕێی هاتنی پیاوە جوامێرەکە بکە، ئەو پیاوەی بە نەختێك پارە ژیان و خۆشەویستان و هەموو دنیات بۆ دەگێڕێتەوە، چونکە هەرچۆنێك بێت جەلال پیاوێکی جوامێرە، ئەی ئەوە نییە تیماری کردیت و بایەخی بە خواردنەکەت دا؟ ئەوەتا بەڵێنەکەی جێبەجێ دەکات و کلیلی زیندانەکە و یەك لیرەی زێڕی تەواوی هێناوە، ئینجا ئەوەش ئەسپەکەم وەك خۆی ماوە، بەڵکو بە راستی دەڵێیت هەر ئێستا لە تەویلەی شاهانە هاتووەتە دەرەوە... بازاڕیش نزیکە و چاوی خۆم بە خێر و بێرەکەی روون دەکەمەوە و خواردن و دیاری بۆ کەسوکارم و ئەسمەر و منداڵەکان و ئیستیری نۆبووك دەکڕم.

هەزار سوپاس و سلاوم بۆ تۆ ئەی رافزی...، ئەی ئەو کەسەی لە لانەی شێری شاهانە رزگارت کردم.

# سابڵاخ
## پاییزی ئەو ساڵە

لەوەتەی لە تاران گەڕابووەوە، دوو مانگ تێپەڕی بوون، بیستی کە شا لە سان پترسبۆرگ گەڕاوەتەوە، لە ترسان کەوتە دڵە خورپە، بەڵام غایلەکانی بە راست نەگەڕان، جەلال رافزی راستی کرد، ئیدی شا بەدوایدا نەی ناردەوە، بێگومان بەو سزادانەی وازی هێناوە، یان لەگەڵ توانەوەی بەفری روسیا و ئێران ئەمیش لە یادەوەریدا تواوەتەوە، یان لەگەڵ سەرکێشیی و شەوە سوورەکاندا، کە ستەمکاری ئێرانی لەگەڵ ستەمکارەکەی دیکە قەیسەری روسیا بەسەری بردووە و ئەمیش سووتاوە. ئەمێستا هەموو شتێك وەك ناوی تاقگەکان رێدەکات و ناوی لە شارۆچکەکەدا وەك ئەڵماسێکی بەنرخ و بێ خەوش دەدرەوشێتەوە. جگە لەوەی بووەتە پیاوی دوو ژنە هیچ شتێکی تر دۆخەکەی لێ ئاڵۆز ناکات. کاتێ لە سەفەری مەرگ لە تاران گەڕایەوە هەواڵ گەیشتە سابڵاخ. ئەو هێشتا لە دەوروبەری شارۆچکەکە بوو تێکڕای دانیشتووانی سابڵاخ بۆ پێشوازیکردنی هاتن، بەڵام چاوی لە ئیستیر گێڕا و نەیبینی، ئەو خەونی بەوەوە دەدی کە بەر لە پێشوازیکاران تازەبووك ببینێت، چونکە گەر ماوەی دوورکەوتنەوەکەی لێ دەربکەین، ئەوا جگە لە یەك دوو رۆژ پتر بەسەر زەماوەندەکەیاندا تێنەپەڕێت، شادمانییەکەی بە ئەسمەر و منداڵەکان و پێشوازیکاران بە دیار نەبوونی نۆبووك وەك ئەوە بوو بەردێکی غلۆرەوە بوو بکەوێتە ناو کانییەکەوە، ئەمەش ویژدانی هەژاند، ئەسمەر دەربارەی ئیستیر پاساوی بۆ هێنایەوە و وتی:

ـــ وا دەردەکەوێت دووگیان بێت، ئیّ منداڵیشە و دەستی بە پرتە و بۆڵە و نازکردن کردبوو!

ئەو پاساوهێنانەوەیەی لە ئەسمەر وەرنەگرت، دوای ئەوەی هەندێك شتی دیکەی بـۆ روون بووەوە، خۆی سەرکۆنە کرد و لە ئاوەزی خۆی کەوتە گومانەوە، پتر رۆیشت و لەوە بوو ئەسمەریش بە گلەیی کردن تێوە بگلێنێت، ئیـدی بـەرەو مـاڵی مـەتتیا هۆگۆنـە کەوتە ریّ و پێی وت:

ـــ ئیستیر لە ژێر رکێفم دەرچووە، پێش ئەوەی لـە سـابلاّخ دوور بکەومـەوە ماڵـە مێردی جێهێشتووە.

باوکی بە کەمیّ شڵەژان و شەرمکردن لە زاواکەی وتی:

ـــ هاوسەرەکەت دووگیانە، شلۆمۆ پیرۆزباییت لێدەکەم و بە باشی مامەڵەی بکە.

بە گلەییەوە وتی:

ـــ مامە، تۆ تەنانەت هەوڵت نەداوە بۆ ماڵەکەی خۆی بینێریتەوە!

مەتتیاهۆ وتی:

ـــ شلۆمۆ، غەدرم لیّ مەکە. هەوڵمداوە، بەڵام کچەکە منداڵە و کەللـە رەقیـشە، هێشتا باڵق نەبووە.

شلۆمۆ بە لێو کرۆشتنەوە وتی:

ـــ ئەمە سروشتی ئەوە، کە گەورەش بێت هەر ناگۆڕێت.

باوکی ئیستیر سەری داخست و بێدەنگ بوو و پرسی گـەر شـلۆمۆ خـۆی لـە ژنـی دووەمی منداڵکاری نەفامتر نەبێت، وا ناڵێت. ئەی ئەگەر پێـی داگـرت و رووبـەڕووی وەستا و وتی:

ـــ لەگەڵ هەویّ دانانیشم، ئینجا یان دەبێت دەرم بکەیت، یان وازم لیّ بێنیت، یان خانوویەکم بۆ بکڕیت لە هەموو خانووەکانی سابلاّخ گەورەتر بێت.

شلۆمۆ بە توورەبوونێکی زۆرەوە هەڵچوو، منداڵەکە چاوقایم و لەخۆباییە، لەگـەڵ ئەوەشدا نەفام و گێلە، بە جەخت کردنەوە وتی:

ـــ ئەسمەر تۆی لەم ماڵەوە هێنا، بەڵام من هەر لێرە بۆ هەتا هەتایە جێت دەهێڵم و بۆ ماڵی خۆم دەگەڕێمەوە.

باوکەکە داچڵەکی و ئیستێر لە سەڵای گریانی دا، عوزر خواهییەکەیان لای شلۆمۆ دادێکی نەدا. مەتتیا هۆ شتی زۆری وت: ئیستێر منداڵێکی بێ ئەزموونە! ئێ وا مەلۆتکەکەیش لە منداڵدانیدا گەشە دەکات و مرۆڤیش لە هەڵەکردن بەدەر نییە!

ئیستێر پاڕایەوە و دانی بە هەڵەکەی خۆیدا نا، بەڵام شلۆمۆ هەر سووربوو:

ـــ بەڵکو لە جیابوونەوە بەولاوە هیچی دیکە نییە.

ئەسمەر جارێکی تر هاتە ناوەوە و وتی:

ـــ دەی وا کچەکە قایل بوو بۆ ماڵ بگەڕێتەوە، وا پەشیمان بووەتەوە و دوای ئەوەش دانی بە گوناهەکەی خۆیدا نا و تۆش لێی ببوورە. شلۆمۆ، من هیچ رقێکم لێی نییە، گەر نەیگێڕیتەوە من لە خۆم خۆش نابم!

وەك ئەوەی خۆی بدوێنێت و پێشبینی نادیارەکانی سبەینێ بکات، وتی:

ـــ بە مەرجێ شتەکە لەم سنوورە کۆتایی بێت.

ئەسمەر وتی:

ـــ ئەمە بۆ من لێگەڕێ، من گرەنتی چارەسەرکردنی دەدەم، بەڵام تۆ ئەوەندە خۆت مەخۆرەوە.

سەرسەختی شلۆمۆ بەرانبەر داواکارییەکەی ئەسمەر نەرم بووەوە، بەڵام پێشبینی ئاژاوەی ئاییندەیەکی دەکرد، کە ماڵەکە پێویستی نەبوو.

بەخۆی وت "هەرچی شتێك رووبدات، ئەم منداڵە هەر بە کاڵفامی دەمێنێتەوە، جگە لە ناخۆشی هیچ شتێکمان لە گێلییەکەی دەست ناکەوێت".

ماوەیەك ماڵەکە ئارام بووەوە و ئەسمەریش چاودێری ئیستیری دەکرد، کە سەرقاڵی زگەکەی بوو، خۆشی و بەختەوەری دڵی شلۆمۆی ئاوەدان کردەوە. بەخت یاریتی و خوداش خۆشی دەوێ، بێگومان خودا رێگای راستی پیشان دەدات و کاری بۆ ئاسان دەکات و لە مەینەتی رزگاری دەکات، بازرگانییەکی بە قازانج و ناوبانگێك چەشنی ئەستێرەیەك لە شەوێکی ساماڵدا دەدرەوشێتەوە. هەموو کەس خۆشی دەوێ و لە

ماڵیشەوە خۆشەویستە و بە هەمان شێوە لە دەرەوەی ماڵیش. گوێ بە ئەڵماسی کچی زێرنگەرەکەی هاوسێیان نادات، کە بە لووت بەرزی و سووکایەتییەوە تێیدەڕوانێت. هەروەك چۆن لەخەڵکیش تریش دەڕوانێت، وەك ئەوەی پێیان بڵێت "ئێوە کێن وا بەو قیتییە بەسەر زەویدا دەڕۆن؟ ئەم زەوییە تەنها بۆ من دروست کراوە کە چون تاوس بەسەریدا ناز بکەم". دەیبینی و دەیوت ئاخر چ سوودێکی هەیە ئەوێك لە دنیادا شتێك ناکات، جگە لەوەی بخوات و بخواتەوە و بنوێت و لە ئاوێنەیەکدا تەماشای خۆی بکات، کە گەورەی بکاتەوە و خەڵکی لەبەرچاوی بچووك بکاتەوە و بە چاو خۆیەوە لە قەوارە و شێوەی مێش و مەگەزدا بیان بینێت؟ هەروەها دەیوت: "ئەم لەخۆباییە شووناکات و ناچێتە نێو کۆمەڵی خەڵکەوە! بەڵام دنیا بێ وەفایە و بەزەیی بە کەسانی وەك ئەڵماسدا نایاتەوە!".

میر عەلی هاوکاری دەربارەی ئەم پەرۆشەی بۆ کاروباری خەڵك لێی دەپرسێت، ئەویش سۆزی گەرمی کپ دەکاتەوە و بە شەرمێکی منداڵانەوە پێدەکەنێت. ئاخر ئەو لقێکی بەرز و پتەوی درەختێکە بەرانبەر بە سۆزی هەڵقوڵاوی بۆ خۆشەویستی بوونەوەران سادە و خاکەرایە، ئەوەتا براکانی، دۆستانی، خۆشەویستانی...، حاخام ناحوم و حاخام میخائیلی برای بۆ لای دێن و پێی دەڵێن:

ــ تایەفەکەمان لە سابلاخی پارێزراودا وەك دەمڕاستی خۆی و سەرپەرشتیکاری کەنیستی گەورە لە شارۆچکەکەدا هەڵی بژاردوویت!

شەرمێکی منداڵانە دایگرت و سەری داخست و زمانی کەوتە تەتەڵەکردن، بەڵام وتی:

ــ ئەو متمانەیەی تایەفە پارێزراوەکەمان بە منی داوە، تەنها بە سوپاسگوزاری و چاکەدانەوە کۆتایی نایات، لێ من بە تەمەن بچووکم و کەسانێك هەن بۆ وەرگرتنی ئەم بەرپرسیارێتییە لە من لەپێشترە. حاخام ناحوم دەستی چەپی بە ریشە چەرمووەکەیدا هێنا و دەستی ڕاستەشی خستە سەر شانی شلۆمۆ و وتی:

ــ کوڕی خۆم وا بووە تەمەن بچووکێك لە حیکمەت و ئاوەزدا کەوتووەتە سەرووی ئەوانەی کە چەندین ساڵ لەو بەتەمەنترن.

خواستنی ئیستیر دەکەوێتەوە بیری شلۆمۆ و گاڵتــە بــە حیکمــەت و ئــاوەزی خــۆی دەکات و سەرێك بادەدات، بــەڵام هەســتدەکات و لەبــەرخۆوە دەڵێــت "بێگومــان مــن زۆرزان و مەکربازم، بەم زۆرزانییەش خەڵکیم فریو داوە، ئیدی بە راستی وا دەزانن مــن هۆشمەند و ژیرم". بە حاخام ناحوم دەڵێت:

ـــ من رای ئەوەم نییە کە لە رۆڵــەکانی تایەفەکــەی خۆمــان بــە ئــاوەزتر بم، لــە کاتێکدا تۆ و حاخام میخائیل خــودا تەمــەنتان درێــژ بکــات لــە رۆڵــەکانی تایەفــە پارێزراوەکەی شارۆچکەکەمانن.

حاخام ناحوم دووبارە دەست دەخاتەوە سەر شانی شلۆمۆ کەتانی و دەڵێت:

ـــ کوڕی خۆم، ئیتر کاروباری ئاین لە سابلاخ بۆ ئێمە بەسە، هەرچەندە میخــائیلی برام هێشتا گەنجە، بەڵام من پیر بووم، شلۆمۆ ئێ پیریش نیوەی مردنە!

بە پێکەنینەوە وەك ئەوەی داوای لێبوردن بکات، لەسەری دەڕوات:

ـــ دە تۆ کاروباری دنیامان بۆ لە ئەستۆ بگرە، یان کوڕی خۆم تۆ تەماحی ئەم دنیا و ئەو دنیاتیش هەیە؟!

ـــ بەڵام من بارم زۆر گرانە و بەرپرسیارێتیم زۆرترە!

حاخام ناحوم بە نارەزاییەکی دەستکردەوە تەماشای دەکات و دەڵێت:

ـــ کوڕی خۆم، ئایا لە خزمەتکردنی رۆڵەکانی تایەفەکەمان و سەرپەرشــتیکردنی کەنیسەکەمان رادەکەیت؟ ئێ خەڵکی خۆشیان دەوێت و متمانەیان لەدەست مەدە، با بارکی خوالێخۆشبووت لە هەموو رەفتار و کردەوەیەکتدا ببێتە پێشەنگ.

بەڵێ کەس ئەم رەت کردنەوەیەی ئەم بە سادەیی و خاکــەرایی لــە قەڵــەم نــادات، پەیوەندییە گشتییەکانی ئەم لە خزمەتکردنی هەموران بەولاوە بە هیچی دیکــە لێــك نادرێتەوە، ئێ خــۆ ئــەمیش لــە ســڵاوکردن لــەم و لــەو و رووخۆشــی کەمتەرخــەمی نەکردووە، ئەو هەوڵی چاکەکردن دەدات، بەڵام هێشتا کاری شەونخوونی بۆ بەرژەوەنــدی گشتی و سەرپەرشتی کەنێستی سابلاخی لە ئەستۆ نەگرتووە، هەستی بــەوە کــرد کــە ئەرکی پتر دەبێت، بەڵام ئەو دۆلکەکە بۆ نێو بــیری خــودی خــۆی شــۆڕ دەکاتــەوە، تــا درەختی ئەم خودە تازە پێگەیشتووە لەبەر چاوی خەڵك پاراو بکات. خودی خۆی! ئــەرێ

به راستی له دنیادا ئەوە خەمێتی؟! لای خەڵك و لای خودا پێکەوە؟ ئەرێ بە راستی ئەو بە دنەدانی ئەم خودە خۆویستە نەبێت، هیچ شتێك ناکات، ئەوەش هەر لە پای خزمەتکردنی ئەم خودە و رازی کردنی ئەم خودە؟ ئەی ئێرەیی و ورووژاندنیش هەر خۆپەرستین؟ تەنانەت ئەوە گەر کاری چاکە و شەرەفمەندی و دەستپاکی و خزمەتکردنی خەڵکیش بێت؟ حاخام ناحوم بە مەزاقەوە دیواری بێدەنگییەکەی رووخاند و وتی:

ــ کوڕی خۆم، گەر رەتی بکەیتەوە، ئەوا تۆ خۆپەرستیت!

ئێستا باوکی سەلمان پێکەنی و وتی:

ــ وا دەردەکەوێت کە من بە راستی خۆپەرست بم، بۆیە ئەوەی تایەفەکە بۆی هەڵبژاردووم قەبووڵی دەکەم.

ئەم وەڵامەم لای حاخام ناحوکم دەبێتە چاکەیەك و دووبارە دەستە نارەقارییەکانی دەخاتە سەر شانم و دەڵێت:

ــ گەر تۆ وا بزانیت کە خزمەتکردنی تایەفەکە خۆپەرستییە، ئەوە تۆ لەو کەسە چاکەخوازانەی کە خۆیان لە نێوبانگ و سوپاسگوزاری دوور دەگرن و کاری خێریان بە نهێنی پێ باشترە لە کاری ئاشکرا.

راستە هەرچی دەکەین رەنگە لە پای خودی خۆماندا بیکەین، تەنانەت جارکێشانیشمان خۆپەرستییە، بەڵام وریابە متمانەی جەماوەر بە تۆ خاکەرایی و بێ فیزیت لەبیر نەباتەوە و چەشنی باڵۆنێك فووت پێدا بکات و بە هەوادا بفڕێت، بەڵام شلۆمۆ کەتانی، تۆ زێدەڕۆیی دەکەیت. ئەی بیرت چوو تۆ یەکەم کەسێك بوویت کە خودی خۆت لەبیر کرد و گرەوت لەسەر ژیانی خۆت کرد، ئەو کاتەی حەسەن بوزورگی منداڵ لە شاخەکەوە بەرەو هەڵدێر کەوتە خوارێ و جلەکانی بە لقی دارێکەوە گیر بوو؟ ئەو دەمە هێشتا ژنت نەهێنابوو و منداڵیشت نەخستبۆوە. ئەوە بوو بۆ رزگارکردنی منداڵەکە بە گیانفیدایی راپەڕیت و بە پەتێکی پتەو بەستیانیتەوە و بەرەو دار بەڕووەکە شۆڕیان کردیتەوە. لە کاتێکدا کوڕەکە رووبەڕووی مەرگ بووبووەوە و لەگەڵ لقە چەماوەکە و لارەوەبووەکەدا ئەمیش بەردەوام بەرەو هەڵدێرەکە لار دەبووەوە. تۆ

دارای ئارامی و چاوەڕێ کردنت لە کوڕە ترساوەکە دەکرد و بـۆ خـۆراگرتن هانـت دەدا، ئیدی خۆت پێی گەیاند و بە پەتەکە بە سینگی خۆتەوەت نووسـاند و لەگـەڵ خۆتـدا بەستتەوە. کاتێك هەردووکتان لەسەر شاخەکە گەیشتنە کەناری ئـارام، هەناسـەیەکی خۆشتان هەڵکێشا ئای چەند بەختەوەر بوویت کە ژیانی حەسەن بوزورگت رزگار کـرد، لەوەش زیاتر بەختەوەر بوویت کە بە پشتیوانی خودا خۆت رزگار کـرد و رزگارکـەریش بوویت! زمانت لە وتنی "خودا منی خـۆش دەوێـت" نەدەوەسـتا و بـە خەرمانەیـەکی شادمانی دەورە درابوویت. تۆ کوێریت و ئەو گڕکانە نابینیت کـە خەریکـە گڕاوەکـەی هەڵدەقوڵێت، کەڕیت و گوێت لە هەڕەشەکانی نییە کـە بـە گـوێی تـۆ و سـابلاخیدا دەچپێنیت "چاوەڕێ کـەن". مـەرگ بـە ئیـشتیاوە خـۆی مـەڵاس داوە، بـەڵام هێـشتا سێبەرەکەی لەسەر رووخسارەکان دەرنەکەوتبوو، هەموو ئەو مەترسییانەی بەڕێوە بوون لە توێی نادیاردا بوون. ئەمێستا هەموو خـەمی سـابلاخ وەك هـەموو سـاڵێك نزیـك بوونەوەی زستانەکەبوو، هەرچی لەتوانایاندا بـوو تفاقیـان بـۆ ئامـادە دەکـرد، ئەمـە ریتمی ژیانە و نەوە لە نەوە و کوڕ لە باوکەوە بۆیان مابووەوە، زستانی سـابلاخ زاڵـم و بێ بەزەییە، برێ جار بەفرەکەی لەژێر خۆیدا بنیادەم و ئاژەڵ و دەرگاکـان دەشـارێتەوە، هەندێکجار خەڵکی ناچار دەبن بۆ ماوەی هەفتەیەك یان پـتر لـە ماڵـەکانیان خۆیـان قەتیس دەکـەن، یـەکجار خـراپ کاریگەرییەکـەی بەسـەر هـەژارانی شارۆچـکەکەدا شکایەوە، بەڵام هۆ باوکی سەلمان دەوڵەمەندی وەك تۆ لە خۆ ئامـادەکردن بـۆ زسـتان سرووتی خۆیان هەبوو، لەجیاتی خەم و پـەژارە مایـەی خۆشـی و چـێژ بـوو، کۆگـای ئازووقە لە ماڵان پڕ بوو لە خۆراك، ئافرەتان مژووڵی جۆرەهـا خۆشـاو بـوون و لـەنێو کوپەڵەی سەوز و دیزە دادەنران، ئەمە بێجگە لە رۆن و دۆشاو و زەیت و شێرێژ و شـتی تر. گوێرەکە سەردەبڕدران، تا لە گۆشتەکەیان قاورمە دروسـت بکـرێ و لـەناو کوپـە دەکران و لەنێو چـاڵ دادەپۆشـران و دەپـارێزران. سـرووتی خـۆ ئامـادەکردن سـرووتی هەبوونی خێر و فەڕ بوو، بەڵام پەلەوەری وەك مریشك و مراوی و باڵندەی دیکە لـەنێو کولانە بەخێو دەکران و لە کاتی پێویستدا سەردەبڕدران، تـەنها ماسـی بـە زۆری لـە دەریاچەی رەزاییە، یان لە دەریای قەزوینەوە دەهێنرا و لە زستاندا کـەم بـوو. شـلۆمۆ

کەتانی حەزی لە ماسیی سوێرکراو و وشکەوە کراو نەبوو، کە لە زستاندا هەبوو، بەڵکو حەزی لە ماسی تازە بوو و هەوڵی دەدا بە پارەی زیاتر (سپی ماسی) دەست بکەوێت. تازووقە خستن جووڵەیەکی بەردەوامە و سرووتێکی ئاهەنگ ئامێزە، هەموو ئەندامانی خێزان بەشداری تێدا دەکەن، دەنگی ئەسمەر و قەشەنگ و منداڵەکان بەرز دەبێتەوە، هەروەها دەنگی باوکی سەلمانیش، تەنها ئیستیر دووگیانە و بێزوو دەکات، شلۆمۆ پرسیاری ئیستیر دەکات و دەیەوێت لەو دەنگە دەنگە بەشدار بێت، بەڵام ئەسمەر پاساوی بۆ دەهێنێتەوە و دەڵێت "وازی لێ بێنە، ئاخر ئەو دووگیانە و بیانووی خۆی هەیە". دەڵێت هیچ نەبێت با سەرپەرشتی سەربڕین و چێشت لێنان و بردنە ژوورەوەی ئەو کیسە زۆرانە بکات، کە لەدەرەوە دێن، هەندێکجار چاوی پڕ لە حەسرەتی خەڵکانێکمان لەسەرە، بەڵام من بەردەوام خۆم بۆی ئامادە دەکەم، کە ئەو حەسرەتەیان کپ بکەمەوە، بڕێ جار هەستی ئاسوودەم تەنانەت دەگاتە مۆسکۆ، هەروەها دەگاتە کۆشکی شا لە تاران. لەو دۆخەی کە تێیدام پتر هەڵپە ناکەم، سوپاسی خودا دەکەم و لەوەش زیاترم لێی ناوێ، جگە لەوەی خێر و فەڕەکەمان بەردەوام بکات و چاوی سەرپەرشتی خۆیمان لێ کەلا نەخات. شانازی کردنم بێ سنوورە، چونکە هەر لە تەمەنێکی زووەوە بووم بە خاوەنی ماڵ و منداڵ و خۆشەویستی، بووم بە دەمڕاست و هەڵبژێردراوی تایەفەکەمان، تەنانەت ناوم لێ نرا پیاوی دوو ژنە. بە شانازییە و لە دۆخی خۆم قایلم و هەستدەکەم شا کۆیلەی منە. بە سەرانسەری ناخی خۆمدا گەشت دەکەم و دەبینم هەموو باخ و گوڵی بۆنخۆشی هەمەڕەنگەیە، کاتێکیش بە نێو خەڵکدا ڕێدەکەم و سڵاویان لێدەکەم و سڵاوم لێدەکەن، چاو دادەخەم و دەشڵەژێم، جۆرە شەرمێك دامدەگرێت، ئاخر من چۆن بووم بە دەمڕاستی تایەفەکە، لەکاتێکدا لە هەموو لێهاتووانی تایەفەکە بە تەمەن بچووکترم؟! درورد بۆ باوکی خوالێخۆشبووم دەنێرم، چونکە هەر ئەو بوو فێری کردم کە بە بێ بیرکردنەوە، هیچ هەنگاوێك نەنێم و پێشبینی بکەم ئاخۆ لە منداڵدانی چارەنووسدا چی هەیە!! بەڵام ئایا بە راستی من زانی بووم لە ژانی ئەو نادیارەوە چی دەکەوێتەوە، لەکاتێکدا ئێمە لە دەرگای زستانێکی سەختمان دەدا و شەڕیش دوور لە ئێمە هەڵگیرسا بوو، گوایا ئێرانیش

بەشداری جەنگێك ناكات، كە هیچ پەیوەندییەكی بەوەوە نییە! لەمەدا مـن كـوێرابیم داهاتبوو، خەڵكەكەش وەك من كوێر بووبوون. چارەنووس پەردەیـەكی لـەنێوان مـن و نابیندەدا دادایەوە و لە نهێنیدا وتـی "ئەمـە دەبێتـە شـتێكی كتـوپڕ" و لەگەڵیـدا پێكەنی و ویستی خەڵكەكە تاقی بكاتەوە...، گرەوی كرد كە مرۆڤ شێتە و لەو دوورەوە لە ئەورووپا دەنگی تەقە دەهات، تەنانەت سابڵاخی دوورە دەست و بێ وەی لەم تەقانە و لە مەرگ رزگاری نابێت.

چۆن نەمانزانی؟ ئەی بۆچی دەبـوو نەفرەتەكـە شارۆچـكە بەسـتەزمانەكەی ئێمـە سابڵاخ هەر بگرێتەوە؟!

# بەهار !

رۆژگار پێمدەڵێت ـــ من گێڕەرەوەم ـــ و ئەمە ساڵی یەکلاکەرەوەیـە ، سـاڵێکە لـە سابلاخ و شلۆمۆش گرنگترە، ئەمە ساڵێکە بۆ یەکەم جارە تەپڵی جـەنگی مرۆڤایـەتی تێدا لێدرا و چون لافاوێك بەرەو تێکرای جیهان دەجمێت...

بە رۆژگار دەڵێم: بەڵکو ئەمە بەیرۆکی شـلۆمۆ کـەتانی و سـابلاخە، سـابلاخ لـە شانۆی رووداوەکانەوە دوور بوو بوون و خودی خۆی لە بیری ئاو و چیا و کـانی و بـاخ و دانیشتووانی سادە و ساکار و بازرگان و هەژاران دەسەلماند. لە گۆنـە و کـەتانی و مـیر عـەلی و بـوزورگ خـۆی دەبینییـەوە، دوور لـە رووداویـن جیهـان، دوورە دەسـت و پێشێلکراوی نێوان جۆرەها وڵات سابلاخ وەك لەبیرکراوێك دووبرا لەسەر فـەرمانڕەوایی کردنی لە ململانێدا بوون...

شلۆمۆ کەتانی بە زەردەخەنە هێمنەکەیـەوە، کـە چـەندین واتـا لـەخۆ دەگرێـت، هەندێکیان بە پێی رووداو و دۆخ گەشن و بڕێکیان توند، قسەکەمان پێدەبڕێت.

ئەم دووانە کوڕانی حاجی زادەن، وەلی و مورتەزا ـــ وەك بۆی دەچـم ـــ گـەر ئـەم دووانە نەبوونایە، ئەوا کاتی گرانییە گەورەکـە خـەڵکی سـابلاخ مردووەکـانی خۆیـان نەدەخوارد. وەلی قووچێکی پان و پڕ بوو، چیایەك بوو لە گۆشت و بەز و لەگەڵ سیما تۆسەنەکەیدا رێکنەدەکەوت، دوو سمێڵی رم ئاسا بەم لاو بەولادا قیت بووبوونەوە، ئـەم دیمەنەی نیازی زۆرداری دەردەخست.

باوکی سەلمان، تۆ هەر لە سەرەتاوە کاتێك یادی ئەو خوێنڕێژەت دەکردەوە، سـیمای بێگـەردت تێـك دەچـوو، ئینجـا لـەپڕ زەردەخنەکـەت گـەردی ئـاڵۆزی و خـەمی

سەرپێچەکانی رووخسارتی دەسڕییەوە و لەگەڵ پێکەنینێکی شاردراوەدا هێمنی جێگەی دەگرتەوە.

ئەمێستاش ئەو رۆژەم لە یادە و بە وردی باسی دەکەم، بەڵام ناتوانم شوێنەکەی دیاری بکەم کە لە چ کاتێکدا بوو. نازانم جەنگ هەڵگیرسابوو، یان خەریك بوو هەڵدەگیرسا، بەڵێ... بەڵێ، ئیستیر مندالّی بوو و (ناحوم)ی بۆ هێنام، کە بە ناوی حاخامی پیاوچاکەوە ناوم نا، حاخامی لە هەموو سابلاخدا خۆشەویست، ئەو یەکێك بوو لەو هەفتانەی کە مێژووی سابلاخ تۆماری کرد و شایی و زەماوەندی تێدا سازدرا و شەوەکانی لە یادەوەری دانیشتووانی شارۆچکەکەدا نەخش بوو، تەنانەت بوو بە مێژوویەك و ئاماژەیان پێدەدا و لەگەڵ رووداوی پێکدادانی دوو براکەدا یادیان دەکردەوە و دیان وت "ئەوە هەفتەیەك دوای لەدایکبوونی ناحومی کوڕی شلۆمۆ کەتانی بوو بە ماوەیەکی کەم...". ئەوە "رۆژی تەویلەکە بوو..." تەویلەکە!

دوای پێکەنین و کرانەوەی رووخسارت، چاوەکانت عەسریان تێدەزا.

نا! نا! رۆژگار ناقایلە ـــ ئێوە غایەنەتی لە رووداوەکان و مێژوو دەکەن و شتەکان تێکەڵ دەکەن، لێگەڕێن با خۆم بیگێڕمەوە.

بەڵکو وەك چۆن پێشتر لەنێو خۆماندا رێکەوتبووین، با هەموومان پێکەوە بیگێڕینەوە.

هەموو رووداوێك دەرکەوتووە، هەموو رۆژێکیش کە چارەنووس لە کوورەکەی خۆیەوە فووی لێدەکرد، سەرەڕای خۆشی و (شەوانی گاڵتە و گەپ)، تۆپەڵە ئاگرێکی لێ بەرز بووەوە.

وەلی حاجی زادە لە شوێنە بەرزەکەی خۆیەوە بەناوی (قایمقام نشین) هەردوو سمێڵە تیژەکەی بادا و وتی: "لێرە جگە لە ناو و ئاڵا و فەرمانەکان، ناوی شای فارس بوونی نییە، چونکە هیچ خزمەتگوزارییەك و کارو چاکەیەك بۆ سابلاخ ناکرێت، لە راستیدا دەسەڵاتی راستەقینەی فارس لێرە هەر نییە، لێرە ئێمە کورد و ئازەری و سوننە مەزەبین، هەر هەمووشمان شیعەی ئێرانین!" شوێنەکەی خۆی خۆش کرد و سمێڵەکانی

لەملاو لەولای روومەتی خۆیەوە دی، بە جۆرێ خەریك بوون دەگەیشتنەوە هەموو دنیا. دووبارە وتی: "من سابلاخم، سابلاخیش منە!".

نا... بەڵێ...، ماوەیەك بوو هەواڵی بەرپا بوونی جەنگ بڵاو بووبووەوە، باوکی سەلمان بە تەمەندا چووە و هەموو شتێکی بیر نەماوە، ئەو رۆژەت لەیادە کە خۆت و میر عەلی هاوکارت لە مۆسکۆ بوون، سەربازەکانی قەیسەرتان بینی کە وەك رەوە کوللە شەقامەکانیان تەنی بوو، میر عەلی وتی:

ــ ئەمە نیشانەی جەنگە.

شلۆمۆ کەتانی بیری لە خۆشەویستانی لە سابلاخ کردەوە، بیری لە ئەسمەر و منداڵەکان و هەموو خۆشەویستان لە سابلاخ کردەوە و وتی:

ــ هیوادارم ئێران بەشداری جەنگەکە نەکات...

راستە شا دۆستی قەیسەرە، بەڵام قەیسەر شەڕی ئیسلام دەکات و دەست درێژی دەکاتە سەر خەلیفە لە ئیسلامبول...، ئێران خۆی ناخزێنێتە نێو جەنگێکەوە کە پەیوەندی بەوەوە نییە، سابلاخیش لەوپەڕی دنیایە و نوێنەرانی دەوڵەتیش لە تاران لە ساڵێکدا لە یەك جار زیاتر نایبینن... هێلکەی کەڵەشێریش ئەفسانەیەکە و لە سابلاخ دێتە دی.

ــ نا... نا، من سابلاخم و سابلاخیش منە.

ئەم وتەیە وەلی حاجی زادە دەیکرد و کۆمەڵێك کاسەلێس و تاوانباریشی لە دەوری خۆی کۆ کردبۆوە، تەنانەت هەردوو برا خوێنرێژەکەش جەعفەر و حوسێن ئەکبەر بوون بە لایەنگری. مورتەزا لە بالکۆنی کۆشکەکەیەوە کە بەسەر باخەکانی سابلاخدا دەیڕوانی دادەنیشت و خەونی بە دەسەڵاتەوە دەبینی، رەزا عەلی دەربارەی فاتمە گفتوگۆی لەگەڵ شەیتاندا دەکرد و پشکۆیەك لە هەناویدا دەئایسا، لە خەیاڵی خۆیدا میری سەفەر کردووی برای دەکوشت و کوڕەکانی محەمەد و ئەحمەد و حەمیدی دەسڕییەوە...، شەیتان بە گوێچکەیدا دەیچپاند و "دەی بجووڵێ، چاوەڕێی چی دەکەیت!".

ــ نا... نا، من دەترسێم.

"ترسنۆك! تۆ ترسنۆكیت". شەیتان وای دەوت و بە چاوێكی تەماح لە بەرنانەوە دەیڕوانییە ڕەزا عەلی لاو و كوشتەی عەشق.

مورتەزا حاجی زادە لە باڵكۆنەكەوە بە خۆی دەوت "ترسنۆك! هەی ترسنۆك! براكەم هەوڵ دەدات بە دەسەڵاتەوە بنازێت و كاریگەر بێت، براكەم لە پشتی باوك و هەناوی دایكم بووە!" هەستا و چاوەكانی پریشكی ئاگریان لێ بووەوە، ئیدی وەك باشترین نیشان شكێن بەرەو براكەی تفەنگێكی تەفاند.

مێزەكەی وەلی بە زەبری تەقەكەی مورتەزا كەوتە لەرزەو وەلی كە دانیشتبوو شێتگیر بوو و سمێڵەكانی لەرینەوە، بەڵام مورتەزا كە بە پێوە وەستابوو تفەكەی قووت دایەوە و هاواری كرد:

ــ دەمهەوێ بە هاوبەشی لەگەڵتدا دەسەڵاتدار بم!

وەلی دەمارە گرژبووەكانی خۆی خاو كردەوەو تفی قووت دایەوە و بە براكەی وت:

ــ دەنگت نزم بكە، شا چاوی هەیە و منیش بەپێی یاسا هێشتا نوێنەری ئەو شایەم كە لە تاران دانیشتووە.

ــ مەبەستت چییە؟!

ــ مەبەستم ئەوەیە من هێشتا نەگەیشتوومەتە دەسەڵات و تۆش داوای بەشە دەسەڵاتم لێدەكەیت!

مورتەزا حاجی زادە هاواریكرد:

ــ بەڵكو تۆ دەسەڵاتداری ڕاستەقینەی كاروباری سابلاخیت.

ــ بێدەنگ بە، ئەگینا هەردووكمان بەرەو تاران دەبەن، تا لە مەیدانی تۆپخانە بە پەتی سێدارە هەڵمان بوواسن.

ــ ئەوە دوورە! وا بەرداشی جەنگی جیهانی دەگەڕێت و ئاژاوەش خەریكە هەموو شوێنێكی وڵات دەگرێتەوە.

ــ بیرت نەچێت، ئێران بێلایەنە و لە توانای شادا هەیە دە سەرباز بنێرێت و بە زنجیر كۆتمان بكەن و بەرەو تاران ڕاپێچمان بكەن.

ـــ هەیهوو، ئەوە دوورە! ئایا سابلاخ ئەوەی بیر دەچێت، کە چۆن پایتەختەکەی ئەحمەد شا کەوتە لەرزین، کاتێك دەنگۆی ئەوەی بیستەوە کە شلۆمۆ کەتانی بازرگانی بە چەکەوە دەکات؟!

هەر ئەو رۆژە بە ئاشکرا بانگی هەڵدا و هەموو لایەکی کۆشکە (ئاوەدانەکە)ی لە تاران لەگەڵیدا هاتە خرۆش. لە سابلاخ چەند چەکێك بەسە بۆ بەرپابوونی شۆڕش و یاخی بوون. کەواتە ئەمە بیرۆکەیە! بیرۆکە...، مورتەزا بەسەر وەلی برایدا هاواریکرد:

ـــ ئەی ئەو کەسەی کە هەردووکمان لەیەك سکەوە لەدایك بووین، گاڵتەم پێدەکەیت، لەجیاتی ئەوەی شوێنێکم لە کورسییەکەی خۆت پێ بدەیت و بانگم بکەیت تا بە تەنیشتتەوە دانیشم؟!

کەواتە مەخابن بۆ ئەو منداڵدانەی کە هەردووکمانی پێکەوە لەخۆگرت، بەڵام من وا دەکەم کورسییەکەت جێگەی هەردووکمانی لەسەر ببێتەوە.

چووە دەرەوە، جەنگەکە هەڵگیرسا، جەنگ لە هەموو دنیا و لە ناخی خەڵکدا بەرپا بوو، دنیا دیتەکان لە سابلاخ گرمەی تۆپیان لە دووری هەزاران میلەوە دەژنەوت، خەڵکێکی زۆر دەیانوت "ئێمە لە نەفرەتەکەوە دووریـن". ژیـان وەك خـۆی دەڕۆیشت، بەڵام شلۆمۆ کەتانی لەناکاو دەنگی گرمەیەکی دووری بیست، کە بەرەو سابلاخ دەهات، لە کەنیستی سابلاخ رۆڵەکانی تایەفەکەی کۆکردەوە و پێی وتن:

ـــ ئەی داواکارانی خێر و حیکمەت، ئێمە لە تەوراتەکەماندا وەڵامی هەموو شتێکمان دەست دەکەوێت، ساڵانێکی وشك و قات و قڕیمان لەپێشە و تەڕ و وشك پێکەوە دەخوات و هیچ ناهێڵێتەوە، هەروەك چۆن یوسفی راستگۆ و گەورەمان ئامۆژگاری میسرییەکان و دەسەڵاتدارانی میسری کرد، منیش راوێژێکتان لەگەڵ دەکەم.

حاخام ناحوم یەکەم کەس بوو کە لایەنگریی قسەکەی کرد و دەستی خستە سەر شانی لاوی باڵابەرز و وتی:

ـــ باشترین دۆزینەوە و باشترین راوێژە، با پێشینانمان ببنە پێشەنگمان!

خەمێك خەڵكە بێدەسەڵاتەكەی داگرت و زۆربەیان لە قووڵایی واق وڕماویدا نـوقم بوون. باوكی سەلمان پێیوتن:

ــ خەمتان نەبێت، گەر لە ڕۆژانی ئاشتیدا ماڵەكەی من داڵدەی دابێت، ئـەوا لـە ڕۆژانی جەنگیشدا ماڵێكە و بەخێروبێرەكەی جێگەی هەمووتانی تێدا دەبێتەوە...

خەڵكی دوور بین لە سابلاخ لە دەروازەی شارەكەیانەوە تـەپڵی جـەنگیان دەبیـست، وەلی حاجی زادەش لە هەنگاوە گەورەكانی براكەیدا دەنگی لێدانی تـەپڵی جـەنگێكی دیكەی دەبیست، كە برا لە خـۆی بـچووكترەكەی بەرانبـەری ڕای گەیانـدبوو، چـونكە ئەوەتا لە ڕێگەی هێزەوە هەڕەشەی دابەشكردنی دەسەڵاتم لێـدەكات، هێـزیش چـەكە، هەرچەندە تۆ بەهێز و زەبر دەست بیت، ئـەوا گوللەیـەكی بـێ بـەزەیی دەتوانێـت لـە ناخافڵدا بتپێكێت و وا لە هێز و زەبر و زەنگەكەشـت بكـات تـەنها وەك حەكایـەتێك گێڕەرەوە بە وشەی "بوو" دەستی پێ بكات. ئیـدی جیـاوازیش لـەنێوان ئـەو كەسـەی بەسەرسامییەوە دەیگێڕێتەوە، یان بە قێزەونییەوە، با ئـەو كەسـە دوژمـن بێـت، یـان دۆست. هەردوو سمێڵەكە بادران و زیت بوونەوە، هەردوو ڕمەكەش بە ڕووی ئەو كەسەدا بەرز كرایەوە، كـە بڵێـسەی شـەڕ و دوژمنایـەتی لـە چـاوانی دەبێتـەوە. هـاواری لـە لایەنگران و پێوە بەستراوانی خۆی كرد:

ــ هەموو شەڕانگێزەكانی ناوچەكەم بۆ كۆ بكەنەوە، ئەوانـەی پیـاوكوژ و ڕێگـر و فێڵباز و لەرێ لادەر و دەربەدەرن. خۆ ئەگەر یەكێكتان لە خوێڕوترین و لـە هـەموان تاوانبارتر، بوارد، سوێند بەخودا لەملتان دەدەم و دەتان كەم بە خۆراكی قەل و داڵ.

یەكێك لە دەستوپێوەندەكان هەڵدەلەرزی و پرسی:

ــ وەلی ئاغای گەورەمان و بژێودەرمان، ئاخر ئێمە چۆن ئەوانە بناسین؟

وەلی چون شێرێكی تێكشكێنەر نەڕاندی:

ــ هەی گەمژە ــ ئـەی نازانیـت پـەیام لـە ناونیـشانەكەیڕا دیـارە و خـودا ئـەو سیمایەی لە ڕووخساریاندا دروستكردووە، دەی هەرچی كەتە و مەچەك ئەستوور و قۆڵ و بازوو كوتراو هەیە، ئەو سەر ڕووتاوانەی كە بە ڕۆن سەریان چەور دەكـەن تـا لەبـەر ڕۆژ بریقێتەوە كۆ بكەنەوە، هەموو ئەوانەی كۆنە برین و شـوێنەواری گوللـە و چـەقۆ

رووخسار و جەستەی شێواندوون، هەرچی ئێسك قورسە و دیمەنەكەی نیشانەی شومییە و ئەنكیر و مونكیر دێنێتەوە یاد، كۆیان بكەنەوە.

یەكێكیان وتی:

ـــ بەڵام گەورەم، هەندێكجار خودا بە قێزەونترین و دزێوترین بەندەی خۆی هێز دەبەخشێت.

وەلی حاجی زادە سەری خۆی خوراند و سمێڵەكانی بادا و وتی:

ـــ كەواتە سەرەڕای ئەوانەی ناوم هێنان، مێشەنگ و دووپشك و ئەژدیها و مێش و مێشوولەشم بۆ بێنن.

چاكەخوازان و ئاشتیخوازانی رۆڵەكانی سابلاخ بە خەم و كەسەرەوە وتیان:

ـــ ئەفسووس بۆ ئەم دنیایە كەوا برا هەموو چەكێكی كوشندە دژی برای خۆی بەكاردێنێت و یەكتر قڕ دەكەن.

ئەوان مەبەستیان لە سوپا شەڕكەرەكان بوو، بەڵام ئەو دەستوپێوەندانەی گوێیان لە وەلی حاجی زادە بوو كە فەرمانی سەیر و سەمەرە دەردەكات، بە چپە چپ وتیان:

ـــ ئەوەتا هەندێك كەس هەن سەرەڕای باراندنی ئاگر و ئاسن بەسەر براكەیدا، هەموو مار و مێروو و باڵندەی گۆشتخۆر و گیانەوەری دڕندەیشی تێبەردەدات.

ئەڵماسی كچی زێڕنگەر كە جووڵەی بێ وچانی ناو شارۆچكەكەی دەبینی، پێدەكەنی و ئەو كچانەی لە دەوری خۆی كۆكردبووەوە كە بە دڵی بوون و بە چاوی كارەكەر تەماشای دەكردن، یان پلەی دەستوپێوەندی پێدابوون:

ـــ دڵم بەمانە هەڵدەشێوێت! هەموویان ئەو شتەی لەبەر زگیانە پووچەڵیان كردووەتەوە و لە هۆڵی پاشەڵیانن، چون دڕندە خۆراك كۆ دەكەنەوە! هەی بەولاترەوە بچن، خودا بە دوو جێگەی شەرم* موبتەلای كردوون و وەك دان ئێشە وای لێكردوون هەر پێكەوە بن.

یەكێك لە كیژە دەستوپێوەندەكانی پێیوت:

* جێگەی شەرم: ئەندامی زاوزێ (وەرگێڕ).

ــ ئازیزم، زیادەڕۆیی مەکە، خۆراك سووتەمەنی ژیانە، بەڵام ئەو شتەی دیکە خودا بۆ پاراستنی توخم و ڕەگەز دروستیکردووە.

ئەڵماس بە لووت بەرزییەوە وەڵامی دایەوە:

ــ خودا چی پێ باشە با وا بکات، بەڵام من ناهێڵم کەس دەستم بۆ ببات، تا لە برسان بڕستم لێ نەبڕێت نانیش ناخۆم، ئێمە خۆمان چارەنووسی خۆمان دیاری دەکەین، بەڵام ئەم مێروو و گەزندانە کە سابلاخ و دنیایان پڕ کردووە، چارەنووسیان بە دەست خۆیان نییە. ئینجا وتی: ئەمە ویستی خودایە!

ئەڵماس تەنها بەسەرە پڕ لەخۆبایی بوونەکەی سڵاوی دەکرد، وەلی حاجی زادەش هەر بەسەر سڵاوی دەکرد، سەری ئەو لێوان لێو بوو لە ئارەزووی دەسەڵات، دڵ پڕ لە خۆپەرستی، سینگی هاڵاوی کوشتن و کاولکاری هەڵدەمژی هەموو دنیا ئامرازی وێران کردنەکەی ئەوی کۆدەکردەوە. ئەڵماسیش هەستی مرۆڤێنی خۆی لە نێو دەبرد و بە یەك هەستەوە دەنازی ئەویش وەك باڵۆن فووی تێدەکرد و لە ئاسمانێکدا پێوەی دەفڕی تێکڕای خەڵکی لەبەر چاوی بچووك و کورتەباڵا بوون. شلۆمۆ کەتانی هاوسەنگی لەنێوان هەردوو نیوەکەی خۆی خواری و سەرێی دروست کردبوو و بە دادپەروەری مامەڵەی هەموو مرۆڤێکی دەکرد و بیریشی لەخەڵکی دەکردەوە، یوسفی ڕاستگۆی بۆ خۆی کردبووە پێشەنگ و دەستی بە کۆکردنەوە و هەڵگرتنی خۆراك بۆ ساڵانێکی قاتوقڕی ڕاکرد. کە گۆشتی دەخوارد و ئێسقانی دەڵستەوە. هەر بەوەوە نەوەستا کە ئامۆژگاری تایەفەکەی خۆی بکات، بەڵکو کاتێ دەیبینی میر عەلی هاوکاری سەرقاڵی پارە کۆکردنەوەیە، پێیوت:

ــ میر، خۆراك کۆ بکەوە، نەك پارە، چونکە ئێمە گرانییەکی دژوارمان لەپێشە. جیهان لە جەنگدایە، تەنانەت گەر لێیشی دوور بین، قاتوقڕی و برسێتی وەك لافاو وایە و سنوور نازانێت.

گەر میر ئامۆژگارییەکەی شلۆمۆی لەگوێ گرتبێت، یان نا، ئەوا مورتەزا حاجی زادە کەسایەتی ڕەچاو دەکرد، مردنی لەبەرچاو بوو، ئینجا تووڕە دەبوو، پاشان لەسەر دابەشکردنی دەسەڵات لەگەڵ براکەیدا سوور بوو، هەرچەندە لەو کەمتر شەڕانگێز

نەبوو، بەڵام وەلی ئەو دەسەڵاتەی هەبوو، ئەو هێزەش کە بە دەوری خۆیدا کۆی کردبووەوە وەك خەرمانەیەك دەوی دابوو، بەڵام براکەی ئەمەی نەبوو، یان رەنگە لە وەلی ستەمکار کەمتر شەڕانگێز بوو، بەڵام تفەنگ راستییەك بوو، لە ئەندێشەی توورەییدا دەژیا، ئەوەندە هەبوو تووڕەبوونەکەی لەسەر زەوییەکی رووتەن و بێ خێر دەئایسا، ئینجا ئەوەندەی پێ نەدەچوو دادەمرکایەوە و لەدووی خۆیەوە خۆڵەکەوە و نووچدان و نائومێدی جێدەهێشت. پرسی "چۆن لە کۆڕی دانیشتنی براکەمدا پەلەم کرد و تەماحی خۆم لە هاوبەشیکردنی دەسەڵات بۆی ئاشکرا کرد؟، بەڵام گەرەکە شتێك هەر بکات". خۆی سەرکۆنە و تاوانبار دەکرد "هەی سەگ! بە راستی من وەك ئەو سەگەم کە دەوەڕێت و گاز ناگرێت". براکەی چەورە و شەڕانگێز و رێگری نارچەکەی کۆکردەوە و پێ وتن:

ــ برا سەگەکەم بەرەنگارم بووەتەوە، بەو خودایە گەرەکە پەندێکی وای پێ بدەم خەڵکی هەر بیگێڕێتەوە و دوای حەفتا ساڵ مێژوو باسی بکات و لە لاپەڕەی کتێب و بە چەندین بەرگ بنووسرێت!

وەلی لە کارامەترین تاوانکارەکانی خۆی دە کەسی هەڵبژارد، کە بریتی بوون لە کەسانی تۆکمە و زەبەلاح و بازوو ئەستوور و سمێڵ بابڕ، سەر رووتاوە و کوێر و جەستە بە خاڵ کوتراو و شوێنەواری کۆنەبرین. سیمایان شوومی و نەگبەتی پێوە دیار بوو، تووڕە و تۆسەن، خەون بە شەڕەوە دەبینن و بە مۆمەوە بەدوایدا دەگەڕێن و بانگی دەکەن...، گەر شەڕ نەکەن مردوون!

وەلی ئەم دە کەسەی کۆکردەوە و زین و لغاو و رکێفی ئەسپە شێیەکەی دانێ و پێ وتن:

ــ هەر ئێستا و دەستبەجێ هێرش بکەنە سەر ماڵی مورتەزای نەفرینی برام، وەك ئەسپەکەم زینی بکەن و وەك ئەسپەکەم لغاوی بکەن، هەر وەك ئەسپەکەشم بە کوچە و کۆڵانان بیگێڕن. ئەو بە هۆی هێزی ئێوە و ویستی منەوە، وەك ئەسپەکەم لەسەر چوار پەل دەڕوات. تا بەم ئاوهایە بەرەو تەویلە تایبەتییەکانم پێش خۆتانی بدەن و لە جێگەی ئەسپە شێیەکەم لەسەر ئاخوڕ بیبەستنەوە و فەرمانی پێ بدەن کە جۆی

ئەسپەکەم بخوات، بەجۆرە لەویّ دەمێنێتەوە تا دانیشتوانی سـابلاخ ببیـنن و خـەلّکی لەدوور و نزیك هەوالّەکەی بژنـەون. خـۆ ئەگـەر ملـی نـەدا و سەرپێـچی کـرد، یـان بەرەنگاریی کرد، ئەوا قەمچی و هێزی ئێوە تەنها شتێکە فێری ملکەچـی و بێـدەنگی بکات.

دە کەسە چەورە و شەڕانگێزەکان راپەڕین و بە یەك دەنگ هاواریان کـرد و پێکـەوە تێیان تەقاند و هەریەکەیان پارچە زێرێکی بە دەستەوە بوو:

ــ ئەی وەلی گەورەمان، بەسەرچاو و فەرمانت لەسەر سەرە!

ئەو رۆژە بوو بە رۆژی (تەویلە) وەك وەلی حاجی زادە ویستی ئەو ناوەی لـیّ بنـریّ. باوکی سەلمان کە باسی ئەو رۆژەی دەکرد بە زەردەخنەی سەر لێوانییـەوە ئاوهـای بـاس دەکرد و سووکە زەردەخنەیەکیشی دەنواند، باسی دەکرد و لە ئاسمانی بیرکردنـەوەدا بـە کەسەرەوە رۆدەچوو، یان لە دەریای بیرەوەریی ناخۆشـدا مەلـەی دەکـرد، ئارامییەکـەی چون ئاسۆی تەمومژی بیابان بوو، وەك ئاوە لێخن و زەلکاوە دوورو پـڕ مەترسـییەکانی بوو.

* * *

بلێسەکە درەختی دارستانەکەی دەخوارد، دارستانەکەش گۆشت و خوێن بوو، ئـاگرە نەفرینەکە دوو دەست هەلّیگیرساندبوو، دەستی شەیتان و دەستی مـرۆڤ. دوژمنـایـەتی مرۆڤ هەموو شتێکی سووتاند و وەك پەتای لارەشە هەموو شوێنێکی گرتەوە، ئێران بیّ لایەن بوو، سابلاخیش پاژێك بوو لە بێلایەنی ئێران. مشوورخۆران خۆیان بـۆ ئایینـدە ئامادە کرد، نرخ بەرز بووەوە و وردە وردە کەلوپەل کەم بوونەوە، لـیّ هـیچ یـەکێك لـە دنیا دیتەکانی سابلاخ، تەنانەت نیمچە پێغەمبەرە خودا ناسەکانیش پێشبینی ئەوەیان نەکرد، کە سابلاخی جوان و بێوەی دەکەوێتە نێو دەمی دەستاڕی جەنگە نەفرینەکەوە و دەمی ماشەکە لە هەردوو لاوە لێی گـیر دەبێـت و ئیمپـارتۆرێتی روسـیای قەیـسەری لایەکە لە هەردوو لای مەقاشەکە و عوسمانییەکان و ئەلّمانـەکانیش لایەکـەی تـر...، مەقاشێکی بیّ بەزەیی سابلاخ دەگوشێت و تا روحی تێدا بێت دەستی لیّ هەلّناگرێت.

ئەی کیّ چیرۆکەکە بگێڕێتەوە؟

ڕۆژگار بە جۆرە لاف لێدانێکەوە دەست پێشخەری کرد "من شایەتحاڵم، من مێژووم، من لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا شایانترم.

گێڕەرەوە ناقایلە و دەبێژێت، "بەڵکو من لە پێچ و پەناکانی دەروونی مرۆڤ لە تۆ شارەزاترم، لە داڕشتنی ڕووداوەکاندا بە داڕشتنێکی هونەرکاری وا کە جوانکارییەکی وای پێدەبەخشێت، تۆ نایزانیت. من هونەرمەندو ڕێکخەر نییم، من دەچمە نێو ئەندێشە و هەستی کەسەکانەوە و وەك داوەتێکی بەلەزەت پێشکەشی خوێنەری دەکەم.

باوکی سەلمان، شلۆمۆ کوردە وتی "بەڵکو شتەکە لە سایەی منەوەیە". من قارەمانی چیرۆکەکەم، منم بە هەست و ویژدان و هزردوە تیایدا ژیاوم، من شایەتحاڵ و هاوبەش بووم، من ڕووداوەکان وەك خۆیان بە وردی و دڵسۆزانە دەگێڕمەوە، وەسفی هەست و هزرەکان دەکەم. تا هەر من لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا و بۆ تەواوکردنی چیرۆکەکە لەپێشترم.

ناکۆکی کەوتە نێو هەرسێکمانەوە، لە نێوماندا گفتوگۆ درێژەی کێشا و قسەمان کرد. هەریەکەمان بە پێی شارەزایی خۆی دەربارەی کەموکورتی ئەوی تر زیادەڕۆیی دەکرد و شارەزایی خۆی دەردەخست و شارەزایی ئەوی دیکەی دەشاردەوە.

لە کۆتاییدا لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە هەرسێکمان، هەرکەسە و لە ڕۆڵی خۆیدا و بە دیدی خۆی بەشداری لە گێڕانەوەی ڕووداو و قەوماوەکانی سابلاخ بکەین.

# کایەی یەکەم*

ئیستر منداڵەکەی بە باوەشەوە بوو، نەختێکیش سکی بەرز بووبووەوە، هەموو رۆژێك بەرەو باخەکە دەچوو و بە کانییەکەدا تێدەپەڕی، کە شوێنی یەکتربینینی ژنانی سابلاخ بوو، ئارەقەکان تێیان دەڕوانی، تەماشاکردنەکەیان جۆرێك لە سووکایەتی و بەدنیهادی بوو، بەڵام برێك جار سەیرکردنەکەیان بەهۆی ڕێزی شووکەیەوە بوو. ئیستر ساڵێك تەمەنی گەورەتر بوو، لێ هێشتا نەگەیشتبووە تەمەنی بالق بوون. باسیان دەکرد و دەیانوت: "ئەو پەندە چەند راستە کە سەگ بە زەبری کلك ئیسقان دەشکێنێت". کەچی شلۆمۆ هەر لەم ساڵەدا شارەزایی و لێهاتوویی خۆی سەلماند. دەیان وت: "باشترین کەسێکە کە تایەفەکە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دنیایی خۆیان هەڵیان بژاردووە...!". هەر لەسەر کانییەکە دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە:

ــ ئیستر درووگیانە و شلۆمۆ بواری نەدا تا (ناحوم) تێر شیر بخوات.

ــ هەر لە دوای ماوەی بێ نوێژییەکەی...

ــ منداڵەکانی وەك دوو جمکانەیان لێ دێت.

ــ ئەی ئەسمەر لەچیدایە...؟

ــ ڕەنگە سەیۆن (زگ شۆڕەوە) بێت.

---

* کایە: واتا (جولە)، بەمانای ڕەهەند، یان یاریکردن نەهاتووە، هەرچەندە لە هەندێ ناوچەدا بە مەبەستی گەمەکردن، یان ئامرازی گەمەکردن دێت، بەڵام لێرەدا بە مەبەستی جەنگ دێت کە ناو بە ناو دەوەستێت و جارێکی دی دەست پێدەکاتەوە. (وەرگێڕ).

ـــ هەر لەبەر ئەمەیە ئەو خۆبەخشییەی کرد و ئیستیرە (شێت)ی بۆ خواست.

ـــ بەسە، ئیدی بەسە! ئەسمەر هێشتا لـە هـەرەتی گەنجیدایـە، بـەڵام خـودا خـۆی دەزانێت بە کێی دەدات.

ـــ هەناریش دەداتە بێ ددان.

ـــ رەنگە شلۆمۆ لەوەتەی ئیستیرە گێلەی خواستووە، توخنی ئەسمەر نەکەوتبێت.

دەزانم ئەسمەر هۆشمەندە، لـەو سـاتەدا بێـدەنگ بـووم و سـەیری یـەکترمان کـرد، سەیرکردنەکەمان بە جـۆرێ بـوو کـە زمـان لـە دەربڕینیـدا دەستەوسـان بـوو. دوای کەمەکێك پێموت:

ـــ تۆ ئـەی (دایکـی منـداڵان) هـەر هاوسـەرە لەپێـشەکەم بوویـت و هـەر واش دەمێنیتـەوە. هـەردوو کوڕەکـە و کـچەکە خـەڵاتی خـودان و نـاحوم چـوارەمیانە و پێنجەمیش ها بەڕێوەیە...، رەنگە لەگەڵ تووڕەبوونی خودا لە بەندەکانی ئـەمیش وەك گوڵەگەنم سەر دەربکات و بێتە دنیاوە.

ئەرێ باوکی سەلمان، تۆ بە راستی ئەوەت دەزانی، یان ئەوە بیرەوەرییەکە و هەناسەی رابردوو ـــ ئایینده کارێژی دەکاتەوە. ئەسمەر (خـۆی راگـرت) و ئیستیر هـەر هۆشـی نەهاتەوە بەر. تۆیەك پیاوماقوڵانی تایەفەکـە لـە کـەنیس کۆدەکەیتـەوە و لـە بـارەی ئاییندەی نادیارەوە ئاگاداریان دەکەیتەوە، هەر لە یەکەم تەقەوە، ئینجا بە دوای تەقەی یەکەمدا تەقەی دیکە دێن و عیزرائیل رێکیان دەخـات و وەك گەدانەیـەکی زەبـەڵلاح ریزیان دەکات تا هەزاران کەس لە دانیشتووانی شارۆچکەکە لە ملی بکەن.

ئایا راستییەکەی بێژم؟ بە دزییەوە لە گوماندایت...، ئێران بەشـداری جەنگەکـەی نەکرد، بەڵام تورکیا هاوسنوورە و عێراقیش بـە هـەمان شـێوە، عێـراق ویلایـەتێکی عوسمانییە، هەروەها لەولاوە رووسیایە.

ئاگرەکە لێمانەوە نزیکە، ئاگرەکە تەشەنە دەکات...، خەڵکی تۆقیون، من دووبـارە میری هاوکارم ئاگادار کردەوە. محەمەد و ئەحمەد و حەمیـدی کـوڕی لەگـەڵ سـەلمان و سەیون و مریەم وازی دەکەن. دەیان بینم و کزە لە جەرگمەوە هەڵدەستێت، بـەڵام ژیـان

لە سابلاخ هەروەك خۆیەتی و بە هەمان ریتم دەڕوات و ئەو هەواڵە شوومانەی کە لـەو دیوی سنووڕەوە دێن، شێلووی ناکەن.

ئەو ڕۆژەی دەربارەی شووکردنی ئەڵماس قسەم لەگەڵ عەزریای دراوسێمان کرد، بەو پێیەی من پێوەندیم لەگەڵ ڕۆڵەکانی تایەفەکەماندا هەبوو، بۆیـە باشـترین گـەنجیانم دەناسی، بە عـەزریام وت کە کچەکەی تـا دێـت گـەورەتر دەبێـت و مـن دەتـوانم ئـەو بێدەنگییە بشڵەقێنم، بە هێنانی تاجە ئەڵماسینە دەیشڵەقێنم. عەزریای زیڕنگـەر بـە نائومێدی و کەسەرەوە پێکەنی و وتی:

ــ تاجە ئەڵماسینە وا لە تاران لەسەر سەری شایە، خۆزگە پێی قایل دەبوو.

ــ ئەی بە کێ قایلە؟

ــ نازانم، ناشتوانم پێت بڵێم کە بە کێ قایلە، تەنانەت گەر موسای سەروەرمان لە گۆڕەکەی هەڵسێتەوە و بیێتەوە بە گەنج پێی قایل نابێت.

بارکی سەلمان شەرم دەکات کە پاشمـاوەی چـیرۆکەکە بگێڕێتـەوە، لـە تووڕەییـانـدا دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕێت، دوایی بیری دەکەوێتەوە کە مەسـەلەکەی ئـەڵماس چـی بەسەر دێت، خەم دای دەگرێت و پێدەکەنێت:

ــ ئەڵماسی بەستەزمان!

بەڵێ ئەڵماس لە ژوورەکەی خۆیەوە قسەکەی ژنەوت و وەك رەشـەبا بـەرەو شـلۆمۆ کەتانی هەڵیکرد و بە بێ تەقێ و بە شاتەشات تفێکی لە دەموچاوی کرد:

ــ ئەو کەسەی دەست لە کاری من وەردەدات هێشتا لە دایك نـەبووە، بـڕۆ بـۆ لای دوو ژنەکەت و خەمی ژنە نەزۆك و ژنە شێتەکەت بخۆ، لووت لە شـتێك وەرمـەدە کـە تەنها شوورەیی و بێ ئابڕوویی لێ وەدەست دێنیت!

باوکەکە لاڵ بوو، منیش دەهری بووم، ئینجا ماڵی دراوسێکەم جێهێشت و جارێکی تر بۆ هەتا هەتایە رووم تێنەکردەوە.

دڵی رەزا بە ئاگری ئاگرپەرستان دەئایسا و دانەدەمرکایەوە، ئەو ئاگرە حەرامەی کە بە یەکەم بای پایزی هەڵکردووی سەرچیاش نەدەکوژایەوە. هێشتا بە ئاگری نیگای ژنی براکەی چزەی لێهەڵدەستا، براژنەکەی تەنها بەو ئاگرەوە نەدەسووتا، بەڵکو لـە ترسـان

هەڵدەلەرزی، تاخر ئەو ژنی مێردداره و دایکێکی ئابڕوومەنـدە، ئـەو پیـاو و منـداڵی خۆی و چەپاڵەدانی گەرەکە و لە ئابڕووچوون دەترسـێت، گـەر کارەکـەی رەزا ئاشـکرا ببێـت، ئـەوا بـە تـاوانی رەزاوە دەسـووتێت و باجەکـەی دەدات، رەنگـە لەگـەڵ بـێ تاوانییەکەشیدا، هەر تاوانبار بکرێت و نوقمی نێو ئابڕووچوون و خوێن رشـتن و مـردن ببێت، چونکە لێرە قوربانی مامەڵەی جەلادی لەگەڵ دەکرێت!

ــ ئەسمەر!

چپەدوویەکی پڕ لەتکاو پاڕانەوە و ناسك و ترساو:

ــ بە مێردەکەت بڵێ!

ــ ناکرێت! ناکرێت! ئەوسا بەوە تاوانبارم دەکات، کە خۆم هانم دابێت، ئـەو دەمـە برا دەست دەخاتە خوێنی برا.

ــ کە "گوللەکە" دەرچوو، ئیدی تۆش کۆتاییت دێت!

ــ کەواتە من لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دراوم، خودا بەزەیی پێمدا بێتەوە.

فاتمە و سابلاخ! لە کۆڕی پیاوان، لە ماڵان، لە گۆڕەپانی شارۆچکەکە، لە کەنیسە، لە کڵێسە و لە مزگەوت، لە دانیشتنی ژنان لە نزیك کانییەکـە، لـە ژووری حـەرەمی ژنان، باس باسی (جەنگی جهانی)یە، کە دەستارەکەی لەبەر دەرگا دەگەڕێت، ئەم قسە و باسانە جێگەی باسی (رۆژی تەویلەکە)و ناکۆکی نێوان هەردوو کـوڕی حـاجی زادەی گرتبووەوە، باسی حەسەن بوزورگیش جێگەی گرتبوو. کە رێگـەی لـە کـچانی جـوانی شارۆچکەکە دەگرت و چاوبڕکێی لەگەڵدا دەکـردن و دڵـی زۆر کـچۆڵەی راکێـشابوو، ئەوەش نەك لەبەرئەوەی کوڕە خانەدان بوو و ماڵە گەورەکەی باوکی بە تەنیشت مـاڵی شلۆمۆوە بوو، بەڵکو لەبەرئەوەی قۆز و جوان و باڵا بـەرز بـوو، ئـەم سـیفەتانەش وای لێکردبوو کە لە هەموو کات و شوێنێکدا بۆی هەڵبخلیسکێن.

پیاوێکی خەڵکی سابلاخ بە برادەرەکانی دەڵێت:

ــ لە راستیدا لە ترسی کوڕی بوزورگ، من کچەکانی خۆم لە ماڵەوە بەند کردووە، دان بەوەدا دەنێم هەرچەندە لەسەر ئابڕوو پارێزی و پاکیزەیی پەروەردەم کـردوون، بـەڵام لەوە دڵنیا نیم کە قۆزی و جوانییەکەی حەسەن بوزورگ فریویان نادات.

ئەمێستا لەجیاتی باس کردنی کوڕی بوزورگ دەیان پرسی:

ــ تۆ بڵێی بە ئاگری ئەم جەنگەی کە زۆر لێمان نزیك بووەتەوە، بسووتێین؟

لە رابردوودا دوا کەسێك وەك ئەوەی پێشبینی بکات، دەیوت:

ــ بڕواناکەم مورتەزا لە وەلی بـرای خـۆش بێـت، ئـاخر بـەو خودایـە دوای کـارە دزێوەکەی، گەر رووخساری مورتەزای بە تەرسی ولاخ و گووی بنیادەم سواخ دابا، ئـەوە هێشتا لەکارەساتی رۆژی تەویلەکە ئاسانتر بوو، بێگومان لەو سۆنگەیەوە خـوێن هـەر دەڕژێت.

ئێستا دەست بە پێشبینی کردن دەکات و دەڵێت:

ــ ئەم جەنگە نەفرەتییە هەروا بە ئاسانی بەسەر سابڵاخدا گوزەر ناکـات، دوایـی بیرتان دەخەمەوە کە لە شارۆچکەکەماندا خوێن بە جۆرێك رێ دەکـات، دەگاتـە بینـە قاقا!

ترسی سبەینێ دێوێکە و بە هـەردوو دەسـتە رچـیوەکانی دڵ دەگوشـێت و لەگـەڵ بەرایییەکانی بای وەیشوومەی زستاندا دەیبەستێت. دیسان باسی مەسەلەکە دەکەنەوە:

ــ شا بەشداری ئەم شەڕە ناکات، ئاخر لەگەڵ کێدا بجەنگێت؟ لەگـەڵ دۆسـتەکەی کە لەسەر تەختی روسیا دانیشتووە، یان لەگەڵ خەلیفەی ئیسلام؟!

پێیان دەڵێم من شلۆمۆ کەتانیم.

ــ ئەوەتان لە دەست چوو کە سابڵاخ ئارام و دوورەدەستە، خودا ویستی کە سـابڵاخ ببێتە پارووێەکی نەرمە قووتی ئەم و ئەو، گورگیش گـوێ ناداتـە بـێ لایـەنی بـەرخ. ئەوەشتان لەدەست چوو کە ئێمە بۆ هەردوو لای ناکۆك بۆ گەیـشتنە مـاڵی دژەکـەی، وەك پردێکین، سابڵاخی جوان و ئاشتیخواز لەناکاو دەبێتە شوێنێکی ستراتیژی گـرنگ بۆ دراوسێ ناکۆکەکانی!

ئازووقەی زستان لەژێر زەمینی ماڵە هەبووەکان دانرابوو، زریانی بـەفریش بەسـەر سابڵاخدا هەڵیکرد و درەخت و ماڵ و رێگاوبان بە کفنی سـارد و زۆر سـپی داپۆشـرا، بەیانییەك خەڵکی لە خەو رابوون و لەدەرەوە جووڵەیەکی نائاساییان بیـست، هـەروەها ژاوە ژاو و جۆرە قسەیەکیان بە زمانێك ژنەوت کەم کەس لێـی تێدەگەیـشت، شـلۆمۆ

کەتانی لەو خەڵکە کەمە بوو کە ماوەیەکی زۆر نەبوو لە دوا سەفەری بازرگانی لەو وڵاتە گەڕابووەوە کە بەم زووانە قسە دکەن...، روسیا!

ئەو موسڵمان و دیان و جوولەکانەی سابلاخ کە نوێژی بەیانییان لە مزگەوتەکان وکڵێسەکان و کەنیسەکان دەکرد، یەکەم کەس بوون دیمەنە سەیرەکەیان دی، بینیان شارۆچکەکە پڕ بووە لە سەربازی غەوارە و جلی زستانەی خورییان لەبەرە و کڵاوی فەرووی رەشیان لەسەرە و بە روونی بڵمە بڵم دەکەن، ئەوانە بۆ یەکەم جار بوو تۆپ و دەبابەیان دەدی، چونکە تفەنگ گەورەترین چەکێك بوو دیتبوویان، بەتایبەتی ئەوانەی لە ژیانیاندا سابلاخیان جێنەهێشتبوو، ئەوانەی بۆ نوێژ چووبوون لە حەژمەتان تووکی سەریان رەپ بووبوو، لەسەر بەفرەکە وشك بووبوون و لەژێر پێیە لەرزۆکەکانیان بەستەڵەکەکە تواببوووە. ئەم دێوە ناسنینانە کە سابلاخی ئارام لەمەوبەر نەی بینیبوون، گۆڕەپانی شارۆچکەکەیان پڕ کردبوو دەروازەکانی داخستبوو و رێگاکانیان گرتبوو. سەربازەکان لەنێو خۆیاندا بڵمە بڵم دەکەن و پێدەکەنن، هەروەك ئەوەی دانیشتووانی سابلاخ تارماییەکی نەبینراو بن، یان وەك ئەوەی دانیشتووانی سابلاخ غەوارە بن و بێن و بڕۆن، غەوارە و بیانییەکان وەك ئەوەی خۆیان دانیشتووی جێگیر و رەسەنی سابلاخ بن، نا دەبوو سابلاخییەکانیان لەبیر بێت، کەسێك ئەم هەڵکوتانە سەرە کتوپڕە پرسی پێ نەکردوون، نە لە دەرگایان داون و نە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەشیان خواستووە، بەڵام ئێمە لە شاری تارمییەکان نیین، ئەمە شارۆچکەی خۆمانە و مافی خۆمانە کاروبارەکانی بەرێوە ببەین...

ـــ ئەوە بەراستیتە؟

شلۆمۆ کەتانی سەیید و تەفلیم* و کتێبی وێردەکانی هەڵگرت و دەرگاکەی کردەوە. ئەو ژاوە ژاو و بگرەو بەردەیەی کە بیستی خەونێك نەبوو کە لە خەودا بینیبێتی، ئەوەتا ژاوە ژاوەکە بەردەوامە و تا دێت بە توندی لە دەرگای ماڵەکەی نزیك دەبێتەوە. ترسی ئەوەی لێ نیشت کە پێشبینییەکەی بێتە دی و بە دووری نەزانی کە

* سەسدید و تەفلیم: ئامراز و کەرەسەی نوێژ و نزای ئایینی جولەکەیە.

سابلاخ ناچار بکرێت و بکەوێتە نێوان بەرداشی جەنگەکەوە، بەڵام شلۆمۆ لەبەر دەرگا هەڵوەستەیەکی کرد و بە شوێن خۆیدا بەرەو هەردوو ژووری ژنەکانی گەڕایەوە. یەکەم جار بۆ لای ئەسمەر چوو، ئەسمەری هاوڕێی سەفەر، سەفەری تەمەن، بە هەموو وردەکارییەك لەگەڵ ژیانی ئەمدا دەژیا. ئەسمەر وەئاگا هات، بەڵام لەناو جێگەکەی راست نەبووەوە، شلۆمۆ پێی وت پێش ئەوەی بۆ نوێژ بڕوات هیچی نەخواردووە، چونکە وا راهاتبوو پێش ئەوەی بڕوات قەشەنگی وەئاگا دەهێنایەوە و هەردووکیان پێکەوە قاوەڵتییان دروست دەکرد، لەپڕ بۆ ژوورەکە گەڕایەوە و هەر لە شوێن خۆیەوە بە چپە وتی:

ــ باوکی سەلمان ئەوە چیتە؟

نەختێك شڵەژا و تفی قووت دایەوە و نەرمە کۆکەیەکی کرد، بە جۆرێك هەناسەبڕکێی پێکەوت وەك ئەوەی بەسەر چیایەکدا هەڵزنابێت، وتی:

ــ ئەسمەر مەترسە، بەڵام خودا هەر خۆی دەزانێت چی روودەدات، دڵم پێم دەڵێت کە هەندێك شت روودەدەن. گەڕامەوە تا چاوەکانم بە سەیرکردنتان تێر بکەم و منداڵەکانیش ماچ بکەم.

ئەم قسەیەی وەك مێکوتێك بەسەر دڵی ئەسمەردا کەوت، ترسا، بەڵکو شڵەژا، خەریك بوو هاواری گەرووی بتەقێتەوە، بەڵام شڵەژانەکەی خۆی قووت دایەوە:

ــ مەڕۆ، مەڕۆ! باوکی سەلمان، لە ماڵەوە بمێنەوە و دەرمەچۆ! وەك هەمیشە زەردەخەنە هێمنەکەی نواند و بەسەر سەلماندا نوشتایەوە و ماچێکی نێوچەوانی کرد، بەسەر سەیوندا چەمایەوە و ماچی کرد، هەروەها بەسەر مریەمیشدا خۆی نوشتاندەوە و ماچی کرد، کیژۆڵەکە خۆی وەرسوڕاند و چاوانی کردەوە و بانگی کرد:

ــ باوکە! باوکە!

لەبری ئەوەی وەڵامی ئەسمەر بداتەوە خەریکی دوێتەکە بوو، ئەسمەر دووبارە وتی:

ــ شلۆمۆ، مەڕۆ!

دوێتەکەی لە ئامێز گرت و وتی:

ــ بەرپرسیارێتییەکەم لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە، خودا لەو بان سەرەوە دەمپارێزێت! هەر ئەوە هاورێ و پاسەوان و داڵدەی من!

... داڵدە و پەنای من! کاتێك ئەمەی پێ وتم سەری بەرەو ئاسمان و بەرەو خودا بەرز کردەوە. کرنۆشی برد و چاوەکانی عەسریان تێزا، ئەو لەگەڵ رووداوەکان دەژی. هەزاران جار تۆز و گەردی لە رابردووی دوور لە خۆی هەڵوەراندووەو شێوە کلۆر و مردووەکەی لەو رابردووە، زیندوو کردووەتەوە. سەرەڕای کەڵەکەبوونی ماندوویی سەر جەستەی کە شوێنەواری گەستنەکەی لە رووخساریدا هێشتا دیار بوو، بەڵام گەنجێکی پێگەیشتوو بوو، ئەو ئێستا و رابردووە، چارە لێك دەدا و پێدەکەنێت، دەترسێت و دڵنیا دەبێتەوە، دەپرسێت و دەگاتە راستی، ئەو راستییە رەهایەی کە هێشتا هەلاوی زۆنگاوە بۆگەن کردووەکانی رووداوەکان لەم رووخسارە هەڵدەستێت.

رووی کردە ژووری دووەم. خەوتبوو، هەستی بە هاتنە ژوورەوەی من نەکرد، ناحوم بەتەنیشتییەوە بوو نەك لە نێو لانکەکەی. جەستەی خەریك بوو فشاری دەخستە سەر ناحوم و لەوە بوو پشووبڕی بکات. جحێڵێکی بێ ئەزموونە، بێگومان ئەوەی روودەدات بەلایەوە گرنگ نییە. ئێستا خەون دەبینێت، تەنانەت کە من مێردیم کاتێك هاتمە ژوورەوە هەستی بە هەنگاوەکانم نەکرد. باڵیم لەسەر دەموچاوی منداڵەکە لادا. هەر بە نووستوویی چارەی لێکنا و بە هەناسەیەکی بێزارییەوە خۆی وەرسووڕاند، ناحوم جووڵایەوە، بەڵام وەئاگا نەهات. ئەمێستا منداڵەکە رەها بووبوو، بەسەربەستی هەناسەی دەدا، ئەوی تر مەلۆتکە و ئاوەڵەیەکە و لە منداڵدانیدایە. ئێستر هەر نووستووە و ژاوەژاوەکەی دەرەوە نابیستێت. جحێڵێکی بێ ئەزموونە...، جحێڵێکی بێ ئەزموونە! ناحوم! ئاخۆ دەبێت چۆن لە سێبەری دایکێکی جحێڵ و بێ ئەزموون گەورە ببێت!، بەڵام من باوکتم باوك! ئەی ئەگەر لە گەرمەی ئەم سەفەرە پڕ نهێنیی و مەترسییەدا مردم!؟ نزام بۆ منداڵەکە و دایکەکە و ئەو ئاوەڵەیەی کە لە منداڵدانیدا راکشاوە، کرد. لە ژووری حەرەمی دووەم هاتمە دەرێ، سەعاتەکەم لە کراسە ئاودامانەکەم دەرهێنا، سەعاتە زێڕین و مۆردارەکەم، تەماشام کرد و هەنگاوی خێرام هەڵێنا، ویژدانم و هەستم پەلەیان لێدەکردم. هەستم بەرەو بەرپرسیارێتی هانی دام. من

گەورە و خزمەتکارم، خۆ ئەگەر رۆڵەکانی تایەفەکەمیش لەم دواکەوتنەم خۆش بن، ئەوا من لەمەدا لە خۆم خۆش نابم! کەواتە سەر لە گەوڕ و پشتیەکە نادەم، نەخێر پێش ئەوەی بگەڕێمەوە لە رێگەوە سەرم لێدان، ئەوە من چیمە؟ ئەی بۆ ئەمڕۆ وەك یەکێك رەفتار دەکەم، کە ماڵئاوایی لە کەسوکاری بکات و بەرەو سەفەرێکی بێ گەڕانەوە بڕوات؟ باوکی سەلما، ئەوە لە دەرەوە چی روویداوە؟ ژاوەژاوەکە لەبەر دەرگایە و تاریکیش خەریکە دەڕەوێتەوە. ئێستا ژاوە ژاوەکە دەرکەوت و ناوەڕۆکەکەی بەرجەستە بوو، بێگومان سەربازی رووسن.

شلۆمۆ بە پێچەوانەی ماڵەکەی خۆی هەنگاوی نا، لە رێگەی بەرەو کەنێس سەسیدو تەفلیمەکە بە بن هەنگڵییەوە و وێردیش لەسەر زاری. ئەمێستا هەستی کرد، کە پێشبینییەکە هاتووەتە دی، دەبا خەڵکی سابلاخ بزانن، ئێمە لە ئاگرەکە ناخەڵەسێین، تا ئەوەتا لەسەرەتای رێگادایین. یەکێك بانگی کرد:

ـــ یاوری! یاوری! بووەستە!

خەسێتمان لە سیمامان و ئەوەی بەدەستمانەوەیە دیارە، ئەمانە کەرەسەی نوێژن، یەهوودی! ئاخۆ بانگی دەکەن، یان تەنها رادەبوێرن! وەرسووڕایەوە و قسەی لەگەڵدا کردن، ئەو روسی دەزانێت و ئەوانیش لە کەسێك دەگەڕێن کە رووسی بزانێت، ئەو بەرپرسیاری تایفەکەیە و ئەوانیش سەرۆکی تایفەکانی شارۆچکەکەیان گەرەکە. کەواتە ئەمە یەکێکە لە باشی و خراپی رێکەوتەکانکی هەردوولایان. بیگرن "وەرە بۆ لای سەرکردە!" کات خەریکە دەیخنکێنێت "کاتی چوونە کەنێس نەماوە!".

لەگەڵ یەکتر کەوتنە گفتوگۆ، بەرەو قسەکردن رایان کێشا و هەوڵی دا بە قسەکردن رایان بکێشێت.

ـــ لەوێ خەڵکی چاوەڕێم دەکەن!

بێ سوودە! ئەمە فەرمانێکی سەربازییە، بەرەو بنکەی کاتی لە مەیدانی شارۆچکەکە رایانپێچا.

ئەمە کەی خێوەتیان هەڵدا و کەی بنکەی کاتییان بۆ سەرکردایەتی ئامادە کرد؟

لەوێ مەلای موسڵمانەکان و قەشەی نەسرانی و حاخام نـاحومی بـینی. سـەرکردە رووسەکە قسەی دەکرد و وەرگێڕەکە بۆی وەردەگێڕا. سـەرکردەکە هەنـدێ شـت دەڵێـت دانیشتووانی سابڵاخ لێی تێناگەن، بەڵام وەرگێڕەکە کە قسە دەکات هەموو رۆڵـەکانی سابڵاخ لێی تێدەگەن. من چیم لەمە داوە، ئەوەتا حاخـام نـاحوم پـێش مـن لێرەیـە!؟ ئێستا نوێژکەران لـە کەنیـسن، رەنگـە حاخـام نـاحوم لـەوێ دەرگاکـەی کردبێتـەوە، بێگومان ئەوان ئێستا وەك مێگەلێکی بێ شـوانن، دڵنیـام لـەبری نوێـژکردن قـسەی حەرام کرا و دەکرێت و سبەینێش ماڵی خودا دەبێتە مۆڵگەی سیاسەتی نێودەوڵـەتی و شوێنی کۆبوونەوە و فەرمانەکانی سوپای قەیسەری روسیای تێدا دەخوێندرێتەوە.

خودایە داوای لێخۆشبوونت لێدەکـەم، داوای بـەزەییت لێدەکـەم و تـۆ بـەزەییترین کەسیت.

بەڵێ، بەڵێ ئەی حاخام ناحوم، تۆ بەساڵەوە چوویت و تۆز و گـەردی سـاڵگار بـە تەوێڵ و مووەکانتەوە ئاوێتەی بەفرەکەی سابڵاخ بـووە، بـەڵام بۆچـی بـە گۆچـانەکەت ئاماژە بۆ من دەکەیت؟! ئەی ئەوە بەس نییە تۆ منت خستە ژێـر بـاری بەرپرسـیارێتی جوولەکەی سابڵاخ، ئینجا دەتهەوێت بمکەیتە میانگیری نێوان رۆڵەکانی تایەفەکـەمان و ئەم رووسانە؟ نەفرەت لە پەرۆشی و لاوێتیم! ئاخر بیرت نەچێت من مێردی دوو ژنم و باوکی چوار منداڵ، دوا منداڵیانم بە ناوی تۆوە ناو ناوە، پێنجەمیـشیان لـەنێو سـکی دایکی سکەخشکێ دەکات و بـەرەو سـابڵاخێکی داگیرکـراو هـەنگاو دەنێـت، یەکـەم هەنگاویشی بەرەو جەنگە. ئایا ئەمە لەباری تەمەن قورستر نییە؟ تۆ ئەی حاخام ناحوم بەرەو ئەم جەنگە تەنگەتاوم دەکەیت، کە بەسەرماندا سەپێنراوە، ناشزانیت تـۆ بـەرەو رووی مـەرگم دەکەیتەوە. ئێ ئەوپەڕێکەی ئەمەر بێوەژن دەکەوێت و ئیستیریش دەبێتـە بێوەژن و چوار منداڵیش بێ باوك دەبن و پێنجەمیش هێشتا لە زگی نادیاردایـە. مـن رەشبینم و بایەخ پێدانم پفم دەدات و دەبمە تاوسێك. نـەخێر، بـەڵکو ئـەم چرکەسـاتە چرکەساتی بێهێزی و لەخۆبایی بوونمە، دەق وەك ئەو رۆژەیە کە ئیستیرم خواست. ئـای ئەمەر خودا لێت ببورێت، خودا لە حاخام ناحومی پیاو چاك و چاکەخوازیش ببورێت.

لەو چرکەساتەدا دنیا لەدەوروبەرماندا چەشنی ئیستیر ساویلکە و بێ ئەزموون بوو. ئێ مادام هێشتا تاقە گوللەیەك نەتەقێنراوە و دڵۆپە خوێنێکیش نەڕژاوە، ئیدی هاتنی رووس، یان عوسمانلی، یان سەربازانی شای قاجاری بۆ سابڵاخ وەك یەکە! ئەمە بیرۆکەی یەکەم سات بوو، ساتی بێهێزی، ساتی دەرهێنانی چزووی مێشەنگ و کوڵاژدم بوو لە شوێنی خۆی، بەڵام کاتێك بۆ لای سەرکردە بانگ کرام و فەرمانم پێدرا، کە فەرمانەکە بگەیەنمە رۆڵەکانی تایەفەکەی سابڵاخ، (هەوێن)ی چرکەساتەکە لە سەرمدا نەما و (بیرۆکەکە) هات، بیرۆکەی رۆژەکان و ساڵەکان.

"ئەی دانیشتووانی سابڵاخ! سەربازەکانی قەیسەر بۆ پاراستنی ئێوە و داکۆکیدن لە ئێوە لە فێڵ و تەڵەکەی عوسمانییەکان و ئەڵمانیای هاوپەیمانیان هاتوونەتە نێو شارۆچکەکەتانەوە، ئەوە بزانن، ئێمە ئازاردانی ئێوە و شارۆچکەکەتانمان مەبەست نییە، بچنەوە سەر کاری خۆتان و دەست لە شتێك وەرمەدەن، کە پەیوەندی بە ئێوەوە نییە، ئازارمان مەدەن و لە ئێمەوە تووشی ئازاردان نابن، بەڵام هەش بەسەر ئەوەی کە رێگە بە خۆی دەدات تا تەگەرە بۆ ئەرکەکانی سوپای پیرۆزی قەیسەر دروست بکات و یارمەتی دوژمنان بدات. ئیدی ئەوەی ئاگادار کرایەوە، پاساوی نامێنێت!

بژی قەیسەر نیکۆلای دووەم، بژی رووسیا!".

فەرمان و پەیامەکەم برد و حاخام ناحومیشم لەگەڵ بوو، بۆ کەنیس چووم و تارماییەکی نەفرین لەگەڵماندا بوو. ئەم تارماییە رەشە وەك خەڵووز، چونکە جیاوازی لە نێوان خەڵووز و خەڵووزاوی نییە، لەگەڵ بەرایی روون بونەوەی شتەکان، بەفریش بە توندی دەستی بە بارین کرد، لە سەرەوە و لە خوارەوە هەر سپی دەچووەوە، لەپێوە تا پاشەڵ هەر سپی بوو، ئەمە کفنی سابڵاخە، بەڵام رەشاییەکە لە ناخی خۆماندایە، خەڵووزاوی و خەڵووز رەشپۆشی و ماتەمینی خۆمان و سابڵاخە...، لە کۆتاییدا حاخام ناحوم وتی:

ـــ چی روودەدات؟

تەماشای هەورە چڕ و بە بەفر ئاوسەکەم کرد و وتم:

ـــ بەفر و زریانەکە بە تەوژم دەبێت!

بە سادەیی نێوان دوو هاوڕێی گیانی بە گیانییەوە وتی:

ـ مەبەستت رووسەکانە! جەنگ!

ئەوەتا ئێستا خەڵووزاوی تێك دەشکێت، بەڵام لە ناوەوە رەش لە رەنگی قیر رەشتر دەنوێنێت.

پێی چەپم بۆ هەنگاوێکی دیکە هاویشت. پێڵاوەکەم لە نێو بەفرە فشەڵەکەدا نوقم بوو، ئەم بەفرە بە سەریەکتردا کەڵەکە دەبێت و دەی بەستێت و دەبێتە شوشەیەکی رەق و لووس و مەترسیدار، رێگە لە رۆیشتنی ئامێر و دەبابە دەگرێت، بەڵام رووسەکان کارامەن و خاوەن شارەزایین، کەنێسەکە نزیکە و زمانیشم لە بۆشاییەکی نادیاردا تەتەڵە دەکات، بەڵام هەست کردنەکە چون پارچە سەهۆڵێك ساردە.

ـــ دنیا و سابڵاخیش بەختەوەر دەبن، گەر ئەڵمانەکان و عوسمانییە هاوپەیمانەکانیان لە بەرایی ئەم جەنگەدا تێك بشکێنن.

ـ مەبەستت ئەوەیە کە...؟

ـ مەبەستم ئەوەیە تا دەردی (پیاوەنەخۆشەکە) گرانتر بێت، پێم وانییە خۆی و هاوپەیمانە بەهێزەکەی تاوەرێك بن لە کاغەز و بە فوویەك لار ببنەوە.

دووبارە پرسی و پەژارە رووخسارە لۆچاوییەکەی گرژ کرد:

ـ مەبەستت ئەوەیە کە...؟

ـ بەڵکو دەترسێم، لە خودا داواکارم باری مەترسی نەفرەتەکەمان لەسەر سووك بکات.

تاریکییەکە توندتر بوو...، سپێتی دنیا زۆرتر بوو...، دیوی دەرەوەی مەرگ سپییە...، سەرماکە! کەنێسەکەمان ئەوە دەرگاکەیەتی!

ـ سێ چوار یەکی نوێژکەران نەهاتوون!

وتم:

ـ بە هۆی ترس و سەرماوەیە!

هەستم بە دڵتەنگی کرد، گەر هاتن و دەرگا بە دەرگایان پێ لێدام و بۆ خوێندنەوەی پەیامەکە گێڕایانم، ئیدی بۆ پێڕاگەیاندن رایان سپاردم "ئەوەی ئامادەیە،

ئەوانە ئاگادار بکاتەوە کە لێرە نیین". من ئەمەم هەر لە خەیاڵدا نەبوو، ئەوەی هات فەرمانەکەم بۆی خوێندەوە، حاخام چووە سەر سەکۆکە و بۆ ڕۆژێکی ئاسایی هەندێك ئامۆژگاری خوێندەوە، دوابەدوای ئەوە بۆ بێ وەی بوونی ساباڵاخ و تایەفەکەمان و تێکڕای دانیشتووانی شارۆچکەکە نزای کرد و داوای لە خودا کرد، کە غەم و پەژارەمان لەسەر لاببات. سەرباری ترس و زریانی بەفر نوێژ و پاڕانەوە پتر لە پێویست درێژەی کێشا. ئەو ڕۆژە پێنج شەممە بوو، کتێبی تەورات دابەش کرا و دوعا و وێردی زۆر خوێندرا. بە خۆمم وت هەندێك خەڵك هەن دەیانەوێت بەرتیل بە خودا بدەن، بەڵام خودا بەرتیل قەبووڵ ناکات. هەروەها وتم ئەوەی بە ڕاستی باوەڕدار بێت، پێشنیار بۆ خودای خۆی ناکات و بۆ ئەو ئەرکەی بۆ خودا جێبەجێی دەکات، منەتی بەسەردا ناکات، بەڵام من خودام لەگەڵدایە و ڕوو لە هەر جێیەك بکەم، دەمپارێزێت. ئاخر ئەوە چۆن لەبیر دەکەم کە لە گەورترین خوێنڕێژانی وەك کوڕانی ئەکبەر و ستەمکاری گەورەی ئێران ڕزگاری کردم؟!

بەرەو ماڵ گەڕامەوە و فەرمانەکەش بە دەستمەوە بوو. لەبەر دەرگا بەفرم دی و ئەسمەر دەرگاکەی کردبووەوە و چاوەڕێی دەکردم، کاتێك بینیمی هەناسەیەکی هەڵکێشا، بانگی مریەمم کرد کە لە ئامێزی بوو، لێیم وەرگرت و هاوارم لێ هەستا:

ــ ئەسمەر لەسەرخۆ خەریك بوو کچەکە لەنێوان دەستەکانتدا بکەوێت!

وتی:

ــ لێم مەگرە، لە خەمی تۆدا دڵم پساوە، کاتێك بینیم گەڕایتەوە بە توندی ڕوحم هاتەوە بەر.

کەمێ بێدەنگ بووم و خەریکی هەڵکۆڵینی تۆز و گەردی ئایینده‌بووم، ئەوەی بینی بووم تەنها گەردێك بوو لەگەڵ هەست کردنێك بە شوومی، شتەکان ئاڵۆز و پڕ مەترسی بوون، لە ئەسمەرم پرسی:

ــ ئەی کوا ئیستێر؟

ــ هێشتا خەوتووە، ئەی دووگیان نییە و بێزوو ناکات؟!

راستگۆیە...، راستگۆیە...، ئەی ئەسمەر جێگات بەهەشتە! چوومە ژوورەوە و مریەمم لە ئامێزدا بوو، ئارەزووی ئەوەم دەکرد کە دایکەکە لە باوەش بگرم و بە دڵەوەی بنووسێنم، گەمە بە پرچە رەش و پڕەکەی بکەم و بەرەو تەختە خەوەکەی ببەم، بەڵام هەموو ئەمانە لە ژێر بەستەڵەکی راستەقینە ون بوون. سەرماکە لە قووڵایی روحدا لە تەوژمدا بوو. لەپڕ دنیا وەرگەڕا و دەمی دەستارێکی کراوەم بینی کە سابلاخی قووت دەدا، لە پێچ و پەنای ناخم هەموو شتێك وشك بوو. ئەسمەر وتی:

ـ باوکی سەلمان، قاوەڵەتییەکەت!

بە هێوری دانیشتم، ئەوەی لە دڵمدا غایلە بوو هیچیم دەرنەبڕی، بەڵام بە چپە وتم"

ـ لەدەرەوە رووسەکان بە قەد کرمی دنیا زۆرن.

رووخساری ئەسمەر گرژ بوو:

ـ رووسەکان؟!

بە بڵمە بڵمێکەوە لەتێکم لە نانی گەرمی سێڵ پچڕی، کە ئەسمەر پێش گەڕانەوەم کردبووی.

ـ بە بێ ئاژاوە سابلاخیان داگیر کرد.

ساویلکانە وتی:

ـ کێیان باشن، رووسەکان، یان فارسەکان؟

وتم:

ـ ئەسمەر، شتەکە ئەوە نییە کامیان باشترن، ئەسمەر، ئەمە جەنگە و هەر خودا خۆی دەزانێت چی روودەدات.

بێدەنگ بووم...، ئیستیر لە ژوورەکەی خۆیەوە بە دەنگێکی خەواڵوو بانگی قەشەنگی کرد. ئەوەتا گێلەکە لە خەو رادەبێت و بێ ئاگایە لەوەی لە دنیادا چی روودەدات. پارچە نانەکەم لە رۆنە تواوەکە نوقم کرد و ئینجا لە هەنگوینە رەشەکەی ناو دەفرەکەم هەڵسوو، بە تووڕەییەوە کردمە دەممەوە و بە چپە وتم:

ـ لەوەش سەیرتر من بووم بە میانگیری نێوان رووسەکان و جوولەکەکانی سابلاخ، گەرەکە بە بێ ریزپەڕ فەرمانەکە بە هەمووان رابگەیەنم.

ترسی لیّ نیشت، منیش درێژەم پێدا:

ــ بۆ یەکەم جارە هەست بە بێ یەغبالّی دەکەم، ئەمڕۆ کەنیسەکە هەر ئەوەتا خەلکی تێدا بوو، ئەمەش وادەگەیەنێت گەرەکە من بە شارۆچکەکەدا بگەڕێم و دەرگا دەرگا، لە دەرگای جوولەکەکانی شارۆچکەکە بدەم، ئێ لەدەرەوەش زریانی بەفرەکە تا دێت توندتر دەبێت.

ئەسمەر بەچپە و بە دەنگێکی ترساوەوە، کە لە ترسان و لە سەرماندا هەلّدەلەرزی، وتی:

ــ لە مالّەوە بمێنەوە و دەرمەچۆ!

بەلاّم زەردەخەنەی بڕوا بە خۆبوون و برێ جار گالّتەئامێز و هەندێکجار حیکمەت ئامادە دەبێت، تەنانەت وا رووسەکانیش شارۆچکەکەمانیان داگیر کرد، ئێ دنیا دەمێکی کراوەیە و دەیەوێت قووتمان بدات، ئاخر ئەو نازانێت رووخساری شتەکان هەلّگەڕاونەتەوە، وای بە خەیالّدا دێت کە رووسەکان لە سابلاّخ سەیران دەکەن، ئەو بە بێ ئاگا هەر لە خەمی مندایە، بەلاّم ئاگای لە رووخساری راستەقینەی مرۆڤ نییە، روسەکان، عوسمانلییەکان، ئەلّمانەکان لە جەنگدان، جەنگ ئەو عاجباتییەی کە سابلاّخ لەمەو پێش نەیدیوە، لەسەرخۆبە ئەسمەر، لەسەرخۆبە، ئەی سابلاّخ! هاکا رووخسارەکە کەلّبە وەحشتناکە کەی دێ دەربخات...!

دەگرمێنێت و ئاگر بە رووی دانیشتووانی شارۆچکەکەدا دەپرژێنێت، ئەی دایکی سەلمان، پەلە مەکە، رۆژانێکمان لەپێشە تووکی سەری ناحوم لە حەژمەتان هەر لەناو لانکەکەیدا سپی دەبێت، رۆژانێك بەرێوەن تەڕ و وشك پێکەوە ناهێلێت، سالاّنێك لە حەوت سالّەکەی میسر قاتوقڕی تر، ئێ تۆش دەتهەوێت لە مالّەوە بمێنمەوە!؟

وەك جاران لە قاقای پێکەنینم دا، پێکەنینەکەم لە خەمەوە هەلّقولاّو ڕێگەی خۆی گرتەبەر. دەمم سڕییەوە و سوپاسی خێری خودام کرد و وتم:

ــ ئەسمەر، ئەمە جەنگە، نازانیت جەنگ مانای چییە؟!

ــ ئاخر باوکی سەلمان، بۆیە دەبێت لە مالّەوە دەرنەچیت!

ــ بەڵام فەرمانەکە فەرمانی جەنگە و پێیان وتووم رایبگەیەنم، ئەسمەر، ئەگەر راینەگەیەنم لێپێچینەوەم لەگەڵ دەکرێت، لێپێچینەوەش لە کاتی جەنگدا قورسە.

ئەوسا ئەسمەر وەك ئەوەی دووپشك پێوەی دابێت، بە شڵەژانەوە راپەڕی و بە دەنگێکی ناسك وتی:

ــ شلۆمۆ، کەواتە برۆ! لە رێگە ئاگات لە خۆت بێت، با فریشتانی خودا لە دواوە و لە پێشەوەت برۆن و لە خوارێ و لە سەری پارێزگاریت بکەن و بە دەورتدا زرێیەکی پارێزەر دابنێن و لە گشت خراپەکارییەك بتپارێزن.

وردە وردە بە نزای ژنە بە ئەمەك و بەخشندەکە نوقم بووم و لەنێو بڕوای خۆمدا خۆم شت و هەستم بە ئارامییەکی خۆش کرد، تا دەنگێکی دیکەی گێلانە لەو دۆخە دایبڕیم، کە لەبەرخۆوە لاسایی گۆرانییەکی خۆشی دەکردەوە، لەدەرەوەش دەنگی تەقەیەك هات و گۆرانییەکەی ئیستیر تێکەڵی دەنگدانەوەی تەقەکە بوو:

هەموو بێدەنگ بوون تەنها ئەو نەبێت، پرسیم "ئاخۆ لەدەرەوە یەکێك کوژرا؟" هەروەها پرسیمەوە "ئاخۆ ئەوەی لە دەرەوە روودەدات سزایەکە بۆ من لەسەر ئەوەی ئیستیرم خواستووە؟ ئاوها بۆ هەموو شوێنێکی سابڵاخی بەستەزمان دوام دەکەوێت؟".

ئەم گۆرانە و ئەم پەژارەیە کە لە نادیارەوە سەریهەڵدەدا، هەر ئەو وەڵامەیە، کە لە خودی خۆمەوە دەستم کەوت، ئیستیر هێشتا بە خۆشی و شادییەوە گۆرانی دەچرێت، وەك کچێك نە شووی کردبێت و نە منداڵیشی بووبێت، وەك رابردوو خۆی بۆ زەماوەندی قارەمانی نێو خەونەکان ئامادە دەکات.



شلۆمۆ کەتانی لە ماڵەکەی خۆی وەدەرکەوت و چاوی لە گوڵێك گیرا، هەردوو پێی نوقمی نێو شتێك بوو، کە لە لۆکەی هەلاجی کراو دەچوو، ئیدی تا هەردوو چۆکی تێدا نوقم بوو. چاوی بە گوڵ نەکەوت، ئەمە هەموو ساڵێك روودەدات، ئەم وەك چۆن ماڵەکەی خۆی شارەزایە، ئاوهاش شارەزای ئەمەیە، بەڵام خولیا کەرانەکەی سەرەڕای گۆڕانیشی هەر زۆری لێ دەکرد، کەواتە سەوزاییەك هەر هەیە، کە لە بەفر و زریانەکە بێ ئاگا بێت و بە کفنی سپیی زستان دانەپۆشرابێت؟!

خولیاکە وەڵامی نییە، بە کپییەکی لە رادەبەدەر بەفرەکە بەسەر یەکدا دەکەوێت و سپێتییەکەی هەموو رەنگێك دادەپۆشێت، تووشی رەشبینی بوو، بۆ چرکەساتێك هێڵێکی سووری بینی، کە وەك تەژدیها بەسەر زەویی سپیدا دەکشا، چەند تەقەیەك بە دوای یەکدا کران، بەر لەوەی لە دەرگای ماڵی دراوسێ زێڕنگەرەکەی بدات، گوێی هەڵخست، ئاگرەکە لە یەك لاوە بوو، رەنگە روسەکان هەر بۆ گەمە تەقە بکەن، یان رێبوارانی پێ دەترسێنن، ئاخۆ هێڵە سوورە کشاوەکەی سەر زەوییە سپییەکە هەر غایلەیەك بوو یان خەون بوو؟ بۆ چرکەساتێك ئەو هێڵە سوورەی بینی و ون بوو. لەمە تێنەگەیشت و لە دەرگای ماڵەکەی عەزریای دا، هێشتا سوور بوو لەسەر ئەوەی سوێندەکەی نەشکێت و نەچێتە ژوورەوە. دراوسێکەی لە ناوەڕۆکی فەرمانەکە ئاگادار کردەوە، لە درزی دەرگاکەوە تاقیی جوولەکەی ئەڵماسی کرد، ئەم کچە بۆچی ئاوها سووکایەتی پێکرد؟ ئایا ئەمیش نیستیرێکی دیکەیە؟، بەلام ئەم کچە وەك خۆی ماوەتەوە و لەخۆبایی بوونەکەی نالەقێت و لە گێلایەتی تێپەڕاندووە و شێتە! تەشقەڵەی ئەڵماس لە ژوورەوە دەربارەی فەرمانەکە دەهری کرد، بەلام ئێستا کاتی تووڕەبوون نییە و تووڕەیی خودا بەسە، لێ لووت بەرزی و نەفرینی مرۆڤ هۆیەکە لە هۆیەکانی تووڕەیی خودا. بەر لەوەی بەر دەرگای ماڵەکەی عەزریای زێڕەنگەر جێبهێڵم وتم:

ــ عەزریا جڵەوی لووت بەرزیی کچەکەت بگرەوە، گەر تۆش ئەمە نەکەیت ئەوە ئەو رۆژە رەشانەی بەرێوەن، دەیکەن!

ئەرکەکەی من رەشە...! سپێتی شتەکانیش نەفرەتێکی رەشە، زریانەکەش هەر رەشە و تا دێت پەرە دەسەنێت. کاتێك دەستی لە ئاگادارکردنەوەی هەموو یەهوودێکی سابلاخ بەردەبێت، بەرەو ماڵەکەی خۆی دەگەڕێتەوە، بەلام گەر بە سەلامەتی بگەڕێتەوە! چونکە هەموو گەردوون رەنگی رەشیی شەوی گرتووە. هەردوو لاقی لەنێو بەفری سپی نوقم بوون. بەفر چارەکە مەترێکی تر کەوتبوو. ماوەیەکە ماڵەوەی جێهێشتووە، ئاخۆ دوای تەواوبوونی ئەرکە شوومەکەی دۆخەکە چی بەسەر دێت؟ ئەی بۆچی تەقە هەر زیاد دەکات؟ هۆ هاروون و میخا و شەمعیا و ساسۆن ئێوە لە کوێن؟

خۆ ئەگەر لێرە و لەوێ تووشی هەندێ لە دۆستانی بووبا، ئـەوا هەنـدێك لـە كاتەكـە كورت دەبووەوە، كات!

هەندێكجار خوێنی كات وەك خـوێنی بـەرخ وایـە و بـەفیڕۆ دەدرێ، بـڕێ جـاریش نرخەكەی لە بازاڕی تەمەندا بەرز دەبێتەوە و وای لێدێت نرخی سەعات دەبێتـە نرخـی ڕۆژ یان هەفتە، یان تێكڕای ساڵ! ڕۆژەكە لەگەڵیـدا كێبڕكـێ دەكـات، تـا خـۆی لـە چەندین مەترسیی قورتار بكات، یەكەمیان مەترسی مەرگە، دەرگا بە دەرگای كوتـا، لەبەرخۆوە نزای كرد و وێردی خوێند و فەرمانەكەیشی خوێندەوە، ئامۆژگاری خـەڵكی كرد تا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چارەنووس خۆراك كۆ بكەنەوە. تارمـایی زەردی برسـێتیی بەسەر ڕووخساری هەژارەكانەوە بینی، كە تا دەهات پتر ڕەنگیان زرد هەڵدەگەڕا! نیوەڕۆ داهات و هێشتا ئەركەكەی بەسەر شانەوە بوو. ئەركەكە نیوەی بـاری كەرێكـە و نیـوە كوشندەكەی تریشی بۆ پشت شكاندن، لەوەدا هەڵـەی كـرد كـە بـەیانی لـە خەڵكـە نزیكەكەی ماڵی خۆیانەوە دەستی پێكرد، ئینجا بەرەو هەرە دوورەكان ڕۆیـشت، دەبـوو پێچەوانەی بكردایە، لە دوورەكانەوە دەست پێبكات، ئینجا بەرەو نزیكەكان تا دەگاتـە ماڵی خۆیان، ئەمێستا دەگەڕێتەوە تا لەگەڵ ئەسمەر و ئیستێر و منداڵـەكان نیـوەڕۆژە بكات، ئینجا نەختێك هەلاژێ و پاشان بۆ ڕاگەیاندنی پەیامی ڕوسەكان پەلە بكـات، نەفرەتیـان لێ بێت، كە هێشتا نەیگەیاندووەتە هەندێك جوولەكەكانی سابلاخ، نەخێر، ئاخر ئەو كاتێ فەرمانەكەیان بۆ دەخوێنێتەوە لە مـەترسی مەرگ دووریـان دەخاتـەوە. ئەمجارە بەرەو ئەوپەڕی سابلاخ دەڕوات و لە شوێنە دوورەكانەوە دەست پێدەكات، ئینجـا دەگەڕێتەوە، خۆ ئەگەر كاتیشی بەدەستەوە مـا، ئـەوا نوێـژی عەسـر و مـەغریب لـە كەنیسە شارۆچكەكە دەكات، بەڵام هایهوو... ئەوە دوورە...

وەك هەمیشە ئەسمەر بە دڵەڕاوكێوە چاوەڕێی دەكرد، دواجار ئیستێریش تێگەیـشت كە چی ڕوودەدات، ئەوە بوو لەسەر خوانەكە لێی پرسی:

ـــ ئایا جەنگ وەك ئەوەیە كە ئێمە بە منداڵیی یاریمان دەكرد؟

پاروەكە لە گەرووی گیر بوو و وتی:

ـــ ئەرێ ئیستێر مەرگ یارییە؟

ـ ئێمە لە یارییەکەدا دەمردین، ئینجا وەك جنۆکە راست دەبووینەوە!

لەپڕ ناحوم دەستی بە گریان کرد و سەیون و سەلمانیش بێزار بوون، بەڵام شلۆمۆ کەتانی بیری دەکردەوە، لای هەستەم بوو کە ئیستیر لە واتای شەڕ تێناگات و نازانێت مانای مەرگ چیە، ئەو بێگومان گێلە و منداڵیشە، بەڵام ئاخۆ هەموو جیهان، ئەم ملیۆنان شەڕکەر و جۆرەها بەرەو لایەنە بە راستی لە واتای جەنگ و مەرگ تێدەگەن؟ باوکی سەلمان پێی وابوو کە ئەم وڵاتە گەورانە ئەوەدەزانن و بە بێ گوێدان بەرەو پیری دەچن. بە خۆی وت "گەر شتەکە وابێت، کەواتە هەش بەسەر ئەم مرۆڤایەتییەی کە دوژمنی خۆیەتی!".

***

لە تاران بەفر بە چڕی دەباری و تۆش هەردوو لاقت خستبووە ئەم لاو ئەولای سۆبە عەلادینە سەوزەکەت و هەردوو لەپت دابووە ئاگرەکەی. رووناکی ناوەوە و دەرەوە، تەوژمی سەرماکە لە ناوەوە و دەرەوە وەك یەك نەبوو. لە بالکۆنەکەوە دیقەتی بەفری بەسەریەکدا کەوتووت کرد، بەفرەکە لەسەرووی پشتێنە زەلامێکی باڵابەرزی وەك تۆوەیە "ئەمە شتێکی سەیرە" ئەمەت وت و بە من پێکەنیت، گەڕایتەوە بۆ ئەو شەوە، هیچ شتێك بەو شەوە بەراورد ناکرێت، وەك ئەوەی خودای مەزن هەمو شتەکانی هەڵگەڕاندبێتەوە و زریانی بەفرەکەی لە رەنگ و لە هەستەوەریدا کردبێتە هێمای مەرگ.

تفەکەم قووت دایەوە، نزیکەی بەر لە پەنجا ساڵ تۆم لەهەرەتی لاوێتیدا لەبەرچاو وێنا کرد. ئەمێستا ئێمە لە تاران لە ساڵانی شەستەکاندایین، بەڵام لە تۆغیانی تەمەندا. تۆ کوردێکی وەك دارکاژ باڵابەرز و چون قاتر لامل، فەرمانی سەرکردەی روسەکانت پێ بوو و لە دەرگای جوولەکەکانی سابلاخت دەدا تا بیانپارێزیت و خۆتیش بپارێزیت، تا پتر ببیتە جێگەی رێزیان و پاداشتێکی دیکەت لەلایەن خودا و خەڵکەوە دەست بکەوێت، زریانی بەفرەکە هێشتا بە کپی لە هەرەتدایە و بەدەستی بۆیەچییەکی لێزانەوەیە و هیچ شتێك فەرامۆش ناکات تا بەرەنگی کفن و رەنگی پاکژی بۆیەی نەکات، هێمایەکی زۆر و چەمکێکی زۆر گۆڕانیان گەرەکە، بڕێ جار مرۆڤایەتی بە بێ

وردبوونەوە شتەکان لە ئەستۆ دەگرێت، یان بە ناچاری و لە سۆنگەی گێلی یان بێهێزی، یان بێ دەسەڵاتی قەبوولّیان دەکات، تا ئەوەتا منیش بە فەرمانی سەرکردە روسەکە وەك ئامێرێك لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر دەڕۆم، فەرمانی پیاوێك نە دەیناسم و نە دەمناسێت، سابڵاخیش نازانێت کێیە، تەنانەت سابڵاخییەکان لە قسەکردنیشی تێناگەن، پیاوێکی خۆتێهەڵقورتێنەر و لە ماڵە بێوەیەکەی خۆماندا بکوژ و بڕ هەر خۆیەتی، بە نەفرەت بێت! قاپووتە لبادەکەم لەم سەرما سەختەدا تینی نەماوە و وەك ئەوە وایە هیچم لەبەر نەبێت، ئەو قەڵایەی کە خۆم لەناویدا دەپاراست، بەرانبەر سەختی سەرماکە هەرەسی هێنا. ئێستا من بەم سەرمایە خۆم گەرم دەکەمەوە و زۆری پێ ناچێت تاریکیی شەو لەگەڵ خۆیدا لوولم دەدات، بەڵام تەنهایی چەنەبازییەکی دیکە و هاواری ترسم بە ڕوودا دەدات. خۆت رابگرە، تۆ لەدار بەڕوو سەختتریت! خۆراگربە، چونکە خودا لە پشت و پێشەوەتە، لە راست و چەپتەوە لەگەڵتدا دەڕوات. لە بان سەرت و لە خوارتەوە، تۆبە خودایە! من پێیەکانم لە لۆکەیەکی ساردی هەلاجی کراو دەچەقێنم، رێگەی بیابانێکی بەفراویم گرتۆتە بەر، تۆبە پێ لە خودای خۆم بنێم، تۆبە! شەو و زریان و داگیرکەران! تاریکی و سەرما و ترس! کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێمەوە! سوپاس بۆ خودا! سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە لە هەموو لایەکەوە دەوری داوم، چونکە ئەرکەکەم بە بێ کێشە بەجێهێنا و بە سەلامەتی دەگەمەوە ماڵەکەی خۆم، بێگومان بێزاری ئاوەزی ئەسمەری تێکداوە، بەڵام بێگومان ئێستا نیستێر سترانی بووك گواستنەوە دەچڕێت، ئێ گەر دەیەوێت با مێرد بە عیزرائیل بکات، بەڵام من پێ لە خودا بنێم، تۆبە خودایە ئەوە چییە؟ کوا پێیەکانم؟! کە هەنگاو هەڵدێنم لەژێر هەردوو لاقمەوە دوو چیا بەرز دەکەمەوە، ئازارێکی بێ قەوام دەستی پێکرد، ئازاری سەرمایە، بەڵام هەر تاشەبەردە، تاشەبەرد. چرکەساتێك وەستام، ئینجا راچڵەکیم، هۆشم لای خۆم نەما! بە راستی بینایی چاوان لەژێر پێمدا نەبوو! کەواتە کارەساتەکە لەژێرەوە... هات. پێیەکانم بوون بە بەرد، دوو بەرد لە بەفر، شلۆمۆ برۆ! ئەوەتا مردن لە ژێرتەوە پەلامارت دەدات! هۆشم لای خۆم نەما، دەی هەردوو تاشەبەردە گەورە بێ گیانەکە بەرز بکەوە و پەلە بکە! پێش مەرگی خۆت بکەوە،

ڕەنگە رزگار بیت! چۆن؟ ئەی کوا ماڵەکەمان لە کوێیە؟ ڕەنگە ماڵەکەم وەڵامی پرسیارەکانم بداتەوە، لەنێو تاریکی و بەفر و ترس گێرە دەکەم، کوێرانە پەل دەهاوێژم. دەی هێز بخە بەر ئەم دوو پێیە مردووە. بەفر و ترس و مردن! بەر لەوەی پێیەکانت لەکار بکەون، بگەوە ماڵ. بەرەو هەناوی خۆت...، بەرەو دڵی خۆت...، بەرەو هەموو ئەو شتانەی تێتدایە!

دەنگدانەوەی دەستڕێژێکی ڕەشاش بێدەنگی شەوەکە دەیگێڕێتەوە، ئاخۆ چەندگیانی لە باخی مرۆڤایەتیدا هەڵپچڕی بێت؟ مەرگ لێرە و لەوێ، لە بێدەگی و لە ژاوەژاودا دەحەپێت، ئەم بەفرە یەکجار بە کپی دەبارێت، ئاخۆ کەی دەوەستێت؟! ئەی خودایە! ئاخۆ هەڵت بژاردووم تا بەرەو لای خۆت بمبەیتەوە؟ خودایە هیچ لاریم نییە، بەڵام دەبێت ئەسمەر و ئیستیر و منداڵەکان چی بکەن؟! خودا کە من حەوجەی تۆم و دەت دوێنم لێم ببوورە، بەڵام تۆ خۆت هۆکاری هەموو هۆیەکانیت و منیش هۆکاری ئەم ماڵە گەورەیەم، خودایە! ئەی خودایە، کوا ماڵەکەمان! ئەوە ئەسمەرە لە پەنجەرەی ژووری رووە و شەقامەکە دیارە، فانۆسەکە لەوێ پرتەپرت دەکات و هەر ئەوەتا نوورەی تێدایە، ڕەنگە نەوتی تێدا نەمابێت...، ئەی منیش نەوتم تێدا نەماوە؟ دەرگاکە کرایەوە و ئەسمەر دەڵێت:

ــ گەر یەك خولەکی تر دوابکەوتیتایە، ئەوا روحم جەستەمی جێدەهێشت و بەدوای تۆدا دەگەڕا!

بەسەر ئەسمەردا کەوت و ئەمیش باوەشی لێدا و راستی کردەوە، بە دەنگێکی نزم وتی:

ــ ئەسمەر بۆ سەر تەختە خەوەکەم ببە!

هەزار پرسیاری ئاڵۆز لەسەر رووخسارە پەشۆکاوەکەی ئەسمەر نەخش بوو. لەبەردەمیدا بە چۆکدا هات و شلۆمۆ وتی:

ــ ئەسمەر، داوای لێبوردن دەکەم! داوای لێبوردن دەکەم!

ــ ئەوە تۆ دەڵێیت چی؟

ــ ئەسمەر، بمخەرە سەر تەختەکە!

ئەسمەر بە چۆکدا هات. شلۆمۆ ڤینی لە لاوازی بوو، حەزی نەدەکرد ببێتە بارگرانی بەسەر کەسەوە، یان داوای شتێك لە بوونەوەرێك بکات، با ئەندامانی خێزانەکەی خۆیشی بن. بەرەنگاری بێ بڕستییەکەی خۆی بووەوە، تا بەسەر مردندا زاڵ بێت. گەر شتێك نەکات، دەمرێت، ئینجا بە بڕینەوەی هەردوو لاقی یان مردن، یان شتێك لە مردن خراپتر.

ـ کوا منداڵەکان؟

ـ نووستوون.

ـ ئەی ئیستێر؟

ـ ئەویش نووستووە.

ـ ئەسمەر، کەواتە هەر تۆ بە تەنها بە ئاگایت.

بە دەنگێکی نزم داوای لێبوردنی کرد.

ـ دەبوو جوولەکەکانی سابلاخ لە فەرمانی روسەکان ئاگادار بکەمەوە.

ـ زۆر دواکەوتیت.

وتی:

ـ لە هەمووی ژیرانەتر ئەوەیە گەرەکە ئێمە پێش کات بکەوین!

ئاماژەی بۆ پێیەکانی کرد. ئەسمەر تەماشای پێیەکانی کرد، پێڵاوەکان بووبوونە بەشێك لە پێیەکان و بووبوون بە پارچەیەك لە سەهۆڵی بە بەرد بوو. ئەم تەماشای رووخساری کرد، پێش ئەوەی ئەسمەر هاواری لێ هەستێت بە ئاماژەیەکی دەم و دەستەکانی هاوارەکەی پێ قووت دایەوە.

ـ ئەسمەر بۆ تەویلەکەم ببە.

ـ پێویستە هەر ئێستا شتێك بکەین!

ـ ئەسمەر، ببە بۆ تەویلەکە.

بە گوێی کرد. بە هەڵلەرزینەوە چووە بن باڵییەوە، ئەو مەرگی خۆی لەم دوو پێیەدا دەبینێت. بێگومان خودا لە بان سەری بوو، بۆیە هۆشی لەکار نەکەوت، لە نێوان خۆڵەمێشی بێ ئومێدی مەرگدا دەستی بۆ پەنگر برد. بەڵێ، تەویلەکە، تەویلەکە!

ئا ئەوە تەویلەکەیە، کەر و ئەسپ و قاتر و مانگا و مەڕ و بزن، ئەمە گەورە نەك تەویلە، بۆنی تەرس و ڕیخی کەڵەکە بوو گەیشتە کونەلووتی، بیرۆکەکەی لەگەڵ کزە هیوایەکدا گەشەی کرد، بۆنی ئەو ئومێدەی کرد کە لە (گەورەکە)وە هەڵدەستا، بە خۆی وت "ڕەنگە ئێستا ژیانت بەم پاشەڕۆیەوە بەند بێت!".

سەری سوڕما، لەناکاو خەریك بوو بیری بگۆڕێت، دیسان بە خۆی وتەوە "ئاخۆ دەکرێت پیسایی و پاشەڕۆی ئاژەڵ پەرجوو دروست بکات؟". ئەی بۆ نا؟! ئەی ئەوە نییە لەشتی مردوو زیندوو دروست دەبێت و ڕووناکیش لە تاریکی ئەنگوستەچاو هەڵدێت؟ دەی با تاقی بکەینەوە! تاقی بکەینەوە!

ــ ئەسمەر پاڵم بخە و بێڵەکە بێنە!

بە گوێی کرد و بێڵەکەی هێنا، وتی:

ــ دەی بە پەلە تەرس و شیاکە بە پێ و لاقمدا بکە. ئەسمەر، لە ژێر ئاژەڵەکان تەرس و شیاکە بێنە.

دیسان بە گوێی کرد، بەڵام ئەمە چییە؟ دڵی داخورپا و ترسا، لەوەیە پیاوە خۆشەویستەکەی شێت بووبێت! ئایا دەمرێت؟ ئەی شلۆمۆ، ئاوەز و گیان بە قوربانت بن...، ئایا تۆ هەر بە زیندوویی خۆت لەگۆڕ دەنێیت و ئەمیش لەژێر سەرگینی ئاژەڵەکان دەیشارێتەوە؟

ــ ئەسمەر، داپپۆشە! هەردوو پێ و لاقەکانم بە هەموو پاشەڕۆی گەورەکە داپۆشە! بە تەرس و شیاکەی هەموو ئاژەڵی سابلاخ دایان پۆشە، بە هەموو تەرس و ڕیخی ئاژەڵی دنیا!

بیرۆکەکە سامناك و شێتانە بوو، بۆنی بێ باوەڕی لێ دەهات، دەشێ ئەمە گاڵتەکردنێك بێت بە ویستی خودا، ئا بەم جۆرە بەندە داوای پەرجوو لە خودای خۆی دەکات؟! تۆ بڵێی بە ڕاستی گشت شتێك لە حەناس بیرێکی پەندیارانە، گێلانە، عاقڵانە، شێتانە، بووەستێت؟! مەرگ ون بوو، وێرد و نزا توانەوە، ئەسمەر بە خۆی و شەنەکەی دەستییەوە هەر خەریکی کۆکردنەوەی تەرس و شیاکە بوو، بەسەر هەردوو پێ و لاقەکانیدا دەکرد، تەنها هەر خۆی لە پشت ئەم تێگەیشتنەوە بوو. منداڵەکان،

تیستیر، دۆستان، میر عەلی، عـەزریا زێڕنگـەر، مـەتییا هـۆ گۆنـەی مـامی، بـرا و خوشکەکانی، حاخام ناحوم و براکەی، خێڵی بوزورگ، سابلاّخی دەلال، ماڵەکەی خـۆی، کانی و چیا و شیوەکان و گژ و گیـا و هەڵـشك، درەخـت، تـاران و مۆسـکۆ، تێکـڕای جیهان لەبەرچاوی توانەوە، جگە لە بیرۆکەکـە و جەنگەکـە و مرۆڤـی لەشـێوەی خـوا دروستکراو، ئەم مرۆڤە پێکدادەر و دوژمنکار و شێتە.

ــ ئەوە چییە؟ ئەریّ من مردووم، یان هێشتا زیندووم؟!

لەخۆ وەئاگاهاتم. گەرمایـیەك لە بن هەردوو لاقم بوو، تاشەبەردە بەفرینەکە لە نێو هەڵمی پاشەڕۆکەدا دەستی بە نەرم بوونەوە کرد.

ــ ئەسمەر، کۆی بکەوە! هـەموو پاشـەڕۆی ئاژەڵـەکان کۆبکـەوە و بیکـە بەسـەر هەردوو پێمدا.

هەموو پاشەڕۆی ئاژەڵی گەورەکە کۆبکـەوە، ریـخ و تەرسـی مـانگـا و گـامێش و ئەسپ و گوێدرێژ، تەنانەت قـشپلی مـەڕ و بزنـەکانیش بێنـە. ئـاخر خـودا ڕێگـەی ڕزگاربوونی پیشان دام، کۆی بکەوە! من دەژیم و ئەسـمـەر بێـوەژن ناکـەفێت، سـەلمان و سەیون و مریەم بێ باوك نابن. کۆی بکەوە، من هەروا بە مێـردی دووژنـە دەمێنمـەوە! نەفرەت لە بیرۆکەکە! ئاخر خودا مرۆڤی ئافراندووە و ئاوەزی داوەتیّ! لە نێوان چـاکە و خراپە سەرپشکی کردووە، نەفرەت و فەڕی پێداوە، من ئاوەزو فەڕم هەڵبژارد، بەلاّم سێ چواریەکی دنیا کوشتار و کاولکارییان هەڵبژارد، گوێم لە هناسەبڕکێی ئەسمـەر بـوو، چیایەك لە پاشەڕۆی ئاژەڵم لە بان خۆم دی. هەسـتم بـە گـەرمی پێیـەکانم و بزوانـی پەنجەکەڵەم کرد، بانگی ئەسمەرم کرد:

ــ ئەی دایکی منداڵانم! بە خۆشەویستی تۆ، ویستی خودا ڕزگاری کردم.

ئەسمەر بە سۆز و بەزەییـەوە تەماشـای کردیـت و ڕووخـسارە جـوان و شـیرینەکەی دەرکەوت، ئەوەندە جوان هەموو خێر و خۆشی دنیای تێدا کۆبووبووەوە، ئەم پیت و فەر و سازگارە دەگمەنە لەبەر تیشك یرووناکی زەردی فانۆسـەکە شـەپۆلی دەدا. ئەمێـستا فانۆسەکەی بە دەستەوە بوو، بەهۆی بەزەیی هاتنەوە و هەڵچوونەوە دەستی دەلەرزی، لە سۆنگەی شتی ترەوە دەستی دەلەرزی نەك بە هۆی سـەرماکەوە، دڵۆپـە عارەقـەی وردم

لەسەر تەوێڵی ئەسمەر دی و دەهاتنە خوارێ، لەدەرەوە و لە ناوەندی زریانە هار بووەکەی بەفرەکە، لەو تەوژمی سەرما بێ بەزەییە، هەردوو پێیە رەق هەڵاتووەکە خەریک بوو ژیانی مرۆڤانەیان تێدا دەگەڕا و وردە وردە دەبوونەوە بە گۆشت و پێست و ئێسک و دەمارگەلێ خوێنیان پێدا بڕوات.

ــ فانۆسی گەورەکە هەڵبواسە و فانۆسەکەی تر ببە و بۆ لای منداڵەکان بۆ ژوورەکەی خۆت بگەڕێوە.

بە سۆزناکی وتی:

ــ شلۆمۆ، ئەی تۆ؟

هێشتا غایلە و گومان لەسەرمدایە، غایلەکەیەک وەک جەنگەکە دڕندە و وەک من لە کاتی یەقینندا لامل، بڕوام بە خودا لەق نابێت، بەڵام خودا هۆشی بە مرۆڤ داوە و بە منیشی داوە، هەروەها بەو شەڕکەرانەشی داوە، کە ئێستا لە ناوچە فراوانەکانی ئەم جیهانەدان، وتم:

ــ من؟ ئاوها تا بەیانی لێرە دەمێنمەوە.

بە سەرسامی و ناقایلی وتی:

ــ لەگەڵ ئاژەڵەکاندا لەژێر پاشەڕۆ لە گەورەکەدا دەمێنیتەوە؟

ــ ئەسمەر، ئێ بەیانی لەگەڵ منداڵەکان و لەگەڵ تۆ و لە پەنای خودا نابم!

بە پەشۆکاوییەوە نزایەکی خێری کرد:

ــ بەڵکو خودا رزگارت دەکات، هەروەک چۆن ئیبراهیمی باوکمانی لە نێو ئاگر رزگار کرد.

هەردوو پێم بە ئێشەوە هاواریان دەکرد، لە شوێنی سڕبوونەکەوە ئازارێکی کوشندە پەیدا بوو، تۆ بڵێی جارێکی تر لەسەر ئەم دوو پێیە هەڵبستم و بەرەو کۆڕی خەڵکەکە و بەرەو مەبەستەکانم پێیان بڕۆم، ئەی ئەم تەمە لەسەر جیهان دەڕەوێتەوە؟ هەر ئەوەندە چاوەکانم بنوقێنم و بیانکەمەوە ببینم جەنگ کۆتایی هاتووە؟ تۆ بڵێی شمشێری ئیزرائیل لە دروێنەکردنی گەردنی خەڵکی بووەستێت؟ ئەی بڵێیت گرمەی تۆپی لەنێوبەر کپ بێتەوە و گوللەبارانی مەرگ بووەستێت؟

سبەینێ...، بە پرسیاری شێتانە لەنێوان بە ئاگایی و نوستندا ختووکەم دەدات و جۆلانەم لەگەڵدا دەکات.

پێیەکانم دەزریکێنن، پێڵووەکانم سەرەڕای تەنهایی و هەڵمی خنکێنەری تەرس و شیاکە ململانێ لەگەڵ رووناکی دەکەن و پەردەیەك بەسەر بیلبیلەکانمدا دەدەن. لەبیری دەکەم! گشت شتێ دەوەستێت، منیش دەمرم تا سبەینێ بە زیندوێتی راست ببمەوە.

سبەینێ! سبەینێ هات و منیش لە نێو لەبیرچوونەوەدا نوقم بووم، کە وەئاگاهاتم بیرم کەوتەوە، پێیەکانم بزواند، پێیەکانم ژیانیان لێ هەڵدەقولا. هەردوو پێم بەرەو سەرەوە بەرز کردەوە، بە گوێیان کردم و چون پەڕ سووك بوون، وەك دوو تۆپ هەڵبەزینەوە. ئەوەی کە شەو روویدا وەك مێردەزمەیەك، یان غایلەیەکی شەیتانانە بوو بێت، لەگەڵ بەیانی و لەگەڵ زریانی بەفرەکە کۆتایی هات، بەڵام بەفرەکە بەسەریەکدا کەڵەکە بووبوو، سەرماکەی سەخت بوو، روسەکانیش چون مێروولە بە سابڵاخدا وەربووبوون، جەنگەکە لەم جیهانە بێ بەزەییانە لە پێکداداندایە و شمشێری ئیزرایل بە پەرۆش و هەڵپەوە سەری بوونەوەران درووێنە دەکات.

# کایەی دووەم

ئەم دوو مانگە سپی ــ رەشن، بەستوو ــ داگیرساون! چۆن بەفر و ئاگر، سەرمای سەخت و گەرمای سووتێنەر پێکەوە کۆدەبنەوە؟، بەڵام لە سابلاخ و دەوروبەری کۆبوونەوە، میرعەلی بە شلۆمۆی هاوکاری وت:

ــ خودا کەی ئەم مسقۆف و گاورانە، کە وەك ئەم بەفرە لەسەر سینگمان مۆڵیان خواردووە، لادەبات؟

شلۆمۆ کەتانی وەڵامی دایەوە:

ــ وا ئێستا بوون بە گاور، لە کاتێکدا لە مۆسکۆ هێندە کەلوپەلمان هێنا، وایلێهات قازانجەکەی ماڵەکەی من و تۆی پڕ لە سامان و خێر و خۆشی کرد.

میر داماو بە بڵمەبڵمێك وتی:

ــ جەنگەکە تەڕ و وشکی پێکەوە سووتاند، تەنانەت سەفەرکردن بۆ تارانیش بووەتە کارێکی ئەستەم، وەك ئەوەیە کە ئێمە لە دەوڵەتێکی جیا لە ئێران بژین.

تەمێکە و لەگەڵ بەستەڵەکی زستان دەڕەوێتەوە. هەندێك هەواڵ ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە "پیاوە نەخۆشەکە"بە راستی نەخۆشە، خۆ ئەگەر ئەڵمانیای هاوپەیمانی نەبووایە، ئەوا وەك خانوویەکی لە هەڵشك دروستکراو بە هەڵکردنی بایەك، هەرەسی دەهێنا، بەڵام ئەوە موسڵمانەکانی سابلاخ لە چ خەیاڵێکدان بە ئاشکرا رقیان لە روسەکانە و ئاواتەخوازن عوسمانی و ئەڵمانیای هاوپەیمانیان بێن، تا سابلاخ لە (پیسی) مسقۆفەکان رزگار بکەن؟ دەق وەك ئەوەیە (پیسی) روسەکان بە هاوپەیمانی ئەڵمان و عوسمانی موسڵمان پاك بووبێتەوە؟!، بە هێمنی و جۆرە ئامۆژگارییەك بە هاوکارەکەی وت:

ــ وا دیاره شا لەوەی ڕوودەدات هەڵوێستی بێلایەنی گرتبێت، دەبا ئێمەش لە شارۆچکەکەی خۆماندا هەڵوێستی ئەو وەربگرین، تا جەنگەکە نەمان پلیشێنێتەوە و هەردوو لای مەقاشەکە کە لە سابلاغ گیربووە، ڕوحمان دەرنەهێنێت.

میر عەلی وتی:

ــ بەڵام چاوچنۆکی ڕوسیا لە سنورێکدا ناوەستێت، هەروەها هیچ موسڵمانێك ڕازی نابێت لەماڵی ئیسلامەوە بەرەو ماڵی گاور بگوێزێتەوە، هەروەك چۆن ڕوسیا ملیۆنانی لەو موسڵمانانەی کە خاکی داگیرکردوون، ناچار کردووە. خۆ ئەگەر هەر دەبێت سابلاغ لە ئێرانی موسڵمانی شیعە مەزەب جیا ببێتەوە، لەوە کەمتر نییە کەلە پشت کوردستانێکی سەربەخۆوە بچێتە سەر تورکیای عوسمانلی سوننە مەزەب نەك بچێتە پاڵ گاورەکان لە ڕوسیا!

بەڵێ ئەوە ئەگەر لە کاتێکدا بێت زگی دنیا بە مەلۆتکەیەکی بەدگۆڕاوی دیار هەڵنەئاوسابێت، بەڵکو بە کۆمەڵێك جمکانەی بەدگۆڕاوی لەژمارە نەهاتوو بەرز بووبێتەوە، ئەو دەمە یەك لە دوای یەك لەدایك دەبن و لێرە و لەوێ فڕێیان دەدات. زگی ئیستیر وا دیسان بەرز دەبێتەوە، ناحومیش کۆرپەکەی جاران نییە تا شیر بخوات. لەگەڵ زەبر و زنگی زستان کە خەریکە تەزووی دەشکێت، ناحوم بە نێو هەموو ماڵەکەدا خەریکی گاگۆڵکەیە و خۆی بەشتدا دەدات و قەشەنگیش هەڵیدەگرێت و ماچی دەکات و ناوی خودای بەسەردا دەخوێنێت.

جگە لە تەقەکردنێکی کتوپڕ، بڕێك تەقەی تریش دەکرێت، دوو مانگەکە بە بێ ڕووداوی ئەوتۆ تێپەڕین، کاتی تەقەکردنیش خەڵکی بە پڕتاو بۆ ماڵەکانی خۆیان دەچوونەوە و تا تەقە بێدەنگ دەبوو خۆیان دەشاردەوە، بە زۆریش بەر لەوەی خەڵکی بگەنەوە ماڵەکانیان کپ دەبوو، کاروباری شارۆچکەکە تارادەیەك وەك کاتی پێشهاتنی ڕوسەکان بوو. دانیشتوانی سابلاغ قایل نەبوون لە (داگیرکەر)ی ڕوسی نزیك ببنەوە، هەر کە گرمەی تۆپ و گیزەی گوللەی ڕەشاش بهاتایە، دەیانزانی کە عوسمانلی (ڕزگارکەر) نزیك بووەتەوە، لە کۆتاییدا پێکدادانەکە تێشکانی (گاوران)و هاتنی پارێزەری ناوچەکەی لێدەکەوێتەوە. ئەم ئاواتخوازییە لە سابلاغ بە نیمچە کۆدەنگێك

بوو، لە تێکڕای ئەورێزیشدا پارتە ئیسلامییە نەتەوەییەکان و ڕۆژنامەکان داوایان دەکرد بچنە پاڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کەچی ویژدانی تاك تاك لەم کۆدەنگییە لای دەدا و لە خولگەی خۆپەرستی و ئارەزووی خودی دەسووڕایەوە، بەستەڵەکی کەڵەکەبووی سابلاخ نەیتوانی گڕ و بڵێسەی دڵی ڕەزا عەلی کپ بکاتەوە، یان ئاگرەکەی مورتەزا حاجی زاد بکوژێنێتەوە. بە چ ڕێگایە بگاتە فاتمە کە لەنێو قەڵای مێردێکدا و سێ کوڕ کە خۆشی دەوێن، خۆی قایم کردووە؟ ئەی چ ڕێگەیەك دەگاتە وەلی نکولێکار و زۆردار، کە لە قەڵایەکدایە و لە سایەی دەستوپێوەندە شەڕخواز و خوێنڕێژەکانییەوە خۆی پڕ چەك کردووە؟! ئایا ڕێگای تۆ بەرەو رووسەکانە؟! نەخێر. تۆ سەرباری برا زۆردارەکەت و لایەنگرە پیاوکوژەکانی هەموو ڕۆڵەکانی شارۆچکەکەتیش لێت دەرەنجێن و لە بەرچاوی زۆربەی خەڵك بە (خایەن) دادەنرێیت، کەواتە با چارەڕێی هاتنی عوسمانییەکان بکات، هەروەها با ڕەزاش چارەڕێی هاتنەوەی میر بکات، ئەوسا با ڕۆژی پەسڵان هەڵبستێت و ئاژاوە بەرپا بێت، تا جەنگەکە بڕوای خەڵکی کز بکات و هەموو شتێك تێکەولێکە ببێت، ئەو دەمە فاتمە ملی بۆ دەدات، چونکە لە ئاژاوەدا تاوەر و قەڵاکان هەرەس دێنن، ئێ ئەمیش نە روسەکانی گەرەکە و نە عوسمانی، ئەو هەر نایشیان بینێت، ئەو جگە لە فاتمەی هاوسەری براکەی هیچی دیکە نابینێت و هەر ئەوی گەرەکە، ئەو ئاژاوەی دەوێت و دەیەوێت دنیا بەسەر یەکدا بڕوخێت. خۆزگە براکەی دەمرد...، ئاخر کەی تێکڕای دنیا دەمرن تا ئەم بگاتە پەرستراوەکەی، با لەو مەرگی بێبەشییە، رزگاری بێت و دەست لە ملی شەیتانی هاوڕێم بکەم، کێ من و فاتمە وەك دوو پاشای بێ تاج بەسەر سابلاخەوە دەهێڵێتەوە؟!

کۆمەڵە ددانێکی زەرد لە دەمیدا قەتیس بوون، ئەوانە ددانی تارماییەکی نادیار بوون و هەموو سابلاخیان لەخۆگرتبوو. زەردەخەنەیەکی زەرد ژەهری لێ دەتکا.

هێشتا ئاسمان لۆکە شیکراوە ساردەکەی دەباراند، لەلای ڕۆژاواوە خۆرێکی ئاسایی لە پشت هەورێکەوە خۆی مت کردبوو، کاتێك گرمەیەك لەو بەرزاییەوە تێکەڵی گرمەی زەوی بوو و لەسەر گۆڕەپانی ناوەندی شارۆچکەکە تەقییەوە، گوللە تۆپێك و

گوللە تۆپێکی دیکەی بەدوادا هات. دوای کەمەکێك دەنگەکان تێکەڵ بوون و لە گوێی هەندێك کەسدا وەك دەنگی مۆسیقا خۆش بوو.

مورتەزا حاجی زادە بەوەی رووی دەدا چێژی دەبینی، ئاگر و هاواری خەڵك، جەنگ و مەرگ و ئاژاوە، ئەمانە شتگەلێکن کەسانێك بە پەرۆشی عاشقانە وەری دەگرن.

منداڵان لە ترساندا و بە لەز خۆیان دەگەیاندە هەمێزی دایکانیان، ناحومی بچکۆلە شێتانە گریا، ئیستیر لەنێو لانکەکەیدا رایژەنی، لێ ئەو بەترسەوە وەك فیتوویەکی ناساز و گوێکەرکەر هەر دەگریا، ئیستیر پێی سەغڵەت بوو، رووە و خاوەنی تەقەکان بانگی کرد:

ـ منداڵەکەتان تۆقاند، ئیدی بەسە هەی بەچکە مشکان! ئینجا بە دەمی گلەییەوە رووی کردە خودا:

ـ ئەم بەڵا گەورەیەت لە کوێوە بۆ هێناین؟ وا سەرمان تەقی و منداڵەکان زراویان چوو، ئەوەتا هەر دەگرین و ژانەسەرەکەم دەبێتەدوو ژانەسەر.

عەزریای زێڕەنگەر بیری لە ئەڵماسی کچە تاقانەی کردەوە و هەستی بە ترسێك کرد "گەر شتێکم بەسەرهات، ئەڵماس چۆن بەتەنها بژێت و کێ لە چرنۆکی ئەم کێوییە... دنیا، بیپارێزێت؟".

ئەمێستا دایکی لەناو گۆڕدا بوو، بەسەر لەدایکبوونی ئەڵماسەوە چووبوو، باوکەکە دەیتوانی لە زەبری ئەم دنیایە بیپارێزێت، ئەمەش لە رێگەی بەشوودانییەوە لانە و بانەیەك و زاوایەك و نەوەیەکەوە بوو، بەڵام ئەڵماس لە دنیایەکی تردا بوو، کەللەی لێوانلێو بوو لە هەڵمی غایلەی بۆگەن، دێوی فریودەر و تاوانبار بە بێ ئاگاداری عەزریا رفاندبووی، کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی و بەستراتی خەیاڵاویی شێتانە، دەیلاواندەوە و بەردەوام لە دنیای خەڵك و ئەو راستییانەی لەم دنیایەدا روویان دەدا، بەرزی دەکردەوە. شلۆمۆ کەتانی راستی کرد، بەڵام ئاخۆ دەبێت سابلاخ هەر لەنێو بچێت، تا ئەڵماس لەو بەرزاییەوە بەرەو زەویی راستەقینە بەر ببێتەوە و دەنگی عەقڵ لەجیاتی زەڕەی غایلە و خەون بێتەوە سەری؟ بەڵام ئەم خەونانە چەند لەبوونیاندا جیاواز بن، ئەوا جگە لە کەللەی ئەڵماس لە سابلاخ و جگە لە سابلاخ ختووکەی

نوەزی زۆری تریان دەدا. لەکاتی بیستنی سەمفۆنیای ئاگر و کاولکاری حەسەن حزورگی لاو بە هاوڕێ هەرزەکارەکانی شارۆچکەکەی وتبوو:

ــ ئێمە خاوەنی بەفرین و دەبینە دەوڵەمەندترین دەوڵەمەندەکانی سابلاخ، خودا ئەمساڵ بەفرێکی زۆری پێداوین و هەزاران بێگانەش هاتوونەتە نێو سابلاخ. گوێم لێ بوو باوکم دەیوت: نرخی بەفر دوو ئەوەندە زیاد دەکات. بازرگانییەکەمان دەگەشێتەوە و سامان ڕەواجێکی وام پێدەدات، تا بتوانم دڵ و هەستی جوانترین کچە هەرزەکاری سابلاخی پێ داگیر بکەم.

کاتی نوێژی شێوان شێتانە هات، تا هەندێك لەوانەی خەونێك لە هەگبەکەیاندایە، بارگاوی بکەن و ترس بخەنە دڵی ئەوانەوە کە دەیانەوێت لە دنیادا بە ئاشتی بژین و ڕێزی ژیانی خەڵك بگرن و خۆشەویستی لەنێو مرۆڤایەتیدا پیرۆز بکەن. ئەسمەر ترسا، شووەکەی لەگەڵ دەستەیەك لە تایەفەکەی دوای نوێژی شێوان لە کەنیسەی شارۆچکەکە لە کۆبوونەوەدا بوو، وەك خووی هەمیشەیی سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و نزای کرد، پارچە گوللە تۆپێك بەسەر ئیستیردا وژەی کرد و تێکەڵی زریکەی ناحومی تۆقیو بوو، نەفرەتی لە دنیا و ناحوم و ئەو ساتەش کرد کە بە کۆت و بەندێکییەوەی بەستووە و توانای بەسەردا ناشکێت، لە چرکەساتێکی تیژتێپەڕدا لە کونی ترس و ژاوە ژاوەوە ڕووناکییەك وەك تیر دەرپەڕی و کەوتە دڵییەوە و لێوی پەشیمانی گەست. باڵندەی خۆشخوانی نێو دڕك و داڵ کەیفسازترە لەوەی لەنێو قەفەزێکی زێڕیندا بەند بکرێت، ئەو خۆی لە کاتێکی شووم و لاوازیدا قەفەزەکەی هەڵبژارد، لاوازی؟ بەر لە هاتنی ڕوسەکان و دوای هاتنیشیان بەردەوام بیری باخەکەی دەکرد، خەڵکی دەیان بینی بە زگی هەڵاوساوەوە ناحومی هەڵگرتووە و دەڕوات، ڕاستە باخی مێردەکەیەتی، بەڵێ، بەڵام لەوێ وازی لەگەڵ پەلەوەران دەکات و دووی پەپوولان دەکەوێت و بەری درەختەکان دەکاتەوە و چون منداڵ خۆی ڕەها دەکات. ئەو وەك پێی دەڵێن ئاوها کاڵفام و گێل نییە، ئایا ڕەهایی و ئازادی زیانێکی هەس؟ ئایا ڕەهابوون و جوانی گێلین؟، بەڵام شلۆمۆ لە شتهایەك ئاگاداری دەکاتەوە و باسی شتگەلێکی دی بۆ دەکات. سەیر لەوەدایە ئەو باسی شتی ترسناکی بۆ دەکات و شتی جوان و خۆشەویستی

لێ قەدەغە دەکات، لەنێو کاسەی سەریدا تۆپێکی تر تەقییەوە و هزری پارچە پارچە کرد و ئاوەزی هەلاهەلا کرد. ئۆف! گەرەکە بۆ لای ئەم بێ مەژگانە بچم و داوایان لێ بکەم، کە دەست لەمە هەڵبگرن! ئەی نازانن ئەوان بەم کارەیان سەری خەڵکی دێننە ئێش و منداڵان دەتۆقێنن؟! نا...، نەخێر، من ئەوانە ناناسم، بەڵام شلۆمۆ هەموو هەفتەیەك چاوی بەسەرکردەکەیان دەکەوێت، داوای لێدەکەم لەجیاتی من پێیان بڵێت، کەواتە شلۆمۆ وەرە، ئیدی من بەرگەی ئەم دەنگە نەفرینانە ناگرم.

ئەسمەر ئەو غایلانەی نەبیست کە بە خەیاڵی هەوێکەیدا دەهات، ئەم هەردوو کوڕەکەی و کچەکەی لای خۆی کۆکردبۆوە و لە تەنیشت پەنجەرەی رووکاری ماڵەکە لە باوشی گرتبوون، لە ئاسمانی شارۆچکەکەدا بڵێسەی یەك لە دوای یەکی بینی، کە لە بریسك و هووڕی گرمە و هەورە تریشقە دەچوون، دواجار گوێی لە گرمەیەك بوو. بە توندی منداڵەکانی بەخۆوە نوساند و تارمایی شووە خۆشەویستەکەی هاتە بەرچاوی...، داچڵەکی.

ئای شلۆمۆ، ئاخۆ ئێستا لەکوێیت؟! وەڵامەکەی لە شێوەی چەند دەنگێکی کز بیست، وەك ئەوەی پێ بن و لەسەر بەفرە کەڵەکەبووەکە بخنکێن. ئەو تەنانەت بێدەنگییش دەژنەفێت، لە پەنجەرەکەوە بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد:

ـ شلۆمۆ!

وەڵامی دایەوە و هاوکات خەریکی هەڵسووڕاندنی کلیلە گەورەکە بوو لەنێو کونی قفڵە زەبەللاحەکەدا.

ـ ئەسمەر، وا هاتم.

ئەسمەر پشوویەکی هاتەوە بەر و خاو بووەوە، مەرگ و ژین تیایدا لە ململانێدا بوون، بەرەو لای هات و بینی منداڵەکانیش لەگەڵیدا شڵەژاون، لە بێدەنگیەکی قورسدا هەموویانی لەخۆ کۆکردەوە، دیقەتی ئەسمەری دا کە لە نێو بێدەنگییەکەدا نوقم بووبوو. وتی:

ـ دۆخەکە پڕ مەترسییە، لەوە دەترسم کە لێی دەترسام، ئەویش نوقم بوونی سابلاخە لە ئاگر و خوێن.

ئەسمەر ساتێك لەنێو خەیاڵەكانیدا خۆی حەشاردا، ئینجا بە چپە وتی:

ــ باوكی سەلمان، بەڵام ئێمە هیچمان بەرانبەریان نەكردووە، ئیتر بۆچی ژیانمان و شارۆچكەكەمان لێ دەشێوێنن؟

ڕەنگە هەمان ئەم زەردەخەنەیە لەو ساتەدا لەسەر لێوەكانم بووبن، ئایا لە تواناتدا هەیە مەتەڵی زەردەخەنەكە هەڵبێنیت و ئەو ئاڵۆزییەی لە هزری مندا دەخولێتەوە، بزانیت؟

لە بەختی یارمدا بڕوام لەق نەبوو، تۆفان و غەریبی ئیسرائیلییەكانم لە میسر هاتەوە یاد، هەروەها رووخانی پەیكەری یەكەم و پەیكەری دووەم و سەبی ئاشووری و سەبی نەبوخەزنەسرم كەوتەوە بیر. بە ئەسمەرم وت:

ــ ئەمە ویستی خودای من و تۆیە.

پرسی:

ــ چی ڕوودەدات؟

پێم وت:

ــ تەنها لە خودا داواكارم لە ئاگر و خوێن بمانپارێزێت.

لێی پرسیم:

ــ تۆ دەیانبینیت، چی دەڵێن، چی ڕوودەدات؟

ــ پەلامارێكی توركیا و ئەڵمانیا بۆ سەر شارۆچكەكە.

ــ كەوابوو توركەكان بۆ سابلاخ دێن؟

ــ هەر خودا خۆی دەزانێت.

ئەسمەر ماوەیەكی زۆر بێدەنگ بوو، ئینجا لێی پرسیم:

ــ شلۆمۆ، رووسەكان و توركەكان و ئەڵمانەكان، كامیان باشترن؟

بەبێ ئاگا نزاكەمم دووبارە كردەوە:

ــ داوا لە خودای خۆم و تۆ دەكەم لە ئاگر و خوێن بمانپارێزێت.

***

لەو شەوەدا شەڕ و پێکدادان توند بوو، بەفری سابلاخ توایەوە و بە هۆی چڕی ئاگربارانەکە شەوەکە بوو بە رۆژ، وردە غەڵبە غەڵب لەناو غەڵبە غەڵبی گەورەدا ون بوو. دەنگی رووسەکان لە هەموو شوێنێك بەرز دەبووەوە، باوکی سەلمان بە چپە وتی:

ــ وا چەك و تفاقەکانیان کۆدەکەنەوە و دەڕۆن!

دانیشتووانی سابلاخ هەموو تێگەیشتن چی روودەدات، ئەوەی لە شتەکە حاڵی نەبووبوو، ئەوا لە میانەی هاواری بە پەلە و بگرە و بەردە بە زمانی روسی و بزووانی شڵەژانی ئۆتۆمبێلەکانەوە حاڵی بوو، کە لەگەڵ دەنگی تەقە و پێکدادانەدا یەکانگیر دەبوو و ئاوازێکی بێزارکەری پەیدا دەکرد، بەڵام زۆربەی دانیشتووانی سابلاخ بۆ ئەم دۆخە گۆرانییان چڕی، بەڵکو بە شەرابی (هەڵاتنی گاوران) کە لە نیوە شەوەوە دەستی پێکردبوو، مەست بوو بوون و هەڵدەپەڕین. سابلاخ عوسمانی (پارێزەری ئیسلام) رزگاری دەکات. بە درێژایی مانگەکانی داگیرکاری روسەکان، ترس زمانی لە گۆخستبوو، رقی باوەڕداری دژی گاور لە سینگدا قەتیس کردبوو، دڵ و سییەکانی پڕ کردبوو لە رقێکی کوێرانە، دەروون تەنگ و بەرقێکی شارراوە خنکاو، دڵان بەردەوام دژی ستەمکاری داگیرکەر لە خورپەی نەفرەت کردن بوون، دوور لە چاوی سەربازانی روس هەر سابلاخییەك تفی بەسەر زەویدا رژدەکرد و بە چپە وشەی ژەهراوی دەوت. ئەو شەوە لە ئاسمانی شارۆچکەکەوە دەروازەکانی شەوی قەدر واڵا بوون. دنیا لە جیاتی بەفر ئاگری بەسەر روسە ورچەکەدا باراند و جەستەی هەلا هەلا کرد. روسە ورچە دەستی بە کۆکردنەوەی پارچەکانی جەستە هەنجن هەنجن کراوەکەی کرد و خوێنی برینەکانی خۆی دەلستەوە. ئیدی بە پەشۆکاوییەوە دەستی بە هەڵاتن کرد و نووچی دەدا و پێی هەڵدەکەوت، هەواڵە راستەقینەکە گەیشتە گوێچکەی هەموو ماڵێکی سابلاخ. لە ناو جەرگەی ژاوەژاوە تێکەڵەکەوە دەنگێکی دیکە پەیدا بوو، سوپاسی خودای دەکرد و شوکرانەی دەبژارد. دەستبەجێ وەك ئەوەی فریشتەیەك رێنوێنی رۆڵەکانی شارۆچکەکە بکات و ئاراستەیان بکات، دەرگاکان کرانەوە و هەزاران پیاو و ژن لە گۆڕەپانەکە کۆبوونەوە، هەریەکە و بە خۆ و داری دەستییەوە، یان تەورەوە، یان خەنجەر، یان شمشێری تیژەوە، تەنانەت منداڵانیش لەنێو جێگەکانیانەوە راپەڕین و دوای باوکان و

مام و خالّیان کەوتن. جەماوەری دڵ گەرم وەك گەرداوی هەڵچوو دوای سوپای (گاور)ی هەلاّتوو کەوتن، مشك راوەدووی ئەژدیها دەنێت، کلکی ئەژدیها کە دەقرتێنێت، ئینجا ئەوەندەی بۆ بکرێ لەسەر قرتاندنی جەستە هەلا هەلا بووەکەی و ماندووەکەی بەردەوام دەبێت، خەڵکەکە ئەمە بە دار و بەرد و چەقۆ دەکات، جەماوەری بە خوێنی داگیرکەری تێکشکاو پیس بوو دەگەڕێتەوە تا بە پاکژی عوسمانی رزگارکەری گەورە و ئازا خۆی بسمیل بکات و بە گوڵاوی پەیمانی خەلیفەی ئیسلام خۆی بۆنخۆش بکات. بە خێرایی دەنگی تەقینەوە و گیزەی گوللە دەگۆڕێت و دەبێت بە سەڵاوات و هەڵهەڵە لێدان، لە جێگەی زمانی ئاجڕ و باجڕی روسی، دەنگی تورکیی بەرز دەبێتەوە و هەندێکجار دەنگی ئەڵمانی تێدەکەوێت، بەمەش خۆشیی دڵی موسڵمانانی سابلاّخ و بە بوونی هاوپەیمانی گاور دەشێوێت! بەڵام هۆشمەندەکانیان پێیان وابوو کە "راستە ئەڵمانەکان گاورن، بەلاّم هاوپەیمانی کردنی موسڵمان، نیوەی موسڵمانێتییە".

زۆر کەس هەناسەی خۆشی هەڵکێشا، میر عەلی وتی:

ـــ ئەوە ئەنگژەیەك بوو و رەوییەوە، ئەمێستا لەجیاتی مۆسکۆی وڵاتی شەڕانگێزان، لەگەڵ ئیسلامبول و بەرلین بازرگانی دەکەین.

لەو هات و هاوارە گەورەیەدا و لە تاریکی شەودا رەزا بۆ لای براژنەکەی هات. میر لە دەرەوەی ماڵ لەگەڵ دۆستانیدا بە بۆنەی سەرکەوتنی باوەڕداران و تێکشکانی گاوران خەریکی ئاهەنگ گێڕان بوو. مندالّکان نووستبوون، پیرێژن و پیرەمێردەکەش هەر نووستبوون. فاتمە لە ژوورەکەی خۆی خشە خشێکی ناجۆری بیست و فانۆسەکەی بەرز کردەوە و دەموچاوی رەزای بینی. وەك ماینێکی تۆقیو خۆی کەلاخست، گەر هاوار بکات مندالّەکان وەئاگادێن و بێگومان محەمەد بۆ باوکی باسی دەکات، دیارە ئەوەش کارەساتێکی گەورەیە، پتر خۆی خستە لاوە، رەزا وەك تارماییەکی زەرد لەبەر تیشکی فانۆسەکە لێی هاتە پێشەوە، بەدەنگێکی نزم وتی:

ـ عاقڵ بە، تۆ وەك برامیت.

ـ نەخێر.

نەخێرەکە لەنێوان ددانە چیڕەکانییەوە دەرپەڕی. فاتمە بە تکا و پاڕانەوە وتی:

ــ منداڵەکان بە ئاگادێن و دەبێتە ئابڕووچوونێکی وا ئەم جەنگە لـەبیری خـەڵکی سابڵاخ دەباتەوە.

هەستی بە بەرکەوتنی دەستێك کرد، شانی بە چـزووی گەزندەیـەکی پـیس کەوتـە لەرزین. فاتمە راپەڕی و بەرەو دەرەوەی ژوورەکە لێی دوورکەوتەوە، لەوێ بە نیوە چـپە و نیوە هاوارکردنەوە وتی:

ــ گەر نەڕۆیت هاوار بۆ خەڵکی دەکەم، با هەموو خەڵکی سابڵاخ بـزانن کـە تـۆ چەپەڵێکی نامەرد و شەڕانگێزیت، رەزا سڵەمییەوە، ئەسپە لغاوکراوەکە ساتمەی کـرد، سەری زامدار بوو، زمانی توانای لستنەوەی بـرینی ئـەم سـەرەی نـەبوو، بـە بۆڵـەبۆڵ دوورکەوتەوە:

ــ خۆشمدەوێی! خۆشم دەوێی! فاتمە کایەی ترمان لەپێشە.

بەهۆی جۆراوجۆری زۆرەوە هەندێك کەس لە سابڵاخ بە بڕوایەکی لە جۆری بڕواکەی رەزای غەمگین و سەرسام، دەیانوت:

ــ کایەی زۆرمان لەپێشە، بەڵام چۆن کایەیەك!

حەسەن چەخماخ خۆی و دەستەکەی بڕوایان بە لینین و ترۆتـسکی بـوو، بەلـشەفی و مەنشەبیکەکانی سابڵاخ بڕوایان وابوو کە رۆژی رزگاری گـەلی روسـیا لـە دەسـەڵاتی بنەماڵەی رۆمانۆف، وەك رزگاری گەلانی ئێران لە دەسەڵاتی بنەماڵەی قاجاری زۆردار، نزیك بووەتەوە. حەسەن چەخماخ بە چپە و بە نهێنی بە هاوڕێیانی دەوت:

ــ ئەمە گورزێکە و لە نیکۆلای ستەمکار دەدرێت، بەڵام لە راسـتیدا ئـەم سـوپا هەڵاتووە لە رۆڵەکانی گەلە چەوساوەکەن، ئەمە سوپای گەلە خراپەکاران بـەم زووانـە لادەبرێن و دەسەڵاتی کرێکاران بەرقەرار دەبێت، بۆیە گومانی تێدا نییە سوپاکەش بـۆ گەڵ دەگەڕێتەوە. ئێوە وریای عوسمانییەکان بن و لە دەفتەرەکانتاندا ناوی ئەو کەسـانە تۆمار بکەن، کە راوەدووی براکانمان، رۆڵـەکانی گـەلی روسـیای سـتەمدیدەیان نـاوە، بەتایبەتی ئەوانەی لە کاتی کشانەوەیاندا سووکایەتییان پێکردوون. لە داهاتوویـەکی نزیکدا براکانمان هێز و هەناسەیان دێتەوە بـەر و دەگەڕێنـەوە، هـەش بەسـەر ئـەوەی پەلامار سوپای روسیای هیوای گەلانی روسیا و تێکڕای مرۆڤایەتی دەدات.

حەسەن چەخماخ و هاوڕێکانی لە سابڵاخ خۆیان بە بیر و باوەڕی لینین و مارکس لە سترتیدلهمای شەوانی سابڵاخ گۆش دەکرد و بە درێژایی نیوەی ساڵەکە جێگەکەیان نێو عەماری چاڵە بەفر بوو، بەفر هەموو کون و کەلەبەرێکی گرتبوو، لە هەموو لایەکەوە بەلباد دەنگبڕیان کردبوو، لە نیوەکەی دیکەی ساڵەکەشدا وەك تارمایی وانەی رزگارکردنی هەژاران و چەوساوەی دەستی زۆرداریان وەردەگرت، ئیدی نە چاوێك دەیبینین و نە گوێیەك دەیژنەوتن، لە نهێنیدا گەشەیان دەکرد و پەرەیان دەسەند. رۆژ بە رۆژ خەڵکی دەهاتنە پاڵیان، وای لێهات خەڵکی دەرەوەی سنووری سابڵاخیشی گرتەوە، ئیدی هەر ئەوەندەی یەکێك دەبوو بە لایەنگریان ئەوەندەی نەدەبرد بە نهێنی پەتاکەی دەگەیاندە نێو خانەوادەکەیشی، بەڵام ئەم (دەستە لەرێلادەرە) لەگەڵ پەرەسەندنیشیدا هەر وەك کەمینەیەك لەنێو پارتە جۆراوجۆرەکانی ئەم بەشە لەبیرکراوەی دنیا، مایەوە. ئەستێرەی زۆرریشیان درەوشایەوە، یان ئەمە شەیتانی جەنگەکە بوو ئەو هەلەی بۆ هەڵخستبوون، مورتەزا حاجی زادە هەوڵی دا بگاتە سەرکردەی سوپای عوسمانی لە سابڵاخ و باجی ملکەچی و قەبوولکردنی خۆی پێشکەش بکات، بە جۆرێك بە پێی لۆجیك و دادپەروەری داوا بکات، تەنانەت دڵی بەرد بتوێنێتەوە و هۆکاری مافی خۆی لە بەڕێوەبردنی شارۆچکە و شایستەیی زۆرتری ئەم لە وەلی ستەمکاری برای، داڵدەدەری خراپەکاران و لەرێلادەر و خوێنڕێژ و ڕێگر و جەردە و تاوانبار، بە ڕەواتر پیشان بدات. مورتەزا ئەوەشی لەبیر نەچوو، کە عوسمانییەکان کوشتەی پارە و دراون، ئیدی لۆژیکی زێڕی بریقەدار مافی خستە ژێر ئەفسوونی نادادییەوە، سەرکردە تورکەکە دڵی نەرم بوو، پێداهەڵگوتن و گەورەکردن ئاوەزی گۆڕی و لە چاوانییەوە بریسکەی زێڕ دەرکەوت و بەرەو هەموو خانەکانی مەژگی دزەی کرد و سەری کەوتە خولانەوە و سمێلە بابرەکانی بادا و سەرە گەورەکەی کە لەنێو بازنەی مەکر و ئەفسوون دەخولایەوە، بەڵێنی سەرۆکایەتی شارۆچکەکەی بە مورتەزا دا، فەرمانیشی دەرکرد، کە براکەی و پێوەبەستراوە تاوانبار و خوێنڕێژەکانی دەستگیر بکەن. جەنگ بێ بەزەییە و هەردوولا لە دەروازەکانی سابلاخ شەڕ دەکەن، ئاوازی جەنگەکە بە دەنگی تۆپ و شەست تیر دەژەنرێ. لە کەنیسە سابلاخ هەموو

خەریکی نزاکردنن، بەتایبەتی حاخام ناحوم و شلۆمۆ کەتانی و ئەوانەی خەو ناچێتە چاویان تا خودا سابلاخی بێوەی و ئەوانەی تێیدان لە کاولکاری جەنگەکە و غەوارەکان بپارێزێت و عوسمانی و مسقۆف و ئەڵمانییەکانیان لێ دوور بخاتەوە، کەچی شلۆمۆ سەرەڕای بڕوا پتەوەکەی و بەجەستە بەهێز و کێلی خۆی و رۆحە پاراوەکەی، هەستی کرد کە خودا بەو ئاسانییە نزای داواکاران قەبووڵ ناکات، هەرچەندە هەندێك هەن و ئەمیش یەکێکە لەوان، خودا هەڵیبژاردوون تا پەنایان بدات و لە تەنگژە و لە بەفر، لە ئاو و ئاگر، لە رۆژانی ئاشتی و لەکاتی جەنگدا، بیانپارێزێت "هۆ رۆڵەکەم، ئایا دەزانیت کە ئاشتی یەك کایەیە، بەڵام جەنگ چەندین کایەیە. ئەمێستا من گەیشتوومەتە خراپترین ساڵانی تەمەن و بیرم نایات کە مرۆڤ رۆژێك لە شەڕ و پێکدادان نەبووبێت، ئیدی لەم پارچە زەوییە گرژی و لەو کیشوەرە کوشتار، لە شوێنێك ئیدی هەر شوێنێك بێت، رەنگە لە هەزاران شوێندا کەللە پووت و گێل قەستی روحی دوژمنە گێلەکەی خۆی بکات". بێجگە لەمە مقومقۆی گەرم بڵاوبووەوە، کە هەندێك جوولەکە بە دەستی تورکەکان یان ئەڵمانەکان کوژراون، هەروەها وتیان کە حەننیا بانۆ خاوەنی دوکانی تووتن فرۆشن و رەنگە کوڕە گەنجەکەیشی بووبنە سەرقافڵەی شەهیدەکان لە سابلاخ، بە پێی ئەو ئەرکەی پێم سپێررا بوو داوام لێکرا لێکۆڵینەوە لە شتەکە بکەم، من ستەمکاری عوسمانییەکانم بیستبوو، ئێرانییە شیعەکان و عوسمانییە سوننەکان رەنگە لە شتێك زیاتر لێك جیا بن، بەڵام لە یەك شتدا وەك یەکن ئەویش زوڵم و زۆردارییە، ئەوەتا جەنگ بەرپا بووە تا شێوەکانی زوڵم و زۆریان بۆ جۆراوجۆر بکات و هەموو قەدەغەکراوێکیان بۆ حەڵاڵ بکات و روحی خەڵکی بەدەستیانەوە وەك بەفری زستان لە سابلاخ هەرزان بێت، بەڵام بەتایبەتی روحی ئێمە وەك خۆڵی ئەستەمولڵ و بەرلین هەرزانە! خودایە لە بەرلین و ئەستەمولڵ رزگارمان بکەیت!

شلۆمۆ کەتانی چاوە درەوشاوەکانی بۆ هەڵبڕیم، هەر ئەو رۆژە بە نائومێدی و پەژارەوە بۆ ئەسمەریشی هەڵبڕی بوو و وتبووی:

ـ حەننیا بانۆی خاوەنی دوکـانی تـووتن و مۆشـێی کوڕیـان کوشـتووە، خـەڵکی دیکەشـیان بـە بـێ گونـاە کوشـتووە. حـەننیا و کوڕەکـەی دۆزرابوونـەوە و سـکیان هەڵدڕابوو و لەنێو چڵپاودا گەوزێندرابوون، وەك دەرکەوت ئـەوان بـۆ کـەنێس چـوون، هەندێك نەسرانیش لە شوێنی جیاجیا دۆزرابوونەوە و کوژرابوون، هەندێك لە لاشەکان هەتك کرابوون، لووتیان بڕابوو. چووم لای سەرکردەی عوسمانی نارەزایی دەربـبڕم، بـەڵام بە ناشیرینترین شێوە وەڵامی دامەوە و هەڕەشەی کرد کـە دەسـتمان ببڕێتـەوە، چـونکە گوایا ئێمە "جاسووسەکانی روسیای دوژمن"ین. دەربارەی کوشتنی خەڵکی بـێ تـاوان پرسیارم لێکرد، بەڵام ئەو نکۆڵی کرد کە عوسمانییەکان خـەڵکیان کوشـتبێت، وتـی "رەنگە هەندێك لە هاوپەیمانە ئەڵمانەکانمان بێزار و بێ تاقەت بووبن، بۆیە بێتاقـەتی خۆیان بـە کوشـتنی چـەند سـەگێك دەرکـردووە". نەمویـست لەگەڵیـدا بـچمە نێـو گفتوگۆیەکی بێ ئەنجامەوە، چونکە لە سووکایەتی پێکردن پترم لێ دەست نەدەکەوت، ئێ ئەمە جەنگە و هەندێك کەسیش پێیان وایە لە جەنگدا هـەموو شـتێك حەڵاڵـە!، هەستمکرد خراپەکارییەك لە ئارادایە. دوعا و نزاکەم لە دڵی خۆمدا قـەتیس کـرد...، بیرم لە ئەسمەر و منداڵـەکان و ئیـستێر و نـاحوم و هـەموو دانیـشتوانەکەی دیکـەی شارۆچکەکە کردەوە.

من ژیانی خـۆم بـە توێکڵـە پیازێـك دەگۆڕمـەوە، تـا رۆڵـەکانی ئـەم شارۆچـکە چاکەخوازە بپارێزم، بەڵام شای قاجاری وا لە تاران لەسەر کورسی دەسەڵات دانیـشتووە و گوێ بەوە نـادات لـەم بەشـەی وڵاتەکەیـدا هاووڵاتییـەکانی چییان بەسـەر دێـت. لەکاتێکدا رووم دەکردە هەر کەسێك لە سابڵاخ، ئیدی هەر لـە ماڵەکـەی خۆمـەوە و هاوڕێیانم، بەڵێنم بە خۆم دا کە "ئێوە ئامانـەتێکن لـە ئەسـتۆی مـن، ئـیتر بـا ئـەم عوسمانییە ستەمکارە با هەر ئابڕووم لە زەلکاو بگەوزێنێت".

من بە وتەکانی باوکی سەلمان کە لە دنیادا روودەدەن سەرسام بووم...

ئەمە ئەو رۆژە رووی دابوو، پێش ئەو رۆژەش هەر رووی دابـوو، ئینجـا لـە شـوێنی جیاجیای ئەم جیهانە بەردەوام بوو، تا ئەم چرکەساتەش نەوەستاوە، پرسیم، چـونکە بـە خۆتێهەڵقورتانەوە لە بڕێك شت راماوە:

ــ مامه شلۆمۆ ئەی دوایی؟

چارەت تێك نا، بیرت نەچووبوو، بەڵام ترس و زەبر کاتێك وەك مێـردە زمـە سـواری سەری بنیادەم دەبێت، بێدەنگت دەکات. لێرە دوای چەندین گرێسالّ، لە تارانی محەمـەد رەزا پەهلەوی جیکەی گالیسکە لـە شـەقامەکەوە دەگەیـشتە ئێمـە و روونـاکی لـە چـاوانمانەوە دەبریـسکایەوە، لـەوێ پـێش چـەند گرێـسالّێك لـە بـاکووری تـاران لـە شارۆچکەیەکی دوورەدەست و لەبیرکراو دەنگی زنجیری دەبابە و بلێسەی ئاگر بوو!

تورك دەڵێت (بکوژە) ئەڵمانی دەڵێت (بکوژە!)، روسـەکان و ئینگلیـز و... هـەمو دەڵێن (بکوژە!). باوکی سەلمان لە خودا دەپاڕایەوە کە لەبـەر خـاتری پێغەمبـەرانی و نێردراوانی و راستگۆیانی نـەفرەتی جەنگەکـە لەسـەر سـابلاخ و کەرایـەتی مـرۆڤ و دڕندەیی مرۆڤ و کێویێتی مرۆڤ هەڵبگرێت، هەروەها خراپەکاری جەنگ نارەزاکەش کـە هەر ئەم مرۆڤە دەیکات، لاببات.

ــ ئیستێر و ناحوم لە کوێن؟

لەناکاو وەئاگا هاتم، هیچ هەست و خوستێکیانم لە ماڵەکـەدا نەبیـست، لـەدوای منەوە ئەسمەر بە شڵەژاوییەوە بانگی کرد:

ــ قەشەنگ! قەشەنگ! ئیستێر و ناحوم هان لە کوێ؟

قەشەنگ هاتە ژوورەوە و منداڵەکەی بە باوەشەوە بوو، ئیستێریش بـە خـۆ و زگـی بەرزەوەبوویەوە بەدوایدا هاتە ژوورەوە.

وتم:

ــ هەی کارەکەری شووم، منداڵەکە لەنێو بێشکەکە دابنێت.

وتم:

ــ نا، قەشەنگ، نەختێك راوەستە!

من بـە ئاسـانی تـووڕە نـابم، بـەڵام کوشـتنی بـانۆ و کوڕەکـەی و کەسـانی تـری دانیـــشتووی شارۆچـــکەکە و هەڕەشـــە و گوڕەشـــەی ســـەرکردە تورکەکـــە و سووکایەتییەکانی، دەمارمیان وەك ژێی کەمان توند کردبوو.

ــ لە کوێ بوون؟

بە ترس و زمانی پەڵتەوە وتی:
ــ ئیستیری خاتوونم فەرمانی پێدام...
بە دڵێکی گوشراوەوە قسەکەم پێ بڕی:
ــ ئیستێر خاتوون و گەورەی تۆ نییە قەشەنگ، هەر خودا خۆی گەورەیە! ئینجا ئەوەشت بیر نەچێت تۆ لە پێش ئیستیرەوە لای ئێمەیت، گەرەکە پێش ئەوەی فەرمانی ئیستێر جێبەجێ بکەیت، مۆڵەت لە ئەسمەر وەربگریت. لە کوێ بوون؟
بەستەزمانە تفەکەی قووت دایەوە و زانی لە دوو لای دژەیەکەوە فشاری دەخرێتە سەر، بێگومان وەك چۆن مریشك لە ڕێوی دەترسێت، ئەمیش لە ئیستێر دەترسێت.
ــ پێی وتم کە ناحوم هەڵبگرم و لەگەڵیدا بۆ باخەکە بچین.
شێتگیر بووم. دەمارەکانم وەك ژێی هەلاج کە بە مێکوت لێی بدەن توند بوو، ئیستێر لە فەرمانم دەردەچێت و لێم یاخی دەبێت، لەمەوپێش ئەمە ڕوونەداوە، لەمەولاش نابێت ڕووبدات، وەك گای هەڵچوو هاوارم کرد:
ــ با ئیستێر بێت! با ئیستێر بۆ لام بێت!
هات و وەك ئەوەی هەر لە فەرمانیشم دەرنەچووبێت، ئەوەی ڕوویدابوو هەر پێوەیشی دیار نەبوو، گێل و نەفام، پێم وت:
ــ ئەی ئاگادارم نەکردیتەوە کە لەم دۆخە ترسناکە دەرچوون قەدەغەیە؟ ئایا دەتەوێت لێم یاخی بیت و ناحوم و ئەوەی ناو سکیشت بخەیتە مەترسییەوە؟، ئەی نازانیت ئەم مردنە لە هەموو ڕێگە و بانەکانی سابلاخ لە بۆسەدایە؟ یان نەتزانیوە کە جەنگ لە تێکڕای شارۆچکەکە لە گەڕدایە و خەڵکانێکیشی تێدا کوژراوە؟
من کوردێکی سەرسەختم! ڕەنگە تووڕە ببم، بەڵام بە ئاسانی هەڵناچم، نا، هۆی هەڵچوونەکەم ئێرەییە بە ژیان، ڕەنگە گێلایەتی ئەم ئافرەتە شارێك لەنێو ببات، خۆ ئەو تەنها شمشێری یاخی بوونم لێ هەڵناکێشێت، بەڵکو ئەوە شمشێری لەنێوبردنە و لەبەرچاوانم رای دەگرێت و دەبریسکێتەوە...، هەڕەشە دەکات...، دەخاتە هەناسەبڕکێ...
چاوانم جگە لە مەرگ هیچی دیکە نابینن، ئینجا چۆن مەرگێك؟ ئەو مەرگی منداڵەکەم و مەلۆتکەکەمە، وای لە ترسناکی ئەم بیرکردنەوەیە؟

بەڵام من ناگۆڕێم، هەناسەیەکی تەنگەتاوی، ئینجا هەڵچوونەکە دادەمرێتەوە. فەرمانم پێدا:

ــ برۆ بۆ ژوورەکەی خۆت، لەمەولا بەبێ فەرمانی من لە ماڵ دەرنەچیت.

کەمێك چاوانم لێك نا، لە رێگە و بانەکان مردنی بەناهەقم هاتە بەرچاو، کە بەنێو هەوای شارۆچکەکەدا دەگەڕا، لەنێو ئاوەکانی، لەناو ماڵدا، مەرگ... هەزار هۆکاری خۆی هەیە، مەرگ پێیەکانی ئەختەبووتێکە و بڵاوبووەتەوە. ئەو تەنها یەکێکە. نەخێر! وەك زانایان بۆی دەچن ئەو تەنها یەکێك نییە! ئەو وەك هۆکار جۆرەها بوونی تایبەتی خۆی هەیە، هەیە هەزار مەرگی ترسناك و ناجۆری دێتە پێش تا دەبێتە شتێکی ویستراوی خۆش... رۆژێك بوو هیچم نەما، دۆستانم دەمیان بە گلەیی بوو کە گوایا هەندێك شتی پێویست لە بازار نەماوە و بازرگانی بووەتە قسەیەکی بێ واتا!

ــ دەروازەکانی شارۆچکەکە خەریکە دادەخرێن.

ــ ئەگەر ئەم جەنگە بەردەوام بێت، ئەوا تێکڕای ناوچەکە لە دنیا دادەبڕێت.

ــ هیچ چارەیەك نییە، تەنها کۆکردنەوەی خۆراك و ئاژەڵ نەبێت.

بازرگانەکان کەلوپەلیان عەمار دەکرد، تا لەکاتی پێویستدا یەك بە دە بیفرۆشنەوە، من خۆراکم دەکڕی و لە ماڵەکەی خۆمدا عەمارم دەکرد، تەماشای زێڕ و زیوی هەڵگیراوی ناو گەنجینەکەم کرد و وتم: "گەر خواردن و خواردنەوە شیرین بوون، ئەوا منداڵەکانم و کەسوکارم و دۆستانم سوود لەم سامانە نابینن".

میر عەلی ئەوەندنەی بۆی کرابا لە گیرفانی خۆی خۆراکی دەکڕی تا بیفرۆشێتەوە. پێم وت:

ــ تۆ مەگەر چۆنها، دەنا قەت بازرگانیت بە خۆراکەوە نەکردووە، کەچی وا ئێستا شتەکە بە پێچەوانەوە دەکەیت، وەك ئەوەی هەموو ئەو قسانەی پێم وتیت، بیرت چووبێتەوە، دەستت کردەوە بە کڕین و فرۆشتنەوەی خۆراك.

وتی:

ــ من وەك تۆ تەماحكار نیم، تـا ئـەوەی لـە توانامـدا بێـت هـەموو شـتێك لـە ماڵەكەی خۆمدا عەمار بكەم و چاوەڕێ بم تا نرخەكان لەمە پتر بەرز ببنەوە، من یەك بە دووم بەسە.

نەخێر، میر، من خۆراك عەمار ناكەم تا بە دە ئەوەندەی نرخەكەی خۆی بیفرۆشمەوە، بەڵكو من بۆ كاتی تەنگانە دامناوە...، من زێڕەكەم دەكەم بە خۆراك و خۆم بۆ سـاڵانی قاتوقڕی ئامادە دەكەم، كە بێگومان بەڕێوەیە. من منداڵەكانم دەپارێزم، ڕەنگـە تـۆ و كەسوكاریشت لە گرانی و برسێتی داهاتوو بپارێزم، وەك بۆی دەچـوون مـردن هـەمان مردن نییە، هەندێك جۆرە مردن هەیە زۆر لەوە دزێوترە كە وێنای دەكەیت. كە مـردن هات دوای ئەوەی ژیان دەبێتە هەموو جـۆرە مردنێـك، مـرۆڤ باوەشـی بـۆ دەگرێتـەوە.

ئەسمەر وتی:

ــ كۆگاكە پڕ بووە لە كیسە و تەنەكە.

وتم:

ــ ژوورێكی دیكە ئامادە بكەن، دەیكەین بە ژووری پێوان.

وتی:

ــ گەورەكە جێگەی ئاژەڵی دیكەی تێدا نابێتەوە، هەموو شوێنێكی ماڵەكە هـەر مریشك و مراوی و پەلەوەری دیكەیە.

پێموت:

ــ ئەسمەر، خۆت رابگرە، رۆژێك دێت هەموو ئەمانە دەبنە یادەوەری و ئاخیـان بـۆ هەڵدەكێشین. چۆن بنیادەم ئاواتی تەندروستی و خەیاڵ ئاسوودەییە، ئێمەش ئاواتیان بۆ دەخوازین.

بە زەبری ترس دەنگی بەسۆزتر كرد و بە چپە پرسی:

ــ مەبەستت ئەوەیە كە...

ــ ئەسمەر، گرانی...، گرانی و برسێتی!

ــ باوكی سەلمان، ئەی جەنگ و نەفرەتەكانی كۆتایی نایات؟

لەسەر ئەوە سوور بووم، کە ژنانی سابلاخ و هەندێك لە پیاوانیش... بەڵکو زۆربەیان لێی بێ ئاگان.

ــ ئەسمەر، جەنگ تەنها واتای مردن نییە، جەنگ کاولکاری و نەفرەتێکە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، کاولکاری و برسێتی و پەتا و کەم ئەندامی و هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ قڕ دەکەن.

ئەوەی وتم ئیستیر ژنەفتی، کە لەو دەمەدا خۆی دابووە بەر خۆرەتاوی ئاداری متبووی تازە راپەڕیو، لاقەکانی درێژ کردبوو، هەردوو کەفەڵی لەژێر سکە بەرزەوە بووەکەیدا ون بووبوو.

وتی:

ــ بە خودا و بە سەری ناحوم، من هەستم نە بە جەنگ و نە بە نەفرەت کردووە، بە پێچەوانەوە سابلاخ لە ریتمە بێزارکەر و روح دەرکەرەکەی دەرچووە، ئەوەتا بە شتی کتوپڕ ئاوسە و گشت رۆژێ تازە دەبێتەوە، روسەکان، تورکەکان، ئەڵمانەکان... دەنگی پێکدادان... کێ دەزانێت سبەی چی روودەدات؟

دەنگی تۆپێك لە گوێیەکانمدا تەقییەوە. نەمزانی ئاخۆ لە سابلاخ تەقییەوە، یان لە ناخی خۆم، بەڵام پارچە تووڕە و بەهێزەکانی لە سەرانسەری خودی خۆمدا بڵاو بووەوە، تووڕەییەکەی خۆم قووت دایەوە، نەك لەبەرئەوەی ئەو شتانە لە دنیادا روودەدەن، بەڵکو ئا ئەوەتا ئەمە نەفرەتێکی دیکەیە و لە ماڵەکەی خۆمدایە و بە جۆرێکیش پێمەوە بەستراوە، لێ بوونەوەی بۆ نییە، مەگەر هەر بە...

داچڵەکیم، ئەی ناحوم؟! ئەی ئەوی دیکە کە لە هەناویدا راکشاوە؟! پەنا بەخودا، پەنا بەخودا!

تفەکەم قووت دایەوە، روحم گەیشتبووە بینە قاقام، هەوڵ دەدەم قووتی بدەم و رێگەم پێنادات، گیربوونەکەی روحم تووڕەییەك بوو تێکەڵ لە بەزەیی، شتگەلێ هەن گەرەکە قووتیان بدەم، دەمم وشکە، روحەکەم دێت و بەگوێم ناکات. لەو ساتەدا بریتی بووم لە پارچەیەك و هەموو نەوتی دنیای بەسەر کرابوو، بە ئەسمەرم وت:

ــ ئەسمەر، جامێ ئاو! جامێ ئاوم فریا بخە.

# کایەی سێیەم

لەگەڵ هاتنی بەهاردا بەفر دای لە کزی، لە سابلاخ نرخی کەلوپەل بەرزتر بووەوە، لە بازاڕەکاندا کەلوپەل کەم بووەوە، خەڵکانێك وەك خۆیان بۆ ئامادە کردبوو خەونیان پێوە دەدی. خانەوادەی بوزورگ ئەم ساڵ بەفر بە دوو ئەوەندەی نرخی خۆی دەفرۆشن، چاڵە بەفرەکەش لە پێویستی شارۆچکەکە زیاترە و بەشی ئەو سوپایانەش دەکات، کە هاتوونەتە ناو شارۆچکەکەوە، بە مەرجێك سەرکردەکان هەر ئەوەندە بەشی ئەفسەرەکان بدەن کە بەکاری دەهێنن. میر عەلی لەوەی عەماری کردبوو یەك بە سێ قازانجی کرد. مورتەزا حاجی زادە لە چاوەڕوانی گەیشتن بە کورسی برا ستەمکارەکەی لەسەر ئاگر بوو. ڕەزا عەلی بە ئاگرێکی بێ بەزەیی دەسووتا، ئاگری عەشقێکی قەدەغەکراو، ئاخۆ ڕۆژێك دێت فاتمە مەیلی بداتێ؟ هەندێك هەواڵ گەیشتنە حەسەن چەخماخ، بۆیە هاوڕێیانی کۆکردەوە و بۆی ڕوون کردنەوە:

- ڕۆژی ڕزگار بوون نزیك بووەتەوە. جیهان تورکیا بە (پیاوە نەخۆشەکە) ناو دەبات. پیاوێکی دیکەی نەخۆش هەیە و هەناسەی لەبەر گەلی ڕوسیا بڕیوە، بەڵام ڕۆژی ڕزگار بوون نزیکە، خۆتانی بۆ ئامادە بکەن و خۆڕاگربن و مەی درکێنن.

دەنگی تۆپ لە هەموو شوێنێکی سابلاخ بەریەك دەکەوتن. ڕۆژێك نییە کپ ببێتەوە، هەندێکجار دوور دەکەوێتەوە، ئینجا نزیك دەبێتەوە، گەر دوورکەوتبایەوە خەڵکی دڵیان خۆش دەبوو و دەیانوت: "موسڵمان گاور ڕاودەنێت و لێمانی دوور دەخاتەوە"، خۆ ئەگەر دەنگی تۆپ نزیك بووایە بڕێك کەس خۆشحاڵ دەبوون و دەیان وت: "ئەوە ڕوسەکان گەڕانەوە و لەگەڵ خۆیاندا ئاسوودەیی و ڕزگاریان بۆ هێناین".

کاتێك شلۆمۆ دوای نوێژی شێوان بەرەوماڵ دەگەڕایەوە، شەوەکەی ساماڵ و مانگ نیوە پڕ بوو، لەم شەوەدا دەستڕێژ بە توندی دەستی پێکرد و ترسیش زاڵ بوو، تەنانەت ئیستیریش ترسا. لە نزیك ماڵەکەی خۆیان فیتووویەکی تیژ گوێیەکانی شلۆمۆی کەڕ کرد. باوکی سەلمان وای بۆ چوو کە گوللە تۆپەکە کەوتە نێو حەوشەی ماڵەکەی خۆیان، خۆی دایە پاڵ دیوارێك و سەری بەرز کردەوە، پریشکێکی بینی کە بە بان سەرییەوە وژە دەکات و بەرەو گۆڕەپانی شارۆچکەکە دەڕوات. زۆر سوپاسی خودای کرد و وتی: "سەربازەکانی عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان بە زۆری لە گۆڕەپانەکەن"، بەڵام خوا و راستان لەوێ نەکەوت، چونکە گەر کەوتبا ئەوە جەستەی خەڵکێکی زۆری هەلاهەلا دەکرد، نێ تورکەکان و ئەڵمانەکانیش مرۆڤن، ئیدی سەرەڕای هەوا و ئارەزووی مرۆڤ، ئەوانە هەر مرۆڤن...، تەنانەت ستەمکارانیش هەر مرۆڤن، زۆرداریی ئارەزووە، بەڵکو لاوازییە، یان نەخۆشییەکی درێژخایەنە لە دەروونی هەندێك کەسدا، بە پەلە خۆی گەیاندە ماڵەوە. ئەسمەر بەلەز بۆ لای هات، هەروەها ئیستیریش بە پەلە هات. سەرسوڕمانێکی گەورەیە، بەڵام هەندێکجار بەزەیی گەورەترە. ئیستیر کەوتە سەر دەست و پێی، هەناسە بڕکێی بوو. بێگومان تۆپێك لە گۆڕەپانەکە تەقییەوە، ئیستیر شێتانە هاواری کرد، ریتمی هاوارەکەی لە ترسەوە نەبوو. ئەسمەر بە سۆزێکی لێزانانەو ئەزموونەوە نیگایەکی کرد، ئینجا وتی:

بەزاتی خودا ئەمە ژانی منداڵبوونە!

لە دەرەوە دەنگی تەقەی شەڕ، بەرەژانی مەرگ لە دەرەوەیە، لێرە لەم ماڵە پیرۆزەدا بەرەژانی ژیانە. باوکی سەلمان ئەرێ ئەوکاتەت لە بیرە؟

دڵم کەوتە لێدان، گێلە منداڵی دووەمی دەبێت و جەنگیش لە دەرێی ئەم ماڵە شتان تێکەڵ دەکات و وردوخاشی دەکات. ئیدی هەر چەند تەقەیەك کرابا، دەنگی تەقینەوەکە هاوارەکەی ئیستیری خەفە دەکرد، ئینجا لە دەرەوە دەنگی تەقینەوە تێکەڵی هاواری شێتانەی ئیستیر دەبوو. دوای هەر تەقینەوە و هاوارێك دەگریا، پەنای دنیا و داوای فریاد رەسی دەکرد:

- هەی گاورینە، مامانم فریا بخەن!

شەڕەکە تا دەهات توند دەبوو و ژانەکەی ئیستیر توندتر، ترسی منداڵەکان زیادی دەکرد و گریانی ناحوم زیاتر، بێزاری گەورەکان زیادی دەکرد و بە هەمان شێوە تەنگەتاوی ئەسمەر و قەشەنگ زیاتر دەبوو. کیژەی کارەکەر خۆ بەخشانە هاتە دەست و وتی:

- من دەڕۆم و بانگی راحیلی مامان دەکەم!

تۆپێکی رووسەکان کەوتە سەر زەوی، ئیستیر بە جۆرێك قیژاندی هاوتای دەنگی تەقینەوەی گولله تۆپەکە بوو. نەمزانی ئاخۆ ئەمە هاواری ترسە یان هاواری ژانی منداڵبوونە. دەمارە توندەکانم وەك ژێی قیسارە لەرینەوە و بە شێوەیەکی بازنەیی بە دەوری ماڵەکە و بە دەوری سابلاخدا زرینگانەوە، ئینجا تەوەندەی نەبرد کپ بوونەوە.

- نا، قەشەنگ، لەم کاتەدات لە ماڵ دەرناچێت، ئەی نابینی مردن دەمی کردووەتەوە و لە هەموو گەڕەکێك خۆی مەڵاس داوە، تا خەڵکی بەرەو دنیای مردن ببات؟

ئیستیر بانگی هەڵدا:

- هەی زاڵم، هەی گاور، لە کارەکەرێك دەترسیت، بەڵام لە گیانی ژنەکەت ناترسیت!

ژێیەکانی قیسارەکەم دووبارە لەرینەوە. زانیم کە رووداوەکان بوون بە مشکێك و لە ناخمدا دەستی بە قرتاندن کردووە. زۆر پەشوکابووم، بەڵام هەرگیز ورەم بەرنەداوە.

- قەشەنگ مرۆڤە، جگە لەمەش تەو یەکێکە لە ئێمە و لای من جیاوازی روحی من و روحی تۆ و روحی قەشەنگ و یان روحی مامرەکانی نێو کۆلانەکان و روحی ئاژەڵەکانی نێو گەورەکە نییە.

ئەسمەر، گەر هەموو چرکەکانی ژیانم دوعات بۆ بکەم، هێشتا دڵم ئاو ناخواتەوە! دایکی منداڵانم سۆزی هەمیشەیی خۆی بەخشی و وتی:

- خۆشەویستم مەترسە! من خۆم منداڵەکەت لێ جیا دەکەمەوە، وەك دەمناسیت بۆت دەبم بە مامان و دایەن و سەرپەرشتیکار و دایك و خوشك و دەستەخوشکی بە وەفا.

لە یەك کاتدا دوو تەقە کران، تەقەیەك لە دەرەوە و لـە مـاڵی ئێمـەش تەقەیـەك. تەقەیەکی ئاگرین پێدەچوو بە چەکی رووسەکان بێت، ئەوی دیکە مرۆیـی و ئیـستیری راماڵی و هاواری کرد...، دوو تەقە و دوو هاوار!

گێڕانەوەی حەکایەتەکەی باوکی سەلمان خەیاڵی بردم و بیرم لە (تەقە و تەقە — ژان - ) کردەوە، یەکێکیان ژیان لە بوون داگیر دەکات و ئەوی دیکەیان ژیان بـەرەو پـێش دەبات و پێشکەشی ئەم بوونەی دەکات. ئەم دووە دژی یەکترن و زمان لێی بەرپرسیارە، ویستم لێی بپرسم: ئەرێ ئەو تەقە داگیرکـەرە چـۆن گـۆ دەکرێـت و ئـەم تەقـە (ژان) بەخشندەیە لە زمانی کوردی و ئارامی و ئازەربێجـانی و تـورکی و روسـی چـۆن گـۆ دەکرێت، بەڵام سەیرم کرد لە دەریای بیرەوەریدا نوقم بووە. بە جۆرێك وەك ئەوەی ئێـستا روویان دابێت، لەگەڵیاندا دەژیـا، بـەڵکو لـە مـاوەی سـاڵانی یـەکتر ناسـینمان بـۆم دەرکەوت کە ئەمە پاژێکە لەو و لەبوونی ئەو، لەگەڵیدا دەنوێت و وەئاگادێتەوە، بەرەو بەغدا و بۆمبای و رەماتکان هەر لەگەڵیدایە. کەوابوو پشتم بە خەملاندن و مەزەندەی خۆم بەست و وام دانا کە رەنگە تەقەی بکوژ هەموو ئەم ز مانانە وەك تەقەژنانە چـاك و بەخشندەکەی تر گوێ نەکەن. ژانی منداڵبوون. شەڕکەرەکان تەقەی مەرگ دەکـەن و ئیستیر بە دەم ژانی منداڵبوونەوە ئازار دەکێشێت و هاوار دەکات، ئەسمـەریش هـەموو مرۆڤبوونی خۆی رەها دەکات و رادەپەڕێت تا ئاو گەرم بکات و خۆی بـۆ منـداڵبوونی هەوێکەی خۆی ئامادە بکات. باوکی سەلمان جڵەو بـۆ بیرەوەرییـەکانی شـۆڕ دەکـات و لەناو سەری خۆیدا رەهایان دەکات، سەرباری لۆچـیی پیریـی و کارەسـاتەکانی ژیـان، زەردەخەنە هێمن و سەنگینەکەی هەر ماوە. تۆش ئەی رۆژگار بە سیمای تـرش و تێـك نراوتەوە بێدەنگیت و توانای قسە کردن نییە. کاتەکەی ئێـستا کـاتی ئـەم پیاوەیـە - شایەتحاڵ — ی قارەمان، شلۆمۆ کوردەی باوکی سەلمان.

بەڵێ ئیستیر لەگەڵ هەر تەقەیەکدا هاواری دەکرد، لەگەڵ ژانەکەی خۆی و لەگـەڵ تەقەکانی شەڕکەرەکاندا هاواری دەکرد. تەقە و تەقەی ژانی دایك، تەقـەی تـرس، لـە هەر دوو بارەکەدا دەترسا، لە هەر دوو تەقەکە لـە خـۆی دەترسـا. مـن دەمزانـی لـە کۆتاییدا منداڵی دەبێت، دەمزانی بیرکردنەوەی لە خۆی لەگـەڵ سـکیدا هەڵاوسـاوە و

خەریکە دەتەقێت، منداڵکارییەکەی و گێلییەکەی نەیان دەهێشت بەسەر خۆیدا زاڵ بێت. بیرکردنەوەی لە حەناس لووتی تێنەدەپەڕی، سەرەڕای مەترسی دەرەوە، ئەو لە داوا کردنی مامان و دایەن نەدەکەوت، بڕوای بە هەوێ بە سۆزەکەی نییە، کە بە دەستی خۆی بۆ ئەم ماڵەی هێناوە، تا بە خۆشەویستی نیشتەجێی بکات و ببێتە هاوبەشی خۆشی و ئارامی ژیانی خێزانەکەی، ئیستر بیر لە مەترسی چوونە دەرەوەی ئەم ماڵە ناکاتەوە، تەنانەت بیر لە ئەندامانی ئەم ماڵە و منداڵە تۆقیو و زمان لەگۆ چووەکانیشی ناکاتەوە، کە دەمو چاوی خۆیان لە ترسان داپۆشیوە و لێرە و لەوێ دەڕواننە نادیارێکی سەپێنراو، تەنانەت بیر لە ناحومیش ناکاتەوە کە پارچەیەکە لە جگەری خۆی و جگەری من و بە کوڵ دەگری، بیر لەو مەلۆتکەیە ناکاتەوە کە دەستی بە لێدانی دەرگاکانی منداڵدانی و ئەم گەردوونە کردووە و تاریکیی شوێنەکەی لێ تەنگ بووەتەوە و یاخی بووە، تا ئەوەتا بەرەو هەوای سەرزەمین تەکان دەدات...، لەم کاتی ئاگر و گۆگردبارینەدا...، بە ژانی تەقە کردنێک لە دەرگای دەدات و هەموو بوونێکی ئیستر دێنێتە لەرزە و دەیشڵەژێنێت، پەلە دەکات و شان بە شانی ئەم جیهانە شێت و هار دەبێت. لەگەڵ تەکانەکەیدا پێوەی دەلکێت و ئازارەکەی زیاد دەکات، لە هەموو لایەکییەوە و لەهەموو تەوەرێکەوە جیهان لە ئامێز دەگرێت. بەسەرسوڕمانەوە رووم کردە مەلۆتکەی بە پەلە بۆ ئەم جیهانە و پرسیم: "بۆچی بەتایبەتی ئێستا! بۆچی؟".

لەم شێتایەتییەی کە دڕندانە دەوری داوین، ئەسمەر تاقە بە ئاوەزەکەی سابلاخ و دەوروبەرێتی، گوشراوی نێو چنگی دڕندەی بێ مەژگ، نەپەشۆکاو نەترسا. ترس و پەشۆکاوی ئەو نوقم بوون بوو لەنێو ئەرکە مرۆڤێنییەکەیدا، خودی خۆی بریتی بوو لە یەك نوا خۆشەویستی و سۆز. ئایا بڕوام پێدەکەیت گەر پێت بێژم، من دوای ئەو هەموو ساڵەی کە لە ئەسمەر بێبەش بووم، ئێستاش لەسەرچاوەی ئەو کاریگەرییەی تێنەگەیشتم؟ کاریگەرییەك بە درێژایی ساڵانی پێکەوە ژیانمان بەردەوام هەستم پێدەکرد؟ ئەوە لە چ کانیاوێکەوە، لە کام تاڤگەوە هەڵدەقوڵا؟ لەو ساتە سەغڵەتییەدا کە شەڕانگیزی کەڵبەی دەرهێنابوو، هەروەك چۆن دەمناسی روحی خۆی بە ئاوی

سازگاری کەوسەر دەشت و خلّتو خاش و خەوشێکی تێدا نەدەهێشت، خلتوخاش بە ئەسەرەوە نەدەلکا، ئەمەشی بە سادەیی و زۆر لە خۆ نەکردنەوە دەکرد و پاکی و بێگەردی پتر دەبوو و بەرەو سەرووی خۆپەرستی لە هەموو شوێنێك هەر هەڵدەکشا. بیرکردنەوەکانم لەگەڵ دەنگە زولاڵەکە یەکانگیر بوو، وتی:

- دەی هەمووتان بچنە دەرەوە و بە تەنها جێمان بهێڵن!

بینیم. تەشتێکی بچکۆڵەی هەڵگرتبوو کە هەڵمی ئاوی گەرمی لێهەڵدەستا و بەر رووخسارە گەشەکەی دەکەوت و بەو کارەی دەی کرد خۆشنوود بوو، چونکە سەرقاڵی دەرهێنانی ژیانێك بوو لە تاریکی منداڵدانەوە بەرەو رووناکایی جیهان. لە دەرەوە چەند تەقەیەك بە دوای یەکدا کران و ئیستر بە بێزارییەوە هەر سوور بوو لەسەر:

- مامانەکە بێنن! هەوێکەم منداڵەکەم لێ جیا ناکاتەوە! هەی زۆردار، تۆ لەوە ناترسێت کە شتێك بەسەر من و کوڕەکەمدا بێنێت؟! ئەم ژنە دەمکوژێت، یان هەردووکمان پێکەوە دەکوژێت!

کاتێك ئەمەی پێڕاگەیاندم من لە دەرەوەی ژوورەکە بووم، هەروەکو ئێستا زەردەخەنەم هاتێ، وا ئێستا زەردەخەنەکە دەبینم کە لەناو ئاوێنە هەڵواسراوەکەی ئەو سەری ژوورەکە نەخش دەبێت، بەڵام ئەو رۆژە رێنەکەوت زەردەخەنەکەی خۆم ببینم، بەڵام تۆ دەزانیت هەمیشە لەسەر لێوەکانم نەخش دەبێت، تا زمان ئاتاجی قسەکردن نەبێت و لە هەمان کاتیشدا هەزار شت بویشێت. لە راستیدا ئەو کاتە من گاڵتەم بە شێتۆکەیی جیهان دەهات کە خەڵکی یەکتریان دەکوشت و بەرانبەر ئەوەش جنێوەکانی ژنەی کاڵفام سووکایەتی بوون بۆ من. تۆمەتە گێلانەکەی بە ئەسەری هەوێی خۆشەویست و دڵسۆز کە گوایە هەوڵی کوشتنی دەدات. ئای ئەمە چ تووڕەهاتییەکە؟!

دەرگای ژوورەکە لە هەر دوو هەوێکە پێوەدرا. لە ژوورەوە غەڵبە غەڵبی ئەسەر دێت، لە دەرێشەوە گرمەی شێتی دنیا بوو. غەڵبە غەڵبێك لێرە و بانگەلایەك لەوێ. لێرە من ناحومی بچکۆلە و خۆشەویستم لە باوەش کردووە و هەوڵ دەدەم لە گریانەکەی ژیری بکەمەوە. خۆم دەخەڵەتێنم، تا شێتایەتی جیهان ئارام نەبێتەوە ئەم منداڵەش ژیر

-ینتەوە، سەلمان و سەیون و مریەم ترسیان ناشکێت، ئیدی قەشەنگ با هەر ئەو حەکایەتە خۆشانەیان بۆ بکات کە لە دایك و باوکییەوە بیستوونی. ئێمە داوای شتی نەکردەنی دەکەین! ئاگامان لەوە نییە لە پشت دەرگاکەوە چی روو دەدات. هەمیشە ئەوە بێ ئاگابووین کە لە پشت ئەم بەربەستەوە رووی داوە، کەچی لەم چرکە ساتەدا بێ ئاگاییەکەمان رەهایە، تەنانەت منیش ئازارم بەدەست ئەم نەزانینە ملۆزمەوە چەشتووە، بەلام لە دوو شت دلنیا بووم، کە ئێستا دەرگای ژوورەکە بەسەر دو ژیاندا داخراوە، بە پەنای خودا دوای سەعاتێك یان دوو یان سێ سەعات لەسەر سێ ژیان دەکرێتەوە؛ ئەسمەر نەئیستێر دەکوژێت و نە کۆرپەکەی، خۆ ئەگەر مەزندە بە خەسار بووم و ئیستێر مرد، یان کۆرپەکەی ئیستێر بە مردوویی لە دایك بوو، کە بێگومان ئەوە نیازی ئەسمەر نییە، بێگومان ئەوە ویستی خودایە، لە خودا دەپاڕامەوە و گریانەکەی ناحوم گوێی کاس دەکردم، تا ئیستێر و منداڵە بەرێوە بووەکەی رزگار بکات و تۆمەتە ناڕەواکانی ئەو گێلە بۆ کالفامەکە خۆی بگێڕێتەوە و بەتالی بکاتەوە و بۆن و بەرامی خۆش و ئازایەتی و خانەدانی ئەسمەری هۆشمەند و (دایکی منداڵان) بلاو ببێتەوە.

ئەسمەر، دایکی کوڕان، تۆ نەختێك بێدەنگ دەبیت...، رادەمێنیت... بیرکردنەوەکانت دەکەونە نێو کونێکی تاریکەوە، لەوێ هیچ دەرفەتێك نییە. ئەو شەوە شەوی ترس و شتە دژیەك و سەیرەکان بوو. ئایا لە خۆت دەپرسیت هەر ئەو شەوە بوو کە بۆ یەکەم جار بۆم هات کە ناوی ئەسمەر بنێم "دایکی کوڕان" یان ئەو رۆژانەی کە بەرێوەن، بەم خۆشەویستییە ئاوسن، تەنانەت ئەگەر کوڕەکەیشی مەلۆتکەیەکی راستەقینەی رووخسار جوان بێت و لەبەر دلان بێت و لەناو جەرگەی ژیانەوە هەلقولا بێت، ئێ مادام ژیانمان کانییەکە و خۆشەویستی بۆندار و نەمریی لەبەر دەڕوات و چك ناکات؟ ئەوەتا تۆ جارێکی تر سلێ دەکەیتەوە و منیش بە نێو ئەو پرسیارانەدا گەشت دەکەم، کە لێتی دەکەم. هەندێك شت لە ناخافلی و بێ ئاگایی دروست دەبن و جێیان دەهێلین و روو لە شتی دیکە دەکەین. هەندێك شت مێژوویان نییە، چونکە لە مێژوویەکی دیاریکراودا

لە دایك نابن. ئەوانە شتهایەكن و هەن و نەمر دەبن، بەڵام میتۆدەكەیان بە نادیاری دەمێنێتەوە و دەچێتە پاڵ ئەو ئاڵۆزییەی كە شتەكانی دیكەی لیٚ شاردووینەتەوە.

ئەو شەوە شەوی ترس و شتە دژیەكەكان بوو. دەستی زەمانە بە تاوەژووی دەستی ئەو شتە ئاڵۆزانەی پەردە لەسەر شانۆی رووداوەكان هەڵدەماڵن. ئەوە تەنگ بە تەمەن هەڵدەچنێت و ئێمەش لە پێچەكانی رووداودا ون دەبین، ئینجا بە خێراییەكی سەرگێژكەر، یان بە هێواشییەكی قورس و بێزاركەر بەرەو پاشماوە نەبڕاوە و نادیارەكەی پێش خۆیان دەدات، ئەوانە رووداو گەلێكن مافی راوەستانمان پیٚ نادەن، تا هەنا سەیەك بدەین، هەر وەك چۆن ئێستا هەناسە دەدەین، وا دەگەڕێمەوە بۆ ئەویٚ، لە ژوورە دەرگا داخراوەكەوە گوێم لە وتەوتێكە، ئینجا بێدەنگییەكی وای بەدوادادێت هەموو ژاوە ژاوی دەرەوە تێدەپەڕێنێت، خودا بیركردنەوەو هەستم تژی دەكات، سوپاسی دەكەم، بەڵام من هاوكات بەداواكارییەكانم باری گران دەكەم، لەهۆی بێدەنگییە كتوپڕەكەی نێو ژوورەكەم پرسی، دەرگای ژوورەكە بەنیمچە جیڕەیەكی بێدەنگەوە وەڵامی دامەوە و كەوتە سەرپشت، رووخساری لەسەر خۆو بە خەندەی ئەسمەر لەبەر رووناكی فانۆسە نەوتییەكەی دەستی دەركەوت. شادمان بوو دەستبەجیٚ لە ژوورەوە گریانی مەلۆتكەیەك بەرز بووەوە. بەر لەوەی ئەسمەر بێتەگۆ زانیم بەشێك لە داواكارییەكانم خودا قەبوڵی كرووە. زۆر پەرۆش بووم بزانم حاڵی ئیستیر چۆنە، گوێم لەدەنگی ئەسمەر بوو بانگم دەكات:

- باوكی سەلمان، وەرە ژوورەوە، ئیستیر كچێكی بووە وەك مانگی تابانە.

بەردەكەی سەر دڵم لاچوو، ناحومم دایی و بەرەو ژوورەوە دوای كەوتم، ئیستیر ماندوو جوان دیار بوو، خەریك بوو شیر بداتە ئەو كچەی نەختێك لەمەوبەر هاتبووە دنیاوە. كچەكەی دوای ئەوەی ئەسمەر ناوكی بڕی بوو، شۆررابوو و قومات كرابوو. ناوك و پزدان و شتەكانی دیكەی پێچرابوونەوە و لەلایەكەوە دانرابوون، تا قەشەنگ لە دەرەوە فڕێیان بدات، تەنانەت سەرچەف و سەرین و جلوبەرگەكانی ئیستیر گۆڕرابوون. هەموو شتێك دڵی دەكردەوە و ئارامی و ئاسوودەیی دەبەخشی، بۆ ماوەیەك شێتایەتی

ـیای هەڵچووی دەرەوەم لەبیر کرد و هەروەکو ئێستا زەردەخەنەکـەم قـوڵتر کـرد. دوای ئەوەی بۆ سەلامەتی ئیستیر سوپاسی خودام کرد، پێم وت:

- مامـان لە ئەسمەر باشتر منداڵەکـەی لـێ جیـا نـا کردیتـەوە، ئەسـمـەر، هـەوێ خۆشەویستەکە، دەبا لە پاداشتی چاکەکانی ئەم کچەمان بەناوی ئەوەوە بنێین.

ئیستیر گۆی مەمکی لە دەمی کچەکە دەرهێنا و هاواری کرد و مانـدوویتی لـەبیر چووەوە:

- ئەرێ پیاوەکە، تۆ ئاگات لەخۆتە؟! ئایا دەزانیت چی دەڵێیت؟! کچەکەم بـەناوی هەوێکەمەوە ناوبنێم، ئەو هەوێیەی گەر توانیبای کـچەکە و منیـشی دەکوشـت؟ لـە ئێستاوە تۆو ئەویش یان ئەوانەی پێیـان خـۆش نییـە، بتانـەوێت، یـان نـا، کـچەکەم ناوی(ئیستیری بچووك)ە.

ئەمێستا هەموو دنیام لەبیرکرد، تەنها پارچە تۆپێك نەبێت کە کەوتە نێو کاسـەی سەرم و تیایدا تەقییەوە و پارچەکانی هزرمیان پەرتکرد، دەنگی بەسۆز و بـە بـەزەیی ئەسمەرم ژنەوت، کە ئیستیری هێور کردەوە:

- خۆشەویـستم، چـۆنت گەرەکـە ئاوهـای نـاوبنێ و ئـارام ببـەوە، چـونکە دوای منداڵبوون تووڕەیی بۆ خۆت و منداڵەکەش مەترسـی هەیـە. دەربـاری خۆشـم مـادام لەژیاندام، حەز ناکەم کەسێك بەناوی منەوە ناو بنرێت!

❊ ❊ ❊

لەو شەوەدا سەرباری تووڕەیی لەناکاو و ئاڵۆزبوونی دەمارەکـان، شـلۆمۆ کـەتانی کوردە گەڕایەوە و بۆ ساتێکی کورت هەستی بە حەسانەوە کرد، دواجار ئەوەنـدەی پـێ نەچوو هەمان قورسایی کەوتەوە سەرشانی، لەکۆتاییدا هەموو ماڵەکە خـەوتن تـەنها ئەو نەبێت، نەفرەت لە رۆژگارێـك کـە بـوار نـادات بنیـادەم تەنانـەت هەناسـەیەك هەڵبکێشێت! ویستی بیرکردنەوەکانی لەنێو ئەم ماڵەدا قەتیس بکات، لە رووداوەکـان رابمێنێت، ستایش بکات، لۆمەو گازاندە بکات، ئاهەنگ بۆ میوانە تازەکە بگێڕێت کە هاتبووە دنیاوە، بەڵام لە نێوان هەردوو بەرداشی دەستاڕەکەی جیهاندا دەهاڕرا، غەڵبـە غەڵب و پێکدادانەکانی دنیا هەموو ئارەزووەکانی خەفەکرد. بیرۆکەی خێرا چوون شفرە

ڕۆژەکان و مانگەکانی دەبڕی و بەناو بژوێنی ئایینـدەدا ڕۆ دەچـوو. بەسـەر هـەموو ویستەکاندا زاڵ بوو. ئەوساتە لە دەرەوە ئاژاوەکـە کـەمی کردبـوو، دەستڕێژی ڕەشـاش لەدوور دەبیستراو لەگەڵ ئەو دەستڕێژانە یەکانگیر دەبوو کە عەقڵی خۆی دەی تەقاندن.

لە پڕ دەنگدانەوەی هاوارێکی بـە کۆمـەڵی ترسـاوی ژنـەوت. گـوێی هەڵخست، نەخێر، دەنگدانەوەکە لەناوەوەی خۆی نایات. ئەمە سـێبەری جریـوە گـەلێکن، دەنـگ گەلێکن لە لوورە دەچن و سەرچاوەکەیان دیار نییە و بەدەم باوە دێن. ئاخۆ ئەو ترسەیە کە گۆشت و ئێسقانی داپۆشیوە و ئەو دەنگـە دەردەپـەڕێنێت؟! ئـەرێ بیـستنم وڕێنـە دەکات و گوێچکەکانم فریو دەدات و دەنگی شێتانەی سابلاخی بەستەزمان دەگەیەنێتە گوێم؟! نا... نا، ئەوەتا وڕێنەی بیستن بێدەنگ بوو و غایلە ترسناکەکانیش کپ بوونەوە.

با هەستم! لەسەر تەختێك لەو هەیوانەی کە دەڕوانێتە حەوشـە گەورەکـەی ماڵەکـە، دانیشت، باڵندە و ئاژەڵەکان نووستوون، مانگ چیاکانی ڕۆژئاوا قوتیـان داوە، لەگـەڵ ئەوەی جیهان شێت بووبوو، هەر هەموو پاڵکەوتن و چون یارانی ئەشکەوت نووستن!

با هەستم! هەستایە سەر پێیان و تەختەکە جیڕەی لێوەهات. وڕەی تەقەیەك دەنگـی دایـەوە و لـە گوێییەکانیـدا دووبـارە تارماییـە دەنـگ کەوتنـە سـەما. فانۆسـێك هەڵدەگرێت، دەرگای ژوورەکـەی ئەسمـەر و منداڵـەکان دەکاتـەوە، کۆترێکـە و خـۆی بەسەر بێچووەکانیدا داوە، لەلای ڕاستەوە تەختە خەوەکەی قەشەنگ خاڵییـە، ئەسمـەر داوای لێکرد کە لە ژوورەکەی ئیستێری زەیستان بێـت و ئاگـای لـێ بێـت. دەرگاکـەی پێوەداو ڕووی کردە ژووری زەیستانەکە. ئەمێستا حـەزی کـرد دەیقـەتێکی ڕووخـساری (ئیستێری بچووك) و هێشتا نەخەملیو بدات. بێ سوودە! لەسەر ئەم ناوە ڕادێـت هـەر وەك چۆن لەسەر ناوی ناحوم ڕاهات، کە بۆ ڕێز و گەورەیی حاخام ناحوم ئەو ناوەی لێنا. ئێستا هەموویان لەنێو چنگی مەرگی زەرد دان، ئەو لە هەموو مردنێك ڕزگاری بـووە و با جوون جوون لێیان ڕابمێنێت، سـابلاخ! ئـای بەسـتەزمان بـەر نـەفرەت کـەوتیت! سابلاخی بێوەی، وەك بەرخێك بێ ئەوەی گوناهێکی کردبێـت، سـزا دەدرێـت...، ئـاخۆ ئێستا کات بەکوێمانی گەیاندووە؟ ئەم ڕۆژە چـەند درێـژە؟! لەسـەر خۆبـە شارۆچـکە کلۆڵەکەت و دانیشتوانەکەی ڕۆژانی درێژتریان لەپێـشە بـەجۆرێ کـات سـەعاتێکی

دەبێتە ساڵێك. بێگومان سابلاخ تاوانبارە! ئاخر کێ بە بنیاتنەرەکانی وت کە ئەم شوێنە ستراتیژی و گرنگەی بۆ هەڵبژێرن؟! شوێنێك لەنێوان رووسیاو تورکیای ناکۆك و بەگژیەکدا هاتوو، هەروەها عێراقیش، ئەوانەی بەبێ ویستی خۆیان لە سوپای عوسمانیدا شەڕی رۆڵەکانی خۆیان دەکەن لەپای هیچدا دەمرن! بەڵام تۆ ئەی قاجاری، ئەی ئەو کەسەی وەك پێشوو نانت ناوی خۆت ناوە (شای شاهان)، لە کۆشکەکەتدا لە تاران بە ئارامی بنوو، لەخۆبایی بوون و کەللە پووتی بێلایەنی لە ئامێز بگرە، بێلایەنی! سەعات سێی بەیانییە و بەناوی بێلایەنییەوە خۆت و پایتەختەکەت لە لەزەتی ئارامی و ئاسوودەییدان و هاوولاتیانیشت لە سابلاخ کەوتوونەتە نێو مەترسی دۆزەخەوە. هۆ سابلاخ، تۆ خەتاباریت، چونکە لە چاوی شای قاجاریدا تۆ هیچ نییت و بەلای بێگانانەوە تۆ هەموو شتێکیت، ئەمێستا سەعات سێی بەیانییە، چۆن؟، هەموو ئەم کاتە تێپەڕیوە و نازانیت چی روویداوە؟ کەواتە بیرت چوو کە ماڵەکە لەم کاتە ناخافڵەدا شنەی ژیانێکی نوێ و بچکۆلەیەکی بێگوناهی بۆ زیاد بووە، کە لەوەی رووەدات بێ ئاگایە؟ کەواتە کاتی چوون بۆ کەنێس زۆری نەماوە. ئەرێ ئەوە من بەڕاستی گوێم لەروحی دەنگە ترساوەکانە، یان هەر غایلەیە؟ بەتوندی لە دەرگا درا، بیری بەلای زرمەی لێدانەکە راداشت. ئیدی بێ ئەوەی چاوەڕێی بکات و لەخۆی بپرسێت، لەم کاتی هۆش لەدەست چوونەی دنیادا کێ لە دەرگای ماڵەکەت دەدات، بەلەز بەرە و دەرگا چوو. بەپاڵ دەرگاکەوە وەستاو فانۆسەکەی بەرز کردەوە:

- ئەوە کێیە؟

بە زمانی رووسی وەڵامی دایەوە و فەرمانی پێدا، کە دەرگاکە بکاتەوە. کەواتە ئێوە بۆ سابلاخ گەڕاونەتەوە، بەڕاستی تورکەکان هەڵاتن؟!

ئەفسەرە رووسەکە کە بە کۆمەڵێك سەرباز دەورە درابوو، چەند بلاوکراوەیەکی بەدەستەوە بوو، بەزمانێکی فەرماندارانە وتی:

- شلۆمۆ کەتانی لەگەڵمان وەرە!

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

- بۆ کوێ؟

- ئێستا بەچاوی خۆت دەی بینیت!

- ئاخر بۆ کردنەوەی کەنێس هەر سەعاتێك یان زیاتری ماوە.

بە سەنگینییەوە وتی:

- کەواتە پەلە بکە، چونکە ئەرکێکی گرنگت لەپێشە.

دڵم بە پێشهاتێکی ناخۆش وەریای کردمەوە، پرسیم:

- ئەرکی چی؟!

دووبارەی کردەوە:

- تۆ جارێ پەلەکە، خۆت دەی بینیت!

لەو شەوە تاریك و وەك قیر رەشەدا دەڕۆین، رووسەکان و من...، ئەفسەرێك و سەربازەکانی و من بەچرایەکەوە لەنێو گالیسکەیەکدا کە دوو ئەسپ رای دەکێشن. گالیسکەوانە رووسەکە بە قامچی تاگر لەسەرپشتی دوو ئەسپەکە دەکاتەوە و دەبنە(با) و بەناو سابلاخی نووستووی بەئاگا و داگیرکاو و بێچارەو تیرۆرکراو و تۆقیودا تەکان دەدەن. شێتانە بەرەو گۆڕەپانی شارۆچکەکە دڕۆین. لەنێو بەریەککەوتن و گوللە و دەنگی تەقە هەردوو ئەسپەکە رادەچەنن و دەوەستن، وەك ئەوەی ئیدی بایەکە (ئەسپەکان) نەجمێت و لەشوێن خۆی بووەستێت و جۆڵانە بکات و چنگ لە زەوییە بەرد رێژەکە گیر بکات و نەجووڵێت.

گۆڕەپانەکە... ئەم گۆڕەپانە بووە بە مێردەزمە و وامنیش لە هەناوی مێردەزمەکەدام، تیشکێکی زۆر دڵی ئەم مێردەزمەیە رووناك دەکاتەوە و پرسیارێکی گیرخواردوو لە دڵم و لەسەر زمانم سەرەتاتکێ دەکات:

- ئەمە چییە؟

ئەفسەرە رووسەکە بە روونی وەڵام دەداتەوە:

- ئەمە پاداشی ئەو کەسانەیە، کە بەدار و تفەنگ راوەدوومان دەنێن و بۆ سەرکەوتنی دوژمن دەست لە پاشماوەی هێزەکانمان دەوەشێنن.

کاتێك دیقەتی لاشەکانم دا کە لە گۆڕەپانەکە کەوتبوون، کۆمەڵێك لاشەی زۆر، هەناسە لە سییەکانم مەیی و لێدانی دڵم بەرز بووەوە. وەك دەمناسیت، سەرباری دیمەنە

دڵ تەزێنەکە و قەتیسبوونی فرمێسك لە چاوانمدا، دڵم سووتاو سۆزم لە شنە ناسكتر بوو. من مرۆڤم هەموو خەسێتی مرۆڤێكی چاكەخوازم تێدایە. لە رووخساری كوژراوەكان رادەمێنم و لێدانی دڵ خێراتر دەبێت، بێ چەند و چوون هەموو سابلاخین، موسڵمانی برامن. ئەوە فازیل قاعودی هاوڕێی منداڵیمە و لەنێو كوژراوەكاندایە، پێكەوە بەسەر دار بەرِوودا هەڵدەزناین و كێبڕكێی هێزمان دەكرد، كە گەورە بووم زانیم هێز هی تفەنگ و تۆپە. ئەوە سەعید زاهیدی بازرگانی بەنێوبانگە و لەدوای سەفەرم بۆ مۆسكۆ هاوڕێی رێگام بوو. ئەمە...، ئەمە...، ئەوە... ئافرەت... و منداڵ، بیست... پەنجا... شەست، نزیكەی شەستیان لە دانیشتوانی سابلاخن... پیاو و ئافرەت و پیر و منداڵی سابلاخن!

- بۆچی؟! بۆچی؟!

شلۆمۆ كەتانی تووڕەبوو، مردنی بەچاوی خۆی دی، بەڵام عەسر نەزایە چاوی. بەتووڕەبوونەوە هاواریكرد:

- بۆچی ئەمەتان كرد؟!

ئەفسەرە رووسەكە پێكەنی:

- شلۆمۆ كوردە، تۆ باكی چیتە، ئەمانە موسڵمانن و تۆ یەهوودیت!

وەك ئەوەی نەوتی بەسەر تووڕەییەكەمدا كردبێت و بڵێسەی بەرە و ئاسمان بەرز بێتەوە، هاوارم كرد:

- ئەمانە براو خۆشەویستی منن، ئەمانە وەك من و تۆ مرۆڤن، ئێمە هەموومان مرۆڤین و سابلاخین.

لەباری نێرییەوە كە چەند رۆژێك لەمەوبەر بێ هێزی بوو، وتی:

- ئەوان دەستپێشخەر بوون، ئاگاداریشمان كردنەوە، كەچی ئەوان هەر كەوتنە راوەدوونانی كۆتایی سوپاكەمان و سەربازێكی زۆریان لێ كوشتین... ئاگادارمان كردنەوە، بێ ئەوەی ئاگادار بكرێتەوە هیچ پاساوێكی نامێنێت و ئەوەی دەست پێشخەر بێت زۆردارترە! دەبا ئەمەیان بۆ ببێتە پەند و ئامۆژگارییەك بۆ ئایندەیان!

تووڕەیی و ئازاری شلۆمۆ کەتانی زیاتر دەبێت، چاوانی بە بینینی مەرگ ئاویان تێدەزێت و دەڵێت:

- ئاخر لەبەرچی بەتایبەتی من دێنن و کەتنەکانی خۆتانم پێ پیشان دەدەن؟!

کەتنەکانتان! نوکتەیەکی لاواز و بوو بەکفنی ئەو مردووانەی وا لەسەر زەوی گۆڕەپانەکە پاڵکەوتوون و بە قاقای بێ شەرمانەی رووسەکان وەك جلێکی کۆنیان لێهاتووە. من کوردێکی سەرسەخت و بێ حەوسەڵەم، گەر تووڕەییەکەم بتەقێتەوە، ئەوا مادام خوداو هەقم لەگەڵدان، رووبەڕووی هەموو دنیا دەبمەوە!

بیرم لە ئەسمەر و زەیستانەکە کردەوە، بیرم لەسەلمان و سەیون و مریەم کردەوە. بارەکەم و ئەرکەکەم چەند قورسن! دەبا بە زیندوویی بمێنمەوە و هەوڵ بدەم ئەوەی بۆم رزگار دەکرێت رزگاری بکەم. ئەفسەرە رووسەکە دەربارەی جەنگ و ئەو تاوانانەی تێیدا دەکرێت کورتە وانەیەکی بۆ خوێندمەوە، ئیستیم لە خەیاڵدا بوو، لێ ئەوەی من لە جەنگەکەدا دەمبینی، ئەو نایبینی، لەکۆتاییدا وتی:

- جەنگ هەر جەنگە، بەڵام عوسمانییەکان بەبێ هۆ خەڵکی دەکوژن و هەربۆ چێژی بینینی لاشەکانیان خەڵکی سەر دەبڕن.

ئەی ئەوەی لە پێشمدایە چییە؟! ئایا ئەی ئەفسەری کەللە پووت دەتەوێت لە رێگەی هێزەوە باوەڕم پێ بێنیت، کە ئێوە بەرخ و کۆترن! ئا ئەوەتا هێشتا تاوانە گەورەکەتان لەبەردەمم دایە و زراوم دەبات؟ تۆش رەوایی بە جەنگە قێزەونەکەتان دەدەیت، تاوانێکی مرۆیی گەورە، لە کاتێکدا تارمایی مەرگ چاوانمی هەڵدەکۆڵی، پێم وت:

- بەم کارەتان ئەوەندەی تر بۆشایی نێوان خۆتان و دانیشتوانی سابلاختان فراونترکرد.

ئەفسەرە رووسەکە بە پێکەنینێکی قێزەونەوە وتی:

- کەواتە تۆ نازانیت ترسان لە مەرگ چی لە مرۆڤ دەکات.

سەرم بادا و بڵمە بڵمێکم کرد:

- تـۆش ئـەی گـەورەم نـەکوردان دەناسـیت و نـە شـارەزایی موسـڵمانانیت و نەدانیشتووانی ئەم شارۆچکە داگیرکراوە.
حەوسەڵەی نەماو هاواری کرد:
- تەمێ دەبن. ئەم وانە زیندووە فێریان دەکات ئیدی لەمەولا پـەلامارمان نـەدەن، بەڵام ئێوە ئەی جوولەکەی سابلاخ، ئەم لاشانە بەدەستی خۆتان دەشارنەوە.
لەوەتەی ئەم جەنگە دەستی پێکردووە، شتی سەیرو سـەمەرە دەبیـنم. واقـم ورِمـا، بەڵام بیانووم هێنایەوە و وتم:
- لێگەڕێ با کەسوکاری خۆیان بیان نێژن، گەورەم کۆستەکە مەکە بەدوو کۆسـت کەوتن!
بەجەختەوە نەڕاندی:
- ئەی جوولەکە، ئەوەندە چەندو چوونم لەگەڵـدا مەکـە! گەرەکـە سـزادانەکەمان تەواو جێی خۆی بگرێت، دەی ئێستا بۆ کەنیسە برۆ و ژمارەیەك لـە پیـاوانی بـەهێزی خۆتانمان بۆ پەیدا بکـە، بـا لـە خـاکێکی بێلایـەن و چـۆڵ، لـە دەرەوەی گۆڕسـتانی موسڵمانەکان دەست بەلێدانی گۆڕ بکەن، تا بەچاوی خۆیان بیبینن و تەمێ بن!
پێش ئەوەی برۆم ترمە ترمێکم کرد:
- دەیکـەم، بـەڵام مـن دووبـارەی دەکەمـەوە، ئێـوە بـەم کارەتـان دوژمنایـەتی موسڵمانەکانی سابلاختان پتر کرد، ئێوە ئیدی هەرچییەك بکەن، ئەوان هەر لایـەنگری عوسمانییەکان دەبن و دوژمنایەتی ئەو کەسە دەکەن، کە دژی موسڵمانەکان بێت!
نەڕاندی، لاشە بێ گوناه و ساردەوەبووەکانی بەردەمان نـەدەیان ژنـەوت و نـەدەیان بینی:
- چۆن فەرمانت پێدەدەم، ئاوها بکە مەسەلەی ملکەچ پێکردن بۆ ئێمە جێ بهێڵە و خۆمان چارەی دەکەین.
- کەواتە بەزاتی خودا سابلاخ و خەڵکەکەی تێداچوون.
- شلۆمۆ، هـەر ئێـستا بـرۆ و فەرمانـەکانم مووبـەموو جێبـەجێ بکـە. واز لـە رووداوەکان بێنە، با هەر وەك ئێمە چۆنمان دەوێت ئاوها بڕوات!

هەموو هەر دەیانەوێت، هەمووانیش بە ئاوەژووی ئەوی دیکە دەکات! جێم هێشت و لەبەرخۆوە ئەمەم دووبارە دەکردەوە (کەواتە سابلاخ و دانیشتوانەکەی تێدا چوون! ئەرێ بەزاتی خودا تێداچووین!).

گەیشتمە کەنیسەکە، چاوەکانم جگە لە مەرگی کەڵەکەبووی گۆڕەپانەکە هیچی دیکەیان نەدەبینی. دەرگاکەم کردەوە و چوومە نێو ماڵی خودا، تەنها هەر خۆم لەگەڵ خودا بووم. وەك کەسێك لێی پاڕامەوە کە داوای بەزەیی بکات، تا سەعاتێك دوای دەرکەوتنی سپێدە نوێژکەران نایەن ئاخۆ ئەم سەعاتە خەڵوەتە لەگەڵ خوادا بۆ لابردنی تەنگژەی شارۆچکەکەمان بەش دەکات؟! بەم وشەیە پێکەنیم... ئاخر تەنگژە سەردەمێکی بەسەردا تێپەڕیوە و هەر وەك خۆیەتی و بە خانوویەکی بێ پەرژین دەچێت. سابلاخ داخی گرانم بۆتۆ...، سووکایەتی بەخۆت و خەڵکەکەت کرا...، ئا ئەوەتان بەبێ گیان لە گۆڕەپانەکەدا پاڵکەوتوون! هەموو ئەو شتانەی لە دەورووبەرمدان وام لێدەکەن لە فریشتە بەرزەکانەوە نزیك بم. بە خەمێکی تێکەڵ بە ئومێدی باوەڕدارێك رووم کردە پەیکەرەکەو کردمەوە. ئەمڕۆ رۆژی پێنج شەممەیە و دانەکانی کتێبی تەورات بەسەر جوولەکەکانی سابلاخدا بڵاو دەکرێتەوە. وەك ئەفسەرە رووسەکە وتی ئەرکێکی قورسم لەپێشە. لە خودا پاڕامەوە کارەکەم ئاسان بکات و مەزەندەکەم نەیەتە دی و سابلاخ و ئەوەی تێیدایە بپارێزێت...، سابلاخ بەزیندوێتی بمێنێتەوە و نەفرەتیش بتوێت...، قەت ئەوەندەی ئێستا بەخوداو شارۆچکەکەمەوە جۆشم نەخواردبوو، بەڵام شتێك لە ناخمدا گاڵتەی بە ئومێدەکانم دەهات. مرۆڤ چەند بەخێرایی ئاوەزی لەدەست دەدات، چەند قورسیشە ئاوەزی یارمەتی دەری بێت!

نا، من پێغەمبەر نییم، من نادیار ناخوێنمەوە، من لەوە بچووکترم کە بەریژدانی خودادا رۆبچم، بەڵام ئەوەندەش گێل و کاڵفام نییم، ئەوەی لە دەورووبەرم روودەدات ئەوە دەگەیەنن کە چ رووداو گەلێك بەرێوەن.

رووداوەکان لەسەر شانی من دەسووڕێنەوە، بەسەر شانی تۆوە ئەی شلۆمۆ کوردە، ئەی باوکی سەلمان، ئایا خۆ ئامادەکردنەکەت بایی ئەو رووداوانە دەکات کە بەرێوەن؟!

سـالآنی برسـێتی و قـاتوقڕی دەسـتیان پێکـرد، ئـەوەتا ماوەیەکـە رووبـەڕووی بووینەتەوە، ئەوەتا ئەم ساڵانە دەستیان پێکـرد، کەچـی زۆر کەسـی شارۆچـکەکەمان هێشتا پێی نازانن!

* * *

ئەو دەمەی جارچی رووسەکان بەنێو کوچـەو کۆڵانـەکانی شارۆچـکەکەدا دەگـەڕاو بانگی هەڵدەدا، باوکی سەلمان لە هەموو شوێنێکی شارۆچـکەکە نـەبوو، جارچـییەك داوای لە موسڵمانەکان دەکرد تا هەستن و بۆ گۆڕەپانەکە بێن. من خـۆم لـەوێ بـووم، منی رۆژگـاری رووداو دیتـە، شـایەتحاڵی هەمووشـتەکان. راسـتە مـن بـەردەوام لـە کەلێنەکانی رابردوودا کەوتووم، بەلآم بیرەوەریـم مـاوە، نـە دەسـڕێتەوە و نـە ژەنگـی رۆژەکانی لێدەدا. بیری من وەك بیری خەلکی نییە، ویژدانیشم وەك ویژدانی مرۆڤایـەتی نییە، من بەراستگۆیی یادیان دەکەمەوە، بە ئەنقەست درۆ هەڵنابەستم، بە هەڵە، یان بەهۆی بیرچوونەوەوە، درۆ ناکەم.

بلآوکـراوەی رووسـەکان نـەماوە و جارچـییەکەش لەگەڵیـدا مـرد، بـەلآم هـەرواز ناهێنێت و لەنێو قەپێلکی سەرمدا وەك تەقینـەوەکانی جەنگەکـە دەنـگ دەداتـەوە و هێـشتا هـەموو رۆژێـك و لەهـەموو شـوێنێك دەتەقێتـەوە. جارچـییە رووسـەکە بـە رێگاوبانەکانی سابلآخدا دەگەڕاو بانگی دەکرد (هۆو موسڵمانەکانی ئەم شارۆچـکەیە، هەر ئێستا هەستن دەست لە هـەموو شـتێك هـەڵبگرن و بەکۆمـەڵ بـەرەو گۆڕەپانـە گەورەکە وەرن، تا بەچاوی خۆتان ئاکامی نەفامی و پـەلامارەکانتان بـۆ سـەر سـوپای رووسیای مەزن ببینن. هەر ئێستا لە گۆڕەپانەکە کۆ ببنەوە، ئەوەی ئامـادە دەبێـت بـا ئەو کەسانە ئاگادار بکاتەوە کە ئامادە نابن. لاشەی کوژراوەکانتان کۆمەڵکراون و لـە گۆڕەپانەکە چاوەڕێتان دەکەن. وەرن، تا ئاکامی دەستدرێژیتان بۆ سـەر ئـاخرو ئـۆخری سوپاکەمان لەکاتی دوا کشانەوەیدا، ببینن. هەرچەندە ئێمە ئاگاداریـشمان کردنـەوە، وەرن چاوتان بەکلی بینینی مردووەکانتان برێژن. نەکەن دەستیان بۆ ببەن، چونکە ئێمە فەرمانمان بە جوولەکەی شارۆچکەکەتان کرووە، تا بیان نێـژن، ئـەوان بـەزۆریش بێـت فەرمانەکانمان جێبەجێ دەکەن، جا ئیتر ئێوە پێتان خۆش بێت، یان نا، ئـەوە جێبـەجێ

دەکرێت، با هەموو ئەمانەش ببنە باشترین پەند بۆ لەمەولاتان. ئەوەش بزانن هەرکەسێ دەستدرێژی بکاتە سەر سوپای ئیمپراتۆر نیکۆلای پیرۆز، لەناو دەبرێت. ئیدی ئەوەی ئاگادار بکرێتەوە پاساوی نامێنێت. دەی پێش ئەوەی مردووەکانتان لەژێر گڵی هەتا هەتایی داپۆشرێن، بەرەو گۆڕەپانەکە پەلە بکەن.. پەلە بکەن!).

جاڕ چییەکە بڵاوکراوەکەی بە زمانی رووسی و کوردی و جەبیلی و ئارامی و ئازەری خوێندەوە، دووبارەو دەیان بارە خوێندییەوەو بەنێو سابڵاخدا لەم سەر بۆ ئەو سەر گەڕاو خوێندییەوە. پێش ئەوەی خەو پێڵووەکانی چاوی بەیانی بەربدات، گۆڕەپانە گەورەکەی سابڵاخ لە موسڵمانەکان جمەی دەهات. هەوای شارۆچکەکە بە هاوارو ئێشەوە لە باکوور و باشورو رۆژهەڵات و رۆژئاوا خنکاو بەرەو دوو تەختی دەسەڵات بەرز دەبووەوە، تەختی خوداو تەختی دەسەڵاتی شا، کەچی هەردووکیان چاویان لە حەناسی موسڵمانەکانی سابڵاخ کەلاخست و گوێیان پێ نەدان. دەنگی کڕووزانەوەی خەمباران و کۆست و کەوتووان گەیشتە نێو خەڵکێکی کەمی سوپای عوسمانلی هەڵاتوو و ئەڵمانە هاوپەیمانەکانیان. سەرکردەکانیان هەڕەشەی ئاگرینیان دەکرد و بەڵێنی تێکشکاندنی سوپای رووسەکانیان دەدا. جەماوەری موسڵمانی سابڵاخ هەوڵیان دا گەمارۆی سەربازە رووسەکان بشکێنن، تا بگەنە کوژراوەکانیان، بەڵام نووکی قەمەی رووسەکان لە بەردەمیان رێگر بوو. هەر لەو کاتەدا ژمارەیەك لە جولەکە کوردە بەهێزەکانی سابڵاخ بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سوپای رووس لە دەرەوەی شار خەریکی هەڵکەندنی سەدو ئەوەندە گۆڕ بوون. بەلای موسڵمانەکانی سابڵاخەوە کارەساتی کۆمەڵکوژییەکە بەچاو سووکایەتییە گەورەکەی رووسەکان بچووك بووەوە، بەوەی کە جوولەکەی شارۆچکەکە شەهیدەکانی موسڵمانان دەنێژن، ئەمەش بەبێ خوێندنی قورئان بۆ گیانی ئەوانەی کە شەهید بوون و بەهەشتیان دەستکەوتووە، هەروەها بەبێ شۆردن و کفنکردن و خوێندنی فاتیحا لەسەریان، سەرباری هەموو ئەمانەش ناشتنیان لە دەرەوەی گۆڕستانی موسڵمانان لە سابڵاخ! هەر وەك چۆن شلۆمۆ باوکی سەلمان پێشبینی کردبوو، ئەم تاوانەی مۆسکۆڤ بەرانبەر موسڵمانەکانی سابڵاخ کەلەبەرێکی دوژمنایەتی قووڵی لەنێوان هەردوولا دروستکرد و بەدرێژایی ساڵانی جەنگە

سـالآنی برسـێتی و قـاتوقڕی دەسـتیان پێکـرد، ئـەوەتا ماوەیەکـە رووبـەڕووی بووینەتەوە، ئەوەتا ئەم ساڵانە دەستیان پێکـرد، کەچـی زۆر کەسـی شارۆچـکەکەمان هێشتا پێی نازانن!

✲ ✲ ✲

ئەو دەمەی جارچی رووسەکان بەنێو کوچـەو کۆڵانـەکانی شارۆچـکەکەدا دەگـەڕاو بانگی هەڵدەدا، باوکی سەلمان لە هەموو شوێنێکی شارۆچـکەکە نـەبوو، جارچـییەك داوای لە موسڵمانەکان دەکرد تا هەستن و بۆ گۆڕەپانەکە بێن. من خـۆم لـەوێ بـووم، منی رۆژگـاری رووداو دیتـە، شـایەتحاڵی هەمووشـتەکان. راسـتە مـن بـەردەوام لـە کەلێنەکانی رابردوودا کەوتووم، بەڵام بیرەوەریـم مـاوە، نـە دەسـڕێتەوە و نـە ژەنگـی رۆژەکانی لێدەدا. بیری من وەك بیری خەڵکی نییە، ویژدانیشم وەك ویژدانی مرۆڤایـەتی نییە، من بەراستگۆیی یادیان دەکەمەوە، بە ئەنقەست درۆ هەڵنابەستم، بە هەڵە، یان بەهۆی بیرچوونەوەوە، درۆ ناکەم.

بڵاوکـراوەی رووسـەکان نـەماوە و جارچـییەکەش لەگەڵیـدا مـرد، بـەڵام هـەرواز ناهێنێت و لەنێو قەپێلکی سەرمدا وەك تەقینـەوەکانی جەنگەکـە دەنـگ دەداتـەوە و هێـشتا هـەموو رۆژێـك و لەهـەموو شـوێنێك دەتەقێتـەوە. جارچـییە رووسـەکە بـە رێگاوبانەکانی سابلاخدا دەگەڕاو بانگی دەکرد (هۆو موسڵمانەکانی ئەم شارۆچـکەیە، هەر ئێستا هەستن دەست لە هـەموو شـتێك هـەڵبگرن و بەکۆمـەڵ بـەرەو گۆڕەپانـە گەورەکە وەرن، تا بەچاوی خۆتان ئاکامی نەفامی و پـەلامارەکانتان بـۆ سـەر سـوپای رووسیای مەزن ببینن. هەر ئێستا لە گۆڕەپانەکە کۆ ببنەوە، ئەوەی ئامـادە دەبێـت بـا ئەو کەسانە ئاگادار بکاتەوە کە ئامادە نابن. لاشەی کوژراوەکانتان کۆمەڵکراون و لـە گۆڕەپانەکە چاوەڕێتان دەکەن. وەرن، تا ئاکامی دەستدرێژیتان بۆ سـەر ئـاخرو ئـۆخری سوپاکەمان لەکاتی دوا کشانەوەیدا، ببینن. هەرچەندە ئێمە ئاگاداریـشمان کردنـەوە، وەرن چاوتان بەکلی بینینی مردووەکانتان بڕێژن. نەکەن دەستیان بۆ ببەن، چونکە ئێمە فەرمانمان بە جوولەکەی شارۆچکەکەتان کروە، تا بیان نێـژن، ئـەوان بـەزۆریش بێـت فەرمانەکانمان جێبەجێ دەکەن، جا ئیتر ئێوە پێتان خۆش بێت، یان نا، ئـەوە جێبـەجێ

دەکرێت، با هەموو ئەمانەش ببنە باشترین پەند بۆ لەمەولاتان. ئەوەش بزانن هەرکەسێ دەستدرێژی بکاتە سەر سوپای ئیمپراتۆر نیکۆلای پیرۆز، لەناو دەبرێت. ئیدی ئەوەی ئاگادار بکرێتەوە پاساوی نامێنێت. دەی پێش ئەوەی مردووەکانتان لەژێر گڵی هەتا هەتایی داپۆشرێن، بەرەو گۆڕەپانەکە پەلە بکەن.. پەلە بکەن!).

جارِ چییەکە بڵاوکراوەکەی بە زمانی رووسی و کوردی و جەبیلی و ئارامی و ئازەری خوێندەوە، دووبارەو دەیان بارە خوێندییەوەو بەنێو سابڵاخدا لەم سەر بۆ ئەو سەر گەڕاو خوێندییەوە. پێش ئەوەی خەو پێڵووەکانی چاوی بەیانی بەربدات، گۆڕەپانە گەورەکەی سابڵاخ لە موسڵمانەکان جمەی دەهات. هەوای شارۆچکەکە بە هاوارو ئێشەوە لە باکوور و باشورو رۆژهەڵات و رۆژئاوا خنکاو بەرەو دوو تەختی دەسەڵات بەرز دەبووەوە، تەختی خوداو تەختی دەسەڵاتی شا، کەچی هەردووکیان چاویان لە حەناس موسڵمانەکانی سابڵاخ کەلاخست و گوێیان پێ نەدان. دەنگی کڕووزانەوەی خەمباران و کۆست و کەوتووان گەیشتە نێو خەڵکێکی کەمی سوپای عوسمانلی هەڵاتوو و ئەڵمانە هاوپەیمانەکانیان. سەرکردەکانیان هەڕەشەی ئاگرینیان دەکرد و بەڵێنی تێکشکاندنی سوپای رووسەکانیان دەدا. جەماوەری موسڵمانی سابڵاخ هەوڵیان دا گەمارۆی سەربازە رووسەکان بشکێنن، تا بگەنە کوژراوەکانیان، بەڵام نووکی قەمەی رووسەکان لە بەردەمیان رێگر بوو. هەر لەو کاتەدا ژمارەیەك لە جولەکە کوردە بەهێزەکانی سابڵاخ بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سوپای رووس لە دەرەوەی شار خەریکی هەڵکەندنی سەدو ئەوەندە گۆڕ بوون. بەلای موسڵمانەکانی سابڵاخەوە کارەساتی کۆمەڵکوژییەکە بەچاو سوکایەتییە گەورەکەی رووسەکان بچووك بووەوە، بەوەی کە جوولەکەی شارۆچکەکە شەهیدەکانی موسڵمانان دەنێژن، ئەمەش بەبێ خوێندنی قورئان بۆ گیانی ئەوانەی کە شەهید بوون و بەهەشتیان دەستکەوتووە، هەروەها بەبێ شۆردن و کفنکردن و خوێندنی فاتیحا لەسەریان، سەرباری هەموو ئەمانەش ناشتنیان لە دەرەوەی گۆڕستانی موسڵمانان لە سابڵاخ! هەر وەك چۆن شلۆمۆ باوکی سەلمان پێشبینی کردبوو، ئەم تاوانەی مۆسکۆڤ بەرانبەر موسڵمانەکانی سابڵاخ کەلەبەرێکی دوژمنایەتی قووڵی لەنێوان هەردوولا دروستکرد و بەدرێژایی ساڵانی جەنگە

ناخافڵەکە پڕ نەبووەوەو لەدڵی موسڵمانەکانیشدا رق و کینەیەکی ئەوتۆی چاند تا نەوەکانی جەنگی یەکەمیش بڕانەوە هەر ئەو رقە مابوو، تەنانەت تا ناوی سابلاخ گۆڕاو بوو بە(مهاباد)، کوڕەکانیان و نەوەکانیشیان رووداوەکەیان بە کەسەرەوە دەگێڕایەوە و رقی باوو باپیرانیان گەیشتبووە ئەمانیش و یادەکە لەمانیشدا سەری هەڵدا بووەوەو هەناسەیان هەڵدەکێشا و ئەو یادە تاڵەیان دەردەبڕی، بەڵام زۆرجار ئەمە بێ سوودە.

لایەنگران و هەوادارانی حەسەن چەخماخ جوون جوون بۆلای هاتن، هەریەکەیان ئەژدیهایەك بوو لەبری قسەکردن ئاگر لە زاریان پریشکی دەدات، کە هەناسەیان دەدا لەجیاتی هەوا دووکەڵ لە لووتیانەوە دەردەچوو... ئەرێ ئەمە کەی راستە؟! ئەم سوپا خوێڕێژە ئاوها برایەتی لەنێو مرۆڤایەتی دێنێتەدی؟ سوپایەك کە برا موسڵمانەکانی سەربڕی و وەك ئەوەی شەرابی کۆنەساڵ بخواتەوە، ئاوها خوێنەکەی فڕکردن و لاشە پاکەکانیانی رادەستی جوولەکەکان کرد؟ ئەم سوپایە کە ستەمکاری لەنێو دەبات و دادپەروەری دێنێتە دی و لەتێکڕای جیهاندا میتۆدەکانی مارکس و لینینی مەزن پیادە دەکات؟

ململانێی ناوخۆی رووسیا لەوپەڕی دایە و جەنگی جیهانیش نیوەی دنای گرتۆتەوە، ئەمەش سوپاکەیە کە جێی ئومێدەو کوشتاری موسڵمانان دەکات و شەڕی سوپای خەلیفەی خودا دەکات و جوولەکە بەسەر موسڵماناندا باڵادەست دەکات؟ئەی بیرتان چوو کە هەندێك لە سەرکردە سوشیالیستەکان، بەڵکو زۆربەیان جوولەکەن؟ ئیتر روسیا چۆن پشتی ئەم جوولەکانە ناگرێت؟ گەر ئەمە پێش سەرکەوتنی شۆڕشی گەل وابێت، ئەی ئەگەر بەڕاستی شۆڕشەکە سەربکەوێت، ئەم سەرکردە شیوعییە جوولەکانە دەبێ چی بکەن؟!

زۆربەی لایەنگرانی حەسەن چەخماخ بۆ ناڕەزایی دەربڕین لە تاوانەکانی رووسەکان، لێی تەکانەوە. حەسەن چەخماخ تەماشای دەوروبەری خۆی کرد، جگە لەچەند کەسێکی کەم لەلایەنگرانی خۆی پتری نەبینی، کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران. ترسێکی لێ نیشت، نەك لەبەر ئەوەی زۆربەی هەوادارانی لێی تەکاونەتەوە و چوونەتە پاڵ

دوژمنانی سوشیالیستی، بیرو باوەڕی پتەوی ئەو وەك چیاكانی كوردستان جێگیرە و باوبۆرانی ساڵان و ڕووداوەكان كاریان تێ نەكردووە، ئەم بیروباوەڕە جێگیرە لەوەوە هاتووە كە سۆشیالیستی هەنگاوێكی وای ناوە تا هەموو ڕووسیا بگرێتەوە، ئینجا بۆ هەموو شوێنێكی جیهان پەل بهاوێت، ئەمە ڕزگاركەری جیهان و مرۆڤایەتییە بەدرێژایی سەردەمەكان و نەوەكان لە هەموو خراپەكارییەكی مرۆڤ ڕزگاری دەكات، بەڵام ئەم بیرو باوەڕەی ئەو وا خەریكە لەخودی خۆی و بە بڕیاری خۆی لەناو ئاوەزیدا لەق دەبێت. ترس بەرەو هەورەكانی برد، ئینجا بەتوندی بەرەو زەوی غلۆری كردەوەو عەقڵی وردو خاشكرد. سەرسوڕمانی خود چرنوكێك بوو لەتوێژی گۆشتێكی خاو گیردەبوو، ماوەیەك ئاوها مایەوە، كاتێك چرنۆكی ئەم سەرسوڕمانەی لە كۆڵ بووەوە، هۆشی وەبەر هاتەوە. حەسەن چەخماخ بڕیاری دا كە شتەكەی یەك لا بكاتەوەو مەترسی بەلاوە بنێت و ڕووبەڕووی سەركردە ڕووسەكە ببێتەوە و دەربارەی ئەو ڕەفتارەی كە لەگەڵ موسڵمانەكانی سابڵاخدا كردوویەتی، ئاگاداری بكاتەوە و پێی بڵێت ئەو كەسە گەمژانە زۆرن كە بەخراپەكردن بەرانبەر كەسانی تر خۆیان ڕیسوا دەكەن، ئەوكەسانەش هەر زۆرن كە خۆیان و هاوڕێیانیان ئازار دەدەن و ئامانجە پیرۆزەكانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە!

بڕیاری دا چاوی بە سەركردە ڕووسە دەبەنگەكە بكەوێت، وتی: ڕاستە دانیشتوانی سابڵاخ كەللەیان مەژگی چۆلەكەی تێدایە و لەكاتی كشانەوەدا پەلاماری سوپای ڕووسەكانیان داوە، بەڵام وا سزای خۆیان وەرگرت و بەو پەلاماردانەیان سەلماندیان كە بۆرژوازین، بۆگەنن، چونكە شۆڕشی گەل بە خوێن نەبێت جیهان پاك ناكاتەوە، هەر بۆیە ئاڵا سوورەكەمان هەڵبژاردووە، چونكە بە خوێنی قوربانیدا نەشۆرراوەتەوە، بەڵام ئەم سەركردەیە عەقڵی كوللەی هەیە و لە ئاوەزی ئیسلام ناگات، باشتروایە دەستبەجێ لەوە ئاگاداری بكەمەوە. حەسەن چەخماخ بە لە خۆرازی بوون و تووڕەییەوە بۆ بنكەی سەركردەی ڕووسەكان لە كەنیسی سابڵاخ چوو. بە قیتی چووە ژوورەوە، بەڵام سەربازە چەكدارەكان ڕێیان لێگرت و باشبوو هەرنەیان كوشت، بەڵام نەی بردە سەرخۆی، ئاخر ئەوێك بیروباوەڕی ماركس و لینینی هەبێت و هەموو جیهان لەپێناویدا خەبات بكات،

چۆن دەیباتەسەر خۆی؟ تەماشای کرد سەرکردە رووسەکە لەگەڵ هەندێك لە ئەفسەرەانی خەریکی خواردنەوەیە. ئەم دیمەنە ئاڵۆزی کرد، کەچی سەرکردە رووسەکە کە رووتەڵەیەکی گاوری دی وا لەنێو بنکەکەدا (کەنێس) بەبێ مۆڵەت وەرگرتن وەستاوە، بەتوندی راپەڕی، ئەرێ ئەمە مشکە یان مرۆڤ؟ یان مێروولەیەکە و نەکەوتووەتە بەرچاوی پاسەوانەکان؟

بەواق ورمانەوە بە رۆژگارم وت (نەمدەزانی لە گاڵتەکردندا تۆ خاوەنی ئەم هەموو توانایەیت!)

رۆژگار وتی: (گاڵتەو پەرۆشی، پێکەنین و گریان، شادی و خەم، ئەو هەموو سەیرو سەمەرەیەی کە دنیاکەی تۆ لەخۆی گرتووە، سەرەڕای ئەوەی دژبەیەکن، دوژمنی یەکترن، ئەی ئەوە نییە هەندێك کارەسات جێگای پێکەنینە، ئەمەش یەکێکە لە گەمژەییەکانی جیهان و لەبری تێکەڵبوون جێگای گاڵتەجاڕییە؟!

ئەمەی وت و لەسەر گێڕانەوەکەی بەردەوام بوو.

سەرکردە رووسەکە بەتووڕەییەوە بانگی کرد:

- چۆن هێشتتان ئەم مێرووە بێتە ژوورەوە؟

حەسەن چەخماخ بە ناقایلییەوە وتی:

- گەورەم، من مێروو نییم، ئەی هاوڕێ من لایەنگرو هەواداری تۆم!

شەرابەکە سەری رووسەکەی گەرم کردبوو، بە پێکەنینێکی گەمژانەوە کەوتە خۆ هەژاندن:

- هەی کوللە، جیام دەکەیتەوەو دەم کەیت بە هاوڕێی خۆت؟! ئایا تۆ لە خزمەتی ئیمپراتۆرێتییە مەزنەکەماندا سیخوڕی دەکەیت؟!

چەخماخ بە پەلە وتی:

- من لایەنگری ئەوانەم کە رووسیا لە ستەمکاری رزگار دەکەن و دادپەروەری لە جیهاندا بەرقەرار دەکەن، ئێوەش بە کوشتنی موسڵمانەکان لایەنگرو هەوادارن لەخۆتان دوور دەخەنەوە.

شەرابەکە کاریگەری لەسەر سەرکردە رووسەکە نەما، گەشی رووخساری گۆڕاو بوو بە خۆڵ بارانێکی تاریك. بە دەنگێك لە دەرەوەی رووحە وشکەڵاتووەکەی هاواری کرد:

- دەستبەجێ ئەم تاوانبارە بەند بکەن، چونکە هەر ئەوە بەس نییە کە موسڵمانە، بەڵکو بەراشکاوی و راستگۆییەوە دان بەوەدا دەنێت، کە ئەو یەکێکە لە دژی لایەنگرانی قەیسەر نیکۆلای رۆمانۆڤی سەروەرو مەزنمان!

حەسەن چەخماخ دەستبەجێ خۆی لەنێوان دوو دێوی زەبەللاحدا بینییەوە، وەك مەقاش هەردوو دەستیان لە قۆڵەکانی گیرکردو بەرەو دەرەوەی کەنیسەکە راپێچی دەکەن. ئاخۆ خەون دەبینێت؟! ئایا ئەم ساڵانەی دوایی لە خەیاڵێکی خۆشدا ژیاوەو وا ئێستا گەیشتۆتە راستی؟! ئایا بەسزای خەونێکی قەدەغەکراو دەمرێت؟! لەنێو پێچ و پەنای واق ورمان و باوەڕ نەکردن ون بوو. لە ناکاو دەنگێکی بەسۆز هێنایەوە شوێنی خۆی و وا پێی دەڵێت:

- ئەی هاوڕێی ئازیز، ئێمە بەهۆی ئەو بوێرییەتەوە سڵاوت لێ دەکەین!

بەدوو چاوی کراوە و پەرۆشەوە دەڕوانێتە زەبەللاحەکەی لای چەپی و لەپڕ ئەوەی لای راستی وا پێی دەڵێت:

- ئەی هاوڕێ، بەڵێنت پێدەدەین کە شۆڕشی گەل بەڕێوەیە و هیچ گومانی تێدا نییە! ئێمە هەموو چەپەڵێکی ستەمکاری وەك ئەم سەرکردەیەمان و گەورەکانی دیکەی لە بابەت بنەماڵەی رۆمانۆڤ کە گەمە بە روسیا و گەلانییەوە دەکەن و بەزۆرداری و داپلۆسین و گەندەڵی حوکمڕانی دەکەن، لەسەر زەوی دەیان سڕینەوە!

چاوەکانی هەڵگلۆفی و سەری راوەشان و بەخۆ هەژاندنەوە لەنێوان شێتبوون و بەهۆشیدا پرسی:

- کەواتە من راستم؟!

- لەسەر رەوتی خۆت برۆ و هەرچەند لە تواناتدا هەیە لایەنگران کۆبکەوە، لەسایەی یەکگرتن و قوربانیدانەوە کاتی سەرکەوتنی گەلان نزیکە.

سەربازە رووسەکەی تر وتی:

- ئێستا خۆت رزگار بکە و بیروباوەڕەی خۆت ئاشکرا مەکە، هێشتا زۆردارانی خاوەن دەسەلات فەرمانڕەوان!

لەوکاتەدا شتێکی زۆر بە خەیاڵی حەسەن چەخماخدا هاتن و چوون، بەلام سروشتی مانەوە سەلماندی کە لە هەموو شتێك بەهێزترە. حەسەن چەخماخ بڕوای نەدەکرد رزگاری بووە، بۆیە وەك با تێی تەقاند. کاتێك گەیشتە رۆخی ئاسوودەیی و دلنیابوو کە هێشتا لە ژیاندایە، بیری لەشتی دیکە کردەوە و هەناسەیەکی شادمانی هەلکێشا.

* * *

رۆژگار لەسەر گێڕانەوەکەی بەردەوام دەبێت، زەردەخەنە گاڵتە ئامێزەکەی باوکی سەلمانیشی لێ نیشتبوو.

بەزۆری شەڕانگێزی بەرانبەر بەهێز دەترسێت و وێك دێتەوە. وەلی حاجی زادە لەگەڵ هەموو پیاوەبەستراوانی لە تاوانباران و خوێڕی و خوێنڕێژەکان کۆبووەوە، هەموو دەسەلات و رواڵەتی ساموشکۆی بەکردەنی لەدەست دابوو. پیاوە بەستراوانی لەو کەسانە بوون دانیشتوانی سابلاخ سلی لێ دەکردنەوەو بەناوهێنانیان جەستە دەکەوتە لەرزین و وەك ئاژەلی بێوەی هەست بە مەترسی مەرگ بکات لە کون و حەشارگەکانیان خۆیان دەشاردەوە. لە کۆبوونەوەکەدا بیروڕایان لەسەر ئەوە گیرسایەوە کە ملکەچی خۆیان بۆ داگیرکەری رووس ئاشکرا بکەن، بەلام ترسی مورتەزای برای شەڕانگێزی بەرۆکی وەلی بەرنەدەدا. مورتەزا واز لە غایلەی دەسەلات ناهێنێت، گەر ئەو دەسەلاتە خەیاڵ پلاویش بێت، مورتەزا (رۆژی تەویلەکە)ی بیر ناچێت. ئەو رۆژەی کە باوکی سەلمان، شلۆمۆ کەتانی کوردە دەی گێڕایەوە بزە تایبەتەکە دووبارە لەسەر رووخساری دەنیشت.

وەلی کەتەو قەڵەو خراپەکارییەکەی تێکەلی ترس و تووڕەییەکەی ئارێتەی ترسنۆکەییە ئاشکراکەی بووبوو، وتی:

- رووسەکان دوژمنی موسڵمانانن، ئەوەتا لە سابلاخ تاوانی چ کوشتارێکیان کرد، بۆ تۆڵەسەندنەوە هەلێك هەر رێك دەکەوێت، بەلام برا گەوجەکەم لە هەلێك دەگەڕێت و لای رووسە دوژمنەکان پیلانێك دادەنێت و خەلکی بە فێلەکەیەوە سەرقاڵ دەبن و

ناوی دەکەوێتە سەر زاریان و گۆرانی پێدا هەڵدەڵێن و ڕۆژگاریش بەسروود وتنەوە پێشیان دەکەوێت، ئەوسا ڕۆژی تەویلەکە هەر لەبیر دەچێتەوە.

جەعفەر ئەکبەری خوێنرێژ بەجۆرێك پێکەنی، ورگی لەگەڵێدا کەوتە سەماو لیك بەدەمیدا هاتە خوارێ، وتی:

- ئەرێ ئەوە بەڕاستی باوەڕ بەم تووڕەهاتە دەکەیت؟ گەر سوپای عوسمانی موسڵمان لەسەری بەدەنگ نەیات، ئیدی چۆن سوپای گاوران کە موسڵمان دەکوژن و سەرمان دەبڕن و ئەتکمان دەکەن، لەسەری وەدەنگ دێن؟!

وەلێ حاجی زادە تەواو بڕوای نەهێنا، غایلەیەکی خراپەکاری ختووکەی ورگە زللەکەیان دەداو دەیان لەراندەوە، گەمەی بە سمێڵە قیتەکەی دەکردو سەمای پێدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا لەو ترسە قوتاری بوو. سەری مورتەزا حاجی زادە کەبەسەر لەشە گەورەکەیەوە قوت بووبووەوە، هێشتا گەردیلەیەك هۆشی تێدا مابوو و بیرۆکەی پیلان و تۆڵەکردنەوە تێکی نەشکاندبوو، ڕۆژی تەویلەکەش کە تا ئەمڕۆ لەبیری خەڵکەکە نەچووبووەوە برینێك بوو لە ئابڕوویدا هێشتا هەردەمی کرابووەوەو بەدرێژایی ڕۆژ خوێنی لێ دەتکا. ڕۆژو مانگ و ساڵ دەڕۆن ئەم هەر لە بیری تۆڵەکردنەوەیەکی شێتانەیە، بەڵام گەردیلە عەقڵەکەی بیرۆکەی پیلانی تێکشکاندو بەرانبەر ڕاستییەکی جێگیر ڕایگرت. هۆش و ئاوەزەکەی بە جەختەوە پێیان وت (لەم وڵاتەدا ڕووسەکان یارمەتی موسڵمانێك دژی موسڵمانێکی تر نادەن، خۆ ئەگەر ئەمەشیان کرد، ئەو دەمە خەڵکی سابلاخ چی پێدەڵێن؟!) دەڵێن مورتەزا دژی براکەی خۆی داوای یارمەتی لە بکوژە گاورەکانمان کرد، ئاوهاش هەرەباشەکانیان دەچنە پاڵ خراپەکارەکانی وەلی و تۆش خۆت تووشی نەفرەتێك دەکەیت گەلێك لە نەفرەتی ڕۆژی تەویلەکە خراپتر.

مورتەزا حاجی زادە نەیدەتوانی وەك باوکی سەلمان نادیاری ئایندە بخوێنێتەوە، ئیدی ئارامی گرت و ئاوێکی ئارام کەرەوەی کردە سەر ئاگرە دایساوەکەی ناخی خۆیدا، بەجۆرێ کارێکی وایکرد ئەم ئاگرە بۆ ماوەیەك دامرکێتەوە. بۆ ئەوەی لایەنگیری دانیشتوانی سابلاخ وەدەست بێنێت، وەك ئەوان دژایەتی خۆی بۆ ڕووسەکان پیشان دەدا، هەر وەك ئەوان کە سەربازێکی ڕووسی دیبا، تفی ڕژدەکردە سەر زەوی.

پێشبینییەکانی باوکی سەلمان شلۆمۆ کەتانی هاتنە دی، دوژمنایەتییەکی قووڵ بۆشایی خستە نێوان موسڵمانەکانی سابلاخ و سەربازە رووسەکان، کە وەك شارەمێرووله. بەشارۆچکەکەدا بلاوبوونەوە.هەر سابلاخییەکی موسڵمان تووشی رووسێك ببوایە، تفی رۆ دەکرد و منداڵانی موسڵمانانیش بەردیان تێدەگرتن و هەڵدەهاتن. ئەم رەفتارە سەربازە(مسقوف)ە سەرخۆشەکانی تووڕە دەکرد، تەقەیان دەکرد، ئیدی گوللەکە هەندێکجار بەهەوادا دەرۆیشت و برێکجار بەر موسڵمانێك دەکەوت، چونکە ئەم گاور و بکوژانەی براکانی خۆی لە شارۆچکەکەیدا دەدی، ئیدی نەیدەتوانی رقی خۆی بشارێتەوە، ئینجا بە برینداری بۆ ماڵەکەی خۆی دەیان بردەوە، یان دەچووە پاڵ کاروانی شەهیدانی ئەو رۆژە شوومە.

بازنەیەکی بەتاڵە و لێك ناترازێت، بەڵکو بە تێپەڕبوونی رۆژەکان حەلقەکانی قایمتر دەبێت.

* * *

بەڕێی خۆتەوە دەڕۆیت و هزرت پەرت بووە، ناتەوێت بەزۆر زەردەخەنەی سەر لێوت بسڕیتەوە، کە شادمانی لێ تۆراوە، بەلام لەگەڵ ئەم شادمانییەدا هەر دەڕۆیت و دەڵێی بەرگە گرتنی ئەم دنیایە لە ئەستۆی تۆیە. ئاسمان ساماڵ و شینە، بەلام تۆ بە تەڵخی و هەورێکی رەشەوە دەی بینیت، مانگ پڕە، کەچی تۆ بە کزی و لە ئاخرو ئۆخریدا دەی بینیت، شنەبای فێنکی چیاکانی کوردستان دەت خنکێنێت. تۆ بە تەنهایت و کێ ئەم هەموو خەمەی شارۆچکەکە هەڵدەگرێت. هەر تۆ دەزانیت ئەوەی ئێستا بەسەر شارۆچکەکەدا دێت سەرەتای گەردەوەکەیە، هاوکار و خۆشەویستت میر عەلی شانبەشانی ئەم دنیایە رووی ترش و تاڵت تێدەکات، تەنانەت محەمەد و ئەحمەد و حەمید گەمە منداڵانەکەیان لەگەڵ سەلمان و سەیون و مریەم کەم بۆتەوە.

لەو بارەوە لێی دەپرسیت، ئەو پێت دەڵێت:

- لەم رووسە نەفرەت لێکراوانە بپرسە!

تۆ ناتەوێت بڕوا بکەیت، بەڵکو لەمە دوورتر دەڕۆیت و پێی دەڵێیت:

- باوکی محەمەد، تۆ بەهەڵەدا چوویت، کارەساتی سابڵاخ بۆ هەموو دانیشتوانەکەی وەك یەکە. هەموو سابڵاخییەك برای سابڵاخییە، کورد برای پشتی کوردە، بێگانە هەرگیز لێکمان ناکەن، تەنانەت دەکرێت وەلی و مەرتەزا حاجی زادەش دەست لەشەڕی یەکتر هەڵبگرن تا ئەم مێردەزمەیە لە کۆڵمان دەبێتەوەو هەموو بێگانەیەك شارۆچکەکەمان جێدەهێڵن!

میر عەلی ماوەیەکی زۆر بێدەنگ دەبێت، ئینجا دەڵێت:

- ئەوەی ئێستا مێشکی منی تێکداوە ئەوەیە بازرگانەکانی سابڵاخ و هی دیکەش لە شارەکانی ئێران و ئازەربایجان بازرگانیان لەگەڵدا دەکردن و ئێمەش یەکێك بووین لەوان، ئەم بازرگانانە زێڕی سافیان دەدانێت و پاشەڕۆیان لێ وەردەگرتن.

سەرباری خەمێکی متبوو، پێدەکەنیت و دەڵێیت:

- میر، ئەوەی تۆ پێی بژیت پاشەڕۆ، ئەوە ژیانی ئێمەیە!

تووڕە دەبێت و دەنگی بەرز دەکاتەوە:

- ڕاستە من و تۆ خۆراکمان لێ نەکڕیون، بەڵام زۆربەی بازرگانەکان جۆرەها خۆراکیان لە رووسیاوە هێنا، خواردنێك دەیخۆین و دەبێت بە پیسایی، واتا ئێمە زێڕی سافمان دانێ و گوومان لێ وەرگرتن!

بە هەموو تواناتەوە دەوان دەدەیت قایلی بکەیت و دەڵێیت:

- میر، ئێمە بەبێ خواردن ناتوانین بژین، باوکی محەمەد، ئەوەی تۆ ناوی گووی لێ دەنێیت سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت، ئاوها نییە وەك تۆ بیری لێدەکەیتەوە، ئەوەی ئێمەو بازرگانەکانی دیکەکڕیومانە، ژیان بووە، نەك گوو، ئەی میر!

میر عەلی لەم ڕاستییە خۆی گێل دەکات، ئەوەی لە سابڵاخ رووی داوە هیچ مرۆڤێك ئیدی هەرچییەك بێت ناکرێت پاکانە بکات و لەرووسەکان خۆش بێت. درێژەی پێدەدات:

- ئەوان ئێستا مەرگمان دەدەنێ. باوکی سەلمان، ئەی خۆت ئەمە نابینیت؟!

بەڵێ ساڵانی قات و قڕی و برسێتی بە ئاشکرا خۆیان دەرخست...، تا ئەوەتا لە ئێستاوە راتان دەماڵم! خەڵکیش لە سابڵاخ مژوولی ئەوەن کە روو دەدات، بۆ ئەو ساتە

دەژین کە تێیدان و سبەینێ و دووسبەیان بیر دەچێت، بەڵام من هەرگیز بیرم لە مردنی بەگوللە نەکردۆتەوە، هەندێك مردن هەیە لەم مردنە بێ زەوەرترە. مردنێك لە هەموو مردنەکان سامناکترە، مردنێکی ترسناك و بێ ڕەزا، بەڵام مادام هێشتا بە بەرییەوە ماوە، دەتوانین خۆمانی لێ بپارێزین...، ئەوە لە برسان مردنە!

بە پانییەك، کاتێك لە کەنیسە بەرەو ماڵ دەگەڕایتەوە، کات هێشتا بەیانییەکی زوو بوو تووشی ئافرەتێکی نەناس بوویت، جلێکی سپی وەك کفنی پۆشیبوو. باوکی سەلمان، ئەو ژنەت لە چاڵی یادەوەری خۆتدا حەشارداو هەوڵتدا لەبیری خۆت بیسرِیتەوە، کەچی دوای ئەوە هەموو سابلاخ باسی ئەو ژنە نەناسەیان دەکرد خەڵکی جارێك بە کچە جوان و جحێڵەکە ناویان دەبردو جارێك بە پیرێژنە سەرماش و برغجە ڕەزاگرانەکە. دەیان وت جلەکانی سپی سپییە، دەشیان وت نەخێر ڕەشە وەك خەڵوزە، هەموو لەسەر ئەوە کۆك بوون کە ئەو ژنە وەك چۆن تەواو بۆ تۆ دەرکەوت، ئەو لەناکاو دەردەکەوێت و لەناکاویش ون دەبێت، باوکی سەلمان لە بەرانبەری وەستایت، سەیرت پێهات بەم بەیانی زووە ژنێك لە ڕێگاوبانە بە مەرگ چێنراوەکانی سابلاخ ببینیت.

لێت پرسی:

- هێی ژنە یەهوودی، لێرە چی دەکەیت؟!

بۆچی وتت (یەهودی) ئەی بۆ نەت وت (موسڵمان)، یان (مەسیحی) یان تەنها (کچێ) یان (ژنێ)؟ بێگومان نازانیت کێیە، بەڵام ئەو پێکەنینێکی خۆش پێکەنی... خۆش، بەڵام ساردی و ڕچیوی مەرگی پێوە بوو و تەزووی بەلەشدا دەهێنا.

- من نە یەهودیم و نە ئیسلام و نە مەسیحی! من ئافرەتێکی (هەواڵدەر)م، هاتووم خەڵکی گرفتار و بەش مەینەت لە سابلاخ ئاگادار بکەمەوە!

بەستەڵەکی سابلاخ دڵی داپۆشیت. ئەی کوردەی لامل و توندو ئازا، نکوڵی ناکەیت داچڵەکیت. ئیدی دەستت بە خوێندی میزمار و نزاکرد، تا جنۆکە و درنج و هێزی خراپەکارت لێ دوور بکەوێتەوە، بەڵام ژنەکە ون نەبوو، هەر لە شوێن خۆی مایەوەو پێکەنینەکەی چون شەختە ناخی دەسمی. لەمیانی گەرداوی پێکەنینە توندو ڕچیوەکەیەوە وتی:

- شلۆمۆ، دوور مەڕۆ، من نە جنۆکەم و نە درنج، مـن لـە جنۆکـەو شـەیتانیش بەهێزترم، ئەی گوێت لێم نەبوو پێم وتیت من هەواڵدەرم. ئاگات لەخۆت بێت، بـارکی سەلمان خەڵکیش ئاگادار بکەوە!

لەبەرچاوت ون بوو. چاوەکانت هەڵگلۆفی، سەرت لەقاند، باسکەکانت بـە ئـازارەوە گوشی. ئەمە راست مێردەزمەبوو، راستییەك بوو هەولتدا لـەبیری بکـەیت و خەفـەی بکـەیت، چـونکە زۆر ترسـاندتی، رای چـڵەکاندیت، وای لێکردیـت لـە ترسـان هەڵبلەرزیت. شەرمت بەخۆهات، نەفس بەرزیت رووشا، بۆیە شتەکەت شـاردەوە، لـێ دانیشتووانی سابلاخ دەستیان بە باسکردنی ژنەکە کردبوو، کە بەشێوەی جیاجیا و بـە جلوبەرگی جیاوازەوە دەردەکەوێت و ئاگاداریان دەکاتـەوە و هەرەشـە دەکـات...، ئینجـا لەبەر چاوان ون دەبێت.

* * *

میرعەلی شەریك و هاوکارم پێی وتم:

- تۆ گەرەکتە هەموو خۆراکی دنیا قۆرخ بکـەیت؟ ئـاخر گەورەکـەت پڕبـووە لـە ئاژەڵ، کۆڵانەکانت بە پەلەوەر خنکاون، کۆگای خۆراك لە ماڵەکەتدا جێی هیچی تـری لێ نابێتەوە. ئەوەی هەتە بەلای کەمـەوە بەشـی شـەش مـانگی هـەموو دانیـشتوانی سابلاخ دەکات و بەشی خێزانەکەت و خزمەکانیشت بۆ چەند ساڵێك دەکات!

پێم وت:

- زیاترم گەرەکە، مادام هێشتا دەست خستنی خۆراك لە توانادایە، ئەی هاوکـاری ئازیزم وەك پێشتر ئاگادارم کردیتەوە، گەر گرانی داکەوت، پارە دادمان نادات، ناتوانین لەجیاتی خۆراك بیخۆین.

وەك ئەوەی بڕوای هێنابێت، بە زمانێکی بەخۆداچوونەوە لێی پرسیم:

- شلۆمۆ، وا رێگای بەرەو مۆسکۆو ئیسلامبول گیراوە، تۆ بە تەمای چی بکەیت؟

- تاران لە شەڕدا نییە! هێشتا دەرگای بازرگانی بۆ چوون و هاتنەوە کراوەیە.

کەمێك دامام و بیرۆکەیەکی روونم بۆهات:

- لە تاران بازاڕی دەکەم! بەڵێ لە تاران بازاڕی دەکەم!

کە (دایکی منداڵان) بینیمی وا خەریکم دوو ئەسپ لە گالیسکە گەورەکە دەبەستم، بەواق وڕمانەوە لێی پرسیم:

- باوکی سەلمان، لەم ڕۆژە پڕ مەترسیانە نیازی کوێت هەیە؟!

بەدەم توندکردنی بەستنەوەی دوو ئەسپەکەوە وتم:

- ئەسمەر بەرەو تاران!

بەترسەوە سینگی خۆی کوتاو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، بە ناقایلییەوە وتی:

- مردن لە ڕێگەوبانەکان دەسووڕێتەوە و تۆش خۆت ئامادەی سەفەر دەکەیت؟!

- هێشتا هەندێك ڕێگەی بەرەو تاران ئارامە...، ئەوەی مەترسییە دوو فەرسەخە، گەر لێی دەرباز ببم، ئەوا هەموو ئێران لەبەردەمم ئارام دەبێت.

- گەر خودا نەکات، لێی دەرباز نەبوویت؟!

بەبڕواوە وتم:

- ئەسمەر خودا لەگەڵمدایە، گەر بەسەلامەتی بەخۆراکەوە گەڕامەوە، ئەوا بەشی هەموو ئەم ماڵەو هەموو خزم و دۆست و ئەوانەی نایانەوێ لەکارەساتی برسێتی لە برسان مردن تێبگەن، دابین دەکەم.

بەپەشۆکاوی و هەڵلەرزین و گەرووی وشکەوە کە هەوڵی دەدا قایلم بکات و پاشگەز ببمەوە، وتی:

- ماڵەکەمان ئەوەندەی تێدایە، جێگەی خێروبەرەکەتی دیکەی تێدا نابێتەوە.

دووبارە بەجەختەوە وتم:

- ئەسمەر، خۆراکی زیاترم گەرکە، زیاترم گەرەکە، خۆ ئەگەر خودا ویستی دەبێت هەر بمرم، با بە ویژدانێکی ئاسوودەوە بمرم!

* * *

ئا ئەوە تارانە، هەروەك شارەزایم دەدەرەوشێتەوە، گوێی لە جەنگەو نای بینێت، ئاشتی لە ژیانی دەچۆڕێتەوە، ئاخر جگە لە شێتەکان کەسی تر شەڕ ناکات! بەسەلامەتی گەیشتمە تاران و ڕێگەی باشووری ڕۆژهەڵاتم گرتەبەر. سێ ڕۆژ بەڕێگەوە بووم، بەچاودێری خوداو نزاکانی ئەسمەر کە لەوشکایی ڕووحییەوە هەڵدەقوڵێت

لەگەڵمدا بوون. منداڵەکان باوەشیان لێدام، سەلمان وەك هەموو جارێـك کـە زانـی بـۆ بازرگانی سەفەر دەکەم، هەوڵیدا لەگەڵمدا بێـت، هەمیـشە ئـەم کـوڕە بـاوکی تاسـا مەیلی بازرگانی هـەبوو، تـەوەتا ئێـستا وەك مـن بازرگانـەو لـە ئەمریکایـە. جـۆرە بەزەیییەکم لە رووخساری هەموویانـدا دی، تەنانـەت رووخـساری نـاحومی بـچکۆلە و زمان نەگرتووش لەو بەزەیی هاتنەوەیە قوتار نەبوو، بەڵکو ئیستیریش بـە نیگایـەکی لاڵەوە کە پەژارەو شتی دیکەی تێدابوو تێی روانیم، پێم وت:

- گەر ویستت هەردوو مـنداڵەکە ببەو بۆ ماڵە باوانت بڕۆ، لەوێ دوو یان سـێ ڕۆژ بمێنەوە.

بینیم گەشایەوە، بەڵام ئیستیری بچووك بە شیرخواردن گەشـابووەوە، ئەوەنـدە شـیری مژی بوو هەڵی هێنایەوە، دیار بوو حەسابووەوە، رەنگە تاقـە کەسـی ئـەم ماڵـە بێـت ئاگای لەوە نییە چی روودەدات و لای گرنگ نییـە بـاوکی دیـار نـەبێت، یـان لـەلای بمێنێتەوە، ئیستیری گەورەی دایکی رۆیشتنمی پێ خۆشترە لە هاتنـەوەم...، چـونکە بـۆ ماڵی باوکی دەچێتەوە، ئەو بەوە دەگەشـێتەوە، هـەروەك چـۆن کـچەکە بەشـیرخواردن دەگەشێتەوە، بەڵام تاران و هەموو ئەو شارانەی لە سنووری باکووری رۆژئاوا وە دوورن، وەك ئیستیری بچووك بەژیانی خۆیـان شـادمانن و گـوێ بـە کارەسـات و کەتنـەکانی جەنگەکە نادەن. ئەحمەد شا لەنێو جلە ئابڕوبەرو خۆ دەرخەرو بێ موبالاتەکەیەوە کەش و فش دەکات و گوێی لەوە نییە گەر هەموو دانیشتوانی ئازەربایجان و سابلاخ بمرن یان بەرەو دۆزەخ بڕۆن!، بەڵام هەڵوێستی بێلایـەنی بـەهۆی زیرەکـی و حیکمەتـەوە نییـە، بەڵکو بەهۆی فشاری دەرەکی یـان نـەمانی بەرژەوەنـدی و دۆسـتایەتی هەردوولاوەیـە. پرسیم (بۆچی دانیشتوانی سابلاخ دەست لە ماڵ و حاڵیان هەڵناگرن و هەڵبێن؟ ئەرێ بۆ تێکڕا بەرەو تاران رەوناکەن، تاخۆیان لە پایتەختی وڵاتەکەیان بپارێزن، ئەرێ ئەوسا چی روودەدات و کێ رەو دەکات؟!) وەڵامێکم دەست نەکەوت. ئەوەتا بۆ تاران هاتووم تا خۆراك بکڕم، نەك بەو نیازەی لە شوێنێك بگەڕێم داڵدەی خۆم و خێزانەکەم بدات. لـەو رۆژەدا هەرچەند زیـرەك بـووم، بـەڵام لەوپـەڕی سـاویلکەییدا بـووم، چـونکە وا بـیرم دەکردەوە، کە مرۆڤ لە ماڵێکدا لەدایك دەبێت، ئیتر دەبێـت تیاشـیدا بمرێـت، چـونکە

ولاّتی بنیادەم و گەڕەکەکەی و کۆڵانەکەی و ماڵەکەی چارەنووسی ئەون و بەدرێژایی ژیان پێوەی لکاوە، بەڵام لەمەولا تەوەی لە من رووپدا چەمك و بیرکردنەوەیەکی زۆری تێکشکاند و دەری خست کە هەندێك شت هەن بە خەیاڵ و هزردا نایەن. ئەو رۆژە ئەمانەم بە خەیاڵدا هات و بەخۆم و گالیسکەکەمەوە بەشەقامەکانی تاراندا دەڕۆیشتم، تا بە خۆراکێکی زۆرەوە لە تارانەوە بەرەو سابلاّخی دامـاو و بەر مەترسی قاتوقڕی و برسێتی بگەڕێمەوە...، لێم گەڕێ با ئێستا پێبکەنم و تۆش بەشداری پێکەنینەکەم بکە، چونکە تۆش شارەزای ئەو ولاّتانەیت کە دیومن و شارگەلێکیش کە بارگەم تێدا خستوون، ئەی بەغدا نەبوو بە ولاّتی دووەمم؟! ئەو رۆژەی لێی دەرکراین هەستم کرد وەك ئەو کەسەم مردوویەکم بەرەو دوور لە مامەڵەکەی خۆم و نووسینگەکەم و کەسوکارم و دۆستانم و شەقامەکانم و چایخانەکەم هەڵگرتووە. لەو ساتەدا کەلای زیرەکی لێدەدەم، هەندێك شتی گرنگ لە چاوانم ون دەبن. شەقامەکانی تارانم تەی کردو بیرم لە ماڵەکەم و کەسوکارم و دۆستانم و هەموو دانیشتوانی سابلاّخ دەکردەوە. هەر ئەوەتا هەستم بە ئاسوودەیی ئەو خەڵکە دەکرد، کە شارەکەیان لێوانلێو پڕکردبوو. تۆپخانە، کۆشك، بازاڕیش هەرشتێك دڵ و حەز بیەوێت تێیدایە، راستە نرخ بەرز بووەتەوە، لێ پڕە لە خێروبێرو بازاڕکراوەیە. بواری ئەوە نییە چاو لە دیمەنی ئارامی و دڵنیایی و ئاشتی تێر بێت. سابلاّخ تێکرا لە دڵمدایە و لە ئەستۆی مندایە و مێردەزمەکەی لێم جیا نابێتەوە، تەنانەت وا بەهەموو شوێنێکی ئەم خەونە خۆشەشدا دەگەڕێم، لێم جیا نابێتەوە، برێ دەنگۆم بیست هەرچەندە دانیشتوانی تاران دەیانزانی، بەڵام پەژارەی نەکردبوون، ئەمەش شەکەتی و بارەکەمیان قورستر کرد و هانی دام کارەکانم تەواو بکەم و چون (با) بەرەو کەسوکارم لە سابلاّخ بگەڕێمەوە. چەندین تەن ئازووقەو خۆرام کڕی. دیاریشم بۆ هەریەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەم کڕی. لە ماوەی ئەو دوو رۆژەدا عارەبانەکە پڕبوو، شتومەکەکان لەناویدا چوون منارە بەرز بوونەوە، بەتوندی شەتەکم داو خۆم بۆ گەڕانەوە بەرەو سابلاّخ ئامادەکرد. لە رۆژی سێیەمدا پێش شەبەق نوێژم کرد و نانم خوارد و سواری گالیسکەکە بووم و ناوی خودام لێهێنا. بە قامچی لەهەردوو ئەسپەکەم داو هەوڵم دا تەکان بدەن، کەچی گالیسکەکە

کەمێك لەرزی و لە شوێنی خۆی هەڵنەکەنرا. لەو کاتەدا بیرم لە سووربوون و تەماحی ژیان کردەوە، کەچی مانگەکانی لەمەودوا نیەتی پاکی منیان لەو تەماحکارییە سەلماند. ئاخر من وەك لێزانێکی راستگۆ بووم کە نادیار بخوێنێتەوە، وەك لێزانێکی لاق تێك ئالاّو وەك میر عەلی هاوکارم دەی وت ئامادە بووم لەکۆتاییدا هەرچی زێڕێکم هەیە لەپای وەدەستهێنانی ئەوەی لە هەناومانەوە فڕێی دەدینە دەرێ، بیدەم، بیدەمە ئەو پاشەڕۆییەی کە ئیکسیری ژیانی لێ هەڵدەقولێت! هەردوو کیسەکەم پشکنی، زەردەکەو سپییەکە هێشتا لەناویاندا شتێك دەدرەوشێتەوە. لە خانەکە گالیسکەکەم جێهێشت و بەلەز بەرەو مەیدانی ولاّخان رۆیشتم، گالیسکەیەك و سێ ئەسپم کڕی، ئینجا بەدوای گالیسکەوانێکدا گەڕام! زێڕەکە لە کیسەکاندایە و منیش لە گالیسکەوانێك دەگەڕێم! لەماوەی دوو رۆژدا هەموو بازاڕەکەم کڕی و لە ماوەی سەعاتێکدا گالیسکە و ئەسپم دەستکەوت، بەلاّم ئاخۆ گالیسکەوانێکم دەست دەکەوێت کە بۆ سابلاّخ لەگەڵمدا بێت؟! هۆ خەڵکینە گالیسکەوانێك! گالیسکەوانێك بەرەو سابلاّخی لێقەوماو لەگەڵمدا بێت و بەسواری ئەسپ بەرەو تاران بگەڕێتەوە و چەندیش زێڕی دەوێت، دەیدەمێ؟! لە تاران تا بڵێی گالیسکەوانان زۆرن، بەلاّم لێرە ناوی سابلاّخ وەك نوشتەی چاوەزاری لێهاتووە، ناوی خودا جنۆکەو شەیتان دەردەپەڕێنێت، کەچی ناو سابلاّخ هەموو گالیسکەوانەکانی تاران لەبەردەم من دەردەپەڕێنێت، ئیدی هەرکە ناوی(سابلاّخ) بژنەون، ون دەبن و لەبەرچاو نامێنن! لێزانن و ژیانی خۆیان خۆش دەوێت و لە مەترسی مردن دوور دەکەونەوە...، هێی سابلاّخی بەستەزمان بووەتە مانای مەرگ، ئیدی جگە لە کەسانی من ئاساو رووسەکان و عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان، کەسی دیکە نە لێی دێتە دەرەوەو نە رووی تێدەکات! ئەوەندە بانگەوازم کرد دەنگم نووساو کەسێك وەلاّمی نەدامەوە. ئەرێ بۆ جارچییەك بەکرێ نەگرم تا بۆ گالیسکەوان بانگەوازم بۆ بکات کە لە گیانی خۆی بێزار بێت؟! نەفرەت لەوەی جەنگی داهێنا! تۆ بڵێی شا هێشتا هەر داوام بکات؟! ئەی جەلال رافزی لەکوێیە کە لە زیندان دەریهێنام؟! هۆ رافزی وەرە بەرانبەر هەموو زێڕو زیوی ناو دوو کیسەکەم گالیسکەوانێکم بۆ پەیدا بکە، تا بەرەو سابلاّخ لەگەڵمدا

بێت! ئەوەی لەناو دوو کیسەکەمدایە بایی چەندین تەنی دیکەی لەو شتەی کە هاوکارەکەم ناوی لێناوە گو، دەکات، بەڵام من ئامادەم هەمووی بدەم بە گالیسکەوانێك قایل بێت بۆ سابلاخ بچێت! بەڵکو تا سنوورو دەروازەکانیشی بێت هەر قەیناکە. بێ سوودە! ناچارم شەوێکی تریش لە تاران بەسەر ببەم. ئەو رۆژی سێیەمیش تێدەپەرێت و من هەروا لە پیاوێك دەگەرێم، چۆن پیاوێك: با گەرو گول. یان قەمبور، یان لەنگیش بێت! پیاوێك تەنها بە لێخورینی گالیسکەی دووەمم تا دەوروبەری شارۆچکەی سابلاخ قایل بێت. نوێژی عەسرم کرد و لەنێو کۆمەڵێك خەڵکی بەرەڵلا و سووك و چرووك وەستابووم! خۆشی لەخۆتان خەڵکی بەرەڵلا و سووك و هەرزانی تاران، ئێوە لێرە بە ئاسوودەیی و لە ئاشتیدا دەژین!

بەبرسێتی مابوومەوە، لە بەیانییەوە هیچم نەخواردبوو، بەوپەری راستگۆییەوە لە خودا پارامەوە و بەڵێنم دا تا گالیسکەوانێك نەدۆزمەوە هیچ نەخەمە سەرزارم.

پێش نوێژی شێوان دوعاکەم گیرابوو و پیاوێکم دۆزییەوە، لاوێك بوو مردن مرخی لێ خۆشکردبوو، تووری دابووە بەر دەرگای برسێتی و هەژاری، گۆشتەکەی وا مژی بوو لەبن پێستە تەنکەکەیەوە ئێسکەکانی دیار بوون...، خواردنم پێداو بووژایەوە، ئینجا بۆ گەرماو بردم و پۆشتەم کردەوە، لە ئاوێنەیەکدا تەماشای خۆی کردو خۆی نەناسییەوە، لیە زەردەکەی بینی و چاوی رێشکەو پێشکەی کردو ئاوەز لەسەریدا نەماو هاواری کرد:

- خواجە، من لەگەڵتدا دێم، گەر مردم ئەوا مردنەکەم لە ژیانم باشترە، خۆ ئەگەر بەسەلامەتی بۆ تاران بگەرێمەوە، ئەوا لیرەکت دەخەمە کارەوەو پێی بەرێوە دەچم و وەك شا لە تاران دەژیم!

بەهۆی عەباسەوە خۆم لەبیرکرد، بۆ گەرانەوەم بۆ لای کەسوکارم و زێدەکەم عەباس تاقە ئومێدمە و نابێت بۆ چاونووقانێك جێی بهێڵم نەبادا بیری بگۆرێت و لەدەستم رابکات. (کلکم بەکلکییەوە) بەست و لەگەڵ خۆمدا بەرەو خانەکەم بردم. نوێژی خەوتنانم کردو نانم خواردو نانم دەرخواردی هاورێی رێگاشم دا. دوای دوو سەعات کەلوپەلەکانم بەسەر هەردوو گالیسکەکەدا بە یەکسانی دابەشکرد. دوای ئەوەی

ئەسپەکانمان لە گالیسکەکان بەست و کەلوپەلەکانمان شەتەک دا، هەناسەیەکی خۆشم هەڵکێشا. لەکۆتاییدا وا بەرەو ساباڵاخ بۆ لای کەسوکارم و خۆشەویستانم و دانیشتوانی شارۆچکەکەم دەگەڕێمەوە. من دوای ئەم ڕۆژە درێژە وا لە شەکەتیدا لە پەل و پۆ کەوتووم. هەڵاژام تا کەمێك لەو شەکەتییە بحەسێمەوە، ئیدی یەکسەر شەوخوونی و شەکەتی لەسەر پێڵووەکانم کێبڕکێیان بوو، هەر ئەوەندە خەوم لێکەوت ونەکەوت کەڵەشێری بەیانی قوقانــدی. هەستام و نوێژم کرد، عەباسیشم هەستاند و لە تویشووبەرەکەم برێ خواردنم دەرخواردی داو سواری هەردوو گالیسکەکە بووین و تارانمان جێهێشت، ئیدی دەستم بە خوێندی دوعای ڕێگاکرد.

پەلەمە بگەمە ساباڵاخی بەهەشت- دۆزەخی نازیز، بە عەباسم وت:

- چاوەکانت باش بکەوە و لەگەڵمدا بڕۆ. ڕێگا دووروودرێژەو هەوراز و نشێوە.

عەباس پێم دەڵێت:

- بێ بەختیەکەم مانای کەم هۆشی نییە، بەپێچەوانەوە گەر زیرەکی و وریایی خۆم نەبووایە قایل نەدەبووم لەگەڵت بێم و چارەنووسی خۆم بگۆڕم.

وەڵامێکی سەیرە، بەڵام ڕاستیشە، ڕەنگە ئەوە باشتر بووایە گەر گردوکۆیەکم بۆ خۆم و کەسوکارم و ئێستا و ئایندە بکردایە و بە کراسی بەرمانەوە ڕوومان لە تاران کردبا، بەڵام سەیرەکە لەوەدایە کە ئەم بیرۆکەیە قەت بەخەیاڵی ساباڵاخییەکدا نەهاتووە، چونکە ئەوکاتە تەنها ئاوەڵمەیەك بوو لە منداڵدانی نادیاردا، ئێ کاتی ئاوس بوونەکەیشی زۆری دەخایاند و مەترسیشی تێدابوو، ئەوسا مردنیش بەرۆکی دەگرت، ئەمانە ڕاستییەك بن یان ئەفسانە، وەك یەکن. مەودایەکەو گالیسکەی مێردەزمەیەکی عەقڵ شێواو و پێچاویەتەوە. کاتێکیش نادیارەکە مەلۆتکەی لێ بووەوە زۆربەی مەترسییەکان بوون بە تاشە بەردێکی مێردەزمەئاسای سەر بیرەوەری و هەستی بەشێك لە ڕابردوو، بەڵام بۆ ئێستاش و لەمەولاش. ئاخر ئەو نایەوێت لەبیری بکەین، سوورە لەسەر ئەوەی بە هەموو ساتەکانییەوە لەگەڵیدا بژین. ژیانت لە بێداریدا بەسەر دەچێت، نووستن لە تەختەخەوەکەت دەدات، من پەلەبووم بگەمە تەختە خەوەکە، عەباس چاوەڕێم دەکات و دەڵێت:

- با بەزەییەکمان بەخۆمان و ئەم گیاندارە بەستەزمانانە بێتەوە، ئاخر گەر لە رێگا پەکیان کەوت چی بکەین؟!

عەباس راستی دەکرد. گەر بێ بەخت نەبوایە، دەبوو بە راوێژکاری شاو خەسێتی سووکایەتی و گەمەکردنەکەی بە ئازاری خەڵکی پێ تەرك دەکرد. نا، ئەمە زیرەکییە و ئەوسا هاورێکانی لە چەقی دەسەڵات و لە کۆشك دوور دەخستەوە. رەنگە عەباس کاتێك بۆ تاران دەگەڕێتەوە لیە زێڕەکە بەباشی بەکار بهێنێت. لەسایەی ئەو خودایەی کە لە نهێنی و لە وەستان و هەڵسان و دانیشتن و لە بێداری و خەوتندا لەگەڵمدایە، دەگەینەوە سابلاخ.

لە دێهاتەکانی سەر رێگا چ خواردنی خۆش هەیە بۆ عەباسی دەکڕم، نالیکی باش بۆ ئەسپەکانیش دەکڕم. بۆخۆشم ئەو میوەو سەوزەیەی کە بەکاڵی دەخورێن دەکڕم. عەباس سەری لێم سوڕماوەو لێم دەپرسێت، وتم پارێز دەکەم و پزیشك بۆی داناوم. درۆیەکی سپییەو لەم رێگە چۆڵ و دوورە گومانی جوولەکە بوونی خۆمی پێ دەشارمەوە، بەڵام زیرەکییەکەی عەباس بەسەر درۆکەمدا زاڵ بوو و وتی:

- خواجە، تۆ بۆیە وادەکەیت، چونکە (موسایی)ت، بینیم نوێژ دەکەیت، بەڵام لێم دەترسیت و درۆم لەگەڵ دەکەیت. گەورەم، من خزمەتکاری تۆم! پشتم پێ ببەستە، من لەوانە نییم خیانەتی لە نان نمەك و چاکە دەکەن. تۆ خواردنت دامێ و ئەوەی بەمنت داوە بەدرێژایی ژیانم خەونیشم پێوە نەدیوە. گەورەم، رەنگە لە سایەی چاکەی تۆوە چارەنووسم بگۆڕێت. خودا بە سەلامەتی بتگەیەنێتەوە ماڵەکەی خۆت، ئەوسا باشترین و خۆشترین خواردن لە ماڵەکەی خۆت دەخۆیت!

ئەم لاوە سەرسوڕهێنەرە، گەرەکە بچێتە جێگەی شای ئێران و لەجیاتی ئەو فەرمانڕەوایی بکات. گەلانی ئێران تەنها بەمە هەناسەیەکیان وەبەر دێتەوە. ئەم قسەیەم لە ناخی دڵێکی بووژاوە بە قسەکانی عەباس کرد.

- عەباس، خۆزگە دەمتوانی لە ماڵەکەی خۆمدا میوانداریت بکەم، بەڵام ئێستا سابلاخ داگیرکراوە و لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئێرانە، کە جێمهێشت لەژێر داگیرکاری رووسەکان بوو، نازانم کە بەیارمەتی خودا بگەینەوە، کێ داگیرکەرێتی!

لەبەر خۆوە لە خودام ویست چۆنم جێهێشتووە ئاوها بیبینمەوە، ئەگینا ئەمە دوا جار و دوا دیدارمە لەگەڵ ئەو و دنیادا، ئەوەتا بە دڵەکوتێ و سۆز و ئەڵهاوە دڵە خورپەمە، ئەم بێ برستییە کتوپڕە کە زۆرم بۆ دێنێت لەکوێوەیە و بۆ چییە؟! من و ئەو دارخورمایەم کە نەدەنوشتێتەوە و نە توندییەکەی کەم دەبێت. دوای بەسەربردنی سێ شەوو سێ رۆژ کە لەخانەکانی سەر رێگا یان لە چۆڵەوانی بارگەمان خست و حەواینەوە، بە عەباسم وت:

- عەباس، کاتی ئەوە هاتووە پەلە بکەین، ئەمێستا ئێمە لە سابلاخەوە نزیکین، ئیدی لەنێوان تۆ و ژیانە تازەکەت هەر ئەو مەودایە ماوە کە بەرەو تاران دەگەڕێیتەوە.

کپییەکی گوماناوی و ئاگاداری ئامێز باڵی بەسەر دەروازەکانی سابلاخدا کێشاوەو منیش گوێ سووك و چاوتیژم، خۆم ئامادەی بیستنی تەقینەوە یان گڕەکەی دەکەم، لە شانسی باشی مندا مەزەنەکەم وا دەرنەچوو، ئارامی دڵنیای کردمەوە. لە دەروازەکانی شارۆچکەکەدا سەربازگەیەکی رووسەکانم دی، دووبارە دڵم کەوتە خورپەو سۆز. هەردوو کیسەکەم دەرهێنا و کردمنەوە، زێڕەکە لەناویدا درەوشایەوە، بەدزی عەباسەوە دوو لیرەم لێ دەرهێنان، کە لەرەنگی گوڵەگەنمی کاتی دروێنە دەچوون.

- عەباس، راوەستە!

- بۆچی؟

دوو لیرەم پیشانی دا، ماوەیەك چاوی تروکاند، زانیم کە باوەڕ ناکات و خەو دەبینێت. هەوڵیدا هەردوو پێڵووە هەڵپەڕیوەکانی کپ بکاتەوە، لەکۆتاییدا وتی:

- هێشتا نەگەیشتووین!

- کە گەیشتینە سەربازگەی رووسەکان، تۆ دەست بکە بەکردنەوەی ئەسپە بەستراوەکەی دوای گالیسکەکەی خۆت، ئەو ئەسپەو دوو لیرەکە هی تۆن و بەرەو تاران پێی دەگەڕێیتەوە! ئێستا وەریان بگرە و لە شوێنێکی تەقەت دایان بنێ، ئەمەش لیرەیەکی زیوە لە رێگە خواردنی پێ بکڕە!

زێڕو زیوەکەی وەرگرت و وای دەزانی خەونە، خێرا لە خەونەوە بەرەو راستی هاتە دەرەوە و پرسی:

- خواجه، چۆن دەگەیتەوە ماڵەکەی خۆت؟!

باوکی سەلمان، هەر بە هێمنییەکەی جارانتەوە وتت:

- خەمی منت نەبێت، بەچاوی خۆت دەبینیت چی دەکەم!

❊ ❊ ❊

هەموو گەڕەکەکە بە جیڕەی پێچکەکانی دوو گالیسکەکە هاتنە دەرەوە، یەکێك لە سەربازە رووسەکان گالیسکەی دووەمی لێدەخوڕی...، سێ کەللە شەکر و پاشماوەی ئەو پارەیەی ناو کیسەکەم مابوون بە بەرتیل دا بەسەرکردەکەیان، ئەسمەر و قەشەنگ قریوەی هەلهەلەیان لێهەستا. دراوسێ و برادەران و ئەندامانی خێزانەکەم کۆبوونەوە. هەمووان لە داگرتنی ئازووقەی ناو دوو گالیسکەکە کۆمەکیان کرد. دیمتری سەربازی رووس کە گالیسکەی دووەمی دەهاژووت، لەگەڵیاندا بوو، بە قەشەنگم وت:

- بەپەلە بۆ کۆگای خواردنەکان بچۆ و دوو شووشەی هەرەباشی شەرابم بۆ بهێنە.

دیمتری وەك عەبباس بڕوای بەچاوەکانی خۆی نەدەکرد، لەپڕ هێزێکی بەقەد هەر چوار ئەسپەکەی تێدا پەیدابوو، بازووی لێ هەڵکرد و ئەوەندەی شەش زەلام کاری کرد. وەك ئەوەی خۆشەویستێك لە ئامێز بگرێت، دوو شووشەکەی بە سینگی خۆیەوە نووساند و بە گالیسکە نوێییەکە و هەردوو ئەسپەکەیەوە بەرەو سەربازگەکە گەڕایەوە.

❊ ❊ ❊

ئیستیر و دوو منداڵەکەم نەدی، لە ئەسمەرم پرسی:

- ئیستیر هێشتا لە ماڵی باوکی نەگەڕاوەتەوە؟

ئەسمەر وتی: ئەو و منداڵەکان وەك خەرمانەیەکی خۆشەویستی دەورم دەدەن.

- دوێنێ هاتەوە، لەگەڵ ناحوم و ئیستیری بچووك بۆ پیاسە چووە، رەنگە بۆ باخەکە چووبن.

لەوساوە ئەم جەنگە نەفرینە بەرپابووە، چەندین جار ئاگادارم کردۆتەوە کە بۆ ئەوێ نەچێت! گەر لەبەر ئەم ئارامی و هێمنییەی ئێستای سابڵاخ نەبووایە، ئەوا بۆ هەتا هەتایە بۆ ماڵەباوانی دەم ناردەوە. بیرم کەوتەوە کە وەرزی میوە رنین کاتی هاتووە، هەروەها کاتی ئازووقە خستنی زستانیش هاتووە. سبەینێ بۆ میوەرنین کرێکارەکان

دەبەم. ئەسمەر! ئەمسالّ دوو ئەوەندە ئازووقە دەخەین، بەلاّم بۆ شەراب و عارەق پێنج ئەوەندەیان لێ ئامادە دەکەین.

ئەسمەر بە سەرسوڕمانەوە نیگای کردم، پێم وت:

- ئەی نازانیت کە عارەق لە راکێشانی رووسەکان چ کارێکی ئەفسووناوی دەکات؟! ئەی نەت دی دوو شووشەکە چی لە دیمتری کرد؟

ئەسمەر داما، هەندێك پەژارە دایگرتم و پرسیم:

- ئەسمەر، ئەوە چییە؟

تەماشای دەوروبەری خۆی کرد، کە بینی منداڵەکان لەگەڵ قەشەنگ دوورکەوتنەوە، بە ترسێکی ئاشکراوە بەچپە وتی:

- باوکی سەلمان، فاتمە! رەزا تەنگەتاوی دەکات، بێ شەرمییەکەی گەیشتووەتە رادەیەك، دەستی گرتووە. بە جەختەوە وتم: ئەسمەر، ئابڕوومەندە و بەهێزە، ئابڕوو وەك زێڕی بێگەردە، ئەگەر بە ئاو و شێ بکەوێت ژەنگ هەڵناهێنێت.

* * *

ئیستر هاتە ژوورەوەو ئیستیری بچووکی بە باوەشەوە بوو، پەلی ناحومیشی گرتبوو، کە بە پاوانەکانییەوە وەك چۆلەکە لەتری دەدا. خێرا بۆ لای هەردوو منداڵەکە چووم و ماچم کردن، سلاّوی ژنە گچکەمم بەلا لووتێکەوە سەندەوە و شتی زیادەم نەوت.

میر عەلی گلەیی لێکردم و وتی:

- لەوەتەی ئەم جەنگە هەڵگیرساوە، نە بۆ نووسینگە دێت و نە سەر لە کۆگاکان دەدەیت. هەموو شتێکت بەسەر مندا جێهێشتووەو خۆت تەنها بەکۆکردنەوەی خۆراك سەرقاڵ کردووە.

پێکەنیم، ئینجا دامام و وتم:

- میر، لەم شەڕو جەنگە کەلوپەلەکانمان بازاڕی نییە.

وەك ئەوەی نوکتەیەکم گێڕابێتەوە هێنامە پێکەنین، بەلاّم وەك دەرکەوت پێکەنینەکەی گاڵتە پێکردن بوو، دەستبەجێ لە گیرفانی کیسەیەك پارەی دەرهێنا و وتی:

- لەوساوە تۆ لێرە نەبوویت سەد تۆپ خام و زەری و ئاوریشم و پەنجا دەرزەن جەمەدانی و بیست دەستە قاپی چینی و دە سەماوەرم فرۆشتووە، ئەمەش بەشی تۆیە لە قازانجەکەی.

کیسەکەم لێ وەرگرت و لە گیرفانم دامناو وتم:

- باوکی محەمەد، هێشتا خەلکی بێ ئاگان، ئەگەر هۆشیان هەبێت لەجیاتی شتی ناپێویست، ئەوەی تۆ پێی دەلێیت گوو، دەکڕن!

بە گالتەکردنەوە وتی:

- لێیان گەڕێ با پێش ئەوەی رووسەکان بیان کوژن، دلی خۆیان بە شتی ناپێویست خۆش بکەن.

تووڕە بووم و بە دەنگێکی بەرز و یەکلاکەرەوە وتم:

- مردنی بە کوشتن زۆر خۆشترە لە برسان مردن.

- لەگەل ئەوەی خۆراك لە بازاڕ کەم بۆتەوە، بەلام خەلکیش هەر بایی رۆژ بەرێکردن دەخۆن.

- باوکی محەمەد، بینیت چۆن خۆراك لە بازاڕ کەم بۆتەوە، ئەمەش سەرەتای برسێتییەکەیە، جا بۆ ئەوەی وا بەڕێوەیە، هەر خودا خۆی و بەزەیی خۆی!

# کایەی چوارەم

شلۆمۆ کەتانی دەزانێت کە ئەم کچی و هێمنییە لە سابلاخ، کچییەکی درۆزنانە و هەڵخەڵەتێنەر و بێ بەزەییە، ئەمە هێمنی پێش هەژینی بوومەلەرزەی وێرانکەرە و ئاگرو ژیلەمۆ هەڵدێنێتەوە. زستانێك نزیك دەبێتەوە لەگەڵ خۆیدا دوو زریان دێنێت، زستانی بەفر و سەهۆڵبەندان و ئەوی دی گەرم و ئاگرو ئاسن و کاولکاری دەبارێنێت. زۆر هەبوون لە سابلاخ هێشتا لەوەی رووی دەدا تێنەدەگەیشت، لێ ئێمە گەر شێتەکان و کەم ئاوەزەکانی لێ دەربکەین، ئەوا سێ کەس دەمێننەوە، کە بەسەر رووداوەکاندا تێدەپەڕن و هەر ئەوەتا دەیان بینن، یان هەر بەلایانەوە گرنگ نییە.

منی رۆژگار لەم ماوەیەدا کە بەلایاندا گوزەر دەکەم، تەنانەت هەست بە دەنگی پێیە قورسەکانیشم ناکەن، ئەم سێیەش ئەمانەن، ئەڵماسی عەزریا زێڕنگەر و حەسەن بوزورگ و رەزا عەلی.

ئەڵماس بەجلوبەرگی دەگمەنەوە بە رێگادا دەڕوات و ناز دەکات و بێزی نایات پێیەکانی بەر زەوی بکەون. بەشتێکەوە لەخۆباییە تەنانەت باوکەکەیشی نازانێت ئەو شتە چییە. تفی رۆ دەکردە سەر زەوی و خۆی لە پیاوان و ئافرەتان و لە جوولەکە و نەسرانی و موسڵمانەکانیش بە بالاتر دەزانی، رۆژێك سەربازە رووسەکان کە دەبینن تف دەکات و رقی خۆی بۆیان ئاشکرا دەکات، بە موسڵمانی تێدەگەن، ئیدی سەبازێك میلی تفەنگی لێ رادەکێشێت و رووی تێدەکات، خۆ ئەگەر هاوڕێکەی هێشتبای تەقەی لێ بکات، ئەوا لووت بەرزی و کالڤامییەکەی ئەڵماس بە دەستی سەبازێکی رووسی سەرخۆش بە مەرگی خۆیان دەگەیشتن، ئەڵماس بە هیچ پیاوێك رازی نەبوو، ئەو پیاوەی لە هەمووان بە بەختتر بووایە، ئەوە پشت تێکردن و دەموچاو شاردنەوەی لە

ئەڵماس پتر چنگ نەدەکەوت، ئەمەش بۆخۆی سووکایەتی و گاڵتەپێکردن بوو بەو کەسە، خۆ ئەگەر بێ شانیش بووایە، ئەوە ئەڵماس لەگەڵ کەسوکارەکەیدا لە ماڵەکەی خۆی بە چەرمەسەری و قسەی ناشیرین و بەهەستی بریندارەوە، دەری دەکردن، زۆرجار ئەم ڕەفتارانەی باوکی بێدەنگ دەکرد و بە غەمگینی لە دڵەوە دەگریا و بیری ئاڵۆز دەبوو، دای ئەوەی ڕووندکی دڵی دەڕژان و فرمێسکی ئاوەزی دەسڕییەوە، بیری لە دۆخی کچە تاقانەکەی دەکردەوە، هەوڵی دەدا لەوە تێ بگات ئاخۆ کچەکەی لەکوێوە ئەم لووت بەرزییە دەستکردەی بۆ ماوەتەوە، ئایا ئەمە بە ڕاستی خۆ بەزلزانییە، یان دیاردەیەکە گەیشتووەتە سنووری شێتایەتی، یان سەرباری سیما جوانەکەی ئەوە خراپەکارییەکە و خۆی پێ دزێو دەکات؟ دایکی کۆچکردووی ئاوها نەبوو، پێچەوانەی دوێتەکەی بوو، باوکەش قێزی لە ڕەفتاری کچەکەی دەبێتەوەو لە ئەتوارەکانی بێزارە، هەروەك چۆن بێزی لە ڕژانەوە دەبێتەوە. ئەڵماس یەکەم منداڵ و دوا منداڵ بوو، دایکی بەسەر ئەمەوە چووبوو، میمکەکانی ڕقیان لێ بوو، پێیان دەوت (بکوژی دایکی)، بەڵام باوکی لە دوو سەرەوە خۆشی دەویست، خۆشەویستی ژنە مردووەکەی و خۆشەویستی کچە خۆی، بەزەیی پێدا دەهاتەوە، چونکە بەبێ دایك لەدایك بوو بوو، ئیدی تەنها بۆ ئەو خۆی تەرخانکرد و خۆی لە ژنهێنانەوە بێبەش کرد، تا بۆ ئەڵماسی (بکوژی دایکی) خۆی تەرخان بکات. هەرچییەکی هەبوو پێی بەخشی، لەپێناو ئەودا ژیاو لەپێناو ئەودا کاریکرد و بژێوی پەیدا کرد، ئیدی بەزەیی و نازکێشان لەم ژیانەدا بەشی ئەو بوون. ئاخر هەتیوکەوتن شتێکە ویستی خودا بووەو ڕەت نابێتەوە. پرسیارێکی بێ بەزەییانە بەردەوام مەژگی عەزریا زێڕنگەری هەڵدەکۆڵی (ئایا بێبەشبوون لەدایك وای لێکرد، یان زێدەڕۆیی لە خۆشەویستی و نازڕاگرتن؟!)، ئەم پرسیارە بەردەوام زۆری بۆ دەهێنا و هەر بە سووربوونیشەوە دەمێنێتەوە، تا چارەنووس تووشی ڕۆژە بێگومانەکەی مەرگی دەکات، ئەوساش دەمی بەم پرسیارە سەیرەوە هەر بەکراوەیی دەمێنێتەوە. ئەڵماس یەکێك بوو لەو سێ سابلاخییە، نە گێل بوون و نە شێت، بەڵام پێ بەسەر مندا دەنێن، منی ڕۆژگار. گاڵتەیان بەو ڕووداوە گەورانە دێت کە لەدەوروبەریان ڕوو دەدەن، بەڵام ژیان بەزەیی بە کەسدا نایەتەوە و کەسێکیش

نامیَنیَت دریَژە بەبیَ ئاگایی خۆی بدات. نە گرمەی تۆپەکان ئەمانەی وەئاگاهیَنا، نـە کەڵەکەبوونی کوژراوەکان...، ئەوان نەرگزین و لەناو خودی خۆیانـدا سـەرقاڵی شـتیَك بوون و لەخۆیان بەولاوە کەسی دیکەیان نەدەبینی...

بەڵام...، حەسەن بـوزورگی هـەرزەکار خـۆی دەنوانـد و بـەنایابترین جلوبەرگـەوە شانازی بەخۆوە دەکرد. خەنجەرە مشتووئەڵماسەکەی بـەدڵ نـەبوو، بـەڵکو دەمانـچەی باوکە بازرگانە گەورەکەی لاپەسەند بوو، ئـەو دەمانـچەیەی کـە بـاوکی لـە شـلۆمۆ کەتانی دوای ئەو سەفەرەی لە مۆسکۆ گـەڕابووەوە، کـڕی بـووی، ئـەو سـەفەرەی کـە ئەحمەد شا لەسـەری لیَپرسـینەوەی لەگـەڵ کـرد و بـە دارکـاریکردن سـزای دا و لـە زیندانیَکی لەبیرکراو توندی کرد، تا پیاویَك بەناوی جەلال رافزی رزگاری کرد!

حەسەن وەك منـداڵیَکی نیَرینـە لـەنیَوان چـوار خوشـك لـەدایك بـوو بـوو، ئـەو خوشکانەی هەمیشە لەتەك دایکیاندا لە ژوورەوە مت بووبوون، مەگـەر بـە فـەرمانی باوکەکەیان، دەنا دەرەوەیان نەدەبینی، حەسەن میراتگری راستەقینە و لـەدوای بـاوکی پیاوی ماڵەکە بوو، رۆژانی سەفەرە دریَژەکانی باوکی، ئەو هەرچەندە بەتەمەن بـچووك بوو، خاوەندارێتی دایکی و خوشکەکانی دەکرد، هەر لە منداڵییەوە فیَری دەسەڵاتداری بوو بوو. حەسەن بوزورگ وا بیری دەکردەوە کە هەموو دنیا هی ئەوە، ئەو بەڕاستی نـەك بەگاڵتە گەمەی بەزیَر دەکرد. ئەوانەی لە ئاستی ئەو و لە ئاستی باوکیـدا بـوون، وەك شلۆمۆ کەتانی شیَت و جوولەکەی دراوسیَیان، خۆراکیان هەڵنەدەگرت، شلۆمۆ کەتانی هەواڵی شووم و ناخۆش بە خەڵکی رادەگەیەنیَت، ئەو پیَغەمبەری تووڕەییـە، حەسـەن بوزورگ هیَشتا لە باوکە دەوڵەمەندە قەبەکەی دەژنەفیَت کە ئەفسوون لە درەوشانەوەی زیَڕدایە، وەك باوکە (باوەڕپیَکراوەکە)ی دەڵیَت: ئەم کانزا زەردە پەرجوو دروست دەکات، کچە جوانەکانی سابلاخ پۆل پۆل وەدەست دیَنیَت، تەنانـەت شـیری چـۆلەکەش دەسـت دەخات. حەسەن بوزورگ لە بابەت ئەڵماسی کچی زیَڕنگەر و رەزا عەلییە، پیَ بەسـەر رووداوەکاندا دەنیَت و جیَیان دەهیَڵیَت و لەبیری خۆی دەریان دەکـات. ئـەو بـەرەنگاری منیش دەبیَتەوە، منی رۆژگار، دەڵیَت: (من رووداو و رۆژگارم، من چارەنووسم و هەموو شتیَك لەژیَر فەرمانی مندایە، من وەك ئەنگوستیلەی پەنجـەکانم میَـژوو دەجـووڵیَنم!

من...! من...! من...!) خەنجەری مشتوو ئەڵماس سام و خۆهەڵنان و سەرسامبوون دەبەخشێت، بەڵام دەمانچە مەرگی لەگەڵدایە و مەترسی و هێزە، ئەوێك گەورەیی و نازو لاوچاکی پێبەخشراوە، دەبا خۆی پێیانەوە هەڵبنێت، دەبا هەرچی خەسێتی بەهێزی هەیە لەمدا کۆببنەوە و کچە جوانەکان رابکێشن. من- بەخۆی دەڵێت- بەرەو دەرەوەی شارۆچکەکە دەڕۆم...، بەو هەموو سامەی هەمە لەسەر حەسیرێك* کە لەگەڵ خۆمی دەبەم لەبن دار مازووەکەی نزیك کانییەکە پاڵ دەدەمەوە. لەوێ کچە جوانەکان جەم دەبن، لەوێ قەدەغەکراو حەڵاڵ دەبێت، ماچ و مووچ دەبەشێنرێنەوە، لەوێ دوور لەچاوی بەدکاران لێو دەخرێتە سەر لێو، لەوێ کەمەرو ناوقەد دەگوشرێن و دەستەکانم بەسەر مەمکی ڤیت تورتدا دێن و دەچن. ئەو رۆژە دێت کە لەژێر باڵی تاریکیدا دۆخین شل دەکرێنەوە و شەرواڵ دێنە خوارێ. لەوێ لەبن دارمازووەکە و بەتەنیشت کانییەکەوە بێ ئەوەی چاوێك ببینێت و گوێچکەیەك بژنەوێت، حەسەن بزورگ بیری چووبوو کە چاوانی من شایەتحاڵن و یادەوەری من ناسڕێتەوە، ئەوەشی بیر چووبوو کە بارودۆخەکان بەردەوام نابن و لەخۆبایی بوونیش بەردەوام نابێت. رەنگە بەرێکەوت رووداوەکان کوێریێ دڵ تیمار بکەن و بەرەو عەقڵ بیگێڕنەوە، رەنگە ئەمە دوای کار لەکارترازان بێت.

رەزا عەلی لەلایەکی دیکەی دارمازووەکەوە، یان لەبن دار بەڕوویەك پاڵی داوەتەوە، نەکوژراوان دەبینێت و نە بریندااران، نە دیل و نە جەنگەکە و سەربازەکان دەبینێت. ئەو هەر لەو شەوەوە، بەر لە سێ ساڵ ئاوەز و دڵ و ویژدانی لە هەموو شتێك خاڵی بووەوە، تەنها لەو نەبێت، ئەویش فاتمەی بەری درەختە حەرام کراوەکە بوو. میوەی براکەی کە لە شیرینی و چێژدا وێنەی نەبوو. ئەو چڵە دارێکی وشك لە زەوی دەروێنێت، فاتمە دەبینێت، شەوێك وەك ئەوەی باشترین رێکەوتی بۆ هەڵکەوتبێت، دەی بینێت، شەیتان ئامادەباشی بۆ دەکات، شەیتان وردەکاری ئەو شەوەی چرکە بەچرکە دێنێتە بەرچاوی، فاتمەی رووت و قووت هەر وەك چۆن خودا دروستی کردووە، ئەم ئەفرێنەرە دەست رەنگینە، یان دروستکەرەکەی ئەهریمەنەو وەك دۆستێك بەوەفاوە لەناخمدا نیشتەجێ بووە؟! پەنا بەتۆ خودایە چیت دروست کردووە، ئیدی ئاهوورامزدا بێت یان ئەهریمەن،

پەنا بەتۆ خودایە، ئەی ئافرێنەری نیاز و گوناهەکان، حەڵاڵ کـاری حـەرام کراوەکـان، چونکە ئەم جوانییە دڵڕفێن و بینایی کوێرکەرەت بـۆ رەخسـاندم، تێکـدەری سـنووری نێوان حەرام و حەڵاڵ، ئاخر کێ دەڵێت هەندێك حەڵاڵ حەرامـە؟! هـەیهوو ئـەوە دوورە! خودای من گەوهەری چاکە خوازی و چۆنێتی خراپەکاری دیاری نەکردووە، خـۆ ئەگـەر حەڵاڵ و حەرام هەبێت، ئەوە حەرامەکە جوانییە و دزێوییەکەش حەڵاڵە، ئـاخر زۆرداری نییە تاقە مرۆڤێك کە ناوی مێردە لەزەت لە ئەفسوونی حەڵاڵێك وەربگرێت و قـۆرخی بکات و سرووتێکی توورە هات لە کەسانی دیکەی قەدەغە بکـات؟، بـەڵکو کەسـانی دیکە تەنها منم! نەخێر، فاتمە تۆ خواوەندی جوانی یۆنان نییت، تـۆ بـە جوانییەکـەت گاڵتــەت بــە هــەموو خواوەنــدەکانی یۆنــان و رۆمــان دێــت، تــۆ تــەنها قــەرەجێکی ئازەربایجانیت و جوانی هـەموو گـەردوون تێـدا کۆبووەتـەوەو داهێنـەری بەشـێك لـە جۆرەکانی ئەفسوونی تێدا بەکارهێناوە، بۆیە بێ خەوشی تێدا بەرجەستە بووە، ئەگـەر بێ خەوش هەر خواوەند بێت، ئەوا تۆ شانت لە شانی داوەو لات داوەتە لاوە، تا جێگەی بگریتەوە، خۆ شەیتانیش بێت، ئەوا تۆی لە بوونمدا رواندووە، تا راستیم پێ بڵێت، ئەو هەمیشە پێم دەڵێت (تۆ ترسنۆکیت!) ئەوەی دروستی کردیت چۆن بەخەیاڵیـدا هـات پێستت لە شیرێکی سپی سپی دروست بکات و هیچ چەورییەکیشی لەخۆ نـەگرتبێت، هەردوو گۆنات بەرەنگی گوڵێکی سووری ئاڵ رەنگ بکات، ئینجا بـە خـەڵووز خـەتی دوو برۆو برژانگەکانت بکێشێت و لە هەردوو چـاڵی چاویـشتدا ئـەم دوو چـاوە رەش و گەورانە دابنێت، لە دەموچاویشتدا چوار بادەم، لووتت بادەمێـك و دەمـت بادەمێـك و دوو ریـز مـرواریش لـەنێو زارتـدا و دوو لێویـشت چـوون درزی هـەنار بـەدەوری دەمتدا.خۆشی لەوەی کە ئەم دەمە دەمژێت کە کەوسەری تێزاوە و بۆنی گوڵاوی لێدێت. پرچەکەتی بە قیر رەش کردووە و وەك هەودای ئاوریشمی رەش پەخشی کـردووەو شـنەبا ئازاری دەدات و دەلەرێتەوەو بە گریەو زاری خۆی بەسەر هەردوو کەفەڵتەوە دەلکێنێت. ئەوەتا هەرچەندە لێت دوورم ئـەم شـتە نەفرینـەی نێـوان لاقـەکانم دەورووژێـت و رەق دەبێت، ئەو شەوە لەوەدا بوو دەمارە خوێنبەرەکانی بتەقێن و دەمارە رەق وەك بەردەکەی درز بەرێت، ئەو شەوە یەکجار تاریك بوو، برا نەفرینەکەم سـەفەری کردبـوو هـەردوو

پیرەمێر و پیرێژنەکەش دەیان پرخاند و لە هەناوی خەوی برای مردنـدا ون بـوو بـوون. هەردوو کوڕەکە کە لیلاوێك لە مندالّدانت دا رووانـدنی، فریشتە، یـان شـەیتانێکی خۆت ئاسا لایلایەی بۆ دەکردن، حەمید هێشتا لـە منـدالّـدانت دا هێلکەیـەك بـوو و تۆماوی برا گەوجەکەم نەڕژابووە هەناوت، وام بەخەیالّدا هـات کـە بـە تەنیـشت دوو کوڕەکەوە راکیشاویت، منیش لەسەر جێگەکەم گەوزو گلێم بوو، تارماییگەلێ بـەبالّی کراوەی لە چەشنی پرچـە رەشـەکەی تـۆ، بەدەسـتەکانیان وەرم دەسـوورێنن و نینۆکـە تیژەکانیان لە گۆشتەکەم رۆدەکەن تا دەگا روحم، بیرۆکەی ئالّۆز ئـاوەزم تووڕەدەکـات و ئاماژەی پرسیاری وام ئاراستە دەکات، کە مەمك و جێگەی شـەرمی هەیـە. نیـازێکی نادیار بەرەو ئالّۆشی راپێچم دەکات، جەستەم دەگوشێت و خەو لەچـاوانم دەتارێنێـت و تەزوویەکی نەفرین بەجەستەمدا بلاو دەکاتـەوە. لـەو بـە ئاگاییـەدا دەمێنمـەوە، بـە لاملییەوە ئازار دەکێشم و هەست بە تینوێتییـەکی درۆزنانـە دەکـەم، تـا ئـەو سـاتە جیاوازیم لەنێوان شەیتان و رەحماندا کرد، پەرۆشە خەیالاّوییەکەم بـۆت خەفـە دەکـەم، هەرکاتێك رووخسارە وەك خۆر درەوشاوەکەتم لێدەرکەوێت، لە ناخمدا ئەو شتەی خەلّکی پێی دەلّێن ویژدان رێکەوتە نەفرینە- پیرۆزەکە - لێی دزیم، دنەدانی ئەهریمەن پاراوی دەکردم. تینوێتی هەموو دنیا لە بوونی مندایە و هەموو ئاوی گەردوون تینوێتییەکەم ناشکێنێت، هەستام ئاو بخۆمەوە، مۆمێکم داگیرسـاند و ژوورەکـەم جێهێـشت. ئێـستا لەناو حەوشەکە بووم، رووەو چێشتخانەکە دەچم لـەپڕ بایـەك هـەلّیکرد و مۆمەکـەی کوژاندەوە و رووناکییە زەردەکەی نەهێشت، وتم: (وەك کوێر بـەرە و چێـشتخانە دەڕۆم و پەل دەکوتم) وەك نابینایەك لێی نزیك دەبمەوە، بەلاّم لەپڕ سەرم سـوڕما، لـە پەنجـەرەی چێشتخانەکەوە رووناکییەك دیارە، رووناکی و لەناو چێشتخانەکە؟! بە ئاگاییەوە نزیـك بوومەوە، لە گوماندا بووم، ئینجا لە شوێنی خۆم نزیـك پەنجەرەکـە وشـك بـووم، لـە چێشتخانەکەوە رووناکی (لۆکس) و خۆر دیارە، فاتمە وەك چۆن خودا دروستی کـردووە، ئاوها رووتە، پەنا بەخودا، بێگومان ئەمـە ئەهریمـەن دروسـتیکردووە، چـونکە خـودا جوانێکی بکوژی ئاوها دروست ناکات. بەپێوە وەستاوە و لەنێو تەشتدا خۆی دەشـوات، دوو دەست بەرەو قـژێکی رەش بـەرز بوونـەوە، پەنجەگـەلێ وەك مێـوی مێـشەنگ بـە

سابوونێکی کەف سپی شەوێکی مەخمەتی هەڵدەگلۆفن، بن هەنگڵەکان دوو بۆشایی سپین و شوێنەواری تووکی تاشراویان پێوە دیار نییە. گەردن شووشەیەکی عاجی نەرمە، گەردنی ئاسکێك لەشێوەی کۆترێکی سپی و بزوێنەرێك دەی جووڵێنێت. دوو مەمك هەریەکە و بەلایەکدا قوت بووتەوە و هەر دەڵێی هی کچە تازە باڵق بوویەکە و تازە دەرکەوتوون، تۆزقاڵێك دانە چۆڕاون و دەڵێی نە رۆژی پڕ لەشیربوون، نە منداڵت بووەو نە شیرت بەدوو منداڵەکە داوە، پەنا بەخوا! دوو گۆی مەمك بە رەنگی گوڵ خۆ دەنوێنن و لە ناوەڕاست خەرمانەیەکی وەك نانی گەنمە، چەند جار برانە فرینەکم مژیونی؟ لە ئێستا بەدواوە مێردی تۆ نییە، من خەریکە هاوار دەکەم! زارم بەدەستەکانم گرتووە، دەمەوێت وەك تێسکەی تفەنگ دەرپەڕم و بەرەو لات بێم و بەخۆمەوەت بنووسێنم، بەڵێ شتێك لە زەوییەکەدا پێیەکانم وشك دەکات، بەلادا دێم، خۆم بەدیوارەکەوە دەگرم. هەرچییەکم تێدایە شل و لینج دەبێتەوە و بەرەو ئەم شتە رەق بووەی سەرووی لاقەکانم دەچۆڕێتەوە! پەنا بەخوا کە دروستی کردیت! هەردوو دەستت یاری بە دوو مەمکەکەت دەکەن، ئەو زکتە و چون سەرینێکی سپی کونێك لە ناوەڕاستیدایە، وا لیکاوم دێتە خوارێ، ئاواتە خوازم کە ئەم چاڵە پڕ بێتەوە، وا دەستەکانت لەپڕ بەرەو زەقییەکی خوار ناوکت دەخزێن، ئەرێ بۆچی لەسەرووی هەردوو لاقتەوەیە و بە پارچەیەکی هونەری دەچێت کە باشترین پەیکەر تاشی جیهان تاشی بێتی؟! لێرە، دوو کۆپانەی وشتر کە پارچەیەکە لە جەستەت شفرەیەك جیایان دەکاتەوە، خۆ ئەگەر هەموو دنیا بیان بینن کڕنووشیان بۆ دەبات. دەڵێن ئەندامی هەموو مێینەی دنیا لەیەك دەچن، ئەوەی وای وتووە درۆی کردووە! سوێند دەخۆم من لە ئەندامی تۆ زیاترم نەدیوە، هەروەها سوێند دەخۆم تۆ تەنها کەسێکیت کە ئەندامی مێینەت هەیە، نە تووکە حەرامەیەك، نە رەگی توکێك، بەزاتی ئەوەی دروستی کردیت تۆ بەبێ تووك دروست بوویت، تۆ بێ خەوشیت و عەوردتت نییە، بەڵام مێر تۆماوەکەی دەرژێنێتە نێوان ئەم دوو شفرەیەوە، ئەوا بەدەستەکانت هەڵیان دەگلۆفیت، دەستێکت ئەمیان هەڵدەگلۆفێ و دەستەکەی ترت ئەوی دیکەیان. منیش دڵم هەڵدەشێوێت و دەگوشرێت و لەوپەڕی سابلاخەوە ترپەی دەبیسترێت، ئاوی سەتڵەکە بەتاڵ بووەوە، وا

بەرەو مەنجەڵەکە دادەچەمێتەوە و ئاوی لێدەکەیتە سەتڵەکەوە، وا ئاوی سارد و گەرم تێکەڵ دەکەیت، بێ ئەوەی ئاگات لە من بێت پشتم تێدەکەیت و برپرەکانت دەردەکەون و دەکرێت وەك دەمارەکانت بژمێرێن، بە نیمچە بازنەیەك دەنوشتێیتەوە، ئینجا برپرەکان بەرەو دوو گوڵمەی خڕ شۆڕ دەبێتەوە و کانیاوێك درزیان تێدەخات، کە دەڕژێنە نێو رووباری دوو شفرەکەوە، گەر من لە پشتەوە باوەشت لێ بدەم و هەردوو دەستم بەرەو هەردوو مەمکت خزاند و ئینجا سکت و پاشان شوێنە پەرستراوەکە، ئەوسا دەمتوانی چیرۆکی چوونە بەهەشتی خۆم بگێڕمەوە، وا دووبارە بەپێوە دەوەستیت و جامەکە بەدەستتەوەیە و بەرەو سەرت بەرز دەبێتەوە، ئاو لەو جەستە پەرستراوەوە دەچۆڕێتەوە، ئاخر هەر ئەندامێکت بگریت تەواو پاکە و ئاوێکی لێ دەچۆڕێتەوە کە جەستەتی بە هەنگوین شیرین کردووە، جەستەت تەنها پیرۆزی بە ئاوەکە دەبەخشێت، دەنا پێویستت بەخۆشۆردن نییە؟!

ئەوەتا بەدەستەکانت (بەردی پێ)یە رەشەکە هەڵدەگریت، جارێکی دی دەچەمێیتەوە، پرچە زۆر رەشەکەت شۆڕ دەبێتەوەو دەگاتە زەوییەکە و بەردەکە، بەردەکە بن پێیەکانت دەسوێت، چ پێویست بەسوین دەکات، ئەو پێیانە لە دەموچاوی من نەرمترن؟! ئەوانە پێی منداڵێکن تازە لەدایك بووبێت، بۆ ئاوی تەشتەکە بەخۆتدا دەکەیت، ئەو ئاوە لە جەستەی بۆن خۆشتەوە چۆڕاوەتەوە، خودا ویستوویەتی ئەم جەستە پەرستراوە لە پاکژی دنیا دروست بکات...! بێنە با لەگەڵ شەرابی جەستەتدا دەمی پێوە بنێم، بەڵکو میزە پاکەکەتی تێکەڵ بکە تا دەردم تیمار بکات، چونکە لە هەموو دەرمانێکی دنیا دەرمانترە. ئەوەتا ئەی فاتمە ئێستا خۆت وشك دەکەیتەوەو نەختێکی دی ئەم جوانییە ئەفسوونارییە بە جلوبەرگ دادەپۆشیت. داپۆشە! ئاخر بەبێ جلوبەرگ دنیا لەسەری بەشەڕ دێت، لام سەیرە کە مێردە کاڵفامەکەت دەی بینێت و چۆن بەزیندوویی دمێنێتەوە؟! چۆن بەبێ تۆ بگەڕێمەوە نێو جێگاکەم!؟ ئەی لەمەولا چۆن بژیم و چۆن بمێنم!؟

بە وریایی دزێك لێت دووردەکەوتەوە. رەزا عەلی لەتری دەداو وەك ئەوە بوو هەموو شەرابی دنیای هەڵقورتاندبێت، وێنەی بە هەموو وردەکارییەکییەوە لە مێشکیدا

هەڵکۆڵرابوو، هەموو بۆشاییەکانی سەری داگیرکردبوو، دوای ئەوەی مەژگی لێ دەرهێناو هەمووی کرد بەبۆشاییەك، لەوێ وەك درەختێك بە چێنراوی مایەوە و بەردەوام گەشە دەکات. هەموو شوێنێکی داگیرکردووە و دیوارەکانی کاسەی سەری بەجۆرێك تەنگ کردۆتەوە لەوەیە بتەقێت. درەختەکە لەوێ لەنێو کاسەی سەری بەری وێنەو خەیاڵ دەگرێت و خۆی بەم خەیاڵانە قایل دەکات، لە ئامێزی دەگرێت، بست بە بست ماچی دەکات، رووبەرێك لە جەستەی خانەیەك نابوێریت ماچێکی لەسەر نەخش نەکات. بەم خەیاڵانە خۆشاوی دەمی دەمژێت و ئاوی نێرێتی دەڕژێنێتە هەموو کونێکییەوە، هەڵی دەگلۆفێت و دەی گوشێت، پێوەی دەلکێت، دەیەوێت بوونی خۆی لەناویدا ون بکات و لە جەستەیدا بتوێتەوە و ببێتە بەشێك لەو و تێیدا ئاکنجی بێت و رووحە چەپەڵ و گڵاوەکەی تێکەڵی گردیلەکانی روحە پاکەکەی بکات، بەشێوەیەك لەمەولا نەتوانرێت پاك و پیس لەیەکتری جیا بکرێتەوە. دەزانێت ئەوەی ئەم بە خەیاڵ ئاواتی بۆ دەخوازێت، براکەی بە کردەنی دەیکات...، ئەو خەون دەبینێت و برا نەفرەتییەکەی بەراستی دەیکات. بیرکردنەوە و ترسنۆکی و بێدەسەڵاتی دەیکوژێت، بەڵام ئەو هەر خەون دەبینێت، ئاواتەخوازە، هیچ شتێك لە جیهاندا بوونی نییە، نە مرۆڤ و نەجەنگ و نە سابلاخ. هیچ شتێك نییە، جگە لە درەختێك کە لەنێو کاسەی سەریدا رواوە و بەردەوام رەگەکانی لە روح و بوونی گیر دەبێت، ئەوەش فاتمەیە. ئازارێك گەورە دەبێت و هیوایەك نما دەکات، ئەویش فاتمەی خەونە گەورەکە و خەیاڵە گەورەکەیە و هەر دەبێت رۆژی بە یارمەتی شەیتان وەدەستی بێنێت!

سێ کەس لە سابلاخ رووداوەکان بەسەریاندا تێدەپەڕن و ئەوان لێیان بێ ئاگان و نیمچە نووستوون. بە پێ دەیان شێلن، بەڵام رۆژی وە ئاگاهاتن بەڕێوەیە... دێت، ئەگەر دوای کار لەکارترازانیش بێت، هەر دێت.

* * *

بەرداشی دەستارەکە دەسووڕێتەوەو تۆ لەناویدا دەهاڕێیت، لەنێوان دوو بەرداشەکە وردو خاش بوویت. خەڵکی باسی ژنە هەواڵدەرەکە دەکەن و بەجۆرەها شێوەو چەندین جلوبەرگەوە دەی بینن. ئەو هەر هەواڵەکەدەدات و شتی تر ئاشکرا ناکات، تۆش بەباری

قورسی سابلاخ پشتت شکاوە، کارەساتەکان دەبینیت کە هێشتا ئاوەڵمەن و لە منداڵدانی نادیاردان و گەشە دەکەن. نەخێر، کارەساتەکان ئیدی لە مەلۆتکەیی دەرچوون و ئێستا منداڵێکە و رووخساری دەرکەوتووە، بە دیمەنی بەدگۆڕاوی ئاوەزەکان تێك دەدات و خەڵکی خۆیانی لێ گێل دەکەن، هەیانە هەر بۆ سووکایەتی چاوی لێ لادەدەن، ئەو هەندە دەڵێن (ئەمە هەوری هاوینە!) دەشڵێن (سابلاخ لە گەرووە رێیەك زیاتر نییە و تەنها پێیدا تێدەپەڕن...، هەرچەند مانگێك یان ساڵێکە و هەموو ئەمانە لەبیر دەچنەوە). هەندێکی تر هێشتا بڕوایان بە پارەیە و زێڕی زەردیش پەرجووە، پێیان وایە ئەم زێڕە درەوشاوەیە کە ئاوی چاو دەبات، تەنانەت دەتوانێت دوژمنانیش تێك بشکێنێت. من پێغەمبەر نییم و زانای سەردەمیش نییم، بەڵام دەربارەی مەترسی و گەمژەیی جەنگەکانم بیستووە و خوێندۆتەوە. هۆ دانیشتوانی سابلاخ برسێتی وا بەڕێوەیە! داوام لە خەڵکی دەکرد تا دەتوانن ئازووقەی پێویست بکڕن. لە کەنیسەکەمان تووشی (بەنحاس)ی برا گەورەم بووم و پێم وتی:

- بانگی داود و دانێل بۆ ماڵی خۆتان بکە و پێش نوێژی عەسر منیش دێم.

زۆر بۆ ماڵی براکانم ناچم، کۆبوونەوەی هەموو براکان لە ماڵێکدا شتێکە بەڕاستی براگەورەکەم سەری لێ سوڕما:

- شلۆمۆ، تۆ ترساندمت، چی روویداوە؟

دەستبەجێ وتم:

- ئەوەی لە دەوروبەرتان روودەدات ترستان ناخاتە بەر، کۆبوونەوەمان لای تۆ، یان لای من شتێکی پێویستە و هەر دەبێت بکرێت.

گەر دەربارەی من قسەیان بکردایە، دەیانوت: (شلۆمۆ لە هەموومان بچووکترە، بەڵام لە هەموومان وریاترو هۆشمەندترە)، دەست نیشان کردنم بۆ سەرپەرشتی کردنی کاروباری تایفەکە بوو بەشتێك شانازییان پێوەدەکردم. ئارەزووم لەمە نەبوو، بەوەش خۆشحاڵ نەبووم کە رووسە داگیرکەرەکان لەو ئەرکەی رام دەپەڕاند و بەبێ ویستی خۆم جێبەجێم دەکرد، بەمنیان سپاردبوو. فەرمانیان پێ کردبووم داواو ئاگادارییەکانیان بە رۆڵەکانی تایفەکەمان بە سابلاخ بگەیەنم و ببمە میانگیر لەنێوان هەردوولا، بەڵام گۆڕ

هەڵکەندن بۆ کوژراوەکانی موسڵمانەکان شتێك بوو بەدحاڵی بوونی تەنانەت لە هەست و سۆزی هاوکارو خۆشەویستم میریش دروستکرد. لەبەرچاوی موسڵمانەکان بووین بە بەکرێگیراو و دەست تێکەڵکردو و لەگەڵ دوژمنان، بەلام رۆژانی داهاتوو بۆیان دەسەلمێنێت کە ئێمە هەر وەکو جاران براو کەسوکاری ئەوانین و مەینەتی جەنگ نامان گۆڕێت.

ماڵەکەی بەغاس کە لە براکانم و خێزانەکانیان جمەی دەهات، بەغاس پێی وتم:

- بێجگە لەکاتی مردنی باوکم و دایکم خوا لێیان خۆش بێت، سەرت بە ماڵەکەمدا نەکردووە، سەریشت لێ نەداوم، مەگەر بەبۆنەی خەتەنەکردنی کوڕێك یان کاتی باڵق بوونی، هاتبیت. شلۆمۆ، خوا بکات ئەم سەردانەی ئێستات خێر بێت.

سلاوم بۆ گیانی یەهودای باوکم و مریەمی دایکم نارد، باوکم دوای لە دایکبوونی سەیون کۆچی دوایی کرد، بەلام مریەم لەگەڵ خوشك و براکانیدا ماڵەکەیان بۆ ئاوەدان کردوومەتەوە. بەخۆمم وت: (ئێمە لە رۆژێکدا ئێرەیی بە مردووان و منداڵان دەبەین).

بەدەنگێك هەموو ئەوانەی لەوێ بوون بیستیان وتم:

- براکانم، من بۆ کارێکی گرنگ هاتووم، من ئەو ئافرەتە هەواڵدەرە نیم کە رۆڵەکانی سابلاخ دەی بینن و دەربارەی شتهایەکی ئاڵۆز ئاگاداریان دەکاتەوە، بەلام روونیشی ناکاتەوە، من برای بچووکتانم و ئەوەندە لەروونیدا زێدەڕۆیی دەکەم، رەنگە تێم نەگەن، یان بەخراپ لێم تێبگەن.

- شلۆمۆ تۆ شتێك دەشاریتەوە و ئای درکێنیت.

- دانێل ئەمەی وت و هەر لەسەرەتاوە بیانووی پێدەگرتم، هەرچەندە ئێمە لەژێر چاودێری دایك و باوکێك بووین، بەلام هەریەکەمان رێگەیەکی جیاوازمان گرتبووە بەر. باوکم کشتوکاڵ و بازرگانی پێکەوە دەکرد، لە سەفەرە بازرگانییەکانیدا لەگەڵ خۆیدا دەی بردم، نەك لەبەر ئەوەی منداڵ و بەناز بووم، بەڵکو من وەك سەلمانی کوڕم هێشتا سەرم لە هێلکە نەجووقابوو بانگەوازی ئارەزووەکانی خۆم دەکرد، بەلام ئەوان ئاڵوودەی زەوی بوون. بۆنی زەوی و تێکەڵبوونی و کێلانی ئەفسوونی لێکردن، ئاخر بەرووبوومی

دوای ماندووبوونێکی زۆر ڕەنجێکی ڕۆمانسیانەیە، باخەکانی باوکم بەهەشتێك بوون بۆ خۆیان و ئێ بێ پارەش نەبوون، بەڵام بیریان هەر لای زەوی بوو، کە لەگەڵ باوکمدا بەناویان دەهێنا. وەك من خەیاڵی بەرزەفڕیان نەبوو، کە بەرەو ئاسۆی دوور بڕوات و دنیا تەی بکات، بەڵکو هەر لە نزیك زەوییەکە مانەوە، وەك ریشاڵی ئاسن پێکەوە بستران و تێك ئاڵان، تەنانەت لەکاتی مەترسیی مردنیش جێیان نەهێشت. من ڕەهەندەکانی بارودۆخەکەیان بۆ راڤە دەکەم، ئەوەی لە منداڵدانی نادیار دایە پێشانیان دەدەم، من گەر ترسم لە ئێوە نەبێت، لەکاتی خۆم نادزمەوەو بێم بۆ لاتان، هەموو خەمی سابڵاخ و دانیشتووانەکەیم لەسەر پشتم هەڵگرتووە.

بەڵام...، یەکێکیان قسەکەی پێ بڕیم و وتی:

- کێ دەڵێت تورکە عوسمانییەکان دووبارە دێنەوە؟ ئەی نابینیت لە گیانەڵادان؟

کەواتە ئێوە کەڕو کوێرن! وتم:

- براکانم، تورکەکان کانێکی مرۆییان هەیە و بە ئاسانی دوایی نایات، ئەوان لە عێراق سوپا ڕێك دەخەن و بەرەو باکووری دەنێرن. براکانم هێشتا شەڕەکە لەوپەڕی گەرمیدایە، گەر ئاگاداری هەواڵەکان بن، ئینگلیزەکانیش بەرەیەکیان لە باشووری عێراق کردۆتەوەو سوپای هیندستان و خۆبەخەشە سیخەکان بەکار دێنن.

بەنخاس ساریلکانە وتی:

- ئەمە مانای چییە؟

- مانای ئەوەیە کە جەنگەکە درێژە دەکێشێت، خۆ ئەگەر جەنگەکە لە باشوورەوە گەرم بێت، ئەوا ڕەنگە سەرچاوەی خۆراك لە دەریاوە بەرەو ئێران ببڕێت.

هەموو بێدەنگ بوون. ئیدی نازانم ئەوەی وتم سەرسامی کردن، یان لە ترسان بێدەنگ بوون، یان لە قسەکان نەگەیشتن، لەکۆتاییدا بەنخاس پرسی:

- کەواتە ئەوە ئەو ترسەیە کە هێشتا بانگەشەی بۆ دەکەیت، بۆیە زۆربەی دانیشتوانی سابڵاخ بە شێتت دەزانن؟!

وەك هەواڵدەرو ئاگادارکەرەوەیەك وتم:

- بێگومان برسێتی بەڕێوەیە...، نیشانەکانیشی بۆ هەمووان دەرکەوتووە...

کەمێك بیرم کردەوە، ئینجا هەناسەیەکەم هەڵکێشا
- خۆزگە تەنها برسێتی بووایە...
ئەم ترسانەم لە خەیاڵی خۆم ڕەواندەوە. خۆزگــە وەك وام پێــدەڵێن شـێت بوومایــە! کاشکێ مـەزنەکانم وەك تیری کوێرانە هەڵەبوونایە...، بریا کەسـێك بوومایـە خـەیاڵ و ورێنە بکات...، شەڵڵا ئەوەی بەخەیاڵی مندا دێت تراویلکەیـەك بێـت و شـێتایەتی و ترس بۆمی دروست بکەن.
- پێشنیارت چییە؟!
- هێشتا کات بە بەرییەوە مـاوە، هێـشتا لـە تـاران ئازووقـەی پێویـست هەیـەو کەڵەکە کراوە، هەموو پارەی مینش لە خزمەتتان دایە.
هەرسێکیان بەسووکایەتی کردنەوە پێکەنین. ناڕەزاییم بەرانبەر سووکایەتیکردنیان دەربڕی وتم:
- جگە لە سەفەری تاران چیدیکەتان لەدەست ناچێت، چـەندتان پـارە پێویـستە، دەتان دمێ. خۆ ئەگەر گرەنتی ئـارامی زۆرترتـان گەرەکـە، ئـەوە دەسـتبەجێ بـەخاوو خێزانەوە بەرەو باشوور بۆ لای خاڵوانمان لە ئەسفەهان، کۆچ بکەن.
شێتاسا لە قاقای پێکەنینیان دا، ناشێت، ئەوە مـنم کـە پـێم پێدەکـەنن! بەیـەك دەنگ وتیان:
- ئەی مەڕو ماڵاتمان، پەلەوەرمان، کێڵگە و باخەکانمان!؟
- ئەرێ ئەم ساڵ هیچتان چاندووە؟!
هەرسێکیان زمانیان تێك ئاڵاو برا گەورە وتی:
- ڕاستیت دەوێـت بـەروبوومی هاوینمـان هـەڵگرتووە، بـەڵام بـۆ کـشتی زسـتان زەوییەکانمان ئامادە نەکردووە.
- کەوابوو دەستبەجێ گالیسکەکانتان ئامادە بکەن و بەرەو تاران بکەونە رێ و تـا دەتوانن خۆراك بکڕن.
- تۆ بەبێ هۆ تۆقیویت!
- مادام هێشتا کات بە بەرییەوە ماوە، بێ دوو دڵی ئەمە بکەن.

- تۆ وڕێنه دەکەیت و بۆخۆت قسه دەکەیت...!

- ئەمه سێ کیسەیه، بۆ هەریەکەتان کیسەیەك زێڕو بەشی تازووقەی دوو ساڵ زیاتر دەکات.

دانێیلی برا ناوەنجی وتی:

- برام بایی ئەوەمان هەیه، پارەی خۆت بۆخۆت، بەڵام ئەگەر ئەم هەموو ماندووبوونەمان چەشت و ئەم پارە زۆرەمان خەرج کرد و دوایی دەرکەوت کە ترسەکەی تۆ تەنها خەیاڵ بووە!؟

- من هیوادارم ترسەکەم خەیاڵ بێت، بەڵام کارتەقەتی سوودی هەیەو زیانی نییه، ئامۆژگاری برای بچووکتان لەگوێ بگرن، ئەمه تەنها گەشتێکەو لێی ژێوان نابنەوە. سەبارەت بە پارەش پارەی منەو وەك وتم لە خزمەتتان دایه.

قسەو وتووێژێکی زۆرمان کرد، لە ئەنجامدا برای بچووك قایلی کردن. سەرەڕای جیاوازی نێوان تەمەنمان ئەزموونی ژیانی من لە ئەزموونی هەر هەموویان زۆرتر بوو. لەمەولا کاتێك جیهان رۆڵەی بەدگۆڕاوی جەنگ دەخاتەوە و لە سابلاخ کەسێك ببینێت، بڕواناکات بەنخاس و دانێل و داود دەبینێت کە سوپایەك لە ئافرەت و پیاو و منداڵ و بەساڵدا چوویان لەگەڵدایه. ئەمه هۆشمەندی ئەو کەسەیه کە پێیان دەوت بۆ خۆی قسه دەکات. رەنگە ئەو کاتەی قسەم لەگەڵ دەکردن سەلایان لە شێتی من کردبێت!

کاتێك ماڵەکەی بەنخاسی برام جێهێشت، سێ کیسه زێڕەکەم لەسەر مێزەکە دانار وتم:

- با هەریەکەتان چەند دەتوانێت عارەبانه لەگەڵ خۆی ببات، کوڕەکانیشتان ببەن، تا لەگەڵتاندا گالیسکەکان لێبخوڕن، بەتایبەتی لەگەڕانەوەدا، ئەمه ئامۆژگاری ئەزموونکارێکە، هەر وەکو شەماشی کەنیسیش دەڵێت نرخی خوێندنەوەی تەورات زیاد دەکات، خودا تەمەنی ئەو کەسەش زیاد بکات، کە زیادی دەکات. ئێوەش بەگوێرەی توانات زیادی بکەن و بۆ خۆراکی خۆتان قرچۆکی لەپارە مەکەن!

جێم هێشتن و ئەوانیش خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون، بۆ سەفەری کڕینی رزگارکەر.

٭ ٭ ٭

لاملی میر عەلی زللە و مستەکۆڵە و پێ لەقەیەك بوون و جەستەمیان هەلاهەلاکرد. سووربوونە برینداز کەرکەی تەنگەتاوی کردم و بەناچاری بەرەو نووسینگەکە پەلکێشی کردم. لەنووسینگە چی بکەین، ئاخر وەك پێم وت کەلوپەلەکانمان لە بازاڕی جەنگدا رەزیلە؟! وەلامەکەم وەك زللەیەکی دیکە لێی وەرگرت. بازرگانەکانی سابلاخ و دەوربەری هێشتا(کۆگاکان) پڕ دەکەن، سەیرم پێهات کە قاپ و قاچاغی چینی لەم رۆژە رەشەدا کەلوپەلی لەبرەومان بێت، وڕێنە کردنەکەم بەزەیی هاتنەوەیە بەم کەسانە. سەرەڕای درەوشانەوەی خۆرو زۆر دەرکەوتنی ژنە هەواڵدەرەکە هێشتا خەو چاوی بەرنەداون، نازانم چۆن راستی نابینن، کەچی دەکەوێتە بەرچاویان و بەگوێی خۆیان دەی ژنەون، ئاخر بەبێ خواردن چی لە قاپ و قاچاخی چینی بکەن؟! لە بازرگانە تاك فرۆشەکانم پرسی: دوای نەمانی خۆراك چی لە قاپ و قاچاخ دەکەن، ئایا ددانەکانتان دەتوانن بیان کرۆژن؟ ئایا گەدەتان دەتوانێت هەرسیان بکات؟!

بێگومان ئەم پرسیارە بە دڵی هاوکارو شەریکەکەم نییە، ئەو ئاواتی ئەوەیە نووسینگەکە پڕ بێت لە کڕیارو کۆگاکە لە کەلوپەل بەتاڵ ببێتەوە.

دوای ئەوەی نووسینگەکە کڕیاری لێ نەما، پێی وتم:

- شلۆمۆ، دەزانیت نەهاتنت بۆ نووسینکە لە هاتنت باشترە؟

تۆ وەك ئەوەیە بە ئەنقەست وا بکەیت خەڵکی لێمان بڕەوێنەوەو لەگەڵ خۆیاندا بڕێوی ئێمەش ببەن!

بڕێوی ئێمە! ئاه بریا لەجیاتی پارە خۆراکیان پێمان دەدا، بەڵام ئەمە دەبێتە تاوان. لەم رۆژانەدا کەلوپەلەکەمان بێ برەوە! شەڵلا هەروەك چۆن لە کۆتاییدا براکانی من برەوایان هێنا، ئەمانیش هەستیان بەمە دەکردو برەوایان دەهێنا و کاروانەکانیان بەرەو

تاران بەرێ دەکەوت و هەرچی خۆراکێکی تێدایە دەیانکڕی، تا سابڵاخ پڕ دەبوو لـەوەی کە زگ تێر دەکات، پڕ لەو ژیانە دەکات کە هاوکارەکەم پێی دەڵێت (گو).

- هێشتا بڕوات نەکردووەکە مەینەتییەکە پەرە دەسەنێت و دەبێت بەکارەسات؟!

بەتاسەوە وتی:

- خودا ویستی لـەم شارۆچکەیەدا کـە گاورەکـان (ئـاڵوگۆڕ بکـات) و سـوپای موسڵمانان دوور بخاتەوە.

ئەوەندە نابات بەچپە باسی دەکەن، وەك ئەوەی نهێنییەکی لەلا بدرکێنم و وتم:

- سوپای عوسمانییەکان ئەوانەی لە عێراقییەکان پێکهاتووە لای چیای حەمرینـە، رەنگـە لـەوێ نـەمێنێت و بـەرەو بـاکوور بێـت، عوسمانییـەکان لـەناو دراوسـێ رۆژئاواییەکەمان ئەوەندە سەربازی یەدەگیان هەیە بۆ چەندین سـاڵ بەشـی خـۆراکی تۆپەکان دەکات.

رووخساری میر عەلی گەشایەوە، ئێستا بە پەرۆش و دوور لە گرژی و تەوسەوە وتی:

- باوکی سەلمان، کەواتە خودا لە دەمتی بژنەوێت، ئەگەر عوسمانییە موسڵمانەکان بەڕاستی ئەم گاورانـە لـە سـابڵاخ دەربکـەن ئـیتر لام گـرنگ نییـە لەگـەڵ هـەموو کەسوکارەکەمدا لە برسان بمرم.

چەند چرکەیەك تاریکی بەر چاومی گرت، ئەوە چـی لـە مـیر عـەلی دەبیـستم؟! دەڵێی دوای دەسـاڵ تازە هاوکارەکەم دەناسـم، هـەر دەڵێـی بـە منـداڵی لـە حەوشـەی ماڵەکە بەپێی پەتی وازیمان نەکردووە و لە کۆڵانیش پێکەوە گەمەمـان نەکردووە، ئـەو دەمە باوکم هاوکارو شەریکی باوکی بوو، تا لە هەموو شتێکدا جێی ئەوانمان گرتەوە!

- ئەی هاوکار و هاوبەشم، ئەمە دوور نییە، بەڵام جەنگ سەختە و بـەبێ روودانـی ئەوەی تۆ دەیخوازیت کۆتایی نایەت.

- واتا سابڵاخ دەبێتە تۆپێك بەدەست هەردوولاوە، تێی هەڵدەدەن و تـووری دەدەن و ئێمەش لەناویداین؟!

- هاورێم، خۆ تۆ وا بەچاوی خۆت دەی بینی، ئەوە دوو جارە تێـی هەڵـدەدەن، ئـیتر هەر خودا دەزانێت تا ئەم جەنگە یەکلادەبێتەوە ئەم گەمەیە چەند دەخایەنێت.

- شلۆمۆ، قەت باوەڕ ناکەم، تۆ بوویت بە پێغەمبەری بەڵاو شوومی!

- بۆیە گەرەکە خۆمان ئامادە بکەین، تا پێی هـەردوولا لـەوەی روویـداوە تونـدتر نەمان شێلێت. بۆیە پێویست ناکات وەك جارەکەی تر لە سابلاخ هەڵەی موسڵمانەکان بەرانبەر رووسەکان دووبارە ببێتەوە، لەکاتێکدا گەر دووبارە ناچار بـوون شارۆچـکەکە جێ بهێڵن.

بە تووڕەییەوە هاواریکرد:

- راوەدوونانی گاورانی بکوژ دوای هەڵاتنیان ناو دەنێی هەڵە؟!

بە غەمگینییەوە وتم:

- چ ناوێکی لێ دەنێیت، بنێـت، بـەڵام ئەنجامەکـە ئاوهـا دووبـارە ببێتـەوە، ئـەم شارۆچکە بێ تاوانەکەمان، بیەوێت یان نەیەوێت تێدا دەچێت.

* * *

کاتێك لەدەرگای ماڵەکە چووە ژوورەوە، بەهۆیەکەوە کـە ئـەو کاتـە لـە قـووڵایی نادیاردا بوو وای بەخەیاڵدا هات کە ئەم خانووە فراوان و گەورەیە لەپڕ تەنگ بۆتـەوە، بەجۆرێك بچووك بۆتەوە دەکرێت بچێتە کونی دەرزییەوە. سەری بـادا و مێردەزمەکـەی لە کۆڵ بووەوە و خانووەکە وەك خۆی لێهاتەوە و حەوشەکە فراوان بووەوە وەك مەیـدانی کێبڕکێی وڵاخی بەرزەی لێهات. کاتی نیـوەڕۆ خـەو بـوو، لـە وادەی نیـوەڕۆژە کـەمێك دواکەوت، ئەسمەریش تا سەرداری ماڵ سەردەقی هەموو خواردنێك نەشکێنێت، بوار بە کەس نـادات نـان بخـوات. بێگومـان منداڵـەکان برسـییان بـوو، لـێ ئیـستیر خـۆی بەهاتنەوەی ئەو نابەستێتەوە و هـەر کـە برسـی بێـت نـان دەخـوات. بـینی شـیر بـە منداڵەکەی دەدات و بە کەوچك شۆربای برنج بە شیر دەکاتە دەم ناحومـەوە. قەشـەنگ بۆ خافڵاندن یاری لەگەڵ منداڵەکاندا دەکات، تا باوکیان دێتەوە. ئەسمەر بە دۆلکە ئاو لە بیرەکە دەردەهێنێت تا کوپە بەتاڵەکە پڕ بکـات. بـەدەنگێکی بـەرز سـڵاوی کـرد. منداڵەکان قەشەنگیان جێهێشت و بەرەو لای رایان کرد، تەنانەت ناحومی بـچووکیش

وازی لـە شـۆرباکەی هێنـا و بـە سـاتمەکردن بـۆ لای هـات. قەشـەنگ بەهاتنـەوەی خودانەکەی گەشایەوە، ئەسمەریش بەشادمانییەوە بەخێری هێنـاو زەردەخەنەیـەکی پـڕ سۆزو خۆشەویستی هەموو رووخساری گرتەوە، تەنها ئیستیر کەڕو لاڵـەو چـاو لەسـەر کچەکەی بەرز ناکاتەوە، کە خەریکە شیری دەداتێ دەست بە قژە رەش و کورتە ئاوریشم ئاساکەیدا دەهێنێت. تەماشای ئەسمەری کرد و نیگایەکی سوپاسگوزاری بۆ رەوانەکرد. هەردوو نیگاکە یـەکانگیر بـوون، هـەردووکیان خۆشەویـستین، بـەڵام مانـدوون. ئـەم بەختەوەرە، کەچی لەوەتەی ئەم جەنگە سەپێندراوە، خەمێکی نادیار سیمای داپۆشیوەو بەختەوەرییـەکـەی دەشـێوێنێت. دیقـەتی دا ئەسمـەر جحێڵێکـی رووخـسار و تەنـدام وردیلەیە، پێست ئەسمەرە، شنەبا گەمە بە پرچـە رەش و درێژەکـەی دەکـات و دەگاتـە خوار پشتی. جوانییەکەی وەك خەسێتی خۆی هێمنە و لەسەرخۆیە، ئەمـەش سروشـتی بوو کە شووشەیەکی لێ دارێشتبوو کە هیچ ئەفسوونێك شان لەشـانی نـەدات و هـیچ جوانییەکیش پێی نەگات. ئیستیر لەو منـداڵترە و لـە رووالەتـدا لـەو جـوانترە، بـەڵام سیمای نیشانەی خراپەکاری لەخۆ دەگرێت، سیمایەك هـەموو تونـدوتۆڵی روحـی لـێ زەوت کردووە و بە تۆڕەکەیەوە بووە. ئـەو شـلۆمۆ کەتانییـە و لەسـەر هـەموو زارێـك بەزیرەکی و هۆزان و هۆشمەندی باس دەکرێت. ئەی چۆن تێکـەوت؟! کاتێـك ئیـستیری خواست چۆن ئەم تێکەوتنەی خۆی هاتە بەرچاو؟ ئایا گـەر ئەسمـەر و قوربانیدانەکـەی ئەسمەر نەبووایە دەی خواست؟ ئەسمەر خۆی بـەقوربانی ئازارچەشـتنەکانی ئـەم کـرد و ئیستیری بۆ خواست، ئەمەش کارێکە جگـە لـە ئەسمـەر هـیچ ژنێکـی تـر نایکـات! ئەمێستا ئەو تەنها لۆمەی خۆی دەکات، دووجار دەی کات نەك جارێك.

هەر کەسێکی تـر خـانێمکی وەك ئەسمـەرو منداڵگـەلی وەك سـەلمان و سـەیون و مریەمی هەبووبا، عاشقی ژنێکی دی نەدەبوو، بەڵام ئەم خیانەتی لە خاوو خێزانەکـەی خۆی کرد و عاشقی ئیستیری گێل و گەوج بوو، بواری بـە ئارەزووەکـانی خـۆی دا، تـا لەرێ لابدات و سنووری خێزانێکی هەبووە بشکێنێت و لـە پـەناو پەسـێری ترسـناکی کۆڵانەکاندا دەست پان بکەنەوە. ئەوەبوو بە قوربانیدانەکەی ئەسمەر قایل بوو، بەڵام ئەو قوربانیدانە بێداری نەکردەوەو ئیستیری هەر خواست...، ئەوەتا ئەمێستا دیقەتی ئیستیر

دەدات، دەبینێت رووخسارە جوانەکەی ئاوێکی گەڕاوە و بۆگەن دای پۆشیوەو هەموو ماڵەکەی گرتۆتەوە! ئەم هزرانەی لەخۆی دوور خستەوە، رۆیشت و دەستەکانی شت و جلەکای گۆڕی و دانیشت، لەگەڵ ئەسمەر و منداڵەکان و قەشەنگ دەستی بە نان خواردن کرد، ئەم کچە دڵسۆز و گوێڕایەڵە! ئیستیر لەخۆی بەولاوە گوێی لە هیچ نییە و داب و نەریتی ئەم ماڵەی تووڕهەڵداوە...، بەڵکو تووڕهەڵدانەکەی گەیشتۆتە حەناس کەمکردنەوە و سووکایەتی. رەنگە جاریش لە ئەسمەر بکێشێت، ئای کێ هێنای و لە مێردەکەی خۆی مارەیکرد! گەر ئەم غایلانەی من روویان بدایە ئەوسا مەینەتی ماڵەکە شانی لەشان مەینەتییەکانی سابلاخ دەدا، بەلام ئایا ئەسمەر قسەی دەکرد؟ ئاخر هەر ئەو نییە ئاگر لەم ماڵە بەردەدات؟ کەواتە سەرچاوەی تارمایی ئەم خەمە کپ و خەفە بووەی سەر رووخساری ئەسمەر چییە؟ ئەو دەیهەوێت دای پۆشێت و دەری نەخات، بوار نادات بکەوێتە سەر ئەم رووخسارە پاك و بێگەردە.

کەوچکەکەی خستە ناو لە گەنەکەوە و پرسی:

- ئەوە چیتە ئەسمەر؟

بیری پەرت بوو، وەك ئەو کەوچکەکەی داناو لەسەرخۆ وتی:

- باوکی سەلمان، هیچ نییە. نانەکەت بخۆ باوکی منداڵان.

پێداگری کرد و وەك کەسێکی پەژارە و خۆتێهەڵقورتێن دەنگی بەرزکردەوە:

- ئەسمەر، ئاسایی نییت، ئەی ئازیزترین هاوسەر، چیت لە خەیاڵدایە؟

بەدەنگێکی غەمگین و گمەی کۆتر ئاسا وتی:

- بیر لە کەسوکارم دەکەمەوە، ئاخۆ لە غەریبی چیان بەسەر هاتبێت؟

هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

- دەست پێشخەرییان کرد و پێش ئەم جەنگە نەفرینە بەرەو عێراق باریان کرد.

- باوکی سەلمان، تۆش شتێکم بیردەخەیتەوە کە خۆم دەیزانم!، بەلام شلۆمۆ باوك و دایکم بۆچی باریان کرد؟

وەك ئەوەی گوێی لێم نەبووبێت، بیری رۆیشت.

- ئەسمەر، ئاخر خوشکەکەت لە بەغدا شووی کرد.

وتی:

- بەڵام من لە سابلاخ شووم کردووە.

- براکەتیش لە بەغدا ژنی هێنا.

- بۆیە کەوتنە دوای دوران و یەکێکیان جێهێشت.

کەمەکێ تاس بردییەوە، ئاخۆ ئەسمەریش وەك ئەم دەستی بەوە کردووە هەست بە تەنهایی و گۆشەگیری بکات؟، بەڵام وتی:

- ئەی ئازیز و خۆشەویست، ئاخر دەیانزانی ئەو یەکە دەدەنە دەستی کێ.

هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

- ئەگەر ئێمەش بەدوایاندا برۆیشتینایە، ئەوا خۆمان لە مەترسی ئەم جەنگە رزگار دەکرد.

بەپێکەنینەوە وتم:

- ئەسمەر، ئایا دەزانیت کاتێك بۆ شتکرین بۆ تاران چووم، بیرم لەوە کردەوە کە بۆ پایتەختی تاران راتان رفێنم، تا مەترسی جەنگەکە دەرەوێتەوە، لەوێ بمێنینەوە؟

- باوکی سەلمان، ئەم بیرۆکەیەی خۆتت پێ نەوتووم!

- چونکە توورەهاتترین بیرۆکە بوو. ئەسمەر، خوانەکەران بنیادەم تووشی هەر مەینەتییەك بێت، هیچ شوێنێك جێگەی ماڵەکەی خۆی بۆ ناگرێتەوە. بە نیمچە عوزرخواهییەکەوە وتی:

- بەڵام باوکی منداڵان، ئەوان لەم شەڕە دوورن.

جارێکی دی پێکەنیم و ئەو نهێنییەم بۆی ئاشکرا کرد کە لەمەولا نهێنی نەبوو:

- عوسمانییەکان، عێراقییەکانیشیان لەم جەنگەدا تێوەگلاندووە و ئەوەی توانای خزمەتی هەبێت کردوویانە بە سەرباز. هەواڵەکان دەڵێن گوایە ئینگلیزەکان بەرەیەکی تریان لە باشووری عێراق کردۆتەوە، بەڵێ ئەسمەر، عوسمانییەکان هەموو نێرینەیەك توانای خزمەتی هەبێت لە عێراق دەی کەن بە سەرباز و بەرەو باکوور و بەرەو باشوور رەوانەی نێو جەرگەی هەراو قەوماوەکەی دەکەن.

بە پەژارەیەکی روونی دەنگییەوە کە لە سیمایدا دەرکەوت وتی:

- تۆ بڵێیت باوکم و براکەمیان کردبێتە سەرباز؟

دووبارە پێکەنیم و وتم:

- ناتوانن، ئەسمەر ناتوانن، چونکە مامم و براکەت رەگەزنامەی ئێرانیان هەیە، ئێرانیش وڵاتێکی بێ لایەنە و یاسای نێودەوڵەتی رێگە نادات بێگانە بکرێتە سەرباز.

- دڵم پێم دەڵێت یان باوکم، یان براکەم، یان هەردووکیانیان پێکەوە کردووە بە سەرباز.

ئەمجارە پێ نەکەنیم، بەڵکو کەوتمە نێو بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، رەنگە ترسەکەی ئەسمەر لەجێی خۆی بێت، ئەو بۆ ئەم بیرکردنەوەیە تاوەزی لە من لە پێشترە.

وەك ئەوەی خۆم بدوێنم و وتم:

- رەنگە عوسمانییەکان گوێ بە یاسا نەدەن، هەروەها جەنگیش پەیڕەوی یاسا ناکات، جەنگ بیانوویەکە لە هەموو قەدەغەکراوێکدا بەدەست مرۆڤەوەیە. ئێ دایکی منداڵان مادام ئەم جەنگە نەفرینە لە ئارادایە، هەموو شتێك لە گوینە.

❊ ❊ ❊

دەزانیت چەند حەزم لە نان و رۆنی خۆماڵییە. تۆ خۆت چەندەها جار بینیومتە پارچەیەك رۆنەکەرەم کردۆتە نێو تاوەیەکەوە و لەسەر ئاگر تواندوومەتەوە، دوای توانەوە دام دەگرت و نانم تێهەڵدەکێشا و بەوپەڕی تامەزرۆییەوە دەمخوارد. ئەوە خوویەك بوو ساڵانی دواتر ئەو رۆنەکەرەیە هۆقەیەك کەمی کرد و ئارەزووەکەش نەمان لەو ئێوارە زریاناوییەدا ئەو رۆنەکەرەیەم توانەوە و دەستم بە تێهەڵکێشینی نان کرد و منداڵەکانیش هەروا تەماشایان دەکردم. بەهۆیەوە کە نەمزانی چییە لەبری ئەوەی شادمان بم دڵم گوشرا. داوام لە قەشەنگ کرد منداڵەکان بۆ ژوورەکەی خۆیان ببات و باش دایان پۆشێت. ناحومیش بۆ لای دایکی ببات و ئەویش داپۆشێت. ئیستیر لە ژوورەکەی خۆی لەگەڵ تیستیری بچووك مژوول بوو، نازانم یاری لەگەڵدا دەکرد، یان رەنگە هەموو ئەو ماوەیە یاری پێ کردبێت. تا ئەمڕۆش نازانم ئیستیر بەراستی تێگەیشتبوو کە ئەو دوو منداڵە مرۆڤی لە گۆشت و خوێن دروست بوون، یان تەنها وەك دوو بووکەڵە تەماشایان دەکات و بۆ ئەوە خستوونیەتەوە تا بێ تاقەتی خۆی پێیان

دەربكات. بایەکی رۆژئاوایی و شاخاوی سارد هەڵیکرد و هەواڵی هاتنی زستانی پێ بوو. ماوەیەك بوو ئازووقەمان بەزیادەوە خستبوو، ژوورێکی زیادەمان بۆ قاورمە و وشکەمەنی تەرخان کردبوو، هەندێك شوێنی تازەشمان لە زەوی بۆ شاردنەوە و لە چاڵ نانی قاورمە دانابوو. هەوا ساردەکە بەر جلەکانم کەوت و گەیشتە ئێسقانم، لەرزێك دای گرتم، ئینجا گوێم لە شتێك بوو کە لە دوورەوە بادەی هێنا، باش گوێم هەڵخست و کرم لەخۆچنی. ئەسمەر بەرانبەرم دانیشتبوو، کە ئاوێنەی دەموچاوی من بوو، ئاڵۆزییەکم لە دەموچاویدا بەدیکرد، دڵنیا بووم کە ئەمە تێکچوونی رەنگی منە، دڵ گوشرانە لەنکاوەکەم زیادی کرد و وتم:

- ئەسمەر، لەگەڵ مندا باش گوێ هەڵبخە!

لێی پرسیم:

- باوکی سەلمان، هیچ دژنەفیت؟!

بیرم کردەوەو دڵگوشراوانەکەم گەیشتە ئەوپەڕی

- ئەسمەر، گوێ هەڵبخە، گوێ هەڵبخە و پێم بڵێ ئەوەی دەی بیستیت لە رۆژئاواوە دێت، یان لە باکوورەوە!

گوێ راگرتنەکەی باش پێوە دیار بوو، ماوەیەکی زۆر گوێ تەقێی کرد، ئینجا وتی:

- باوکی سەلمان، وا تێدەگەم نیشانەی زستانە، من گرمەی هەورێکی توند دەژنەوم، رەنگە ئەمە بەرایی زستانێکی سەخت بێت.

خەمێك سەری تێکردم و بەسەر دڵگوشرانە سەرچاوە نادیارەکەمدا زاڵ بوو.

- بەڵێ ئەسمەر، ئەمە زریانە، بەڵام زریانی جەنگە نەك زستان، دایکی منداڵان رەنگە هەردوو زریانەکە یەك بگرن و دەست لەناو دەست سەر لە سابڵاخ بدەن.

ئەمێستا رەنگ تێکچوونەکەی تەنها رەنگ تێکچوونەکەی من نەبوو، دوو رەنگ پەڕیوی لە سیمایدا تێکەڵ بوون، بە بێزارییەوە پرسی:

- باوکی سەلمان، ئەی تۆ چی دەژنەفیت؟

- ئەسمەر، (پێکدادانێکی توند) دەژنەفم کە لەلای رۆژئاواوە بایەکە دەیهێنێت.

- مەبەستت چییە؟!

ریتمی دەنگی ناسك و ترساو بوو، کاشکێ دەمتوانی هێوری بکەمەوە، لێ من نازانم درۆ بکەم، تەنانەت درۆی سپیش دادێك نادات، وەك هەواڵدەرێکی شووم کە پێیم ناخۆشە وابم، وتم:

- مەبەستم ئەوەیە، کە توونی داگیرساوی جەنگ دووبارە لە سابلاخ نزیك دەبێتەوە!

بۆ سبەینێ ترسەکەم بەڕاست گەڕا، سەبازە خاوو خلیچکە رووسەکان لەخەو رابووبوون نائاسایی گورج بووبوونەوە، جموجۆڵ و چالاکییەکیان تێکەوتبوو کە تێکڕای شەقامەکانی سابلاخی گرتبۆوە. سەنگەرەکان قایم دەکران و مەتەرێزی تازەش چێ دەکران. گڤە و ورەی ئۆتۆمبێلی سەربازی زنجیردار وەستانیان بۆ نەبوو، لوولەی تۆپەکان ئاراستەی رۆژئاواو باکووری رۆژئاوا کرابوون، کە سەرچاوەی تەقینەوەکان بوون. تۆپباران نەدەوەستا، جارێ توندو گاڤێ نزم، بڕی جار مەگەر باش گوێت خەڵخستبا، ئەگینا نەت دەبیست، جارێ واش هەبوو گەر مژوولی شتی تریش بووبایت بەروونی دەت بیست و ئاگاداری دەکردیتەوە، بێگومان ئەم زمستانە گەرم و دایساو دەبێت، تەنانەت ئەگەر هەموو ماڵەکانی سابلاخ بکەونە ژێر بەفر و بەستەڵەکیشەوە. لە گەڕانەوەی براکانم و ئەوانی تر بە خۆراکەوە لە تاران دڵنیا بووم. بڕیارم دا کوڕەکان بۆ میدارش* نەنێرم و لە ماڵەوە قەتیسیان بکەم. میری عەلی بە رووخسارێکی مژدە بەخشەوە وتی:

برادەر رووسەکانت خۆیان بۆ هەڵاتن ئامادە کردووە.

قسەکەی وەك نینۆکێکی تیژ گۆشتەکەمی سمی. تووڕەیی و ئازارەکەیم قووت دایەوەو بە ناقایلییەوە وتم:

- برادەرەکانم؟! دیارە عوسمانییەکانیش برادەری تۆن؟! میر، تۆ برادەری منیت، هەموو رۆڵەکانی ئەم شارۆچکە داماوە برادەری منن. ئێمە ئێرانین و کوردین، هەرچەندە شا لە تاران سەری ناوەتە بن باڵی خۆی و دەستی لێ بەرداوین، رووی خۆی لێ وەرگێڕاوین و پاشەڵی تێکردووین و پێماندا دەڕێت، بەڵام عوسمانییەکان و رووسەکان شارۆچکەکەمانیان کردە شوێن پێ لەقەی خۆیان و رێڕەوێك بۆ ئامانجە

گلاوەکانی خۆیان، جگەل تێکدان و کاولکاری هیچی دیکەمان لێیان دەست ناکەوێت. هاوڕێم ئەمە بەچاوی خۆت دەبینیت و دڵنیا دەبیت.

بێدەنگم کرد، چرکەیەك منیش بێدەگ بووم و لێم پرسی:

- ڕەزای برات ها لەکوێ؟

هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

- ئەم لاوە دەڵێی تووشی جۆرە شێتییەك بووە، بەردەوام بێ ئاگایە و زۆربەی کاتەکانی لە نزیك کانییەکەی دەرەوەی شارۆچکەکە بەسەر دەبات.

ئەودەم بیرکەوتەوە کە ئەسمەر دەربارەی گێچەڵکردنەکەی ڕەزا بە فاتمە، پێی وتم. خۆ ئەگەر مەسەلەکە ئاشکرا بێت، ئەوا کارەساتەکە لە ماڵی میر لە کارەساتی سابلاخ کەمتر نابێت! کەواتە چارەسەرەکە هەر ئەوەیە گوللەیەکی رووسەکان یان عوسمانییەکان ڕەزا بەرەو ئەو دنیا ببات، ئەوسا وەك شەهیدێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و کێشەکە کۆتایی دێت و پەردەیەکیش بەسەر ڕاستییە جەرگبڕەکەدا دەدرێت، بەڵام بێم و ئەوەی فاتمە بۆ ئەسمەری باس کردووە لای هاوکارو شەریکەکەم بدرکێنم، ئەوە دەبەنگییەکە مەگەر هەر لە ئیستیر بووەشێتەوە. ئێ کەواتە پێی بڵێم (ژنی بۆ بێنەو لە کۆڵی خۆتی بکەوە!)، سەرباری شادمانی بەنزیك بوونەوەی گەیشتنی سوپای موسوڵمانەکان و دەرپەڕاندنی گاوران لە سابلاخ، میر دەهێنمە پێکەنین، ئاخر لەژێر چەپڵەرێزانی تۆپ و خرمەی ڕەشاش و قریوەی شەڕکەران، ژن بۆ براکەی بخوازێت و دەستی خۆی و بووکەکەی بەخەنەی مرۆیی سوور بکات، کەواتە:

- میر، لە ماڵەوە بەندی بکە، چونکە گوللەی عوسمانی، یان رووسی جیاوازی لەنێوان دۆست و دوژمن ناکات.

پەلەم کردو ئەوەی وتم نەم دەویست بیڵێم...، ئەمە چارەسەرێکە لە مردنەکەی یان لە ژنهێنانەکەی خراپترە. بەستەزمان فاتمە، گەر ڕەزا لە ماڵەوە لەگەڵیدا بمێنێتەوە...، بەر لەوەی میر بیر لە پێشنیارەکەم بکاتەوە، پەلەم کردو وتم:

- باشتر وایە وازی لێ بهێنیت، چی دەکات با بیکـات، چـونکە دەوترێـت رووداوی گەورە زیندوو دەکوژێت و مردوو زیندوو دەکاتەوە.

رۆژگار بۆ چرکەیەك هاتە ناوەوە و قسەکەی بە باوکی سەلمان بڕی:

- تۆ شایەتحالّی ئەنجامەکەیت، باشیش دەزانیت کە کەسانێك هەن تا رۆژی پەسلاّن سلاّویان لێ ناکەیت.

بـاوکی سـەلمان زەردەخەنـە بـچکۆلە و بەرەنگارییەکـەی نوانـدو بەهەناسـە هەلّکێشانەوە درێژەی پێدا.

- لەو رۆژەدا نە مـن دەمزانی، نە میریش ئەوەی دەزانی، وەك چۆن ئێستا مـن دەیزانم و تۆش دەیزانیت.

* * *

دوای دوو رۆژ تەمی سەر راستییەکە رەوییەوەو تەمی جەنگ و زستان ناوچـەکەی گرتەوە. ئێستا تەواو دەمانتوانی گرمەی هەوری ئاسمان و گرمەی تۆپـەکان و رووناکی هەورە تریشقەو گڕی گوللە و پارچە تۆپ لەیەکتر جیا بکەینەوە. کوشتار نزیك بووەوەو بوو بە شەڕی دەستەو یەخەو ئالّۆزی، بوو بە بڕیـارو وەلاّم و وەرگـرتن و بەخـشین. لێـرە پارچە گوللە تۆپێك دەکەوێت و لەوێ یەکێکی دیکەی بەدوادا دێت و دەتەقێتەوە، ئەم تەقینەوانە وەك بەرد لەیەکتر گرتن سەرناشکێنن، بەلّکو جەستە هەلا بەهەلا دەکەن و روحەکان رادەڕفێنن، کێبڕکێیەکە سـەرکەوتن بـۆ ئـەو کەسـەیە کـە زۆرتـرین خـەلّك بکوژێت، ئەو کەسەش دەبێتە قارەمان کە لەوێرانکردنی کێلّگـە و مـالّ و خانووبـەرە دەست پێشخەر بێت. هەندێکجار هەورەکان بەشەرمەوە بەفرەکـە بـەهێمنی دەبـارێنن، ئینجا بلاّو دەبنەوەو شوێنەکەی خۆیان بۆ خۆرێکی رچـیو جێـدەهلّێن و کفـنی بـەفرو بەستەلّەکەکە رووناك دەکاتەوەو پـتر سـپێتی دەبەخـشێت. لـە رابـردوودا ئـەم بـەفرە سەرباری ئاستەنگەکانی هێما بوو بۆ پاکژی و جوانی، دواجار کـە بەناچـاری گـیرۆدەی جەنگ بووین، ئیدی بـوو بـە هێمـای کفنێـك تێکـڕای سـابلاّخ دادەپۆشـێت. بـەلێ، هەورەکان هەندێکجار بە دزییەوە بەشەو بەفر دەبارێنن و بەشەرمەو هەلّدێن، بەلاّم ئەم جەگە شەرم ناکات و هەر لە دوورەوە عـەورەتی خـۆی هەلّـدەمالّێت و تـەپلّ و زوڕنـا

لێـدەدات و وەرزی دروێنــەی رووح و خـاپوورکردنی خانووبـەرە رادەگەیـەنێت. هـەموو خەڵکی سابڵاخ زانییان وا عوسمانییەکان هاتن و رووسەکانیش بۆ جاری دووەم هەڵدێن.

موسڵمانەکان بەخۆو تێڵاو تفەنگیانەوە بەرپەری بێ ئارامییەوە خۆیان بۆ هـەڵاتنی رووسەکان ئامادەکرد. حەسەن چەخماخ و هاورێکانی خـەم دای گـرتن، جوولەکـەکان و دیانەکانی سابڵاخ لە چاوەڕوانییەکی پڕ پەژارەو ترسدا بـوون، بـەڵام ئەڵماسـی کـچی زێرنگەرو حەسەن و زورگ و رەزا عەلی هەر لەنێو قاوغ و قەپێلکی خۆیان مابوونـەوە، هەر یەکەیان خەریکی ژیانی خۆی بوو، بەیەك ریتم لەگەڵ ئارەزووەکانی خۆیان دەژیان، نەدەبینن و نەدەبیستن، جگە لە ختووکەدانی شەیتانەکانیان ئاگایان لە هیچی تر نییە، ئاوهاش لە خراپەرکارییەکانی جەنگەکە دوور بوون. بەفر بارین پـێش وادەی خـۆی بـە چەند هەفتەیەك مزگێنی بەفرێکی زۆر دەدات و لە هاوینی داهاتوو خانەوادەی بـزورگ زێرێکی زۆریان دەست دەکەوێت و بواریش بۆ حەسەنی نازدار هەڵدەکـەوێت پـتر خـۆی هەڵبنات و کچە جوانەکانی دیکەی پـێ سەرسـام ببێـت و بێنـە ریـزی کـچە جوانـە سەرسام بووەکانی دیکەی سابڵاخ.

زۆرم لە ئیستێر کرد کە لەماڵ دەرنەچێت، ئاگاداریـشم کـردەوە کـە بەتـەنها یـان لەگەڵ هەردوو منداڵەکەدا دەرنەچێت.

نارەزایی دەربڕی وتی:

- من ناتوانم لـە ماڵـەوە دابنیـشم، خەریکـە روحـم دەردەچـێت، بۆچـی وازم لـێ ناهێنێت هیچ نەبێت بـا بـۆ گۆڕەپانەکـە بـچم، تـا تەماشـایەك بکـەم و بـزانم چـی روودەدات؟! چەند حەز دەکەم کاتێك تۆپێك دەتەقێت ببینم سەربازەکان چۆن هەڵدێن؟!

دو وشت تەقینەوە، یەکێکیان لەناو سینگم و ئەوی تریـان لـەناو مـەژگم، هـاوارم کرد:

- بۆچی تۆ وای دەزانیت گوللە تۆپ قاپ قاپێنـەو گەمـەی پـێ بکـەیت؟! ئـاخر بنیادەم لە ناخافڵدا لە مردن ئاگادار دەبێتەوە، رەنگە ئەو دەمە بێت ئیدی هەسـت بـە ئازاریش ناکات. راستە هەندێك کەس هەر بە منداڵی دەمێننەوەو قـەت گـەورە نـابن تەنانەت گەر باڵقیش بن و دە زگیش بکەن!

دووباره نارەزایی دەربڕی:

- من دە زگم نەکردووە، هەر نـاحوم و ئیـستیری بـچووکم بـووەو هێـشتا منـدالّم. تەماشای ئەو کچانە بکە کە لە تەمەنی مندان، هێشتا لە شەقام یـاری قـاپ قـاپێن دەکەن و منیش لە مالّەوە دانیشتووم و بەدوو مندالّ گیرۆدە بووم؟!

ئای دایکی مندالاّن خوا لێت ببورێت!، بەلاّم من بۆ گلـەیی لـەتۆ بکـەم، گلـەیی لەخۆم دەکەم. ئەوە منم عاشقی سەوداسەر، ئەوکەسەی تینوێتیم شـکاندو ئاگرەکـەیم کوژاندەوەو گەرمییەکەیم سارد کردەوەو ئەلّهاکەیم بۆ گەڕاندەوە...، ئای سـەرەڕای ئـەو پیاهەلّدانەی دانیشتووانی سابلاّخ چ گەمژەیەکم!

ئێوارەکەی گوللە تۆپ لەگەلّ بەفردا دابارینە سەر شارۆچکەکە، گوللـە تۆپـەکان درندانە خۆیان بە گرمەو زرمەوە ئاشکرا کرد، بەفریش بـە سـەنگینی و هێمنییـەکی ساردو کپ. ژاوەژاو لە دەرەوە پتر بوو. هێندەی نەبرد بە زمـانی جۆراوجـۆر و تێکـەلّ و پێکەلّ لەگەلّ ریتمی دەنگێکی رەق گەیشتە گوێمان، بە خۆمم وت: (ئەوە تێك پرژان و ئێستا جەنگەکە دەستەو یەخەیەو لەنزیکمانەوە بە چەکی سپی دەکرێت).

زانیم رووسەکان ئەم کایەیان دۆراند و وا عوسمانییەکان هاتن، بێگومان ئەفـسەر و سەربازی ئەلّمانیشیـان لەگەلّدایە، قسەکان بە ئەلّمانی و تورکی و ئازەری و کـوردی و ئارامی دەگەیشتە گوێچکەمـان، بەلاّم بەرووسی بەشـێوی هوتـاف کێـشان لـە دوورەوە دەنگی دەدایەوەو داوای کۆمەك و رزگاربوونی دەکرد، تا دەهات دوورتر دەکەوتەوە و ون دەبوو، لێتی ناشارمەوە ترسێك گوشیمی و رۆحی دەرکردم، لەخۆم نەدەترسـام، بـەلکو ترسی ئەم مالّەم هەبوو، خەمی ئەسمەرو ئیستیریم بوو، لە عەزرییای زێرنگەر و حاخـام ناحوم و بنەمالّەکەی دەترسام، خەمی حاخام میخائیـل بـرایم بـوو، خـەمی براکـانم و کەسوکاری ئیستیرم بوو، خەمی هەموو یەهودی سابلاّخ وهەموو نەسـرانییەکانم بـوو. لەو موسلّمانانە دەترسام کـە بـە هەلهەلـە پێـشوازی عوسمانییـەکانیان دەکـرد، ئـەم هەلهەلانـە لەگـەلّ دەنگـی پێکـدادان و پاڕانەوەیـەکی سەرچاوە نادیـار لـە دوورەوە دەبیـستران. دەنگـە رەقەکـە وەسـتا، بـەلاّم گوللـە هـەر دەنگـی دەدایـەوەو زمانـە رۆژهەلاّتییەکان لە دەرەوەی مالّەکە تێکەلّی ئـەلّمانی دەبـوون، لـەناوەوەی مالّەکـەش

بێدەنگییەکی سووك و ئاڵۆز، گرژ، لاڵ، چاوانێك لەو بێدەنگییەدا نیگای زۆر بلێیی و تۆقین ئاڵوگۆڕ دەکەن. منداڵەکان لە ئامێزی من و ئەسمەر و ئیستێر خۆیان مت کرد، لەم ماڵەدا بێدەنگییەك باڵی کێشاوە، بێدەنگی عەدەم و نەبوویەك مەگەر بۆڕەی گایەك یان حیلەی ئەسپێك، یان قرتە قرتی مریشکێك بیشڵەقێنێت...، یان هەناسە گەلێکی شڵەژاو و بارگاوی بە ترسێکی نادیارو لێواو لێو لەمەرگ.

هێشتا ئاسمان پارچە کفنی زۆر سپی بەسەر سابلاخدا فڕێ دەدات و پارچەکان یەك دەگرن و لە خوارەوە کەڵەکە دەبن و پێکەوە کفنێکی زەبەللاح دروست دەکەن و شارۆچکەکە و هەرچی تێیدایە دادەپۆشێت. هۆ باوکی سەلمان، تۆ وا چاوەڕێی ئەو دەنگە شوومانە دەکەیت کە لە شارۆچکە ئاوەز لەدەست چووەکەتەوە دەردەچن. تۆ شتەکانیش بەچاوی خۆت دەبینی، بەلاّم تۆ پێغەمبەر نییت تا وردەکارییەکانی وێنەکە ببینیت.

بە بێدەنگییەکی تەواو ڕەهاوە دانیشتیت، تەواو وەك چۆن بڕێ جار بەرانبەرم دادەنیشتیت، چەند خولەکێك بەبێ دەنگی لە شتێك رادەمێنیت، یان شتێکت بیر دەکەوێتەوە، یان ئاواتەخوازی شتێکیت، یان لەبەر خۆوە جنێوم پێ دەدەیت، چونکە من ڕۆژی شەممە یەك جگەرەم پێکردبوو، یان نەفرەت لە دایکی عەزیزە دەکەیت، چونکە لە سۆنگەی ئەو ماسییەی بە نرخێکی گران بۆت کڕی بوو، هەر جنێوت پێدەدات و ئاواتە خوازە بمریت. لەو ساتەدا لە سابلاخ بێدەنگییەکەت بە پرسیار گەلێك ئاوس بوو، لەنێو کاسەی سەرت بازیان دەدا و لێك دوور دەکەوتنەوە، پەلەتە هەموویان بزانیت، بزانیت لەو چرکە ساتەدا چی روویداوە و چی روودەدات. هەموویان لە ترس و پەژارەدا ریزیان بەست، مردن و جەنگ تەوەری حەزی زانین و پرسیارەکانتە. لەو کاتەدا بە بەردبووەدا وەك بارێك بەهەموو قورساییەکییەوە سێ جۆرە خەڵکت دەبینی جۆرێك بەبێ شەرم و بەبێ بەزەیی یان تۆزقاڵی ویژدان، بێ سڵەمینەوە مەرگ و کاولکاری دەچێنن. جۆرێکی تر بەبێ ویستی خۆیان خزێنراونەتە نێو زۆرانبازییە نەفرینەکەوە و بەبێ گوناه پێوەی دەناڵێنن و لە سۆنگەی تاوانێکی نەکردو و سزا دەدرێن. خەڵکانێکی تریش تاجی بەختەوەرییان لەسەرەو لە کەوانەکانی ئەم جەنگە- بەدگۆڕاوە- کوشندەیە دەباز بوون و

ئەمێستا لە هەمێزی ئارامیدان و بەجلوبەرگی ئارامییەوە خۆ دەنوێنن! خۆشی لە خۆیان چونکە شادمانن، بەڵام ئەی سابلاخیش لە ئاسوودەیی و دڵنیاییدا نەبوو، بێگومان دانیشتوانی ئەم شارۆچکەیە شادمان بوون هەر وەك چۆن ئێستا دانیشتوانی تاران شادمانن؟! ئاخر دانیشتوانی ئەم شارۆچکەیە چ تاوانێکیان کردووە، تا توشی ئەم نەفرەتە بێن، نەفرەتێك هەرگیز لە خەیاڵیشیاندا نەبووە؟!دانیشتوانی سابلاخ نە داوای جەنگیان کردووە و نە ویستوویانە، ئەی کەواتە بۆچی خۆیان لە توونی جەنگەکەدا دەبیننەوە و تێیدا دەسووتێن و گایان لەناو گاران نییەو پێیان بەفر دەی بات؟! سەیرەکە لەوە دایە هەندێك لە خەڵکی سابلاخ بە دۆخەکە قایل بوون و هەڵوێستی لایەنگرییان بۆ یەکێ لەلایەنە شەڕکەرە داگیرکەرەکان نواند و برێ جار بەشادمانییەوە پێشوازی داگیرکەری بێگانەیان دەکرد و پێی دەگەشانەوە، کە دەبوو هەر سابلاخییەك لەوەی بەسەریدا هاتووە غەمگین بووبا، چونکە دەسەڵاتی ئەوەی نەبووە بەهەردوو بێگانەکە بڵێت: ئێمە شارۆچکەیەکی ئاشتیخوازین و لەژێر سایەی دەوڵەتێکین دەستێکی لەم جەنگە شێتانەیەی ئێوەدا نییە. دەستمان لێ هەڵبگرن و لە شوێنێکی دیکە و دوور لە ئێمە شەڕی خۆتان بکەن. لێمان گەڕێن با بژین هەر وەك چۆن پێش هاتنی ئێوە بە ئاسوودەیی و هێمنی دەژیاین.

لەو شەوەدا خەو نەچووە چاوانم. ئەوەتا کەوتینە ناو هەناوی زریانەکەوە و جەنگیش لە دەرەوەی ماڵەکەم و لەناو سەرمدا دەگەڕێت. کێشی قورسایی سەر شانم تا دێت زیاد دەکات، بەڵکو دەبێتە دوو ئەوەندە. ئەمە یەکەمجارە لەژێر بارەکەمدا چۆك دادەدەم، بەڵام ناشلۆمۆ، تۆ کوردیت و لەسەر تاشەبەردی رەق لەدایك بوویت و گەورە بوویت، لەهێزی ئەم چیایانەوە سەختی و خۆراگریت وەرگرتووە، دەی بەرەو پێشەوە بڕۆ لە ویستی ئەو خودایەی وا لە ئاسمانە لاریت نەبێت. خودا لە هەموو مەینەتییەك لەگەڵتدایەو رزگاری کردوویت و لە هەموو ئاستەنگەکانیش رزگارت دەکات. ئاخر تۆ ئێستا تێکڕای ئەم ستەمدیدانەیت، تۆ لە جەستەی سابلاخی زامداردا شادەماریت، شادەماری ئەم جەستە ئازار زەدەو بەسوێیە، تۆ لە ئازارەکانی جیا نابیتەوەو مەینەتی کۆڵت پێ نادات...، بۆیە دەبێت بمریت.

لەنێو ئەم بیرکردنەوە توندانە چەندین سەعات مردم، ئینجا هەڵسامەوە. رنگە ئەم پۆشاکە رچیوە هەر مابێت، بەلاّم لەو مەرگە نام پارێزێت کە لە رێگەو بانەکان خۆی مەلاس داوە، فانۆسە کە رێگام بۆ رووناك دەکاتەوەو درِ بەهەندێ تاریکی دەدات، بەلاّم بێگومان مەترسیشم لە دەور کۆ دەکاتەوە، هەر وەك چۆن پەپوولەو گوڵە ئەستێرە لەخۆی کۆ دەکاتەوە.

دەنگە بەسۆزو پرِ پاڕانەوەکەی بیری پچڕاندم:

- باوکی سەلمان، تکات لێدەکەم مەڕۆ!

گوێم لێی بوو وەك هەمیشە دەپاڕایەوە، لێم پرسی:

- ئەوە تۆ نەنووستویت؟!

- چۆن خەوم لێ دەکەوێت، وا دەت بینم بە درێژایی ئەم شەوەکە لەسەر جێگەکەت هەر تەپ و تلت دا؟! مەڕۆ!

گەرەکە ئەوەی لەمەوپێش تێی نەگەیشتووە، تێی بگەیەنم و ئەوەیشی لەبیرم چووە بیهێنمەوە یادی.

- ئەسمەر، دۆخەکە لەوە ترسناکترە من لە بەر پرسیارێتییەکانم هەڵبێم.

بە پاڕانەوەوە وتی:

- بەلاّم...

- ئەوەی خودا بۆمی نەنووسی بێت تووشی نابم. هەر ئەو قەلاّو پارێزگارمە.

- ئاخر تا دەگەڕێیتەوە، دڵم دەپسێت.

وەلاّمێکم نییە. بەسەر منداڵەکەکاندا نوشتامەوە، لێیان رامام، نوستبوون، نێوچەوانی هەریەکەیانم ماچ کرد. بام دایەوە لای ژوورەکەی ئیستیرو ناحوم و ئیستیری بچووکم ماچ کرد. دایکیان لە خەوێکی قووڵدا بوو.

دەرگاکەم کردەوە، رووناکی فانۆسەکە سپێتی هەموو شوێنێکی دەرخست. ئەی خوایە من خۆم رادەستی تۆ دەکەم، بەسەلامەتی بۆ لای خاوخێزانەکەم بم گەڕێنەوە.. بەگوێ هەڵخستنەوە، بەچاوی تیژەوە، بەهەستەوەرییەوە رۆیشتم. بێگومان ئەم شەو لە رێگەوبان و کوچە و کۆلاّنەکانی سابلاّخ چەندین گیان کێشراوە. دڵنیام شەڕکەرەکانی

هەردوو سوپاکە کوژراو و بریندارەکانی خۆیان هەڵگرتووە، کە بەفرەکەش باریوە خوێنە ڕژاوەکانی داپۆشیوە و کەسیش لێرە نییە. سەربازە رووسەکان پێشەیان وایە لە هەموو شوێنێك بڵاو دەبنەوە، بەڵام تورکەکان و ئەڵمانەکان لە خانووە گشتییەکاندا خۆیان قایم دەکەن و تەنها ئێشکگرەکانیان بە رێگاو کۆڵانەکاندا دێن و دەچن. رەنگە ئێستا خەریکی خۆ تەکاندن و خۆرێك خستن بن... یان کە هاتوونەتە ناو سابلاخەوە وەك رووسەکان بە نۆشکردنی بادەی خوێنی دانیشتوانەکەی ناهەنگ بگێڕن. ئای هەوای شارۆچکەکەمان! تۆ پاك و بێگەرد و شنەیەکی خۆش بوویت و لە چیا سەر بەفرینەکانەوە بەسەرماندا هەڵت دەکرد و رووحە ماندووەکانمانت دەبووژانەوە، ئەوا ئێستا لێوان لێویان کردوویت لە دووکەڵ و بۆنی بارووت و بە رووحی کوژراوەکان بارگاوی بوویت! دەی شلۆمۆ پێ هەڵگرە، مەرگ لە هەموو سووچی کۆڵان و پێچەکانی گەڕەکەکاندا ئامادەیە. پەلە بکە، بەڵام ئەو تۆپەڵە راکشاوەی ناوەندی رێگاکە چییە؟ فانۆسەکەم بەرزکردەوە، پێم هەڵگرت بەرەو لای مرۆڤە راکشاوەکەی سەر بەفرە فشەڵەکە رۆیشتم، لێدانی دڵم زیادی کرد، لەناکاو واقم وڕما، تۆ بڵێیت چاوەکانم فێڵم لێ بکەن؟ ئاخۆ بەهۆی رووداوەکانی ئەم شارۆچکەیەوە بێ بڕست و ئاوەزم بێ هێزبووە؟ فانۆسەکم زیاتر نزیك خستەوە...، خەریك بوو دڵم بەیەکجاری لە لێدان بووەستێت، ئینجا هاتەوە سەرخۆی و شێت بوو، بەدیار مرۆڤە راکشاوەکە و بێ پشت و پەناکەوە، مرۆڤە مردووەکەوە...، وەستام کە لەنێو گۆمیلەکەیەکی نیمچە سوور کە بەفرە سپییەکەی رەنگ کردبوو. خەمی ئەم کوژراوە ئازیزە هەناسەی قەتیس کردم، چنچکم دایەوە... حاخام ناحوم، ئەی خودا پەرستی راستگۆ! ئاخر بۆچی تۆ دەکوژن، تۆیەك هەموو بوونت چاکە خوازییە؟! ئایا لەهەموو ژیانتدا ئازاری مێروولەیەکت داوە تا بەم مردنە قێزەون و ناڕەزایە سزات بدەن؟! ئاخر خودای تۆ چۆن پشتی بەردایت و لە ناوەندی رێگاکە وەك پیاوچاکان و راستگۆیان خوێنەکەتی حەڵاڵ کرد؟! ریشە خوێناوییەکەیم سڕییەوە، لەگەڵ ئەوەی بەستەڵەك بوو، بەڵام خوێنەکەی هەر لینج و گەرم بوو. هێی فرمێسك هەڵبقوڵێ و بۆ چاکە خوازترین پیاو بگری! هۆ گریانی بێدەنگ تاو بسەنەو بۆ لەدەستچوونی ئەم سەربڕدراوە ناقایل بە! ئەی قوڵپی گریانی

لەنێو سینگ و ئەوك قەتیس ماو! هۆ فرمێسکی چاو تۆ لەکوێیت، بۆ پێلّوەکانت تەڕناکەیت و دانابارێیت؟ کانیاوی چاوەکان بوون بە تاشە بەردێکی وشك، ئایا روندکەکانت چکیان کرد؟ ئەی چاوە بەستووەکانم، ئەم بەستەڵەکە مرواری تێدا قەتیس کردووە و قەپیلکەکانی جیّ ناهێڵێت؟

نەگریایت. کارەساتەکە بە واق ورماوی بێدەنگی کردیت رووداانی خەمە لەناکاوەکە وشکی کردیت. باوکی سەلمان، کە گوێم لێت دەبوو باسی مردنەکەی حاخام ناحومت دەکرد، دەم بینیت لە تاریکی خەمێکدا هەڵدەچوویت و هەڵمی پەرۆشیك رووخسارتی دادەپۆشی زەردەخەنە گاڵتە ئامێزە بەردەوامەکەتی دەسڕییەوە. لەم کاتەدا بواری زەردەخەنە و گاڵتەکردن نامێنێت، چونکە کارەسات و غەم و واق ورمان توخم گەلێکن لەو ساتەدا نابەجێن، بەلاّم ئەوەندەی نەبرد هەمور ئەوانەت لەسەر دەرەوێنەوە. دەبوو شتێك بکەیت، هەوا تەنها بۆنی خوێنی تەڕی حاخام ناحومی لەخۆ نەگرتووە، بەلکو پێشبینی ئەوەی پێیە کە لە هەمور چرکەیەکدا مەترسی مردن بێنێت. دەبوو بەپەلە شتێك بکەیت. چی بکەیت؟! لاشە خلّتان خوێن بووەکەت هەلّگرت، ئاخر بەم کۆستە گەورەوە بۆ کوێ دەڕۆیت؟ دەستێکت فانۆسەکەی گرتبوو، ئەوی دی لە هەردوو لاقی حاخام ناحومی مردوو ئالاّبوو. بۆکوێ دەی بەیت؟ قورساییەکەی لەسەر شانت چون چیایەك ململانێی لەگەلّ ماندوێتیت دەکرد و دی رەواندەوە. مالّی حاخام میخائیلی برای نزیکە و ئەویش وەك تۆ لاوێکی بەهێزو خۆراگرە، بەلاّم تۆ هەر خۆت ئەم جەستە قورسەت هەلّگرتووە، قورس. حاخامی شەهید کەتە نەبوو، ئەم قوساییە گرانبەهایەشی قورسایی لاشە نەبوو، دەتزانی تۆ قورسایی حیکمەت و زانیاری و خودا پەرستیت هەلّگرتووە.

تۆ فەڕو چاکەخوازی و جوانترین خەسێتت بەسەر شانەوە بوو! وای لە قورسایی زانست! وای لە گرانبەهایی فەڕو خوداپەرستی! هەمور ئەمانەت لە مردوویەکدا بەکۆلّ هەلّگرتبوو، پێی لەرزۆکت بە کەسەرو خەمەوە بەناو بەفرە فشەلّەکەدا هەلّدەنا... دەڕۆیشتیت و دلّت لەنێو قەفەزی سینگتدا خەمی گەورەتر دەبوو، سەرت دوای ئەوەی لە سوێی کۆستەکە مەژگی تێدا نەما، بوو بە قەپێلکێکی بەتالّ...، داخی

گرانم بۆ زانست و چاکە خوازییەك کە دەچنە ژێر گڵەوە! داخی گرانم بۆ دژێك کـە دژی خۆی تیرۆر دەکات! ئەریّ پرسیت بۆچی بەتایبەتی لـەو کاتـەدا؟! بەدرێـژایی سـاڵانی کۆست کەوتنەکە لە سابلاخ (بۆچی) وشەی سەر زارت بوو، ئەوەندەت بەکارهێنا سواو وەلامێکت چنگ نەکەوت...، خۆتیش نەتزانی چۆن گەیشتیتە ماڵی حاخام میخائیل... چۆن ئەوساتە قورقوشم ئاساو سامناکە تێپەڕی. برای خۆ ئامـادەکردو بـۆ رۆیـشتن تـا نوێـژی بـەیانی بکـات، چـاوەکانی هـەڵگلۆفی، لـەپڕ بـینی وا بـرا سـەربڕاوکەی بـە کۆڵتەوەیە. هەرگیز رۆژێك نەتتوانی باسی ئەو هەڵوێستە بکەیت، کە حاخام میخائیل چاوی بە برا ساردەوە بووەکەی کەوت، کە بەکۆڵ هـەڵت گرتبـوو.تـۆ بـەردەوام بـواری کاتێکت بۆ جێدەهێشتم، تاوەکو بیر بکەمەوەو هەڵوەستەکە وێنا بکەم.

دەوان دەدەم هەڵوەستەکە لە هەزار شێوەدا وێنـا بکـەم. کارەسـاتە کتوپڕەکـە وەك بروسکە لە میخائیل دەدات، لە سەلاّی گریانێکی بەکوڵ دەدات. میخائیل تۆ ئاسا بیرو هۆشی لەحەناس کۆستەکە وشك دەبێت. میخائیل تێناگات و لـە تـۆ دەپرسـێت چـی روویداوە؟ ئاخۆ میخائیل خۆی بەداوە ئومێدێکەوە دەبەستێت کە براکەی هێشتا ژیانی تێداماوە... (شلۆمۆ پێم بڵێ، ئایا هێـشتا دڵـی لـێ دەدات؟ ئایـا دەتوانرێـت رزگـار بکرێت؟) نەخێر... نەخێر، لەراستیدا هیچ شتێك لەمانە روویان نەدا. لاشەکەتان لەناو ماڵەکـە لەسـەر جێگەیـەك راکـشاندو بـە سەرچـەفێك داتـان پۆشـی...، میخائیـل هاوسەرەکەی لە رووداوەکە ئاگادار کردەوە، ئینجا پێکەوە بەبێ دەنگی بـەرەو کـەنیس رۆیشتن.

هێشتا دەرگای کەنیس داخرابوو، بەڵام لە دەرەوە دەمی چـاوەڕوانکاران داچـەقابوو، ترس بە رووخسارییان دەوەڕی، زمانەکانیش دەیان پرسی چی روویداوە، بـەڵکو دەربـارەی ئەوە دەدوان کە رووی دابوو کوشتار لە سابلاخ. هەرسێ براکەم لەوێ بوون، لـێ ئیلیـا بابایی و خۆشەنگ کۆهەن و کوڕەکانی ئەمرۆ بـۆ کـەنیس نـەهاتوون... و لەمـەولاش نایەن، ئیدی ئەوان و زۆری تر لە جوولەکەی سابلاخ و نەسـرانییەکانی نـابینرێن و تـا رۆژی پەسلان دەنگیان نابیسترێت. چەندین خێزان لەناو ماڵی خۆیاندا لەکاتی نوستن و لەناو جێگادا کوژران. دەوترا مەترانی کڵێسە و چەند خێزانێك لە نەسـرانی و سـریانی

شارۆچکەکە سەربڕراون. کۆی هەموویان پانزە جوولەکە و بیست و سێ مەسیحی بوون...، هۆیەکەشی تۆڵەسەندنەوەی ئەو شەهیدە موسڵمانانە بووە کە قوربانیانی کوشتاری رووسە گاورەکان بوون. زانیم! زانیم! مادام هێشتا شەڕەکە لە ئارادایە، ئیتر خودا چەپاڵەی خەڵکە موسڵمان و جوولەکەو نەسرانییەکد بدات و...، بەڵام کوانێ حاخام ناحوم؟!دەمت دوورا بوو، بەدوو دەستی لەرزۆك و ژان و تووڕەییەوە رووت کردە شوێنی نوێژکردنەکە، چاوەڕێت کرد، تا غەڵبە غەڵبەکە کۆتایی بێت و نوێژکەران لەشوێنی خۆیان دابنیشن. بەو ئومێدەی کە غەڵبەغەڵبەکە دوایی بێت هەر چاوەڕێك کردو چاوەڕێت کرد. بێ سوودە! ئاخر دڵ چۆن هێور دەبێتەوە گەر سابڵاخ بە مردنێکی ئاوها (لەسەرخۆ) بمرێت؟!

کۆستەکە دوو لالغاوەی نەهەنگێکەو بوونە وەران قووت دەدات. کونێکە و لەبن سابڵاخ کراوەتەوە، گرکانێکی سامناکە و شارۆچکە بەستەزمانەکەو ئەوەی تێیدایە، قووت دەدات. گیاندارە خورافییە تێکشکێنەرەکە تا ئەو پەڕی دەم دەکاتەوەو چاوەڕێی نێچیر لەدوای نێچیرە، لێدانێکی مێزی سەکۆکە داوای هێمنی دەکات، هەمیشە خوو زاڵە. لەناکاو بێدەنگی باڵ دەکێشێت، لەپڕ دەنگێکی نارازی و تووڕەو رەها دڵی بێدەنگییە غەمینەکە شەق دەکات، وا دەمە دووراو و نووقاوەکە لەپڕ دەکرێتەوەو لاواندنەوەیەك لە لاواندنەوەکانی رۆژی لێخۆشبوون دەخوێنێتەوە:

(پیاوانی بڕوادار ون بوون، ئەوانەی بە کردەوەکانیان باڵابوون بەداواو پاڕانەوەیان ئەو کۆست و کارەساتانەی کە خودا بۆمانی ناردووە ناهێڵن. ئەگەر بەچاوی گوناهکارێکەوە تێیان بڕوانین، رەنگە لەدەستمان چووبن ئەوان بەهۆی گوناهەکانمانەوە جێیان هێشتین، ئەوان کۆچیان کرد تا ئاسوودەییان دەستکەوێت و ئێمەشیان بە هەناسەی سارەدەوە جێهێشت.

نەخێر! بۆ رۆژانی داواکردنی بەزەیی و رۆژووگرتنی لێبوردن ناگەڕێینەوە! بەڵام بەردەوام بوون لە رۆژوگرتن و درێژکردنەوەی رۆژانی داواکاری بەزەیی سوودمان پێدەگەیەنێت. براکانم، خودای گەورە لە ئاسمان ویستی مرۆڤێکی زاناو لەهەموومان خواپەرستتر بۆ لای خۆی بباتەوە. مرۆڤێك لەکاری چاکە پتری نەزانیوە، براکانم، حاخام

ناحوم لەرێگەی هاتنی بۆ ئێرە تا نوێژ بۆ خودای خۆی بکات و ئەوەی خودا بە مرۆڤی بەخشیوە پیرۆز بکات، کوژرا. کوژراو لەگەڵ ئەویشدا پانزە جوولەکەو بیست و سێ مەسیحی کوژران و گەیشتنە برا موسڵمانەکانیان، ئەوانەی رووسەکان پێشتر کوشتیانن. ئەمانە هەموو لە دانیشتوانی سابلاخی پارێزراون، کە ئەفسووس پارێزراو نییە، هەموویان بەفیرۆ خوێنیان رژا، نە گوناهێکیان کردبوو، نە تاوانێك، هەر ئەوەبوو داگیرکارانی شارۆچکەکەمان لە کێبرکێی لێدانی یەکتردا ئێمە دەکوژن. خودا تۆڵەی هەموو بێتاوانەکان بسەنێتەوە، بەڵام ئەوانەی کە ئەو کەسانەیان لە تایەفە بچووکەکەی ئێمە لە سابلاخ کوشتووە، بۆ ئێمە زەبرێکی گورچکبڕە، خۆ ئەگەر دۆخەکە هەر وەك ئێستا بەردەوام بێت و سابلاخ ئاوها وەك تۆپێك بمێنێتەوە و رووسەکان و عوسمانییەکان تێی هەڵبدەن، ئەوا هەر بەتەنها تایەفە بچووکەکەی ئێمە تێدا ناچێت، بەڵکو کەسێك لە سابلاخ لە ژیاندا نامێنێت. وەك وتم شارۆچکەکەمان بە موسڵمان و جوولەکەو نەسرانییەوە لە جەنگێکدا قوربانی داوە، نە راوێژمان پێکراوە و نەدەستی خۆشمانی تێدایە، بەڵکو شەڕانگێزان بەزۆری زۆردارەکی لەسەر خاکی ئێمە دەی گێڕن. کەواتە گەرەکە هەموو دانیشتوانی سابلاخ بۆ ئەم مەینەتییە پشتی یەکتر بگرن و پێکەوە دەست بخەینە ناو دەستی یەکتر تا قەوارەی کارەساتەکە کەم بکەینەوە، چونکە ئێمە هەموومان لە چارەنووسدا براین. یارمەتی برا موسڵمانەکانمان بدەن لەکاتی مەینەتییەکانیاندا، برا موسڵمانەکانیشمان لەکاتی مەینەتییەکانمان پشت و پەنامان دەبن. خودا پشتو پەنای هەموومان بێت و لەوەی روودەدات شارۆچکەکەمان بپارێزێت. ئەم کەنیسە بەهۆی رووداوەکانەوە داناخرێت، بە پێچەوانەوە گەرەکە لەم رۆژە پڕ ئاشووبانەدا زیاتر نوێژ بکەین و داوای بەزەیی بکەین، ئێرە باشترین شوێن و نزیکترین شوێنە لە خودای گەورەمان. مردووەکانمان بەبەرچاومانەوە وا باران لێیان دەدات، بەرۆژی رووناك و بەبەر چاوانەوە دەیاننێژین و نوێژی ئاسوودەیی مردوویان بەدرێژایی ساڵەکە بۆ دەخوێنین، ئەوەی ئەرکی پرسە و دانیشتنی حەوت رۆژەی ماڵەوەی لەسەرە، با ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات. کتێبی تەورات و کتێبی نوێژ و نزا بەسەر خێزانانی ئازیز مردە دابەش دەکرێت، بەڵام ئەمانە هەموو داوای رۆژکەوتن

جێبەجێچ دەکرێن، ستەم و زۆرداری و هێز، بێهێزەکـان ناترسـێنێت، بـەڵام سـتەمکار هەمیشە بۆ زەبر وەشاندنی خۆی پەنا دەباتە بەر نهێنی و بن پەردەی تـاریکی. لەهـەر شوێنێك بن خودا هەمیشە یارو یاوەرتان بێت. بڕوامـان هەیەو هەر بڕوامـان هەیە).

کە بۆ مـاڵ گەڕایەوە، ئەسمەر بە پیرییەوە هات و نیگەرانی پەرێشانی کردبوو، بینی چارەی وەك تاشە بەردێکی لاڵ وشك هەڵاتووە و لە سـیمایدا هـیچ شـتێك دەرناخـات. لەبەر خۆوە بڵمە بڵمێکی کرد و هەندێك لە پەژارەکەی ڕەوییەوە:

- باوکی سەلمان، سوپاس بۆ خوا بەسـەلامەتی گەڕایتەوە.

بەدڵگرانی و چپە ئاسا وتی:

- ئەسمەر حاخام ناحومـیان کوشت.

هەواڵە ناخۆشەکە زمـانی بەست، ئەمیش بەردەوام بوو:

- پانزە جوولەکەو بیست و سێ نەسرانیشیان کوشتووە، هەردوو خێزانـی بابـایی و خۆشەنگ کۆهەن لەنێو کوژراوەکاندان و کەسێك لەو دوو خانەوادەیە رزگاری نەبووە.

ئەسمەر سەری بەگێژەوە هات و بەسەر تەختەکەدا کەوت، دەستی بە گریان و سینگ کوتان کرد ، بەگریانەوە وتی:

- هاوار بە مـاڵم بۆ سابڵاخ، کەسێك لە سـابڵاخ نامێنێـت! هـاوار بـە مـاڵم بـۆ سابڵاخ! ئاخر چی کردبوو تا ئەم نەفرەتەی خودای بەسەردا بێت؟!

بەبێ دەسـەڵاتییـەوە وتی:

- ئەسمەر ئامـادە بە ، پێش نوێژی عـەسر مردووەکانمان کفن دەکەین و دەیان نێژین.

ناحومی بچووکی لەنێو خوشك و براکانیدا لە حەوشەکە دی کە چون پۆڕ دەڕژێشت و ساتمەی دەکرد و بێ ئاگا لەوەی رووی دەدا ، هەوڵی دەدات لاسایی خوشـك و براکـانی بکاتەوە، پارچە بەفری دەهاویشت کە لە پەناو پەسێری حەوشەکە کەڵەکـە بـوو بـوو. بەرەو لای ڕاپەڕی و بەتوندی و گەرمییەوە باوەشی لێداو مـاچ بـارانی کـرد. ئیـستێری سەرسوڕماوی کەوتە بەرچاو، بەزمـانێکی ئاگادارکەرەوەو یەکلاکەرەوە رووی تێکرد:

- لە ڕێگەو بانەکان مردن دروێنـەی روح دەکـات، نەکـەی بەتـەنها یـان لەگـەڵ منداڵەکان لە مـاڵ بچیتە دەرەوە.

گێلانە سەرێکی لەقاند، ئەم لەبەرخۆوە پرسی:

- تۆ بڵێی ئەوەی لە سابلاخ روودەدات، تێی بگات؟!

قورساییەکەی سەرشانی(کێشێك)ی تر زیادی کرد.

❊ ❊ ❊

هۆ رۆژگار ئینجا نۆرەی تۆیە!

ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوویت، ئەرێ تۆش رووداوەکان بێدەنگت دەکات؟!

وتی: من هەڵیان دەگرم و ئەوانیش من دەپێچنەوە و هەڵم دەگرن، بێ ئەوەی شایانی بم پێمدا هەڵدەوترێت و بەبێ گوناە نەفرەت دەکرێم. من لە شایەتحاڵێك پتر نیم. چاوانم هەیە و دەبینن، چاوی زۆر و بێ ئەندازە. بیرچوونەوە لای من نییە، نەدەستم هەیەو نەدڵ، بەڵام نازانم بۆچی ئێوە منتان کردووە بەسەنگی مەحەك و بڕێ جار دەپارێنەوە (ئەی رۆژگار تکایە!) یان (نەفرەت لە رۆژگار...) یان هەندێکجار سۆزتان دەبزوێت (بەزەیی خودا بۆ رۆژگار...) ئێوە تەنها خۆتان هۆکارو دەردی ئەمانەن.

ناقایلییم دەربڕی و باوکی سەلمانیش لەگەڵ مندا نارازی بوو.

(هەر بۆ نموونە سابلاخ وەربگرە! ئەوەی بەسەریدا هات دەستی خۆی تێدا نەبوو، شەڕانگێزان حورمەت و ڕێزیان شکاندو وەك بوومەلەرزەیەکی تێك شکێنەر، وەك گەردەلوولێکی هار و هەڵچوو، وەك تۆفان، یان وەك پەتایەك لێیان دا).

(هایهوو!) رۆژگار وتی: (شتگەلێ کە خواستی مرۆڤی تێدا نییە تێکەڵی ئەو شتانەی مەکەن کە هەمووی دەستکردی مرۆڤە، ئەوەی لە سابلاخ رووی داوە شتێکە دەستکردی مرۆڤە. ئەمە حەکایەتی هەموو شوێن و کاتێکە).

حەکایەت. من و رۆژگار دەی بینین، بەڵام مرۆڤ بەهەموو گەوجی و دڵڕەقی خۆیەوە دروستکەرێتی، بۆیە زەردەخەنەی گاڵتەجاڕی و ناقایلی لالغاوەکانم بەرنادات. ئەو هەموو جیهانی مژووڵ بەجەنگ و ناکۆکی و ئارەزووە تووڕە هاتەکانییەوە قووت دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا دەیکات بە چارەنووسێکی هەڵاوسا بەمەینەتییەکانی جیهان. حەکایەتێکەو هەرگیز کۆتایی نایات، چونکە کەس پەند لە وانەکانی و خراپی ناکامەکانی وەرناگرێت.

(هـەمووتان گـەوجن و هـەمووتان شـەڕانگێزن و هـەمووتان.. یـان زۆربـەتان قوربانین!).

(تۆ فەلسەفە لێ دەدەیت، چونکە ئەوەتا بڕیار لەسەر شتهایەك دەدەیـت، هـەر بـە مەتەڵی دەمێنێتەوەو هەڵهێنانی بۆ نییە، ئێ مـادام هەنـدێك مـرۆڤ هـەن و لەسـەر زەوین، مادام تۆ لە شایەتحاڵێك زیاتر نیت. دەی کـەوابوو چـیرۆکەکە بگێـڕەوە، ئەوسـا چۆنت گەرەکە ئاوها بێزاری دەربڕە، بەڵام واز لە بڕیاری جـێگیرو حـەتمی بهێنـە، ئـەوە لەسەرڕووی زانیاری و تێگەیشتنی هەموومانەوەیە).

- کەواتـە هـەر کەسـێك لـە دانیـشتووانی سـابلاخ حەکایـەتێکی هەیـە، هـەر سەربازێك، یان ئەفسەرێك کە هاتوۆتە سابلاخ حەکایەتێکی هەیە، هەزاران حەکایەت و سەربردەی بچووك و گەورە هەر هەمووی چیرۆکی سابلاخی شێواوی ساڵانی جەنگەکە دادەڕێژێت، لێ چیرۆکەکەی ئێمە سنوردار و نەخشە بۆکێشراوەو دەربارەی ئەوانـەن کـە شلۆمۆ کوردە بۆی باس کردوویت، هەندێك ڕووداو بەسەر قارەمانەکانیدا هاتووە، بەڵام ئەو لێیان بێ ئاگایە. خەڵکانێك دێن، تا حەکەیاتی مەینەتی دانیشتوانی شارۆچکەکە بگێڕنەوە، ڕەنگە شلۆمۆ کوردە بەهێڵی گـشتی دامـاڵراو بەسـەریاندا تێپـەڕی بێـت. لەتوانای ئەو هونەرمەندەی کـە لـەباوکی سـەلمانی بیـستووە، هەیـە سـیمایەکی وای پێبدات کە کەسێتییەکی پێ دەبەخشێت، بەڵام ئێمە قسەکەمان دەربارەی کەسـانێکی دیاری کراوە: سـێ کـەس، ئەوانـەی بەسـەر خـودی خۆیانـدا داخـراون و لـەو دیـوی ڕووداوەکانەوە، لەپشت دنیاوە، لەودیوی ڕاستییەکانەوە، مردووەکانەوە، دەژین، مەگـەر بەهۆی هەژینی بورمەلەرزەیەکەوە، ئەگینا ڕۆژی پەسڵانیان لێ هەڵناستێت: ئەڵماس، حەسەن بوزورگ، ڕەزا عەلی.

ڕەزای سەرسام بە حەڵاڵی برا بێ ئاگاکەی لە ڕووداوەکان، حـەڵاڵێك لـەناو وێنـەی ڕووت بوونەی شەوی گەرماوەکە ڕاوکرا، وێنەیەك ژنـە جـوان و بەپۆشـاکی پـاکیزەیی داپۆشراو لێی بێ ئاگایە. لەڕەزا هەڵدێت و لە نیگاکانی دەترسێت، خۆی بۆ مێردەکەی و سێ کوڕ تەرخان کردووە. وەك شارۆچکەکەی بەستەزمانەو جێگەی شەرمی لەخەیاڵی لاوێکدا دەردەکەوێت و دەبێتە کۆیلەی جەستەی.

هەموو ساتێك بەخەیاڵ رووتی دەكاتەوەو بە غایلەكانی هۆگرانە دەی بینێت و گۆشتە تەڕو بڕەكەی دێتە دەستییەوە، دەی بینێت ئەندام بە ئەندامی جەستەی پێ دەبەخشێت، بێ ئەوەی گوێ بداتە قەدەغەو حەرام كراو، هەرچییەكی بوێت وای لێدەكات. ئاواتە خوازە خەیاڵ ببێتە راستی و بەجۆرێك دنیا تووشی دۆخێك بێت وا لە شووەكەی بكات نیمچە پەككەوتەی ماڵەوە ببێت. جێ خەوەكەی رەزا دڕكی لێ دەڕوێت، مارو دووپشكی لێ دەترووكێن. شێت و حاویج دەبێت و خەریكە بەرەو ژووری براو غەنیمی پەلامار دەدات، تا ئابرووی زەوت بكات و توخنی لێ حەرام كراوی خۆی بكەوێت، چونكە بەخوایشتی خۆی فریشتەكەی خۆی خنكاندووەو شەیتان هاتۆتە جێگەی.

حەسەن بوزورگ خەون بە زستانێكی دیكەی بەفراوییەوە دەبینێت، تا پارەیەكی زۆرتر دەستی باوكی بكەوێت و ئەمیش بە كچی جوانی دیكە شاد بێت و بیانهێنێتە نێو(حەرەمسەرا) كەی و تا شانازیكردنی خۆی دەربخات (ئەوەتا هەموو كیژانی سابلاخ هی منن، هەموو كچە هەرزەكارێك لە شارۆچكەكەمان خۆی بەسەر پێڵاوكانمدا دەدات، هەر بە تەنها منم پاشای رەگەزە جوان و شیرینەكەی تر!).

ئەم تەماحانە بەسەریدا زاڵ دەبن و لە خەونێكی هەرزەكارانەی خۆش نوقم دەبێت. ئێرەییەكەی بەرانبەر خوشكەكانی زیاتر دەبێت و پتر سوور دەبێت كە لەتەك دایكیان لەماڵەوە قەتیسیان بكات، بەمەش راوێژەكانی باوكی جێبەجێ دەكات كە پێی وتووە ئافرەت بۆ ماڵەوە دروست بووە، ئەو لە ماڵ دالیك دەبێت و هەر لە ماڵیشەوە دەمێنێتەوە تا لەناو دارە بازێك لێی دەردەچێت. دایكی و خوشكەكانی بەگوێی دەكەن و ماڵەوە جێ ناهێڵێن. كاتێك باوكی لە ماڵ نابێت، ئیدی حەسەنی نێرینە لە ماڵەكەی خۆیدا دەبێتە فەرماندەرو جەللاد. ئەو دەیەوێت جگە لە دایكی و خوشكەكانی هەموو ئافرەتانی سابلاخ بێنە دەرەوە... گەر زیناكارێك ئابڕووی خەڵكی بەخۆی رەوا ببینێت، ئەوا ئەم لە هەموو كەس پتر نیگەرانی ئابڕووی خۆیەتی. ئەو بە دروشمی خۆهەڵنان (كچان جوانی ژیانی دنیان) شانازی دەكات، زیاتریش بەوە شانازی

دەکات کە (ئابڕومەندترین ئافرەتی سابڵاخ دایك و خوشکەکانی منن، تەنانەت جگـە لە باوکم و من... چاویان بە رووخساری پیاوێك نەکەتووە!).
ئەو وەك سلێمان میراتی گەنجینـەو هـەزار کەنیزەکـەی بـۆ دەمێنێتـەوە، برایـەکی نەفرەتیشی نییە تا لەو میراتە ململانێی لەگەڵـدا بکـات، بـەڵام چـوار خوشـکەکەی مایەی دڵتەنگی ئـەمن و هـزری ئـاڵۆز دەکـەن، چـی دەقـەومێت گـەر یـەکێك لـە خوشـکەکانی بەدزییـەوە بـەرەو دەرەوەی شارۆچـکەکە بخزێـت و گـیرۆدەی عەشـقی هەرزەکارێکی خۆی ئاسا ببێت، لەوێ لەژێر درەختێك دوور لە چـاوی خـەڵکی بـەلیك دەمی خوشکەکەی گلاو بکات، ئەی ئەگەر هەر وەك چۆن ئەم دەستی گەر لەسەر جل و بەرکیشەوە بێت، گەمە بە جەستەی کچی خەڵکی دەکـات، ئاوهـاش دەسـتی پیاوێـك گەمە بە جەستەی یەکێك لە خوشکەکانی بکات؟! ئایـا رێـی تێدەچـێت یـەکێ لـە خوشکەکانی رۆژێ بە نهێنی زەردەخەنەیەکی بۆ یەکێ لە لاوەکانی سابڵاخ نەنواندبێت و ئەویش بۆی سەندبێتەوە، یەکێ لە خوشکەکانی، دەشێ هەر هەموویان تەماشایەکی وایان کردبێت، کە ئەم لێی تۆقیوە؟! ئایا خوشـکەکانی لـە خـەڵکی بـەدەرن؟! ئـاخۆ هەستیان لەهەستی جحێڵانی دیکەی دنیا جیاوازە؟! تـۆ بڵێـی لەخـەڵکی بـەدەربن و ئارەزووی پیاویان نەبێت و سۆزو خۆشەویستی بەرەو رەگەزەکەی تر رایـان نەکێـشێت؟! وای چ کارەساتێکە! کەواتە تۆ بڵێیت گۆشەگیری خوشکەکانی ئاوها سەرکز کردبێت؟! یان قـەتیس بـونی ماڵـەوە شـەوق و ئـارەزووی بـۆ پیـاوان لەناخیانـدا خنکانـدووەو لەگۆریچەی نادیاری خودی خۆیاندا خەفەی کردووە، ئاوهاش تووشـی سـاردی ئـارەزوو بوون. حەسەن بوزورگ هەستی بەترسێك کرد، کە بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بـە جەنگـە کاولکارەکەوە نەبوو، کە لە دەوروبەری خۆی و ژێر پێیـەکانی دەگـەڕا...، خراپـەکاریش نییە، خۆشەویستی و ئیرەیی بە خوشـکەکانی لەشـەڕانگێزی باشـترە. ئیـدی کـە ئـەم غایلانەی بۆ دەهات، ترسی لە خوشکەکانی زیاتر دەبوو. هەستی کرد خوشکەکانی لە تەنگژەدان، رەنگە خـۆی هەسـت بـە تەنگـژە بکـات. هـەموو گریمانـەکان خەسـێتی بەدگۆڕاوی و ئێسك قورسی پیشان دەدەن، ئەمەش ئەگەرێکی تـرەو وەك واشـە بەسـەر سەرییەوە دەنیشێتەوەو مـەژگی هەڵـەکۆڵێت: رەنگـە گۆشـەگیری سـەپێنراو هەسـتی

ڕەگەزایەتی لە خوشکەکانیدا خەفە کردبێت، بێگومان گەر بۆیان هەڵبکەوێت بەدزییەوە خۆیان دەخەنە ئامێزی پیاوێکەوە! ئەی بۆچی خودا بەنێرینەیی دروستی نەکردن، ئەوسا دەبوونە هەرزەکار گەلێکی وا هێڵەیان بەکچانی سابلاخ و دەوروبەری دەکرد و لەزەتیشیان پێ دەگەیاندن؟! ئەی ئەڵماس، ئەم دراوسێ لەخۆباییە ڕۆژێك هەر دێت ملکەچی دەکات و وای لێدەکات بۆ ڕۆژی دوایی خۆی رادەستی بکات. ئیدی هەر ئەو ڕۆژە وەك ئەوەی نەك هەر سابلاخ، بەڵکو هەموو دنیای دەست کەوتووە، دەی کاتە قاوو شانازی دەکات (ئەوە من بووم پڵنگە مێییە دڕندەکەم رامکرد) بە هەموو دنیارای دەگەیەنێت کە (حەسەن بوزورگ هەر خۆی بە تەنها دڵە شێرەکە ملی بۆدا، ئەڵماسێك هەموو پیاوانی سابلاخ دەستیان لێ شوشتبوو!). هەروەها دەڵێت: جگە لە خەڵکی تەنها لەبەر پێی من دەڕۆیت و ئامێز و لاقەکانیم بۆ دەکاتەوە.

حەسەن چەخماخ وەئاگات و سەیری کرد مێردەزمەکەی بۆتە بەشێك لە وەتاگاییەکەی. چەخماخ کە جڵەوی بەدەست رووسەکانەوە بوو، بە ئاوەژووی باوکی سەلمان ئەم جەنگەی بە مێردەزمەنە دەزانی.

ململانێی نێوان کۆنەخوازان و بەلشەوییەکان لەوپەڕی دابوو. حەسەن چەخماخ دڵنیا بوو لە سەرکەوتنی هاوڕێ شیوعییەکانی، سەرکەوتنەکەش لەچەند ڕۆژ یان چەند هەفتە یان چەند مانگێك زیاتری نەدەخایاند! وائێستا لە مێردەزمەکە وەئاگادێت، مێردەزمەیەك لە یەکەم پێتی ئەلف و بێی جەنگەکەوە تا دوا پێتی هێشتا لە پشت چیاکانی ئازەربێجانەوە تا دەگاتە مۆسکۆ و سان پترسبۆرگ خۆی مەلاس دابوو. لەگەڵ چەپەڵی ئەم جەنگەدا چەخماخ پۆلینی کردبوو بۆ خەونی گوڵگوڵی و مێردەزمەی ڕەش. هەرچەندە خۆی موسڵمان بوو، عوسمانییە تورکەکانیش لەسەر زەمین خەلیفەی ئیسلام بوون، بەڵام لە روانگەی چەخماخەوە مێردەزمەبوون، رزگاربوونی تێکرای جیهانیش بەدەست عوسمانییە ستەمکارەکانەوە نەدەهاتە دی، بەڵکو بەدەستی سوپای رووس دێتە دی. لەم کاتانەدا بوومەلەرزە خاکی رووسیای بە توندی هەژاند و لەوێ خەڵکی بەلێشاو دەچنە پاڵ بزووتنەوەی کرێکاران و گەل. دێوەکە گێنگڵ دەخوات و ڕۆژی رزگاری نزیکە. عوسمانییەکان هێشتا ماون و لە گیانەلادان و لەسەر زەوی

خراپەکاری بڵاو دەکەنەوە. چەند سەدەیەك لە گەندەڵی و زوڵم و زۆرداری کاتی ئەوەی هاتووە کۆتایی بێت، بەڵام (پیاوە نەخۆشەکە) سەربەرز دەکاتەوە، ئەمەش بە ئاگاهاتنەوەی پێش مردنە، زۆرتریش لەم بە ئاگاهاتنەوەیەی بترسێت، چونکە پێش گیان دەرچوونی دزێوترین دەست دەوەشێنێت.

من ماف بە رووسەکان نادەم لە کوشتارە سامناکەکەیاندا، چونکە هێشتا لایەنگرانی قەیسەری خراپەکاری نیمچە دڕاویان تێدا ماوە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە، کە سەرکردە نەفرینەکەیان سەربەوە، ئەو تاوانەش بۆ هەندێك لە گەوجەکانی سابلاخ بەڕەوا نازانم، چونکە کەوتنە دوای پاشماوەی سوپای رووسەکان و زیانیان پێگەیاندن، ئەو سزایەش مافی خۆیان بوو، بەڵام... سەرم سوڕماوە... بەڕاستی قێزەونی جەنگ و ترسناکییەکەی سەیرە!

ئاخر عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان چییان دەکرد، گەر تێك شکابان و دانیشتوانی سابلاخ هەمان کاریان لەگەڵ کردبان وەك بە پاشماوەی سوپای رووسەکانیان کرد؟! دڵنیام سابلاخ و ئەوەی تێیدایە لە بێخەوە هەڵیان دەکێشا و بەسەر سەری دانیشتوانەکەیدا دەیان رووخاند. کەواتە تۆڵەسەندنەوەکە بۆ ئەوەبوو ئەو چەند کەسە دەبەنگە لە دانیشتوانی سابلاخ پەند وەربگرن، بەڵام ئاخۆ پەندیان وەرگرت؟! نەخێر بەڵکو کاڵفامی و گێلایەتییەکەیان زیادی کردو دووبارە کەوتنە راونانی رووسەکان. ئەی ئەم عوسمانی و ئەڵمانانە پاساویان بۆ کوشتنی جوولەکە و نەسرانییەکانی سابلاخ چییە؟ رەنگە جوولەکە و نەسرانییەکانی سابلاخ لەم جەنگە ترسنۆکییان نواند بێت، تەنانەت ماڵەکانی خۆشیان لێیان وەڕەس بوون، مەگەر بۆ نوێژکردن، یان ناشتنی مردوویەك بێنە دەرەوە، ئەگینا هەر لە ماڵەوەن، ئەگەر دەریش بچن ئەوا وەك مێروو خۆیان بە دیوارەکانەوە دەنووسێنن، ئەگەر بۆیان بکرێت ئەوا خۆیان لەنێو دیواری کووچەو کۆڵانەکان حەشار دەدەن. خۆ ئەگەر بە شەقامی سەرەکی یان گۆڕەپانەکەدا بڕۆن، ئەوا لە ترسی کارەساتێکی کتوپڕ هەزار جار ئاوڕ دەدەنەوە، بەڵکو دەم بیست هی وایان هەیە کاتێك لەوبەری شەقامەکەوە بۆ ئەم بەری بپەڕێتەوە، ئەوا وەك گوێ زەوی بەدەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە. کەوابوو بیانووی ئەڵمانەکان و عوسمانییەکان لە

کوشتنی بەستەزمانەکانی شارۆچکەکەمان چییە، مەبەستم جوولەکەکان و دیانەکانی سابلاخە؟! خۆ ئەوان دەستیان بۆ تاڵە موویەکی سەرتان نەبردبوو، ئایا هەر بۆ خۆشی کوشتن دەیان کوژن؟! بێگومان هەر بۆ ئەوەیە، بەڵام خوێنڕێژەکان پاساوی تاوانەکەیان بەوە دەدەنەوە گوایا ئەمە لە تۆڵەی کوشتاری موسڵمانەکانە بەدەستی رووسەکان. ئێوە ئەگەر دەتوانن بڕۆن تۆڵە لە رووسەکان بکەنەوە، بەڵام ئەوە دوورە، ئێوە تەنها بە برا بێهێز و بێدەسەڵاتەکانی ئێمە دەوێرن. هەی پیاو کوژان بیانوویەکی گونجاو بێننەوە! ئەرێ ئێوە خەڵکی بێتاوان بەتاوانی خەڵکی دیکەو بە بیانووی تۆڵە سەندنەوەیەکی بێ بنەما دەکوژن؟!، بەڵکو بەدرێژایی سەردەمەکانی سوڵتانە گەوجەکانتان هەر ئەمە ئەتوارتان بووە!

حەسەن چەخماخ لەم بیرۆکانە ورد دەبووەوەو هەستی دەکرد مێردەزمەکەی فشار دەخاتە سەر دڵی و هەناسەی لەبەر دەبڕێت و بە قۆڵ و بازوویەکی ئەختەبووت ئاسا دەی گوشێت و بە هەموو هێزییەوە چنگی لێ گیر دەکات... تا بانگەوازەکەی موو بەموو بەگوێی هاورێیانی نەدا ئاسوودە نابێت:

(هاورێیان! وێژانی جیهان خەوم لێ دەتارێنێت، هەر لەم چرکە ساتەدا وا شەوغوونی هەموو دنیا رژاوەتە نێو چاوەکانم. گومانێکم نییە، بۆ چرکەیەکیش گومانم نەکردووە، کە ئێوە لە ئازاری ئەوەی روودەدات هاوبەشی منن. لە فەرهەنگی ئێمەدا میللەتان و گەلان و چینەکان و ئایینەکان لە وشەی (هاورێ)دا دەتوێنەوەو تێکرا دەبنە یەك قەبارە مرۆی یەکگرتوو، بەڵام هێشتا چاریان بەجۆرە کلێ دەرێژن کە کاتی بەسەر چووە، هەنگوینی، سوور، سەوز... لە کۆندا کەسانێك هاتن مرۆڤایەتییان بەسەر گرووپ و پارت و تایەفەدا دابەشکرد، ئێمە دێین جارێکی دی یەکیان دەخەینەوە. هاورێیان، جیاوازی لەنێوان جوولەکە و نەسرانی و موسڵماندا نییە. ئێمە بڕوامان بە مرۆڤ هەیە، دراوسێتی براکانتان لە مرۆڤایەتی دا بکەن. دانیشتوانی شارۆچکەکەتان لە دێرزەمانەوە دۆست و دراوسێ و برادەرتانن، لە شمشێری عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان بیان پارێزن، ئەی گەلانی جیهان یەك بگرن).

شلۆمۆ کەتانیش بانگەوازی ئەمەی دەکرد و هیچ ئامۆژگارییەکانی مارکس و لینین و تەنانەت ترۆتسکیشی نەخوێندبووەوە، خۆیشی بە هیچ بیروباوەڕێک یان مەزەبێکی نامرۆڤانەوە نەبەستبۆوە. مرۆڤێنی دایکی هەموو بیروباوەڕو مەزەبەکانە، بەڵام ڕەوتی ڕووداوەکان لە سابلاخ هەڵبژاردنێکی نەهێشتبووەوە، ئەم هەڵبژاردنەش داواکاری شلۆمۆو بانگەوازەکانی حەسەن چەخماخ بوو، کە دانیشتوانی سابلاخی بەرەو بۆتەیەك دەبرد هەموویان لەناویدا بتوێنەوەو ئاوێنەی یەکتر بن، تا بکوژان لە هەردوو سوپاکەدا بشڵەژێن، تا خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی شارۆچکەکە رزگار ببن، با لەوەولا ڕووداوو کارەساتەکان بگێڕنەوەو شانازی بەیەکگرتنی دانیشتوانەکەی لە هەموو بیروباوەڕو ئاینەکان بکەن.

* * *

جگە لە کەسانێکی کەم، ئەوان برای یەکترن!

دەمی مورتەزا حاجی زادە چۆن دەمی ئەژدیها لە بری هەڵم ئاگری لێ هەڵدەستێت، بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوەو هەورەکان دەی گێڕنەوە، ئاوەکەی هەڵم دەکات و دەڕەوێتەوەو پێیەداخ بووەکانی دەکەونە سەر بەفرەکەو دەی توێننەوە، بن پێیەکانی دەبێتە گۆماوێك و فراوان دەبێت تا دەبێتە دەریاچەیەك و هەموو سابلاخ دادەپۆشێت، ئینجا هەر ئەوەندە دەچێتە ژوورەکەی خۆیەوە دەی بڕێت و بە پێیەکانی دەی شکێنێت، تا هەموو شتێك لە دەرەوە دێتەوە دۆخی جارانی خۆی. سەرماو بەفرو جەنگ و عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان. ورگە زلەکەی لە سەغڵەتیان دەهەژێت و هەردوو سمێڵی کە لە کلکی سمۆرە دەچن لەسەر ڕیتمی تووڕەیی تەپڵێك سەما دەکەن، ئەم جارە براکەی دەست پێشخەری کرد و بەدیاری و بەرتیل، بەو باجەی کە لە ماوەی ساڵێکدا لە دانیشتووانی سابلاخی ستەمدیدەی سەندووە، دەمی سەرکردە عوسمانییەکەی چەور کردووەو ئەویش نەرم بووەو شوێنێکی لەسەرا بۆ بنکە و سەرکردایەتی بۆ دیاریکردووە. درەوشانەوەی کانزا زەردەکە ئاوەزی سەرکردە عوسمانییەکە دەڕفێنێت و چاوی کوێر دەکات، بۆیە هەموو دەسەڵاتێکی مەدەنی لە سابلاخی پێدەدات و هەواڵیش بۆ مورتەزا دەنێرێت و ئاگاداری دەکاتەوە کە دژی

براکەی پیلان نەگێڕێت، هەڕەشەی لێدەکات، کە نەك هەر فەلاقەو دارکاری دەکات، بەڵکوگەر پیلان دژی وەلی بگێڕێت، ئەوا گۆشتەکەی هەنجن هەنجن دەکات و دەی برژێنێت و دەرخواردی خۆی دەدات.

بیژییەك پشتیوانی بیژییەك دەکات، بەڵام براکەم هەوڵ دەدات سووکایەتیم پێ بکات و زەلیلم بکات، دەبا چاوەڕێی گۆڕانی بارودۆخ بین، ئەم وشەی (براکەم)ە هەڵوەستەی پێکرد و لە ماناکەی راماو بینی ئەم وشەیە دوو هەزار جار لە درۆ لێوان لێوە، یان ئەگەر درۆ بدرێتە پاڵ برا زۆڵەکەی، ئەوا درۆکە دەبێتە خودی وشەکە و وەلی برایشی، بەڵام گومانی تێدا نییە کە ئەم و وەلی لەیەك منداڵدانەوە هاتوونەتە دەرێ، لێ چووزانێت ئەو پشتەی لێی کەوتوونەتەوە، پشتی یەك باوکە؟ سەری سوڕما، بەڵام ئەم جەستە زەبەللاحە لەسەریدا هەندێك عەقڵی تێدا ماوە، ئەم عەقڵە بەرەو راستییەك رێنمایی کرد، هاسان نییە بینادەم دانی پێدابنێت، ئازایانە وتی: (ئایا من لە شەڕانگێزی و زۆڵێدا لەوەلی کەمترم؟!) کەواتە مەسەلەکە مەسەلەی هێزە، نەك مەسەلەی لێوەشاوەیی. ئەمان هەردووکیان لەگەڵ رووسەکان و عوسمانییەکان هیچ جیاوازییەکیان نییە، بەڵام هەریەکێك لەوان ئەو هەلەی بۆ رەخساوە پێ لەسەر خاکی سابلاخ بچەقێنێت و دەسەڵاتی خۆی تێدا پیادە بکات و بە ئارەزووی خۆی خەڵکەکەی بکوژێت.

ئەو هێشتا ئەم هەلەی بۆ نەڕەخساوە، ئێ بەدەستی وەلی ستەمکاریش زەلیل کراو سووکایەتی پێکرا. بە هەڕەشەوە وتی: ئای وەلی، کاتێك دێمە سەر کورسی دەسەڵاتەکەت، دەمبینی لە تۆ زۆردارترم...، لە سوکایەتی و زەلیل کردنت چۆن داهێنان دەکەم، تا لە یادەوەری خەڵکیدا رۆژی تەویلەکە دەسڕێتەوە، ئەوسا خەڵکی باسی ئەوە دەکەن کە من چۆن سوکایەتیم پێکردوویت و زەلیلم کردویت، مەرج بێ ئەوەی بەتۆی دەکەم خەیاڵیش تێپەڕێنێت بگاتە دنیای ئەفسانە، بەڵام چۆن و کەی؟! هێشتا وەلی بە پشتی هێز بەربەرەکانی دەکات، ئەو لەجەستەو جل و بەرگەکانی خۆی ورد دەبێتەوە، تەماشا دەکات لە هەر بستێکی لەشیدا نیشانەی شەرمەزاری و سووکایەتی پێکردنی پێوەدیارە). برۆ بۆکنی و داوای گفتوگۆی لێ بکە، هاوکات بە

پەنهانی هەوڵی کۆکردنەوەی لایەنگر بدە، تا دەستی خۆت بووەشێنیت، چونکە هەلێك هەر دەڕەخسێت. بیرۆکەیەکی زیرەکانەیە، بەڵام ئابڕومەندی بەتوندی ڕێ لەوە دەگرێت، کە (موسڵمان تا جەستەی لە شوورەیی پاك نەکاتەوە، چۆك دانادات!)، (ئاخر ئەمە فێڵێکە لە تەگبیری عەقڵە)، (بەڵام بەهای عەقڵ بەرانبەر ئەوەی خەڵکی باسی دەکەن، چییە؟ دەڵێن مورتەزا حاجی زادە سەرباری ئەوەی لە ڕۆژی تویلەکەو ئەوانی دیکە پێی کرا، چۆکی بۆ وەلی برای دادا...، دەك چاوی ترسنۆکان کوێر بێت!) کەواتە بڕۆ بۆ لای و بەتوندی قسەی لەگەڵدا بکە و ئاگاداری بکەوە کە دەست لە سووکایەتی پێکردنت هەڵبگرێت، ئەوسا بە هێمنی و بە نهێنییەوە بەدوای پیلانەکاندا بچۆ! ئاوهاش خەڵکی دەڵێن: مورتەزا ڕووبەڕووی براکەی بۆتەوە، هەرچەندە وەلی کۆمەك لە عوسمانییەکان وەردەگرێت، بەڵام مورتەزا قارەمانانە قسەی لەگەڵدا کرد! بەم وشەی (قارەمان)ە دڵی ئاوی نەخواردەوە، بەڵام ئەمە عەقڵی بۆی پێشنیاری کرد و ئەمیش بەدڵییەوە نووسا. بۆ لای دەڕۆم و بەرەنگاری دەبمەوە! بۆ لای دەڕۆم و لە سنوری خۆی رایدەگرم! سڵاو لەم بیرۆکەیە!

مورتەزای حاجی زادە نزیك سەرا لە ئەسپەکەی دابەزی، کە لەشی بەچاو دوێنێوە دوو ئەوەندە دیاربوو، تژی بوو لە پشت بەخۆبەستن و ئابڕوومەندی، سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو خەڵکە تاك و تەرایەی بەرێکەوت لە نزیك سەراوە تێدەپەڕن، بیبینن، کەچی زۆربەی خەڵکەکە بۆ خۆ پاراستن لە بەفری کەڵەکە بوو ، جەنگەکە لە ماڵەکانیان خۆیان حەشاردابوو، جگە لە سەربازە عوسمانییەکان و دەست و پێوەندە شەڕانگێزەکەی براکەی، کەسی دیکە نەیان بینی. لێیان نزیك بۆوە، ئەوانە لە هەڵبژاردەی خوێنڕێژو ڕێگرەکان بوون، هەردوو براکە، کوڕانی (ئەکبەر)یشیان لەگەڵدا بوو، ئەم دوانە هەر بەناوهێنانیان لەرز دەکەوتە دڵ و دەست و لاقی ئازاترین پیاوی ئازەربێجان و کوردستان، بەڵام ئێستا بەرانبەر پیاوانێك بچووك بووبوونەوە، کە شەیتان خستبوونییەوەو بە مەمکی تاوان گۆش کرابوون و عیزرائیل لەشێوەی ترس و تۆقین بوو بوو بە هاوپەیمانیان. ئەمانە لەو گێل و گەوجانە بوون هەناسەیان هەوای سازگاری سابلاخی ژەهراوی دەرکرد و قورسایی پێیان لە قورسایی جەنگەکە لەسەر

دانیشتووانی شارۆچکەکە سەختتر بوو. ئا ئەوەتا کونەپەپوو هەموو قەلەڕەشەکانی لە دەوری خۆی گرد کردۆتەوە، گلاوێك گلاوگەلێ بەرز دەکاتەوەو براکەی خۆی پێیان بەردباران دەکات، بەڵام وەلیی خۆت و ئەو هەرچی و پەرچییانەی وان لەگەڵتدا، بۆم راوەستن! چووە پێشەوەو رووخۆشییەکی درۆزنانە و دەستکردی نواند، هەر کە ناسییان، دەستو پێوەندی براکەی لەبەر دەرگاکە رایان گرت. دەستبەجێ چارەی گرژ بوو. یەکێکیان بەدەنگێك وەك دەنگدانەوەی پارچە تۆپێکی رووسەکان، یان عوسمانییەکان لێی خوڕی:

- چیت گەرەکە

- من برای ئەوم

دەستیان بە پێکەنینێکی ناسازکرد، هەش بەسەر ئەوانەی ئەمانە پارێزگاری پارێزگاکەیان بن! کەواتە باشترایە دانیشتووانی سابلاخ خۆیان بکوژن، یان لە جەنگەکەدا بکوژرێن: یەکێکیان وتی:

- وەلێ ئاغا هاتنە ژوورەوەی ئاژەڵانی قەدەغە کردووە، هێی ئەسپی زگ زل بەشوێن خۆتدا بگەڕێوە!

مورتەزا خۆت رابگرە، تۆ رووبەڕووی هیچ و پووچترین بوونەوەر بوویتەوە، قوڕ بەسەرت، هەی ئەو کەسەی بەدرۆ ناوتیان ناوە وەلی!

- گەرەکە براکەم ببینم...، هەر دەبێت ببینم!

یەکێك لە رێ لادەرەکان بەچاو ئاماژەی بۆ جەعفەر کرد و جەعفەریش هاتە ژوورەوە، ئینجا گەڕایەوەو بانگی کرد:

- هێی ئەسپەکە، دەی بۆ لای گەورەو تاجی سەرت وەرە ژوورەوە...

وەلی لەسەر کورسی دەسەڵاتەکەی پان بوو بووەوو جەستە گۆشتنەکەی خەریك بوو لەسەر کورسییەکە دادەچەکایە سەر زەوییەکە، بەقێزو بێزەوە لە تەوقی سەرەوە تا بن پێیەکانی تەماشای براکەی کرد و بەمنگەیەك وتی:

- چیت دەوێت؟!

سەرەتایەکی باش نییە، بەڵام تۆ ئەی مورتەزا بەڵێنت بەخۆت دابوو، کە بەوردو خۆراگرییت، وەك ئەوەی بە ئامێری بەرزکەرەوە دەنگی لە گەروویییەوە بەرز بکاتەوە، گڕی و رەقییەکی بەدەنگی خۆی دا:

- وەلی، هاتووم ئاگادرت بکەمەوە...

کورسییەکەی وەلی کەوتە جۆلانەو جەستەیشی لەگەڵیدا کەوتە هەژین، رووخساری و سمێڵەکانی کەوتنە سەماکردن، ئیدی وەك ئەوەی یەکێك بێ وەستان ختووکەی بدات و بیهێنێتە پێکەنین، دەهەژێت و هەناسە هەڵدەکێشێت، ئینجا بە گاڵتەو تەسەوە دەپرسێت:

- ئاگادارم دەکەیتەوە؟! لەچی ئاگادارم دەکەیتەوە...، هەی مێروولە؟!

مورتەزا تووڕەبوو، ئەمجارە پێویستی بەرەنگ تێکچوون و ئامێری بەرزکردنەوە نەبوو، تووڕەیی جڵەو و ئاستەنگ ناهێڵێت...

بەڵام نەکەی مورتەزا نەکەی ئاوەزی خۆت لەدەست بدەیت!

- تۆ برامیت، بەڵام بەردەوام گەمە و سووکایەتیم پێدەکەیت، وەلی دەست لەسەر براکەت هەڵبگرە!

وەلی نوکتەیەکی دی ژنەوت، پێکەنینەکەی قووت دایەوە، ئەمجارە بە تەوسەوە وتی:

- هەی کەرە، فەرمانی تۆیە...! باشە دەستت لێ هەڵدەگرم، بەڵام مادام بەپێی خۆت بۆ ئێرە هاتوویت، کەواتە بەدەستی خاڵی لێرە دەرناچییت!

بەهەردوو دەستی چەپڵەیەکی لێداو نەڕاندی:

- ئاتۆ شەڕانگێز!

دەستبەجێ بوونەوەرێکی زەبەللاح و ئێسك قورس دەرکەوت، بەهیچ جۆرێك دیمەنی لە مرۆڤ نەدەچوو، جگە لە (شەڕانگێز) ناوێکی دیکەی نەبوو. مورتەزا حاجی زادە تەماشایەکی کرد و ترسێکی لێ نیشت کە لەوەو بەر هەستی پێ نەکردبوو. ئەمە مورتەزا حاجی زادەیە بەو هەموو هێزو درییەی خۆیەوە شەڕانگێزەکە دەبینێت و ترسی لێ دەنیشێت! لە راستیدا خراپەکاری و شەڕانگێزی پلەی هەیە، بێگومان ئەم بوونەوەرە لەوپەڕی شەڕانگێزی و خراپەکاریدایە.

کێ دەزانێت؟ رەنگە وەلی وای لێکردبێت و بە شەڕانگێزی و خراپەکارییەکی رووت و رەها بارگاوی کردبێت. بوونەوەرێکی ناشیرین و تێکشکێنەر بوو، بەڵام بێگومان یەك گەردیلە هۆشی نییە. بریتی بوو لە خراپەکارێکی ئەوتۆ وەلی چۆنی ویستبا ئاوهای بەکاردەهێنا. ئەمێستا وەلی فەرمانی بە (شەڕانگێزەکە)دا، کە مورتەزا بەرەو ئاسیاوەکە ببات و پەتی ئەو هێسترە بکاتەوە کە بە دەوری بەرداشەکەدا دەخولێتەوە، ئینجا مورتەزا لە جێگەی ئەو ببەستێتەوەو چاوانیشی ببەستێتەوە، ئەوسا نیلەکە لە ملی بکات، ناچاریشی بکات لەسەر چوار پەل بەدەوری خولگەکەدا بخولێتەوە، تا دەفەردە گەنمی تەاو دەهاڕێت (گەر وەستا، یان توانای نەما، یان خاوبووەوە، ئەوا بەرقامچی بدەو بەزەییت پێدا نەیەتەوە. ئاگادار بە دەبێ بە توێزی ئالیکی هێسترەکە بخوات. کە هەر دەگونییەکە هاڕرا، چۆن زبڵ و خاشاك فڕێ دەدرێ، ئاوها تووڕی بدە سەر شەقامەکە!).

مورتەزا حاجی زادە ئەو تۆزە ئابڕووەی کە مابووی، ئەویشی تکاو نەما و کەوتە نێو زەلکاوەوە. ئەمە سووکایەتییەکەو بنیادەم بەرگەی ناگرێت، ئەمە ئەشکەنجەیەکەو لەسەرووی توانای مرۆڤەوەیە. مورتەزا حاجی زادە لەو چرکەساتی بێدەسەڵاتییەدا گریا...، گەر ئەم شەڕانگێز بێت، ئەمە شەڕانگێزییەکەو لەوپەڕی لاوازیدایە. ئێستا براکەی خراپەکارێکە و لەوپەڕی توانا و هەڕەتدایە. مورتەزا رۆژی تەویلەکەی بیرچووەوە، ئەوەی باوکی سەلمان کوردە لە زاری راهاتبوو و بە رۆژی (تەویلە) ناوی دەبرد بیری چووەوە کە بەچاو ئەم رۆژە شومەوە (رۆژی خولگەکە...) ئەوپەڕی ئابڕوومەندی بوو و بەهیچ جۆرێك بەراورد نەدەکرا، بەڵام خەڵکی هەر باسی (رۆژی تەویلەکە)یان دەکرد، ئەوە رۆژێك بوو بە بەرچاوی دانیشتوانی سابڵاخەوە روویدا، بەڵام (رۆژی خولگە) ئابڕووبەرەکە، جگە لە مورتەزاو براکەی و چەند کەسێك لە دەست وپێوەندی وەلی بەولاوە، کەسی تر نەی بینی، وەلی ئەو چەند کەسەیشی ئاگادار کردەوە کە باسی (رۆژی خولگەکە) نەکەن و فەرمانی پێدان پەردە پۆشی بکەن، بۆ ئەوەی خەڵکەکەی لێ نەڕەنجێت و وایان لێ بکات بچنە پاڵ برا سووکایەتی پێکراو و ئابڕوو تکاوەکەی، بەڵام مورتەزا سوێندی خوارد و بەڵێنی دا کە برینی سووکایەتی و ئابڕوو

تکانەکەی هەروا بەکراوەیی بمێنێتەوە، تا بەتۆڵە سەندنەوە سارێژ دەبێت، ئیدی لەوکاتەوە بەنهێنی دەستی بە کۆکردنەوەی لایەنگران کرد، کە دەبوو وەك ڕۆژی خولگەکە لە ڕۆژانی داهاتوو سەنگێکی هەبێت.

# کایەی پێنجەم

(گوڵ)ی هاوسەری مورتەزا حاجی زادە لە پەناوپێچی ئەو ڕووداوانەدا ون بوو، کە بۆنێکی سەیریان لێدەهات، بۆنی بخور وەك ئـەوەی بـۆنی سـرووتی ئەفـسوونێکی ڕەش بڵاوبکرێتەوە. ئێوارەیەك مورتەزا دوای ئەوەی بەدرێژایی ڕۆژەکە لە ماڵ دەرچـوو بـوو، هاتە ژوورەوە. خۆڵ و تۆزاوی و جلوبەرگ پیس و قژ بژ و ناڕێك تۆزوگەردی سـپی لـێ نیشتبوو. وا دەردەکەوت کە لەپڕ پیرو پەککەوتە بووبێت، شەکەت و ریسواکراو، تووڕەو داخ لە دڵ و بێدەنگ بوو. لەبن جلە شێواوەکانییەوە شتێکی گەورەی شـاردبووەوە، کـە وەك کلیلێکی گەورە جلەکانی بەرز کردبۆوە، گوڵ بە سەرسوڕمانەوە لێـی پرسـی کـە چییەتی، وەڵامی نەدایـەوە، چـووە ژوورەکـەی خـۆی و دەرگاکـەی داخـست، نـە داوای خواردنی کرد و نە وەڵامی پرسیارێکیشی دایـەوە، لـەپڕ بـەدەنگێکی بـەرز داوای لـە هاوسەرەکەی کرد، کە ئاوی گەرم و جلوبەرگی خاوێن و مەرهەمێکی برینی بۆ ئامـادە بکات. بۆ یەکەمجار لە ژیانی هاوسەرێتیاندا حەزی لەوەبوو کە بەتەنها خـۆی بـشوات. گوڵ ملی کەچ کرد، چونکە ئارەزووەکانی شووەکەی فەرمانە. سەرنجیدا، وا پـەردەکانی چێشتخانەکە دا دەداتەوەو لەوێ زۆر دەمێنێتـەوە. هـەروەها سـەرنجی ئەوەیـشی دا، وا هەموو ئاوە گەرمەکەی ناو مەنجەڵەکەی تەواو کرد و ئەو ئـاوەی خـۆی پـێ شـۆردبوو لەناو تەشتەکەدا نەهێشت تا بیکاتە ناو زێرابەکەوە، بەڵکو ئەم ئەرکەی نەخستە سەر ئەو و خۆی ئەمەی کرد. سەیرە، بەڵام لەوەش سەیرتر ئەوەبوو کاتێك ئەم هات تـا جلـە پیسەکانی ببات و بیان خاتە سەر ئـەو جلانـەی دەیـان شـوات، هـیچ شـوێنەوارێکی جلەکانی نەبینی، هەروەها تەماشـای کـرد مەرهـەمی برینەکـەش شـتێکی وای لـێ

نەماوە، هەموو ئەمانە چەندین پرسیاریان لا دروستکرد، بەلام گولّ کەی ئەمەی کردووە، کە پرسیاری وا سەیرو سەمەرە لە مورتەزا بکات؟! بەلام ئەوەی رووی دا سەرەتایەك بوو بۆ رووداني شتی زۆر سەیرترو حەزی زانینی دەکات بە تێکەلەیەك لە پرسیاری هەلاوساو و ئاوەزی تێك دەدات و بەسەر سامییەوە بێدەنگی دەکات. مورتەزا ئەو شەوە شامی نەکرد. داوای لە گولّ کرد کە ئێرەتی لە ژووری ژن و مێردایەتییەوە بۆ ژووری دانیشتنی ژنان بگوێزێتەوە، تا ئەو دەمەی خۆی پێی دەلێت بگەرێتەوە. بەگوێی کرد، بەلام نهێنییەکە چییە؟!

گولّ لە ژووری دانیشتنی ژنان فانۆسەکەی کوژاندەوە و لە کونێکی پەردەکەوە دەستی بە چاودێریکردن کرد، دیقەتی دا ژوورەکەیان لە نهۆمی یەکەم رووناکە. مورتەزا نەنووستبوو، نەنانی شێوانی خوارد و نە جلی شەوی لەبەرکرد. پێش نیوەشەو بینی وا بەبێ فانۆس دەخزێت و دەرگای حەوشەکە دەکاتەوە و بەو تاریکییە دەچێتە دەرەوە. ئەوە چی روودەدات؟ پرسیارەکە تووڕی دایە نێو گۆمیلکەیەك لە سەرسوڕمان. سەرەتا وای بۆچوو دوای نەختێکی تر دەگەڕێتەوە. مەزەنەکەی وا دەرنەچوو، کات دەڕوات و گۆمیلکەی سەرسوڕمانەکە تا دێت دەبێتە دەریایەکی هەلّچوو و ترسی دەخستەوە. ئەم ترسە خەوی لە چاوانی تاراند، کات دەڕوات و مورتەزا لە هەناوی نادیارێکی پڕ مەترسیدا ونە، تاریکی دوای نیوەشەو، جەنگ، وەلی برای. ئاخۆ بەرەو کوێ چووەو کەی دەگەڕێتەوە؟ ساتەکانی شەو دەکەونە چەقی رابردووەوە، بۆ پاشەکشێی تاریکی لە سەعاتێك زیاتری نەماوە. ئاخۆ لە کوێ بێت مورتەزا؟! پرسیارەکە دلّی هەلّدەکۆلێت و کەلّەشێری بەیانی دەقووقێنێت و بالّەکانی بەیەکدا دەدات. لەناکاو دەرگای مالّەکە دەکرێتەوەو ئەویش لەسەرخۆ دەست پێکدا دەدات. گولّ دلّنیا نەبوو کە ئەوەی هاتە ژوورەوە شووکەیەتی، تا ئەوکاتەی بینی دەچێتە ژوورەوە و چراکە دادەگیرسێنێت. کاتێك لە کونەکەوە بینی، ئیتر هەلاژیا و هەموو ئەوانەی جێگەکەی و ترس و پەژارە و خەوزڕان و تەنانەت حەزی زانینەکەیشی تێکڕای دایان رمانە سەر جێگەکەی و خەو بردییەوە، تا خۆری چێشتەنگاو کەوتە سەری و بەترساوییەوە بە ئاگاهات.

بە چاوی خەواڵوو و بە پەلە رابوو تا قاوەڵتی بەیانی بۆ مێردەکەی ئامـادە بکـات. مەسینەوە دەست شۆرەکەی بۆ هێنـا، سـەیری کـرد خـەمبارە. نـە قسـەی کـرد و نـە هیچیشی خوارد، بەڵکو بەدەست ئاماژەی بۆ کـرد کـە هـەموو تەوانـە دوور بخاتـەوە. سیمای پەرۆش و نهێنی پۆش بوو، قسە گل دەداتەوەو ئاشکرای ناکـات. گـوڵ ویـستی شتێك بڵێت، بەڵام زمانی لەنێو زاریدا وشك بوو. بەشـوێن خۆیـدا گەڕایـەوەو تووشـی خەدیجەی کارەکەر بوو.

ئەوەی پەژارەی کردبوو بۆی باسکرد...، بەڵام خەدیجە چی لەدەست دێت، ئەوێك چۆن بەرخ لەگورگ دەترسێت، ئاوها لە خودانەکەی دەترسێت! مورتـەزا دەرگاکـەی لەسـەر خۆی داخست و نوست، نیوەڕۆ هـەروەك بـەیانی هیـچی نـەخوارد. دەمـەدەمی عەسر خەدیجە بەلای ژوورەکەیدا تێپەڕی و بینی وا خەریکی کرتاندنی پارچە نـانێکی رەقـەو دەی خوات و لەبەر خۆوە بڵمەبڵمێکی ئالۆز دەکـات. ئێـوارەش نـانی نـەخوارد و هـەر خەریکی کرتاندنی نانە رەقەکە بـوو، بێـدەنگ وەك شـوورەیەکی ئاسـنە و ناشـکێت، سەرسوڕمان زیاد دەکات و لەناکاو مورتەزا بەجۆرێك دەبێتـە کەسـێکی دیکـە و نـە ژنەکەی دەیناسێتەوە و نە ئەندامانی ماڵەکەش لێی تێدەگەن. هەروەك دوێنێ بە تەنها خۆی شت و نەیهێشت گوڵ پشتی بشوات. دووبارە داوای مەرهەمی برینی کرد. کاتێـك ئەم چێشتخانەکەی جێهێشت گوڵ هاتە ژوورەوە تا ئاوی تەشتەکەی فڕێ بـدات و جلـە پیسەکان ببات و بۆ شتن بیان خاتە سەر جلەکانی تر، بینی تەشـتەکە بەتاڵـە و جلـە پیسەکانیش دیار نین. لە دوێنێوە مورتەزا چی بەسەر هـاتووە؟ ئـەوەی دوێـنێ روویـدا ئەمڕۆ وەك خۆی دووبارە دەبێتەوە! دەوروبەری نیوەشـەو مورتەزا لە ژوورەکەی خۆی دزەی کرد و دەرگاکەی کردەوە، ئینجا پێوەی داو تاریکی و دەرگا داخراوەکە لوشـیان کـرد، ئەو بەبێ فانۆس دەڕوات، ئاخر بۆ کوێ و چۆن بەم تاریکییە کاری خۆی دەکـات؟ خـەو زۆری بۆ گوڵ هێنا وەك دوێنێ چاوەڕێی شووەکەی نەکرد. ئـەوەبوو خەدیجـەی کارەکـەر ئاگاداری کردەوە کە خودانەکەی لەگەڵ قووقەی کەڵەبابی بەیانیدا بۆ مـاڵ گەڕاوەتەوە.

ئەوەی لەم دوو رۆژەی دواییدا روویدا لە رۆژی سێیەمیشدا روویدا، بـەڵام مورتـەزا حاجی زادە لە رۆژی چوارەمدا هەروەك جاران و بە پێچەوانەی ئەم سێ رۆژە، لـە خـەو

هەستا. نانی خوارد و قسەی کرد و هەندێك ڕووناکی کەوتبووە سەر ڕووخساری. داوای لە ئەندامانی خێزانەکەی کرد کە بەرخێك سەربڕن و هەروا بەساغی و بێ پارچە پارچەکردن پڕ ناو زگی لەبرنج بکەن. چونکە بۆ شەو هەندێك میوانی دێن. لەگەڵ ئەوەشدا داوای لە گوڵ کرد کە لە ژووری دانیشتنی ژنان بمێنێتەوە و بۆ خۆشوردنی ئەم نەیاتە گەرماوەکە. جگە لەمەش داوای مەڵحەمی برینی نەکرد و ئاوی خۆشوردنەکە و جلەکانی بۆ ئەو و کارەکەرەکە جێهێشت.

ئەمێستا قۆناغێکی تر لە ڕووداوە سەیرەکان دەستی پێکرد. حەزی خۆتێهەڵقورتانی گوڵ هەڵاوساو ئەو مەتەڵانەی ڕوویان دەدا لەوزەیدا نەمان. لە ژووری دانیشتنی ژنان دانیشت و لە کونێکی بچووکی پەردەکەوە دەستی بەچاودێریکردن کرد. ئێوارە تێپەڕی و کەسێك نەهات، نوێژی خەوتنان کراو میوان نییە، مورتەزا خۆی خزاندۆتە ژوورە گەورەکەوە، پاشان نەختێك پێش نیوەشەو لە ژوورەکە هاتە دەرەوەو بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت. درزێکی خستە دەرگاکەوەو بۆ ژوورەکە گەڕایەوە، بەپێوە وەستای چاوەڕێی کرد. وەك ئەوەی لەناو ژوورەکەدا ڕۆژی ڕووناك بێت، بە لۆکس ڕووناك کرابووەوە. پیاوێك لە درزی دەرگاکەوە بۆ ژوورەوە دزەی کردو مورتەزا ئاماژەی هاتنە ژوورەوەی بۆکرد. گوڵ لەبەر ڕووناکی بەردەرگای ژوورەکە توانی باڵا و ڕووخساری پیاوەکە ببینێت, ڕووتەڵەیەك بوو لە ڕووتەڵەکان، ڕووخساری ترسناك، جلوبەرگێکی ڕەنگ چووەوە، بیری نایات یەکێك لە سابلاخ لەم بچێت. هەروا تەماشای دەکرد، بەڵام جێی دەرکای حەوشەکە تەماشا کردنەکەی پچڕاند. پیاوێکی دیکە دێتە ژوورەوە، ڕووتەڵەیەکی دیکە ڕووخسار نامۆ و سامناك و جلوبەرگ دڕاو و کۆن. ئیدی بەم ئاوهایە خزین و دزەکردنی ڕووتەڵەکان لەو شوێنەی لای دەرگاکەوە پێچ دەکاتەوە بەردەوام بوو، تا ژمارەیان گەیشتە سی ڕووتەڵە. لە ماوەی نزیکەی نیو سەعاتدا هەموویان گەیشتن، ئەوسا مورتەزا دەرگای حەوشەکەی داخست و چووە ژوورەوە، پەردەکەی دادایەوەو دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی و میوانەکان داخست. نزیکەی دوو سەعات دەرگای ژوورەکە هەر داخرابوو، ئینجا لەپڕ دەرگای ژوورەکە کرایەوەو مورتەزا

دەرکەوت و دووان لەمیوانە رووتەڵەکانیشی لەگەڵدا بوو. بەرەو چێشتخانەکە رۆیشتن و بە سینییەکی مسی گەورەوە گەڕانەوە کە بەرخە بەبرنج ئاخنراوەکەی لەسەر بوو.

رۆژی دوایی خەدیجە سوێندی بۆ خاتوونی خودانی خوارد، کە ئەو بەدزییەوە لە کونێکی پەردە دادراوەکەوە تەماشای کردووەو بەهۆی تاریکییەوە نەبینراوەو هەرچییەك لەناو ژوورەکە روویداوە بینیویەتی. ئەو پیاوانەی بینیوە چۆن کێوی ئاسا بەرخەکەیان لووش کردووە و برنجە چەورو پڕ لە بادەمەکەیان بە لەپ لوول داوەو ئاودیوی دەمیان کردووە، ئینجا کە سینییەکە لەخواردن بەتاڵ بۆتەوە و تەنها ئێسکی تێدا ماوەتەوە، دەستیان بە لێستنەوەی ئێسکەکان کردووە و مۆخەکەیان مژیوە، ئینجا دەستیان بە جلە پیسەکانیان سڕیوەتەوەو دەمیشیان بەسەردەستی قۆڵی جلەکانیان سڕیوە. کاتی بانگدانی کەڵەشێر مورتەزای گەورەم وتی:

- برادەران، بیرتان نەچێت! دەرگاکە دەکەمەوە، یەکەمجار ئەوەی رێگاکەی بەرەو چەپە ئەو دەچێتە دەرەوە، دوای خولەکێك ئەوی رێگاکەی بەرەو راستە دەچێتە دەرەوە، دوای خولەکێك ئەوەی رێگای بەرەو پێشەوەیە بەدوایدا دەچێتە دەرەوە، ئیدی بەمجۆرە. کاتی یەکتربینینمان دوای سێ رۆژی دیکە لەهەمان کاتدایە، دەمتان کلیل و کلۆم بکەن، تەنانەت ناوی خۆتانیش لەبیر بکەن و پاداشتتان پاداشتێکی گەورەیە!

دوای نیو سەعات ماڵەکە میوانانی مورتەزا حاجی زادەی تێدا نەما، دەرگاکەی داخست و گەڕایەوە سەر جێگاکەی و نوست...، ئێستا لەخۆ قایل و بیر ئاسوودەو دڵنیا بوو!

بەیانی زوو هەستاو ژنەکەی تەماشای کرد وا بە گالیسکە دەڕوات و شارۆچکەکە جێدەهێڵێت، ئینجا دەگەڕێتەوە و برێ بەرخ و گوێرەکەی لەگەڵ خۆی هێناوە، هەروەها چەند فەردە برنجێکیش. گوڵ نەیزانی مورتەزا ئەم هەمووەی لەکوێوە هێناوە، ئاخر خواردن و ئاژەڵ لە سابلاخ کەم بوو بوون. بەمەش سەرسوڕمانەکەی زیادی کرد، چونکە گەورەکە پڕ بوو لە ئاژەڵ و کۆگای خواردنەکەش تا بنمیچ هەڵدرابووەوە. ئەوەندەی عەقڵی پێدا شکا، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە داوەتکارییەکە بەردەوام دەبێت، ئەمەش وا دەگەیەنێت کە ئەم میوانە ئێسك قورس و ترسناکانە درێژە بەهاتن دەدەن.

مورتەزاش بێ ئەوەی دەست لە ئازووقەی ئەندامانی خێزانەکە بدات، سوورە لەسەر داوەتکردنی میوانەکان، بەتایبەتی خواردنیش لە سابلاخ کەم وەچنگ دەکەوێت، بەلام لەکوێ دەی هێنێت؟ جارێکی دیکە پرسییەوە، ئیدی پرسیارەکەی لەگەڵ پرسیارە زۆرەکانی دیکە لە دنیای تەمومژدا ون بوو.

هەروا بوو مورتەزا فەرمانی دا داوەتێك وەك داوەتەکەی دوێنێ ئامادە بکرێت، نانی خواردو خۆی شت، ئینجا شەو داهات، مورتەزا وەك دوێنێ شەو خۆی لە ژوورەکەیدا قەتیس کرد، گوڵ لە پەژارەدا خەوی لێ نەکەوت و لە ژووری حەرەمی ژنان لەسەرەوە هەر چاوەڕێی کرد، ئینجا پێش نیوەشەو ژوورەکەی جێهێشت و درزێکی خستە دەرگای حەوشەوەو ژوورە گەورەکەی بە لۆکس ڕووناك کردەوە، هەروەك دوێنێ شەو ڕووتەڵەکان لە درزی دەرگاکەوە خزانە ژوورەوەو هەر یەکەو خولەکێك دوای ئەوەی تر هات. هەموو ئێسك قورس و ڕووخسار ترسناك، بەلام بێگومان ئەمانە ڕووتەڵەکانی دوێنێ نەبوون، ئەوانەی دوێنێ زۆربەیان لاواز و ڕەقەڵە بوون، لێ ئەمانە وەك ئەو پاڵەوانانەی کە بەر لەجەنگەکە هەندێکجار بەناو شارۆچکەکە دەگەڕان، بالا بەرز و پان و پۆڕ بوون. پێش ئەوەی ئەوان بڕۆن گوڵ خەوی لێکەوت، بەلام خەدیجەی کارەکەر سەیری کرد وا خودانەکەی لەگەڵ دووان لەو پاڵەوانانە دێتە چێشتخانەکە و بە سینییە بەرخی ئاخنراو بە برنج و مێوژ و بادەم بەرەو ژوورە گەورەکە دەگەڕێنەوە. ئەمجارە خەدیجە پێویستی بەوە نەبوو سەرکێشی بکات و لە درزی پەردەکەوە بڕوانێتە ئەوەی ڕوو دەدات، هەر لەسەر جێگەکەی خۆیەوە کە لە نزیك ژوورە گەورەکە بوو گوێی لە غەلبە غەلب و شەڕە سەگێك بوو، لە تۆ وایە جەنگێکی دیکە لەنێو ژوورەکەدا بەرپابووە.

دەنگی یەکێك لە ڕووتەڵە زبر و چون تۆپەڵە قورەکان دیاربوو چێژی لە خواردنەکەی نێودەمی وەردەگرت و بە ددان دەی جوی، بەرزبووەوە. کارەکەرەکە بۆ خاتوونی خودانی باس دەکرد، کە ئەم زەلامە زبر و ڕەزا گرانانە لەگەڵ یەکەم قووقەی کەڵەشێری بەیانی یەکە یەکەو بەجیاوازی یەك خولەك لە ماڵەکە دەرچوون و بەگوێرەی دەنگی پێیان ژماردوونی و نزیکەی سی کەس دەبون. بەیانی زوو مورتەزا حاجی زادە چووە دەرەوە، ئینجا گەڕایەوە و دوو کۆڵکێشی لەگەڵدا بوو، کە چەند

فەردەو پێویستی دیکەیان بردە ژوورە گەورەکە، ئیدی نە ژنەکە و نە کارەکەرەکە نەیانزانی چییە. مورتەزا داوای کرد کە هۆڵی گەورەی پێشوازی بۆ ئامادە بکرێت و دوو گوێرەکەش سەر ببڕدرێن و بە ساغی بە برنج و کەرەسەی دیکە بناخنرێن و بکوڵێنرێن. ئێوارە خزایە هۆڵە گەورەکەوەو گوڵیش چووە ژووری دانیشتنی ژنان لەسەرەوە. ئیدی حەزی زانین بەحەوت جمك زگی پڕکردبوو و ماوەی سەك پڕییەکەیشی بەسێ رۆژ تەواو کرد. لەناکاو بەرەژانێکی سەیر لە شێوەی ئەو پرسیارانەی ئاوەز دەشێوێنن، تووشی بوو. دەیزانی کەئەم بەرەژانە کوشندەیەی تا راستییەکە نەزانێت بەرۆکی بەرنادات. وەك دەڵەشێرێکی ئازا بڕیاری دا تەنانەت ئەگەر ئەم بەرەژانە سەیرەی بگاتە لێك جیابوونەوەش، ئەو هەر خۆی شتەکە روون بکاتەوە!

هەورێکی رەش بەری ئاسمانی تەلخ کردبوو. وەك ئەوەی گەرمی جەنگەکە گەیشتبێتە ئاسمان، هەورەکان بەفریان نەباراند، لەم وەرزەشدا باران بارین کەم بوو، هەندێکجار دەباری و ئەو توێژاڵە بەفرەی رادەماڵی کە شارۆچکە داگیرکراوەکەی داپۆشی بوو. ئەم ئێوارەیە چاوی ئاسمان بەفرو بارانی بە تێکەڵی باراند و خوناوی کرد. بەڕاستی شتێکە و کەم روودەدات، کەچی مورتەزا حاجی زادە رووخۆش دیاربوو ئەم دیاردەیەی پێخۆشبوو. چاوی بری بووە بەفری بڵاوەبووی نێو حەوشەی ماڵەکەی کە باران رای دەماڵێت. شادمان بوو، بەڵام شادمانییەکەی تێکەڵی پەژارە و چاوەڕوانی بوو بوو. وەك کەشە سەیرەکەی ئەمساڵ لە ناخیدا گەرماییەك تێکەڵی تەزووی ساردییەك بوو بوو. ئاخرکەی لە زستانی ساباڵاخدا روویداوە کە پلەی گەرمی نەگاتە رادەی بەستن؟! شتێکی نەگونجاوە، بەڵام وەك دەردەکەوێت لە بەختی باشی ئەمە. دەبا ئاسمان چك بکات و هەڵمی مەنجەڵی رقی بەرز ببێتەوە و سەرما و بەفر بسووتێنێت و هەورە رەش و سووتاوەکە وشك بکاتەوە. نیوەشەو نزیك بووەوە، مورتەزا درزێکی خستە دەرگای ماڵە بەلۆکس رووناك بووەکە، تا پێچێ دروست بکات، بەرەو ژووری پێشوازی گەڕایەوە. هەور زگی بەسەر ماڵەکەدا دادابوو، پرووشەی بارانەکە وەك دووکەڵێك لەبەر رووناکی لۆکسەکان سەمایان دەکرد. میوانەکان یەك لەدوای یەك هاتنە ژوورەوە، تارمایی کەسەکان لە بازنەی رووناکییە بەهێزەکەدا مرۆڤبوونی ئەوانی

وەدەست دەهێنایەوە، یان وەك دووڕەگێك لە دڕندە- مـرۆڤ دەردەکـەوتن، باریـك، لـەڕ، درێژ، پان و پۆڕ، باڵا مـامـناوەندی. هەندێکیان لەوانە بوون دوینـێ هـاتبوو، تیایانـدا هەبوو پێرێ هاتبوو، هەشیان بوو ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار بێت. گوڵ رووتەڵـەکانی ژمـارد، ژمارەکەی لێ تێکچو، نەوەت رووتەڵە، رەنگە سەدو لەوەیە لـەنێوان نـەوەت و سـەددا بن، یان دەشێ لەوە زیاتر بن. لـەڕێ لادەرو رەوتـەنی، لەهەرچـی و پەرچـی هەرچـی و پەرچیتر، ئەشقیاو خوێڕیگەلێ خـوێڕیترین کەسـی سـابلاخ قـیـزی لـە تێکـەڵبوونیان دەبێتەوە. ئایا مورتـەزا شـێت بـووە؟! ئـەی ئـەم تێکـەو لێکەیـە چییە؟!...، حـەزی زانینەکەی توندتر بوو، ئازارێك شڵەژاندی کە بنیادەم بەرگەی ناگرێت. بـەڵێ گەرەکـە راستییەکە هەر بزانێت، ئیدی با نرخی ئەم بەرە ژانەیشی لێك جیابوونەوە بێت!

چاوەڕێی کرد تا خواردنەکە لە چێشتخانەکەوە بردراو تـا سـینییەکان بـە بـەتاڵی هێنرانەوە و تەنها ئێسکی لێستراوەیان لەسەر مابوو. بۆ یەکـەمجارە لەوەتـەی مورتـەزا پێشوازی ئەم میوانە گومانلێکراوانە دەکات، بەدەستی خۆی مەسـینەی ئـاوی دەسـت شۆردن و خاولی دەهێنێت، بێگومـان دەیهەوێت فێری شێوازی رەفتارو پاك و خاوێنیـان بکات، بەڵام هەتاکەی چاوەڕێ بکات؟! هەر ئێستا دادەبەزێتە خوارێ، هەموو روونـاکی لۆکسەکان لەنێو هۆڵە گەورەکە کۆبووبووەوە.

باران لەبان سابلاخ لێی کردەوە. جگە لە هـەوری بێـدەنگ و سـەرهەڵگرتوو هـیچ نـەما وا تـاریکی بـاڵ دەکێشێت. بـە وریاییـەوە دابـەزی...، پـەردەکانی هۆڵەکـە دادراونەتەوەو دەرگاکەشی داخراوە. لە کونێك گەڕا کە لێیەوە تەماشای ژوورەوە بکات، هەمیشە هەندێك کون هەر هەن و بنیادەم گوێی ناداتێ، چونکە هەسـت بـە ئـارامی دەکات و مەترسی هەمیشە لە دەرەوەیە. ئاخۆ کەسی تر بەهەمان شێوازی ئەم میوانـە عاجباتییانە بۆ ژوورەوە دزەیان نەکردووە، کێ دەزانێـت؟! ئەمێـستا بـوار نـادات ئـەم پرسیارانە مـژوولی بکـەن. بـە دزییـەوە نیگـا قەدەغـەکراوەکانی رەوانـەکرد، بـینی مێردەکەی وا خۆی خزمەتی رووتەڵەکان دەکات، ئاو بەدەستیاندا دەکات و هەندێکیش یارمەتی دەدەن. دەست شۆرەکە رادەگرێت، یەکێکی دی خاولی بـە میوانـەکان دەدات. بێگومان مورتەزا شێت بووە، ئـاخر ئـەوەتا خزمـەتی خـەڵکانێك دەکـات، تەنانـەت

زەویش نایان گرتتە خۆی و لەسەر رووی خۆڵاوی خۆی وەدەریان دەنێت. ئەو سەرەڕای ئەوەش بە (ئەی هاوڕێیانم) ناویان دەبات.

- ئەی هاوڕێیانم، ئەوە نانمان خوارد و دەست و دەممان شت، با ئێستا بۆ دڵسۆزی و نهێنی پارێزی سوێند بخۆین، با سەر دەستەکەتان (شێری چیا) دەست پێ بکات.

قورئانێکی بەرگ زیوینی بە یاقووتی پیرۆزەیی زیوکەفت کراوی خستە بەردەستی. پیاوە زەبەللاحەکە دەستی خستە سەر قورئانەکە و سوێندی خوارد:

- بەم کتێبەی خودا سوێند دەخۆم کە بۆ گەورەم مورتەزا ئاغای حاجی زادە دڵسۆز بم و ببمە یەکێك لە لایەنگرانی و نهێنی بپارێزم.

ئاخۆ ئەوە چ نهێنییەکە؟ ئایا شووەکەی گرووپێك، یان مەزەبێکی نهێنی دروستکردبێت؟

سەرکێشییەکی دیکەی خۆتێهەڵقورتان کەوتە سەری. ئایا دەبێت بگاتە راستییەك؟!

قورئانەکە ئەم دەست و ئەو دەستی پێکرا، سوێندەکە هەمان سوێند بوو، پەرۆشی بۆ کارەکە راستگۆیانەیە. تۆ بڵێی ئەم کارە چی بێت؟ ئایا بەرەنگاری داگیرکەران دەبنەوە؟ وا کۆتاییان بە سوێند خواردنەکە هێنا، بێدەنگییەك ناو هۆڵەکەی گرتەوە مورتەزا لە ناوەندی قەرەباڵغی دانیشتووەکان دەوەستێت. سیمای چون هەورەکەی بان سەری تەڵخەو جۆرە تووڕەییەك تێکەڵ بە ئازار باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشاوە، لەکۆتاییدا (لەم قۆناغەدا ئەمە دوا دیدارمانە، ئەوەی زانیتان، زانیتان، پەیمانمان بەست و بۆ گوێڕایەڵی و تۆڵەکردنەوە لە وەلی زۆردار سوێندمان خوارد و ئەمجارەش بیرتان دەخەمەوە).

مورتەزا بێدەنگ دەبێت، ئینجا جلەکانی سەرەوە لەبەر خۆی دادەکەنێت. ئای لەوەی کە لەسەر پشتە پانەکەی دیتی! هەندێك شوێنەواری قامچی بوو، ئێستا رازی بە تەنها خۆشوردنەکەی زانی کە بۆچی داوای مەڵحەمی لێی کرد. مورتەزا roویکردە رووتەڵەکان وتی:

- بە فەرمانی وەلی ستەمکار چەپەڵترین خەڵقەندەی خودا ئەمەی بە خانەدانی خێڵەکە کرد. ئەو ڕۆژەی کردمی بە کەرو بە دەوری بەرداشەکەدا گێڕامی، تا دە فەردە ئارد پڕبوون بە قامچی لێی دەدام. برینی قامچییەکان سارێژ بون، بەڵام ئاخۆ برینی سووکایەتی پێکردن سارێژ دەبێت؟ ئایا مرۆڤی پێشێل کراو تەنانەت سێبەرەکەشی لەمە بێدەنگدەبێت؟

لەوەبوو هەناسە بڕکێکەی ئاشکرای بکات، زۆری لەخۆ کرد و بەدەست دەمی خۆی گرت و هەنسکی دا.

بەڕاستی ئەمەی بە مێردەکەی کراوە بە پیسترین ئاژەڵیش ناکرێت؟

ئارام بگرە، بینی وا دووبارە جلەکانی لەبەر دەکاتەوە، ژاوە ژاوێک کەوتە نێو هۆڵەکە، مورتەزا بەدەست پێکدادانێك بێدەنگی کردن:

- ئەو بەرەڵڵاو چەتەیەی کە ناوی شەڕانگێزە، فەردەکانی بە کۆڵم دا دا، لە کاتێکدا من لەسەر چوارپەل دەڕۆیشتم، بەرەو کۆگای ئازووقە بردمی، لە چرکەیەکدا ئازار و سووکایەتی پێکردنەکەی خۆم بیرچووەوەو خۆم لەنێو کۆگایەکدا دیتەوە نەسەرەتای هەبوو نە کۆتایی، پێچ و پەنایەکی وا رووبەرەکەی لە دە هەزار مەتری چوارگۆشە کەمتر نییە و تا بنمیچەکەی خۆراك هەڵدراوەتەوە. ئەو ئازووقەیەی من بینیم بۆ ماوەی چەند ساڵێك بەشی هەموو سابلاخ دەکات. زانیم کە وەلی ستەمکار هەموو ئەم ئازووقەیەی بۆیە کۆکردۆتەوە تا ئەو دەمەی خۆراك دەست ناکەوێت و برسێتی و قات و قڕی هێڵە دەکات، ئیتر بە نرخێکی گران بە دانیشتووانی شارۆچکەکە بیفرۆشێت، هەروەها تا دەست بەسەر ئەو پارە و سامانەیاندا بگرێت کە هێشتا لێی نەدزیون. ئەوەشم زانی کە ئەو دڕندە زەبەللاحەی کە ناوی شەڕانگێزە لە فەرمانی گەورەکەی دەرچووەو منی بۆ ناو ئەم کۆگایە هێناوە. کلیلی ئەو کۆگایە وەك بینیتان بە منە، لەبەد بەختی وەلی نەفرین ئەم دانەیەم لە کلیلەکە دەست کەوت، دانەی زۆر لەو کلیلە لە کن (شەڕانگێزەکە)و هی تریش هەیە. ئا ئەمە کلیلی کۆگاکەیە کە لە ئاخرو ئۆخری مانگ کاتێ مانگ دەرناکەوێت دەچنە ناو کۆگاکەوە، من کلیلەکە دەدەمە دەست سەردەستەکەتان، ئەمەش دانەیەکی دیکەیە و ئاسنگەرێکی

لایەنگرمان بۆی کۆپی کردم، دەیدەمە دەست جێگری سەردەستەکەتان، ئەمانەش دوو کلیلی ئە کۆگایەن کە نزیك کۆگاکەی وەلییە، کۆگاکە هی خۆمانە، پێش ئەوەی کۆگاکەی وەلی بسووتێنن تا دەتوانن خۆراك لە کۆگاکەی ئەو تاوانبارەوە بۆ کۆگاکەی خۆمان بگوێزنەوە.

ئەم دوو کلیلە دەدەمە دەست (شێری چیا) و جێگرەکەی. ئەو خۆراکە خۆتان و دانیشتوانی گوندەکانتان لە برسێتی رزگار دەکات. ئەم خۆراکە بۆ چاکەخوازی بەکار دێت، لەجیاتی قۆرخکردنی و دزی لە خەڵککردن زیادکردنی دەوڵەمەندییەکەی وەلی تاوانبار، کۆمەڵێك روح رزگار دەکات، ئێستا با هەریەکێك لە ئێوە لەم جلوبەرگە رەشانە هەرکەسە و پڕ بە بەری خۆی یەکێك هەڵبژێرێت، دەمامکی شەیتانیشی لەگەڵدایە، هەر یەکەتان با دەرمانی بێ هۆشکەری شل بە دەمامك و قامیشەوە وەربگرێت.

جارێکی دیکە ژاوە ژاو هۆڵەکەی پڕکرد، گوڵێش زمانی بەستراوە و لە ترسان و لەسەرمان هەڵدەلەرزێت. مورتەزا دەستەکانی پێکدادا و هەموو لاڵ بوون. هەر هەموویان جلوبەرگی رەش و ماسك و هۆشبەریان وەرگت و لە شوێنی خۆیان دانیشتن.

- ئێستا جارێکی دیکە پلانی کارکردنتان بۆ دووبارە دەکەمەوە، هەرچەندە جارێك گوێتان لێم بوو، ناوی خۆتان و زمانتان لەبیر بکەن. بێدەنگی تەواو مەرجی خۆ پاراستنە، بەوەی باشە عوسمانییەکان بە پێچەوانەی رووسەکان لە شەودا شارۆچکەکە تاریك و بێ رووناکی دەکەن، هەروەها بەپێچەوانەی ئەوان لە بنکەکانی خۆیان کۆدەبنەوە و لە شارۆچکەکەدا بڵاو نابنەوە. چوارشەممەی ئایندە شەوەکەی رێکەوتی کۆتایی مانگە و مانگ ئاوا دەبێت و دەرناکەوێت. وەك لێرە لە کۆبوونەوەکەدا زانیتان لەو شەوەدا سەردەستەکەتان کۆگاکەی وەلی دەکاتەوە، ئێوەش یەك لەدوای یەك دەچنە ژوورەوە، تا دەتوانن ئازووقە هەڵبگرن و لە کۆگا نزیکەکەی خۆمان بە تاڵی بکەن. هەریەکەتان چەند جارێك ئەم کارە دووبارە دەکەنەوە تا هەفتەکە کۆتایی دێت. لە نیوەی شەوەوە تا بانگی کەڵەشێر هەموو شتێك بە پلان دەکرێت. ئیدی لەوکاتەوە ئێوە کەڕولاڵن و نابینرێن، بەدرێژایی هەفتەکە زۆرترین ئازووقە بگوێزنەوە بۆ کۆگاکەی

خۆمان. رۆژی سێ شەممە دوای تێپەڕبوونی هەفتەیەك لە شەوی مانگ ئاوا بوونەکەوە دوا شالاوتانە. لە کۆتاییدا سەردەستەکەتان کۆگا و ئەوەی تێیدایە دەسووتێنێت. لە چەندین شوێنەوە گڕی تێ بەردەدات تا دڵنیا بێ ئەوەی تێیدایە لەنێوچووە. هەموو ئەو ئازووقەیەی دەیگوێزنەوە، وردە وردە دەدرێتە کەسوکارتان و رۆڵەکانی گوندەکانتان. ئەمەش بە هێمنی و دوای ماوەیەك لە سووتاندنی کۆگاکەی وەلی ستەمکار جێبەجێ دەکرێت. کەسێك لە لایەنگرانی هەست بەم کەمکردنەی ئازووقەی ناو کۆگاکە ناکات، چونکە ئەوەی ئێوە دەیبەن هاوتای دەرکردنی کوندە ئاوێك لە دەریا نییە، بەلام هۆشبەرەکەیان شلەکە تا کەسێك بەرهەڵستیتان نەکات بەکاری ناهێنن. خۆ ئەگەر خودا نەکردە یەکێکتان دەست لایەنگرێك لە لایەنگرانی وەلی کەوت، ئەوا ماسکی هۆشبەری شل لە دژی بەکار بێنن و دەستبەجێ دەکەوێت. سوێندەکەتان بە قورئان لەیاد بێت و نەکەن پێش هەفتەی دیاریکراو و دوای ئەوەش لە ماڵەکەی من نزیك ببنەوە، یان هەوڵ بدەن پەیوەندیم پێوە بکەن. هەفتەیەکتان لە پێشە بۆ بیرکردنەوە لە رێگا بەرەوکۆگاکە لەوێشەوە رێگای بەرەو کۆگاکەی خۆمان. ئەوەتان لەیاد بێت هەر سەرپێچییەك لە پلانەکە رەنگە هەموومان بەرەو لەنێوچوون ببات، ئێستا بڕۆن و خودا پشتیوانی هەموومان بێت.

لەگەڵ پرووشەی باران و بەفری نوێدا، چاوەکانی گوڵ دووبارە رەهابوونەوە. وەك دزێك بە وریاییەوە لە تاریکییەکەدا گەڕایەوە و بە نەردەوانەکەدا بەرەو ژووری دانیشتنی ژنان لەسەرەوە، سەرکەوت. کاشکێ ئێستا دەیتوانی هەمهێز لە شووەکەی بدات و عەسر بەسەر شانیدا برێژێت و دڵنەوایی بکات، ئینجا...، داوای سەرکەوتنی بۆ بخوازێت. بێ ئۆقرەییەکەی کپ بووەوە، بەلام خەم و ئازارێك بۆ مێردەکەی دایگرت کە لە ئازاری خۆتێهەڵقورتانەکەی بەسوێ تربوو.

لایەنگران لەگەڵ قووقەی کەڵەشێری بەیانی دەستیان بە دەرچوون کرد. وەك مورتەزای مێردی پێی وتبوون لەنێوان هەریەکە و ئەوی تردا نیو خولەك نێوانیان بوو.

رۆژگاری زۆر بلێ چرکەیەك بێدەنگ بوو، هەناسەیەکی هاتەوە بەر، ئینجا باوکی سەلمان ئاسا زەردەیەکی تەوسامێزی هاتێ و دەستی کردەوە بەتەواوکردنی سەربوردەکە.

گوڵ بۆ ژووری ژن و مێردایەتی لە نهۆمی یەکەم گەڕایەوە. وەك ئەوە بوو ژیـان بـۆ دۆخی جارانی گەڕابێتەوە، بەڵام رووداو گەلێك لە دەروونی ژن و پیاوەکەدا بە پـەنهانی ختووکەی دەدان. خۆتێهەڵقورتان و ترسی لێك جیابوونەوە لە گوڵ دوورکەوتنەوە، بـەڵام جۆرە خۆتێهەڵقورتانێکی دیکە سەری کردە هەناوی، ئایا پیلانەکەی سەردەگرێت؟ لـە هەموو دڵییەوە ئاواتەخوازی سەرکەوتنی شووەکەی بوو، بەڵام شووەکە گـەڕابۆوە سـەر ژیانی خواسایی خۆی، یان رەنگە وا خـۆی پیـشان دابێـت. وەك نەخۆشـێك چـاوەڕوانی چاکبوونەوە بکات، ئەمیش چاوەڕێی شەوی مانگ ئاوابوونی دەکرد، کە وەختـی هـات شڵەژاو خەوی لێ نەدەکەوت و گوێی سووك هەڵخستبوو. لەخودا دەپاڕایەوە تـا گـوێی لە قووقەی کەڵەباب بوو، کەواتـە شـەوی یەکـەم بـە سـەلامەتی تێپـەڕی، مورتـەزا نەیدەزانی کە گوڵیش بەهەمان هەست بەشداری دەکات و بە نهێنی لـە نـاخی دڵـەوە کۆمەکی دەکات، لە هەفتەی (شالاوەکە) لە ماڵەوە خۆی قەتیسکرد و نەچـووە دەرەوە. پەژارە و خەوزڕان هەموو شەوێك بەرۆکیان دەگرت، کەچی رۆژ دەبووەوە هـیچ شـتێکی تازە لە سابلاخ باس نەدەکرا، هەناسەی خۆشیی هەڵدەکێشا و سوپاسی خودای دەکـرد. رۆژی سێ شەممە کە رۆژی سووتاندنەکەیە نزیك بووەوە...، مورتەزا بە هاوسەرەکەی وت کە هەڵبژاردەیەك لە پیاوماقوڵانی سابلاخ و سەرکردەی سـەربازی عوسمانییـەکان بـۆ ماڵەکەی خۆی داوەت دەکات، با بەرخ و گوێرەکە سەرببڕێن و جۆرەها خواردنی خـۆش لەگەڵ میوەجات و خواردنەوە و چەرەزات و شیرنەمەنی ئامادە بکرێن. گوڵ لەرازی ئەم داوەتە تێگەیشت و ئەمێستا بۆی دەرکەوت کە ئـەم سـەرەی بەسـەر جەسـتەکەتەکەی مێردەکەیدا قوت بۆتەوە، نەك تەنها گەردیلەیەکی بچووکی ئاوەزی تێدا بـووە، بـەڵکو ئەو قەپێلکە سەرە خاوەنی جەستەو ئاوەزێکی بلیمـەت بـووە، یـان لەوانەیـە کینـە و ئارەزووی تۆڵەسەندنەوە بلێسەی رووناك کەرەوەیان لە مژگیدا دایساندبێت؟! گـوڵ لـە کانگای دڵەوە بە هیوای ئەوەبوو ئەو چاڵەی لە جەستەی ئابڕووی لە قوڕهەڵکێـشراوی مێردەکەی پڕببێتەوە. لە گۆشەنیگای ئەم و مێردەکەیدا جگە لەتۆڵەسـەندنەوە شـتێك نەبوو ئەم چاڵە پڕ بکاتەوە!

لە شەوی دیاریکراودا رابواردن و گۆرانی گەللەی میوانەکانی مورتەزایان گەرم داهێنا، هیچ یەکێك لەوان نیشانەی شلەژان و گومان و تێکچوونێکی لە مورتەزا بەدی نەکرد، سوێندی لە میوانەکانی خوارد کە تا بەرەبەیان نابێت ماڵەکەی جێبهێڵن، کاتێکیش لەبەر دەرگا بەڕێی خستن، بۆنی سووتانی کرد، تەماشای کرد وا لە ئاسۆوە بڵێسەی ئاگر بەرە و ئاسمان بەرز دەبێتەوەو خەریکە هەموو سابلاخ رووناك دەکاتەوە.

کە میوانەکان رۆیشتن دەرگاکەی پێوەدا و لەبەرخۆوە شتێکی دەوت و زەردەخەنە و خۆشنوودییەك نیشتبووە سەر رووخساری (سوپاس بۆ خودا! سوپاس بۆ خودا! ئەمێستا دڵی وەلی سووتاو ئەوەی وا بەڕێوەیە مەزنترو زیرەکانەترە!).

وەلی بەڵگەی تەواوی بەدەستەوە نەبووتا پەنجەی تاوان بۆ براکەی درێژ بکات، بەڵام لە دەروونی گرتێبەربووی خۆیەوە لەگەڵ سووتانی کۆگاو سامانەکەیدا دڵنیا بوو کە مورتەزا دەستی لە سووتانەکەدا هەبووە. بەڵێنی دا کە لە هەلێکدا تۆڵە بکاتەوە.

بازنەیەکی داخراوە، بەڵام بەم شێوازی رق و کینە کوێرانەیە بۆ کاولکردنی شارۆچکە بێ تاوان و نەفرەت لێکراوەکە، ململانێی برایانی حاجی زادە کەوتە هاوشانی ململانێی رووسەکان و عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان، بە سووتاندنی ئازووقەو کەلوپەلە یەکجار زۆرەکان لە کۆگاکەی وەلی حاجی زادە، سەرباری کوشتارو کاولکاری، قات و قڕی و برسێتی بوون بە چارەنووسێکی راستەقینەی سابلاخ، بەڵام ئەوەی لایەنگرانی مورتەزا لە کۆگاکە رزگاریان کرد، خەڵکانێکی دیکە لە دەرەوەو دەوروبەری لە برسێتی و مەرگ رزگار کرد.

٭ ٭ ٭

لەو رۆژەداو لە رۆژەکانی دواتر سابلاخ تووشی جۆرە غایلەیەك، یان راستەقینەیەکی تێکەڵ لە ترسێکی زاڵ بوو، ژنە هەواڵدەرەکە خۆی پیشانی زۆر کەس لە دانیشتوانی سابلاخ دا، هەندێکجار لەهەمان ئان و ساتدا خۆی پیشانی چەندین کەس و لە شوێنی جیاجیا دا. خەڵکەکە بەشێوەی جۆراوجۆر بینیان، جارێ وەك هەرزەکارو گاوێ وەك: ژن، پیرێژن، شۆخ و شەنگ، قێزەون، ناسك، ترسناك، سپی پۆش،

ڕەشپۆش، بەسوراو، بەسەوزاو، یان بەزەرداو، بەڵام لەهەموو دۆخەکانی و شێوەکانی هەواڵی قوڕبەسەری و ماڵوێرانی دەدا، دەربارەی نەفرەتێك ئاگاداری دەکردنەوە کە شارۆچکە داماوەکە دەگریتەوە، وەك ئەوەی هێشتا نەی گرتبێتەوە.

پرسییان: ئەرێ ئەوەی دیتمان ڕاست بوو، یان خەیاڵکردەیە، یان هەر ئەو ترسەیە کە ڕوودەدات بۆمانی دروست دەکات؟! سەرسوڕمان: ئەرێ دوای ئەو هەموو کارەساتەی خودا بەسەریدا هێناوین، هێشتا ماوێتی، هێشتا نەفرەتیەکی خراپتر و تاڵترماوە؟!

بەڕێکەوت کوڕیژگەیەك لە ماڵی خۆیان بۆ وازیکردن بۆ کۆڵان دێتە دەرێ. لەناکاو کیژۆڵەیەك لێی دێتە پێشەوەکە لەوبەرە نەی بینی بوو. دوێتەکە لێی دەپرسێت:

- وازی دەکەیت؟

لە شەرمان زمانی گۆ ناکات، دواجار دەپرسێت:

- چی ی ی؟!

کچەکە وەڵامێکی سەیری دایەوە، بە زەردەخەنەیەکی مەکراوی و زیرەکانە پێی وت:

- یاری پیربوون و بەساڵەوە چوون!

کوڕیژگەکە سەری سوڕماو پرسی:

- یاری پیربوون و بەساڵەوە چوون؟ ئەم یاری بەساڵەوە چوونە چییە؟!

کیژۆڵەکە پێکەنی و وتی:

- ململانێ، مرۆڤ بە ململانێ زوو پیر دەبێت. لەمیانەی یارییەکەوە سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە بتوانێت لەویتر زووتر و زۆرتر پیر ببێت!

کوڕیژگەکە پتر سەری سوڕماو تێنەگەیشت. بە تووڕەیی و دڵنیاییەوە وتی:

- ئەرێ کچێ تۆ تەوسم پێ دەکەیت! ئاخر هەر ئەوەی خودای گەورە بۆ مرۆڤی بڕیوەتەوە، لەوە زیاتر کەسێك ناتوانێت لە چرکەیەکدا بە ساڵەوە بچێت و پیر بێت!

کیژۆڵەکە بە دڵنیایی و سوور بوونەوە وتی:

- من دەتوانم! دەتەوێت ببینیت؟!

کیژۆڵەکە لەبەرچاوی دەستی بە گەشەکردن کرد، لە چەند چرکەیەکدا لە کیژۆڵەییەوە بوو بە کچێکی هەرزەکار، ئینجا کچێکی باڵق بوو. کوڕەکە لە بەردەمیدا وەك دارخورمایەك بایەکی بەهێز لقەکانی بهەژێنێت، کەوتە لەرزین. زمانی بەستراو خۆی بۆ هەڵاتن ئامادەکرد. نزیکەی دە مەترێك لێی دوورکەوتەوە بەڵام ئەو نەکەوتە دووی، بەڵکو هەر لەجێی خۆی مایەوەو دەستی درێژکرد، تا دەهات قوڵ و باسکی درێژ دەبۆوە تا وای لێهات کەوتە پێش کوریژگەکەوە، ئیدی رێی لێگرت و نەیهێشت را بکات. کوڕەکە هەستی بە چنگێك کرد لە ئاسن بەهێزتر، دەی گرێت و بەرەو خۆی دەی گێرێتەوە. ویستی هاوار بکات، تۆزێکی پۆلاین دەمی پڕکردەوە. کەواتە لەچاو نوقاندن زیاتر هیچ چارەیەکی دیکەی نییە، هەوڵی دا چاوەکانی لێك بنێ، کەچی پێڵوەکانی رەق بوون، بەبێ ویستی خۆی گلێنەی چاوەکانی بەرووی کچەکەدا زەق بوونەوە، بەناچاری تەماشای دەکات و کچەکەش بەخێراییەکی شێتانە بە قۆناغەکانی تەمەندا تێدەپەڕێت، ئا ئەوەتا ئێستا ژنێکە لە پاییزی تەمەندایە، نا ، بەڵکو پیرێژنێکە پرچی ماش و برنجە ئەو پێستەی کە پێش چەند چرکەیەك تەڕو بڕ بوو، ئێستا سیس و پەژموورده بووە...، وا خەریکە چرچ و لۆچ و وشك دەبێت، ئەو کچە جوانە لەچەند چرکەیەکدا بوو بە پیرێژنێك لەوپەڕی تەمەنی لێکەوتەییە، جلە جوانەکانی لەچاو پروکانێکدا جۆرەها رەنگیان لێ پەیدا بوو، رەنگەکانیش لەگەڵ قۆناغەکانی تەمەنیدا دەگونجێن، ئەوەتا لەکۆتاییدا دەبێتە سپییەکی چون کفن، بەڵام پێستە وشکەکەی لەبەر پیری دەستی بە قڵیشان و داچۆڕان کردو وا گۆشتی دەموچاوی بەربۆوە. لەکۆتاییدا ئەوەی لەبەر چاوی کوریژگە دامأوەکە مایەوە تەنها لە قەپیلکی سەرێك بەسەر پەیکەرە ئێسکێکی سپییەوە پتر نەبوو...، کوڕەکە ئاوەزی تێکچوو، لێ کەوتبووە داوەوە و توانای خۆ دەربازکردنی نەبوو. پەیکەرە ئێسکەکە وەك ئەژدیهایەك فیشکاندی، زمانێکی چون زمانی ئەژدیها لەنێوان ددانەکانی بۆشایی قەپیلکە سەرکەوە شۆڕ بووبووەوە:

- من ئافرەتە هەواڵدەرەکەم و هاتووم دەربارەی ئەو خراپەکارییە لە ئەندازە بەدەرەی لەم شارۆچکەیەدا روودەدات ئاگادارتان بکەمەوە. بەکەسوکارو خزمەکانت رابگەیەنە،

کە خاکی سابلاخ گۆڕەکانی یەق دەکاتەوە، گۆشت تێکەڵی گۆشت دەبێت، جێی شەرم، جێی شەرم* پایەماڵ دەکات.

مێردە زمەکە ون بوو، کوڕیژگەکە دەستی بە هاوار کرد و بەرەو ماڵی خۆیان رایکرد. بەپەشۆکاوی لە دەرگای دا، وەك پەلەداری خورمایەکی بەر رەشەبا هەڵدەلەرزی. دەرگاکە کرایەوە. بە هەناسەبڕکێ و لەرزینەوە خۆی خستە هەمێزی دایکی، چاوەکانی ئەبڵەق و بە پەشۆکاوی دەگریا. ئەندامانی خێزانەکەی دەوریان لێدا (کوڕە، ئەوە چیت بەسەر هاتووە؟!)، (عەلی ئەوە تووشی چی بوویت؟!)

هەوڵی دا قسە بکات، بەڵام نەیتوانی، دایان پۆشی، کەچی هەر هەڵدەلەرزی. ئاویان دایێ و لەگەرووی ئاو دیو نەبوو. دەگریا و خۆی بە دایکییەوە دەنووساند. دوای چەند سەعاتێك کەمێك هێور بووەوە، لێیان پرسی کە چی بینیوە، باسی کیژۆڵەیەکی دەکرد کە لەبەرچاوی لە چەند چرکەیەکدا پیربووە و بۆتە پەیکەرە ئێسك و ئێسکەکەش قسەی کردووە، هەندێك شتی وتووە و ئەم لێی تێنەگەیشتووە. بۆ نموونە: گۆڕەکان یەق دەکەنەوە، خاك تێکەڵی گۆشت دەبێت، یان زەوی خۆی یەق دەکاتەوە و گۆشت تێکەڵی هەندێك شت دەبێت و ئەم لە واتاکەی نەگەیشتووە، ئینجا وەك کەسێك زەبری دۆزەخی دی بێت، دەستی بەگریان کردەوە.

کەسوکارەکەی ترسیان لێ نیشت، دایکی بەسینگ کوتانەوە وتی:

- رەنگە کوڕیژگەکە عەقڵی تێك چووبێت، عەلی لەدەستم چوو!

داپیرەکە دڵنیای کردەوە:

- ئەمە ترساوە، بێگومان سەگێك پێی وەڕیوە، بەپەلە شێخێك بێنن با بەسەریدا بخوێنێت و نوشتەیەکی بۆ بنووسێت، ئەوسا ترسەکەی نامێنێت.

گۆڕەکان، یەق کردنەوە، گۆشت وخاك. هەموو ئەم دیمەنە سەیرانە کەوتبوونە بەرچاوی کوڕەکە. ئاخۆ ئەمە تۆقینە، یان شێت بوونە؟!

---

* جێی شەرم: ئەندامی زاوو زێی نێرومێ، عەورەت (وەرگێڕ).

کەسێك بڕوای پێ نەدەکرد، قسەکانیان بە وڕێنە دادەنا، لەگەڵ ئەوەشدا ژنە هەواڵدەرەکە کەوتبووە بەرچاوی زۆربەی دانیشتوانی سابلاخ و بەرستەگەلێکی ئاڵۆز ئاگاداری کردبوونەوەو لێی تێنەگەیشتبوون.

* * *

هێی سابلاخ، دنیا عەورەت و جێشەرمی خۆی دەرخست، هەموو شتە ئابڕووبەرو شەرمهێنەکان دەرکەوتن، لێ من هێشتا هەر ڕۆڵە بەوەفاکەی تۆم. خێرو فەڕ چەند کەمیش بینەوە من لە کانەکەیەوە دەری دەهینم. تاریکی خوێنە، بەڵام ئەوە لایەکەی دیکەیەتی ڕووبەڕووی تاریکی ئەنگوستە چاوە. کەسانێکی زۆر لە دانیشتوانەکەت لە ڕۆژی تەنگانەدا بە هاوارییەکەوە دەچن، ئەمیان بەهانای ئەویانەوە دەچێت، گەر چەرخ وەرسوڕا، ئەوا ئەویان بەهانای ئەمیانەوە دەچێت. عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان زۆربەی مانگەکانی زستان لێرە لەنگەریان خست و وەك خووی لە مێژینەی کەش و هەواکەمان کۆمەڵە بەفر بەسەریەکدا نەکەوتن. میر عەلیم جێهێشت و نیوەڕۆ بەرەو ماڵ گەڕامەوە. چارەگرژییەکی ناهۆگرم لەروخساری بەدی کردو ئەوەندەی تر خەمو خەمۆکیم پتر بوو. دانیشتم تا لەگەڵ ئەسمەرو منداڵەکان نیوەڕۆژ بکەم، دیقەتم دا ئەسمەر نان ناخوات، زانیم لە دۆخێکی ناجۆردایە، تەماشای ڕووخساریم کرد شوێنەواری گریانم لە چاوانیدا بەدی کرد، دەستم لە خواردنەکە هەڵگرت و پرسیم:

- دایکی منداڵان، چی ڕووی داوە؟

- هیچ نییە، باوکی سەلمان، هیچ نییە!

تەنانەت ریتمی دەنگیشی ئەوەی دەردەخست کە ئەم(هیچ نییە) درۆیە، ئێ ئەسمەریش هیچ شتێك لە من ناشارێتەوە، خۆ ئەگەر درۆیشم لەگەڵدا بکات، ئەوە نایهەوێ دڵم تەنگ بکات، یان دەیەوێت خراپەکارییەکم لێ دوور بخاتەوە، بەڵام من (شلۆمۆ کوردە)م و لە بەغدا ئەمەم لەسەر نووسینگەکەم نووسی بوو و دوای ساڵانێکی دوورو درێژ کە پرسیارەکەم لێی کرد، چونکە ئەوەی گەرەکمە وا بەهاسانی وازی لێ ناهێنم، من دەمویست بیزانم، دەبوو هەر بیزانم، بەڵام بە شێوازی نەرم و نیانی دەیزانم، ئاخر چۆن مامەڵەی ئەم هەموو نەرم و نیانی و چاکەیە بەتوندو تیژی بکەم؟!

- ئەسمەر، بەم نانە سوێندت دەدەم ئەگەر پێم نەڵێیت!

بەری لە داباریینی فرمێسکەکانی گرت، بەرەنگاری دەنگی خۆی بووەوە، تا غایەنەتی لێ نەکات و راستی دەروونی لەدەست دەرنەچێت. نا، بەرگەی خەمی ئەسمەر ناگرم، خەمی من بۆ ئەو ترسی ئەوەیە روویداوە و من نایزانم. بوو بەتووڕەیی و هاوارم کرد:

- ئەسمەر، پێم بڵێ چیی رووی داوە؟!

- باوکی سەلمان، من تاوانبارم!

پتر تووڕە بووم، خواردنەکەی بەردەمم بوو بە سکڵی ئاگر، هزرم بەرەو کەسوکاری لە عێراق رۆیشت، چرکەیەك بەدووی راستیدا گەڕام، خێرا بەرەو ماڵەکە گەڕامەوە، ئایا ئەوەی بیری لێ دەکەمەوە راستە؟

تۆ بڵێیت راست بێت؟!

- قەشەنگ! تۆ قەشەنگ!

بەڕاکردن هات و پێم وت:

- قەشەنگ، ئەوەی رووی داوە پێم بێژە.

داماوە سڵەمییەوە، دەستێکی کەوتە ئەملاو دەستەکەی دیکەی ئەولا، بینیم تێداماوەو نازانێت چی بکات.

- خاتوونم، پێی بێژم؟!

- بەسەریدا هاوارم کرد و ئاگری تووڕەیی لە گیانم بەربوو.

- ئەوە داوای مۆڵەت لە خاتوونەکەت دەکەیت، تا گەورەکەت لەوە ئاگادار بکەیتەوە، کەچی رووی داوە؟

بەترس و دوودڵی و زمانی گیراوەوە دەستی بەگێڕانەوە کرد، کەواتە مەزنەکەم راستە دەرچوو، سەرەڕای ئەوەی چەندین جار دەرچوونە دەرەوەم لە ئیستێر قەدەغە کردووە، کەچی چاوەڕێی دەرچوونی منی کردو بە دوو منداڵەکەوە بۆ باخەکە چوو بوو. ئەسمەر بۆی نیگەران بوو بوو، ئەوە بوو پێش هاتنەی من گەڕابووەوە. ئەسمەر بیری هێنابووەوە کە لە فەرمانی من دەرنەچێت و خۆی و دوو منداڵەکە نەخاتە

مەترسییەوە، بەڵام ئیستر شەرمی خستبووە لاوەو بۆ جنێوپێدانی ئەسمەر و من زمانی بەرەڵڵا کردبوو.

ئاگری دۆزەخ لە ناخمدا لە پێش چاوم داگیرساو وەك ئاژەڵێکی هەڵچوو بەرەو ژوورەکەی ئیستر تەکانم دا. بەروخسارێکی ترش و مۆن و بەسەلارییەکی دەستکردەوە لەسەرجێگەکەی دانیشتبوو، دەنگم دیوارەکانی ژوورەکەی لەرانەوە؟

- ئەری ژنەکە، بۆچی وا خۆت سووك و چرووك دەکەیت؟

بەلووت بەرزیی و روو هەڵماڵڕاوی و بێ شەرمانە وتی:

- من سەربەست و ئازادم، خۆ تۆ بۆ ئەوە منت نەخواستووە تا لە ماڵەوە بەندم بکەیت!

- ئاخر فەرمانی منت شکاندووە، هەردوو منداڵەکەم و خۆتت خستۆتە مەترسییەوە، جنێوت بەمن و ئەو ژنە داوە کە تۆی بۆ ئێرە هێنا...

بێدەنگ بوو، وتم:

- بەلامەوە گرنگ نییە تۆ بۆ دۆزەخیش بچیت، بەڵام کورەکە و کچەکەم بەلاوە گرنگە. ئاخر ئەوان جوولەکەو نەسرانی دەکوژن، خۆ ئەگەر لە شوێنێکی چۆڵ تووشیان بن دەستیان لێ ناپارێزن، تۆ بەکەرایەتی خۆت بەرەو پیری مەرگی خۆت و مەرگی دوو منداڵەکەوە دەچیت. سەرباری ئەمەش تۆ جنێو بە من و بەو کەسە دەدەیت کە چاکەی بەسەرتەوەیە!

هێشتا بێدەنگ و چارەی لێك دابوو، وتم:

- جنێوەکانت بەمن هەر نەیسە، بەڵام کەسووکایەتیت بە ئەسمەر کردووە، مافی خۆیەتی داوای لێبوردنی لێ بکەیت، دەی بڕۆ بۆ لای و سەری ماچ بکەو داوای لێبوردنی لێ بکە...

ئێستا پێکەنی و بە تەوسەوە وتی:

- من داوای لێبوردن لەو ژنە بکەم؟ ئەوە دوورە! ئەگەر ئەم ماڵە بەرد بەسەر بەردیدا برووخێت، ئەمە روونادات. خەریك بوو پەلاماری بدەم، بەڵام لەجیاتی ئەوە وەك شێت بەهاوارکردنەوە بۆلای ئەسمەر گەڕامەوە:

- ئەسمەر، تۆ بۆ ئێرە هینات، دەی هەر ئێستا بیبەوە بۆ کەسوکاری!
ئەسمەری داماو بە گریان و پاڕانەوە کەوتە سەر پێیەکانم:
- پێم وتیت من تاوانبارم، خۆم لە شتێك هەڵقورتاند، نەدەبوو خۆی تێهەڵقورتێنم، من لێم بووریوە، باوکی سەلمان تۆش لێی بوورە.
لە دەستی من دەرچوو.ئەسمەر لەبەر چاوم خۆشەویستترو بەرێزترو بالاَتر بوو. تەنها گلەیی لەخۆم دەکەم، ئای مرۆڤ چەند هەڵە دەکات، کەچی لاف زیرەکی و بلیمەتی لێدەدات! ئای چەند هەڵەی زۆر دەکات و ناوی هەریەکەیان دەنێت (هەڵەی تەمەن!).
وەك هێستریکی چەمووش و گینگز بەرەو ژووری نەفرینەکە گەڕامەوە، دەنگم ڤالاَیی ژوورەکەی پڕکردو خەریك بوو ژوورەکە بتەقێتەوە، سوێندم خوارد:
- من لە ئێستاوە هاتنە ئەم ژوورە لەخۆم حەرام دەکەم، بەلاَم بۆ دواجار ئاگادارت دەکەمەوە، کە نابێت بەبێ ئاگاداری من لەم ماڵە دەربچیت. ئەوە ئەسمەر لێت خۆشبوو، بەلاَم تا من و تۆ لە ژیاندا بین، من لێت خۆش نابم!

* * *

لەکاتێکدا لەگەڵ خەڵکەکەدا لە کەنیسە نوێژم دەکرد، بەتوندی بۆردومان دەستی پێکرد. لەم دواییەدا بۆردوومانەکە لە بەرزاییەکانی سابلاَخ دەنگی دەدایەوەو خەڵکەکەش پێشبینی هەندێ شتیان دەکرد، بۆردوومانەکە کپ دەبۆوەو هاوکات پێشبینییەکانیش کپ دەبوونەوە. پێشبینییەکان ترسیان لەگەڵدا بوو.. سابلاَخ تۆپێکەو بێگانەکان تێی هەڵدەدەن و خوێنی لێ دەدەڵێت و وردە وردە لاواز و پووچ دەبێتەوە، کەنیسەکە لەنوێژکەران جمەی دێت، جەژنەکانمان بیرچووەوەو دەستمان بەرۆژووگرتن کرد، دوعای بەزەیی و لێخۆشبوونمان دەخوێند، زۆر کەس بۆ خوێندنی (قەدیش)* دەهاتن و بۆ روحی کوژراوەکانیان و ئەو کەسە بێ تاوانانەی کە لەم مانگانەی دواییدا لە جەنگە سەپێنراوەکە کوژراون.

---

* قەدیش: نوێژی ئاسوودەیی مردوو.

نوێژکەران جاران پێش بەرەبەیان رادەبوون و نوێژیان دەکردو زوو بۆ سەر کارەکانیان دەڕۆیشتن. وامان لێهات تا رووناکی بەیانی شارۆچکەکەی رووناك نەکردایەتەوە، کەنیسەکەمان نەدەکردەوە، دواجار درەنگانێ دەردەچووین. زۆربەمان بێ کارماینەوە، خۆراکیش بەردەوام لە کەمی دەدا. ئەوەی وەك مێرووله بۆ زستان خۆی ئامادە نەکردبوو و خۆراکی هەڵنەگرتبوو، بەدڵتەنگی و ترسەوە دەی پرسی (ئەم جەنگە کەی دەبڕێتەوە؟!).

ئێمە لە ناوەڕاستی نوێژکردندا بووین دەنگی بۆردومانکردن بەرزبووەوە، لە دەرەوە غەڵبە غەڵبی عوسمانی- ئەڵمانی نا هۆگر دەبیسترا.

زانیم شتێك روودەدات، بێگومان نوێژکەرانیش زانییان شتێك بەڕێوەیە. غەڵبە غەڵبەکە تا دەهات بەرەو ناو کەنیسەکە نزیك دەبووەوە، ئەمە قوراوەکەیە. هەموو راپەڕین تا هەر کەسەو بە پەلە بەرەو ماڵی خۆی رابکات و لە خاوو خێزانی خۆی دڵنیا بێت، بەڵام من بەلێدانی مێزی سەکۆی نوێژکردنەکە رامگرتن و داوای چاوەڕێکردنم لێکردن. لێدانی مێزەکەش ئەوەی دەگەیاند کە (گوێ بگرن هەندێك شتی گرنگ هەیە!) هەموو گوێیان هەڵخست و هزری بڵاویان گردکردەوە. کە لە بێدەنگییەکە دڵنیابووم و زانیم هەر کەسەو بێدەنگ بووە، دەستم بە قسەکرد، قسەکانم کاروباری تایفەکەو کەنیسی تێدەپەڕاند، لەوەش گرنگتر قسەکانم خەمی شارۆچکەکەو هەموو دانیشتوانی سابلاخ بەگشتی بوو:

(براکانم، لەکەستان شاراوە نییە شارۆچکەکەمان، سابلاخی پارێزراو ماوەیەکە بەدەست مەینەتییەکەوە گیرۆدەبووە، بەجۆرێك لە پێشوونانی خۆمانمان نەبیستووە کە پێشتر تووشی مەینەتی ئاوها بووبێت. ئەگەر برا موسڵمانەکانمان لە سابلاخ داڵدەی زۆربەمانیان نەدایە، ئەوا گۆڕەکانمان گۆڕستانەکەمانیان پڕ دەکرد و ژمارەی نزاخوێنی قەدیش لەم کەنیسەماندا پتر دەبوو، ئێستا وا هەموومان گرمەی تۆپە نزیکەکان و ژاوەژاوی توند لە شەقامە نزیکەکانەوە دەژنەوین و دەزانین کە سوپای رووسەکان وا لە دەروازەکانی سابلاخە، خودا بیپارێزێت، ئەمەش وا دەگەیەنێت ئەگەر رووسەکان بێنە ناو شارۆچکەکەوە مەینەتییەکە لەسەر ئێمە نامێنێت و تووشی برا موسڵمانەکانمان

دەبێت، وەك دەزانن مەینەتی ئەوان لە مەینەتییەکەی ئێمە زۆرتر دەبێت، وەك رووسەکان خۆیان دەڵێن بیری تۆڵەسەندنەوەیان بەرانبەر موسڵمانەکان هەیە و دەیانەوێت ئەو تۆڵەیە بکەنەوە، نیێ وەك بینیتان جاری پێشوو کاتێك سابلاخیان داگیرکردەوە، موسڵمانەکان چییان بەسەر هات. براکانم هەریەکە با بەپەلە فریای دراوسێ موسڵمانەکەی هاورێکەی و برادەرەکەی بکەوێت. پێش ئەوەی کار لەکار بترازێت لە ماڵەکانی خۆتاندا دالّدەیان بدەن. خودا پشتیوانی ئەوان و ئێمە و سابلاخ و ئەوەی تێیدا بێت. خوا دەست بە باڵی ئەو کەسەوە بگرێت کە دالّدەی دراوسێکەی دەدات، پەنا بەخوا).

پەژارە کەوتە سەر رووخساری ئەسمەر، سەرسوڕمان و نیشانەی پرسیاری پێوە دیاربوو، بەلام وەك خووی تایبەتی خۆی گوێڕایەڵە و پرسیار ناکات. بۆ ڕێکخستنی نهۆمی دووەم داوام لێکرد یارمەتی قەشەنگ بدات، گوولله‌تۆپ وەك تەرزەیەکی قورس دەباری و کاتیش بەدەستەوە نەما. ئەوە چنگێکە لەدوو چنگان، چنگێکی قورس و چنگێکی سووك. رەنگە لە جاری یەکەمدا بەلای جوولەکەی سابلاخەوە فریشتەی خەیاڵ من بوو‌بێتم. تا جوولەکەکان رزگار بکەم. نەخێر، من نە شێت بووم و نە رەفتار سەیر و سەمەرە. من وەك مرۆڤێك بیرم دەکردەوە کە لەوپەڕی وشیاریدا بێت، ئەسمەریش مەگەر لە شتهایەك کە پەیوەندی بە ئاسودەیی منەوە هەبێت، ئەگینا گوێڕایەڵە و ناپرسێت. تەماشای کردم وا لە گەرمەی ئاژاوەکەدا خەریکم دەچمە دەرەوە. بە دەنگێکی پڕ سۆزو پچڕپچڕی قوڕگەوە وتی:

- هەش بە سەرم، باوکی سەلمان ئەوە لەم دۆزەخەدا بۆ کوێ؟!

بەوپەڕی ئارامییەوە وتم:

- گەرەکە پەلە بکەم و ئەو میوانانە بێنم کە نهۆمی دووەمیان بۆ ڕێك دەخەین، ئەسمەر، میر عەلی و هەموو خێزانەکەی.

ئەسمەر وەك هەموو جارێك زاتی کرد، بەلام ئەمجارە داواکردنەکەی بە تکاو پاڕانەوە بوو:

- باوکی منداڵان، مەچۆ دەرەوە، دەرەوە دۆزەخەو خۆت بەرەو پیری دەچیت؟

ئەسمەر، ئەم خۆشەویستییەی تۆ بۆ من خۆپەرستییە، چونکە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەیت بەم خۆشەویستییە مەزنەت، لە رزگارکردنی نۆ روح رێم لێدەگرێت. ئەسمەر: نۆ روح، لە لەزەتی بەهاناوەچوونی هەموومان بێبەش دەکەیت! لەزەت و شادمانییەك رەنگە ئێستا زۆر لە نوێژکەران دوای ئەوەی لە کەنیسە دەرچوویین و بەپەلە بەهاواری دالّدەدانی دراوسێ و هاورێیانەوە چوون، پێی شادبووبن. گەر ئەم خۆشەویستییەی تۆ لە سابلاخ پەرەبسێنێت، ئەوا سابلاخ تێدا دەچێت و تۆ هەستی پێ ناکەیت! دایکی منداڵان، ئەی نازانی پاراستنی براکانمان ئەرکێکە و لە ئەستۆمانە؟! ئێ میر عەلی لەگەڵ بیرکردنەوەی ناجۆری جاربەجاری، لەگەڵ بەغاسی برامدا جیاوازی نییە، فاتمەش لەگەڵ خوشکە دوورەکەت لە عێراق جیاوازییەکی نییە، هەروەها محەمەد و ئەحمەد و حەمید لەگەڵ سەلمان و سەیون و ناحوم جیاوازییان نییە! براکەی وەك براکەتە و ئەسمەر، دایك و باوکیشی وەك دایك و باوکتن!

لەراستیدا ئەم زەردەخەنە هێمن و پڕ مانایە بوو کە لەو دەمەدا نیشتە سەر لێوەکانم و هاوکات بەنێو ژانی کارەساتی شارۆچکەکەدا تێدەپەڕیم، لە هەر هەنگاوێکدا گرمەی تۆپێك و لە هەر چرکەیەکدا دەستڕێژی گوللە بوو. لە ئەنجامدا ئا ئەوە ماڵی میری هاوکار و شەریکمە. لەپێش خۆم دەی بینم و باوەڕ ناکەم. ماڵی هەردوو لامان بەخێزان و ماڵەوە تانهۆ هیچمان بەسەر نەهاتووە.

کەمیر بینیمی باوەڕی نەکرد، چاوەکانی ئەبڵەق بوون و بەتوندی هاواری کرد:

- شلۆمۆ، تۆ شێت بووی! لەم کاتەدا چی تۆی گەیاندە ئێرە؟!

- میر، تۆ شێت بووی! ئاخر لەکاتێکی وادا هەموو ئەم خێزانە چۆن لێرەدا دەهێڵیتەوە؟!

بە بیرێکی ئاڵۆزەوە وتی:

- شەریکی رەفتار سەیر، دەتەوێت چی بکەم؟!

کاتی توندوتیژی و گفتوگۆو گاڵتەکردن نەماوە. من غەڵبەغەڵبێك دەبیستم و لە دوورەوە دەگەنە گوێچکەکانم، بەڵکو بڵمە بڵمی زمانی رووسیش لە دەروازەی شارۆچکەکە دەژنەوم، ها ئێستا هانەختێکی تر هاتنە ناو سابلاخەوە!

- هەر ئێستا هەمووتان لەگەڵمدا دێن، ئەگینا لە ماوەی سەعاتێکدا هەموومان تێدا دەچین.

نەخێر بۆ ئەم بیرۆکەیە ئامادە نەبوو، بە ناقایلییەوە وتی:

- شلۆمۆ، هیچ گومانی تێدا نییە تۆ شێت بوویت!

پەژارەی دەروونم بوو بە دەریایەکی هەڵچو، وتم:

- شێتی ئەوەیە کە لێرە بمێنینەوە، ئاخر ئێوە دڕندایەتی تۆڵەی رووسەکان شارەزان.

بڕێ جار ترس کاری نەکراو دەکات، کە زاڵ بوو ئاسن نەرم دەکات.

- باوکی سەلمان، ئاخر بۆ کوێمان دەبەیت؟

- باوکی محەمەد، بۆ ماڵی خۆمان، بەڵکو ئەوە ماڵی خۆتانە!

- ئەی پیرەمێرد و پیرێژنەکە؟! ئەی ئەم ماڵە ئاوەدان و ئەم کەلوپەلانە؟!

- تۆ دایکت هەڵبگرە و منیش باوکت لەکۆڵ خۆم دەکەم، فاتمە کوڕە بچووکەکە هەڵبگریت و ئامینەی کارەکەریش کوڕەکەی تر، ئێ محەمەد و رەزای برات دەتوانن بەگورجی بڕۆن!

گەر خەمی شتومەکی ماڵەکە لەگەڵ مەترسی گیانەکان بەراورد بکرێت، ئەوا تووڕەهات و بێ نرخ دیارە، بە نیگەرانییەوە وتی:

- ئەی ماڵەکەو کەلوپەلەکانی ناوی؟!

تەنگەتاوم کردو وتم:

- ئێستا کاتی ئەوە نییە بیر لەمە بکەیتەوە، پەلەیان لێ بکە، گەر هەروا بە دوو دڵی بمێنیتەوە و بیر لە ماڵەکە و شتەکانی ناوی بکەیتەوە، لێرە رووبەڕووی مەرگ دەبین، ئەوسا نەماڵ دەمێنێت و نە سابلاخ و نەدنیا!

باوکی سەلمان، وەك مێگەلێ لەبرینگە* رابکات، داتنە پێش خۆت. هێی میر،ئەوە دایك و باوکت بۆچی ئاوها تۆو رەزای براتیان بەم لووت بەرزییەوە خستەوە؟! ئەی بۆچی

---

* برینگە: مەڕ برینەوە، واتا لێکردنەوەی خورییەکەی.(وەرگێڕ)

هەموو براو خوشکەکانت، ئەوانەی لەتۆ گـەورەترن لـە ولآت پـەرش و بلآوبوونەتـەوە، تەنها تۆو ئەم هەتیو چەیە نەبێت، کە هەوڵ دەدات دەست درێژی بکاتە سەر ئابڕووت؟ ئای میر باوکت چەند قورسە، مەوداکـە دەکاتـە دوو ئەوەنـدە! بـاوکی محەمـەد، ئـەی قورسایی دایکت لەسەر پشتی تۆ چۆنە؟ میر، ئـەوەی تـۆ ئێـستا دەیکـەیت، دەرگـای بەهەشتت بۆ دەکاتەوە، بەڵام قورسایی سەر شانی من تادێت قورستر دەبێت و شـەڕیش بەردەوامە، ئەوەتا ئێمە بەچاودێری ئەو کەسەی لە ئاسمانە بەنێو تەقینەوەی تۆپەکانـدا تێدەپەڕن، ئەوە لەتوانای ئەو کەسەیە کە لە هەموو کەس بەتواناترە، واخەریکـە کـپ دەبێتەوەو دەوەستێت. کەواتە با پێش گەیشتنی رووسەکان پەلە بکەین، یان پێت وایـە پێمان دەگەن و تا ئەو رۆژەی مردووان هەڵدەسنەوە، ناگەینە ماڵەوە؟.. ئەوە ئێمـە هـەر دەڕۆین و دەڕۆین. ژاوەژاوکە کپ دەبێتەوە، دوور دەکەوێتەوە، لێرە بێدەنگییـەکی تـەواو دایگرتین. باوکت لەپڕ لەسەر پشتم لێم دەپرسێت (بۆ کوێ دەڕۆین؟!) هەناسە بڕکێـی من و قورساییەکەی ئەو زمانم لەگۆ دەخەن و وشەکە بەجۆرێك لـە دەمـم دێتـە دەرێ هەر دەڵێیت بەرد دەکرۆژم. ئیدی لێرە شوێنەواری عوسمانی و ئەڵمانەکان دیـار نییـە، خۆزگە رۆیشتنەکەیان گەڕانەوەی لەدوا نەبوایە، بەڵام ئەمجارە کێ رووسەکان لە سابلاخ دەردەپەڕێنێت؟ حەکایەتێکە کۆتایی نایەت، نێ مادام شا لە تاران لەسەر تەختەکەی روونیشتووەو لێرە گوێی لە دەستاڕی شەڕەکە نییە، کەواتە گەرەکە جەنگەکە کۆتـایی بێت، تا بێگانە داگیرکەرەکان وازمان لێ بێنن و بۆ وڵاتی خۆیان بۆ دۆزەخ بڕۆن، ئـەرێ میر، گوێت لەهیچ دەنگێك نییە؟ وابزانم نێوان ئێمە و ئەو کوشـتارەی کـە رووسـەکان دەیکەن، تەنها دروو فەرسەخە، بەڵام ئەمجارە نیشانە و تیرەکانیان بەزۆری سەر دەکـات، چونکە زۆربەی ماڵە موسڵمانەکان لە شارۆچکەکەدا وەك ماڵەکـەی تـۆ مـیر چـۆڵ و خاڵییە، ئیتر وا تێدەگەن کە موسڵمانەکان لە ترسی زەبرو زەنگی ئەوان هەڵاتوون. خـۆ ئەگەر ماڵەکانی ئێمەشیان پـشکنی، ئـەوا ئـەی مـیر لـەنێو چـاوانی خۆمـان دەتـان شارینەوە، دوای ئەوەش خۆ دانیشتووانی سابلاخ لە سـیمادا وەك یـەکن و جیاوازییـان نییە، تۆش هەر وەك لەیادم بێت لەکاتی شێنەییدا دوای لەدایکبوونی حەمید کـە دوا منداڵە هەر سێ کوڕەکەت خەتەنە کـرد، کەواتـە هـیچ نـەماوە تـەنها ئـەوە نـەبێت

شایەتمانی یەهودییانەی خۆمانت فێر بکەم، تا رووسەکان لێیان تێك بچێت و هەموو بوارێکی دنیایان لە کوشتن و تاوان لە شارۆچکەکەمان لێ تێك بدەین. ئەوە دەرگای ماڵەکەمانە، ئەسمەر دەرگا بکەوە، بیکەوە، ئاخر من هەر خۆم بەتەنها رۆیشتم و وا لەگەڕانەوەمدا دە کەسین! دەی بیکەوە، ئێمە فریشتەکانی خودا پاراستمانیان، نەکەی هەلهەلەی خۆشی لێ بدەیت، ئەگەر هەلهەلە لە دەمت دەربچێت، ئەوا دەبێتە هاوارو کۆست کەوتن (تۆڵەسەندنەوە).

هێی ئەسمەر، چ ژنێك دەگاتە تۆ، رام سپاردیت نەهۆمی دووەم ئامادە بکە، وا ئامادەت کردووە، وا بۆنی چێشتی نیوەڕۆ دەکەم، کە لە چێشتخانەکەوە هەڵدەستێت! دەزانم تۆ حەوەجەت بە راسپاردن نییە، گەر ئێستا سەرقاپی مەنجەڵەکان هەڵبدەمەوە، دەبینم تۆ بایی میوانەکان چێشتت لێ ناوەو بەشی خۆمانیش بەزیادەوە دەکات. هۆ ئەسمەر دایکی منداڵان چەند دڵم پێت خۆشە!

منداڵەکان بەیەکگەیشتن، لەوەتەی چاویان بە دنیا رۆشن بۆتەوە برادەری یەکترن. منداڵەکانی من و منداڵەکانی میر و یاریکردن سێبیەمیانە. ترساو شادمان بوون، تەنها بەیەك گەیشتنەکە سەرچاوەی شادمانییەکە نەبوو، ئاخۆ باوەڕ دەکەیت شادمانی منداڵەکان لە ترسی ئەو شتانەی لە دەوروبەریان رووی دەدا، بوویێت و لێی تێنەدەگەیشتن؟! ئەوان دەنگەکان دەژنەون و پەژارە لەرووخساری گەورەکاندا دەبینن و دەزانن برێك شتی ترسناك لە دەرەوە روو دەدات، بەڵام ناوەڕۆکی ئەم شتهایە نازانن. ئەوان لەو شتە نادیارانەی ناو مەژگی خۆیان کە هاوکاتە لەگەڵ تەقینەوە و شڵەژانی گەورەکان، وەك گەمەیەك، گەمەیەك هەرگیز لایەنی شادمانی کەم نییە، مامەڵە لەگەڵ ترسەکەدا دەکەن، ئەوە ترسێکە تێکەڵ لە شادمانی. ترس و پەژارەو سەلارییەکی تێکەڵ لەبێزاری و تەنگەتاوی بەسەر رووخسارە جوانەکەی فاتمەوە دیار بوو. تەنگەتاوی و ترسەکەیش لە ئەنجامی ئەو تیرانەوە بوو کە چاوی بێ شەرمانەی رەزا ئاراستەی جەستە جوانەکەی دەکردو بە دزی میرەوە بەسەریدا دەیباراند، میر خەمبار و شڵەژابوو، دیقەتیم دا بێ ئارام و بێ ئۆقرە بوو. کە لێم پرسی هەندێك پاساوی

هێنایەوە پێی قایل نەبووم، لەکاتێکدا خواردنێکی زۆر لەسەر خوانەکە ریزکرابوون، وتی:

- لەم رۆژە رەشە خەڵکی چەند حەوجەی خواردنن، ئەوەتا ئێوەش ئەی باوکی سەلمان، خواردنی خۆتان دەرخواردی ئێمە دەدەن.

بە زەردەخەنە تەوساوییەکەمەوە کە زۆرجار لە خۆشی و ناخۆشیدا بەسەر رووخسارمەوەیە، وتم:

- میر بخۆ، بخۆ! ئەمە ئەو خواردنەیە کە تۆ بە سوکی تەماشات دەکرد و ناوت نابوو (گو)!

بێگومان خەمەکەی خەمێکی تر بوو، بەڵام وتی:

- هاوڕێم تۆ راستت کرد، وا ئێستا هەستی پێدەکەم، کە خۆراك روحی ژیانە و ئێمە لە ئێوە زەوتی دەکەین!

خەریك بوو هەڵبچم، ئاخر وا سوکایەتیم پێدەکات، تا خەمە راستەقینەکەی خۆی لە من بشارێتەوە.

- میر، ئەوە چی دەڵێیت؟ باوکی محەمەد، وەك ئەوە وایە ئەم قسەیە لە یەکێکی تر بژنەوم! وا تۆ بەچاوی خۆت دەبینیت و بە گوێیەکانت دەبیستیت. کۆگاکان پڕن لە ئازووقە و گەورو کولانەکان جێی ئاژەڵ و پەلەوەری دیکەیان تیا نابێتەوە، مەڕو مانگاکان دوو ئەوەندەی جاران زاوزێ دەکەن، مریشك رۆژانە هێلکە دەکەن، خێرو فەڕ لە خۆمان و برادەرو خزم زیادە، میر، ئەمەش لەسایەی خودای من و تۆوەیە!

پاروەکەم قووت داو وتم:

- پێویستە لەسەر ئەوە رابێیت کە ئەم ماڵەو ئەوەی تێیدایە تاخودا حەز بکات لە خزمەتتان دایە تا ئەم جەنگە نەفرەتییە کۆتایی دێت. ئێوە هەر وەك چۆن بەڕاستی بەشێك بوون لە ئەندامانی ئەم ماڵە، هەر لە ئێستاوە ئێوە بەشێکن لەم ماڵە.

میر بێدەنگ دەبێت و بیر دەکاتەوە، خەیاڵ بەرەو قوڕگی گەرداوێکی هەڵچوو دەیبات. پیرەمێردو پیرێژنەکە دڵنیان، منداڵەکان پێکەوە بەگۆڕانکارییەکان شادمانن، بێ ئاگایی میر چاوبڕکێ ژەهراوییەکەی براکەی دەشارێتەوە، هەروەها تەنگەتارییە

کوشندەکەی فاتمەش دەی شارێتەوە، چاوبڕکێیەکی درووپشکانە. دیقەتی دەدەم، جگە لە بیرو خەیاڵ و پەژارە هیچی دیکەی تێدا نابینم، رووخساری چون جولاَنە دەڵەرزێت، پێی دەڵێم:

- باوکی محەمەد، سوێندت دەدەم، گەر راستیم پێ نەڵێیت. ئەوە خەیاڵ بەرەو کوێ دەتبات و لە ئێمە دوورت دەخاتەوە، ئێمە دەت بینین، بەلاَم تۆ خەریکە ئێمە نابینیت؟

راستییەکەی! وەك ئەوەی پرسەدار بێت، وتی:

- ماڵەکە، باکی سەلمان ماڵەکە! پارەوسامان و ئایەو مایە، خشڵ و زێڕو زەبەر، هاوکارم هەمووی لەوێیە! باوکی سەلمان گەر بدزرێت کۆتاییم دێت!

لێت ناشارمەوە لەسەرەتاوە هەندێك لە پەژارەکەی میر منیشی گرتەوە، ئینجا گەشبینییەکی لەبار بەسەر پەژارەکەدا زاڵ بوو. زەردەخەنەکەم قووڵ بووەوە. بە روح و جەستە لێی نزیك بووم، بەهۆگرییەکی تەواو، کە هەر لەمنداڵییەوە کۆی کردبووینەوە، دەستێکم خستە سەرشانی:

- براکەم خەمت نەبێت، بەڵێنت پێدەدەم هەر ئەوەندە تۆزو بای شەڕەکە بڕەوێتەوە بۆتی دێنمەوە.

کاتێك تاریکی داهات تەمەکە رەوییەوە رووسەکان وەك کوللە بەناو سابلاخدا بلاَوبوونەوە، ئەوان کە کۆنترۆڵی بکەن بەهەموو شەقامەکاندا بلاَو دەبنەوە، ئاوهاش ئامادەگی خۆیان لە هەموو شوێنێك دەسەپێنن. لە شەودا وەك تورکەکان ناکەن و شارۆچکەکە تاریك ناکەن، بەڵکو بە ئەنقەست رووناکی دەکەنەوە، ئەوان لە ئامادەگی ناترسن، بەڵکو گەرەکیانە لە بێدەنگییەکی رووناکدا بوونی خۆیان بۆ هەموان ئاشکرا بکەن. لە دڵەوە نزام دەکردو فانۆسەکە بەدەستمەوە دەلەرزی... هەرچەندە فانۆسە نەوتییەکان لە شەقامەکان تیشکەکەیان کز بوو، پێویستم بە فانۆسەکەی خۆم نەبوو، بەلاَم هەر رۆیشتم و رۆیشتم. لە نزیك ماڵی میر کۆمەڵێك لە سەربازە رووسەکان دانیشتبوون و گۆرانیان دەچڕی. ئیدی وەك ئەوەی نە لە شەڕو کوشتاردابن و نەماندوو بووبێتن، بانگیان کردم (یەفری! یەفری!) یەکێکیان ناسیمیەوە، چونکە وەك دەزانێت من میانگیری نێوان رووسەکان و تایفەکەمان بووم. بەناوی خۆمەوە سلاَوی

لێکردم و سڵاوەکەیم سەندەوە، ئینجا دوای چەند هەنگاوێك من لەبەردەم ماڵە چۆڵەکەی هاوکارەکەم بووم. لە ترسان دڵم کەوتەخورپە، دەرگاکە کلیل نەدرابوو، درزێکی تێکەوتبوو بەجۆرێ دەتوانرا لەو درزەوە بەشێك لەحەوشەی خانووەکە ببینرێ. ئەی خودایە، تۆ بڵێیت دەرگاکەیان بۆ ئەوە شکاندبێت، تا دانیشتوانەکەی بکوژن؟! یان ماڵ و سامانی هاوبەش و هاوکارەکەم لەدەستچوو و ئەوەی هەیبوو تالآنیان کرد؟! نەمدەزانی، کەچی وەڵامەکە چەند مەترێك لێمەوە دوور بوو. کلیلەکەم بۆ گیرفانم گێڕایەوە بێ ئەوەی بەکاری بهێنم، پاڵم بە دەرگا قورسەکەوە ناو بە بازرقەیەك گەیشتمە ناو حەوشەکە. لەپڕ بایەکی توند و سەیر بەر پشتم کەوت، فانۆسەکە خەریك بوو بکوژێتەوە، پەنا بەخوا! شتێك لەدواوە رام دەکێشێت، لاقەکانم رادەکێشێت. بەزەویدا کەوتم. فانۆسەکەم بەتوندی گرت، لە دەستمدا کەوتە لەرزین، هەندێك پرتە پرتی کردو نەکوژایەوە. ترسێك بەسەرمدا زاڵ بوو! ئەمە کێیە؟! خۆم راگرت و بە وریاییەوە رابووم و فانۆسەکەمیش بەدەستەوە بوو. بەدەوروبەری خۆمدا هەڵم روانی، ترپەی دڵم تێکەڵی نزاکردن بوو. ئەمە کێییە؟! ئەوە کێ بوو لاقەکانمی راکێشاو بەزەویدا دام؟! کەس دیار نییە. بێگومان ئەوەی بەزەویدا دام دوژمنە گەورەکەم، ترس بوو! نەگینا... نا، نا، گەر بۆ ئەم بیرکردنەوانە خۆت شل بکەیت، ئەوا بێ ئەوەی بەڵێنەکەت بۆ میری هاوکارت ببەیتە سەر بەشوێن خۆتدا دەگەڕێیتەوە...، ئێ رۆژێ لەرۆژان میر باسی ئەوەی بۆ نەکردووم کە ماڵەکەی جنۆکەو شەیتانی تێدایە. هەی نەفرەتی خودا لە ترس. گڕی فانۆسەکە دوای ئەوەی هەندێك پرتە پرتی کرد دووبارە گەش بووەوە. رووناکی فانۆسەکەم ئاراستەی هەموو شوێنێکی ماڵەکە کرد. ئێرە تەواو بێدەنگەو جگە لە سترانی رووسەکان لەدەرەوە هیچ شتێکی دیکە دای ناچڵەکێنێت. لە ژووری نووستنەکە گەڕام- قاسەکە لەوێیە و میر وای پێ وتم و کلیلەکەیشی دامێ پارە و خشل و زێڕەکانی لەناو قاسەکەیە. چوومە ژوورەوە، رووناکی فانۆسەکە پێش من گەیشتە ئەوراکە. ئەمە قاسەکەیە و کلیلەکەی لەگەڵ کلیلی ماڵەکە لە گیرفانمدان، کلیلی ماڵەکەم پێویست نەبوو. لەبەرخۆوە میزماری داودم دەخوێندەوە، ئەمێستا گۆڕیم و دەستم بە نزاکردن کرد، داوام لە خودا کرد کە خەجاڵەتم نەکات و هەموو شتێك لە شوێنی خۆی بدۆزمەوە، ساماناکەی میر، خشڵەکانی فاتمە. هەندێك لە

سامانەکەی هی پیرێژنەکە بوو، بەڵام زۆربەی میر بە عارەقەی نێوچەوانی خۆی بەدەستی هێنابوو. من دەتوام ئەو شایەتییەی بۆ بدەم. لەو سەفەرانەی کە سامانەکەی تێدا کۆکردەوە من موو بە موو لەگەڵیدا بووم، سەفەری هاوینە و زستانەی دوورو درێژی پڕ مەترسی. کورتترین سەفەر، سەفەری تاران بوو، ئینجا بەرەو دوورتر بۆ مۆسکۆ و ئیسلامبول و نێوان ئەو شارانە. ئەی خودایە! گەر سامانەکەی میر دزرابێت ئەوە دەگەیەنێت کە لە رووسەکان رزگاری نەبووە و بە دەستی ئەوان بە شێوازێکی توندتر و بێ ئەوەی دەست بۆ جەستەی ببەن کوشتوویانە. ئەی خودایە وا قاسەکە دەکەمەوە، دڵم بەبینینی (کولەکەی روح)ی شەریکەکەم شاد بکە. بێ ئەوەی دەستی دزانی پێگەیشتبێت. خودایە من گەواهی ئەوە دەدەم ئەو سامانەکەی بەرەنج و عارەقەی نێوچەوان پێکەوە ناوە، سامانێکی حەڵاڵ و زوڵاڵ هەر لە یەکەم پارچەیەوە تا دوا پارچەی. قاسەکەم کردەوە. لەچاو پرووکانێکدا هەرچی قورسایی سەرشانم هەبوو، سووك بوو، مەینەتی و کارەساتم بیر چوونەوە، سوپاس بۆ خودا! سوپاس بۆ خودا! ئەمە سندوقی سامانەکەیە،ئا ئەمەش قوتووی خشڵەکانی فاتمەیە. کانتۆرەکە پڕە لە کیسەو سەرچەف. هێی مری، خەنی لەخۆت، بەڵام نەفرەتت لێبێت! سندوقەکەو قوتووەکە چەند قورسن! هەر لەبەر ئەمەیە وتراوە(ئەوەی سەنگی سووك بێت، نرخی زۆرترە!) باوکی محەمەد، چەند لەسەر سامان کۆکردنەوە سووریت،هەندێ لە دەوڵەمەندەکانی سابلاخیش لەسەری سوورن! ئەوانە ئەو رۆژی دوا پارچە نان لەبازارەکانی سابلاخ کۆتایی دێت، پارەکە دەخۆن! بەڵام میر،تۆ بەختت هەیە و هاوکاری شلۆمۆی باوکی سەلمانیت و خۆراك بۆخۆت و خێزانەکەت مسۆگەر دەکات، وا ئەمانەش دەگەیەنمەوە دەستت، کە ئەمرۆ بۆیان ئۆقرەت نەمابوو. کەواتە کێ راستی کرد؟! ئایا کەسێکی وەك تۆ کەدەڵێیت(پارە پیسی دنیایە) یان ئەوەی وتی: (سامان روحە؟!) نا.. میر! من نە ئەوەم و نە ئەمە، منیش تۆ ئاسا بازرگانێکم، بەڵام روح پیرۆزترین ئافریدەی خودایەو رای سپاردووین کە بیپارێزین. هاورێ و هاوکارم، نەفرەتت لێ بێت خۆ سامانەکەت دڵی لەرەگەوە پساندم...! سندوق و قوتووەکەم هەڵگرت و هاتمە دەرەوە. ئەم دووە بەقەد بارەکەم قورسن! لەبەر دەرگاکە هەڵوەستەیەکم کرد، هەردوو بارە قورسەکەم لەسەر زەوییەکەداناو کلیلەکەم دەرهێنا. نیازم وابوو دەرگاکە کلیل بدەم، لێ بروسکەیەك

لەناو سەرم بلاچەی دا، دەستم گێڕایەوەو کلیلەکەم لەگیرفانم دانایەوە، بۆچی هەموو ماڵەکە بۆ میر نەگوێزمەوە؟! بیرۆکەیەکی شەیتانەیە، بەڵام جێبەجێکردنی کارێکی نەکردەنی نییە. لە ماڵەکەی مندا شەراب و خواردنەوە هەیەو پەرچوو دروست دەکات. ئیَ وا بەدووری چەند مەترێك نزیکەی بیست سەربازی رووس دانیشتوون و بەبێ خواردنەوە گۆرانی دەچڕن، خۆ هەر ئەوەندە ناوی شەراب بژنەون ئاوەز لەسەریاندا نامێنێت:(چی دەڵێن شەرابێکی کۆن لەماڵی مندا هەیە، هەریەکەتان شووشەیەکی بەردەکەوێت، بەمەرجێ شتومەکی ئەم ماڵە بۆماڵەکەی من بگوێزنەوە؟!) ئەوسا دیارە دەڵێن(ئەم موسڵمانە لەترسی تۆڵەسەندنەوەی ئێمە هەڵاتووەو ئەم یەهوودیە کوڕی شەیتانەش دەیهەوێ ماڵەکەی تالآن بکات!). شەرابی ماڵەکەی من کۆنە. وشەیەکی ئەفسووناوییەو بیرو هۆشی هەر رووسییەك وەك موگناتیس رادەکێشێت و کەللەی پڕ لەخەیاڵ و چێژی شەراب و سەرخۆشی دەکات. هەموو بەرزە پێ هەستان و بەرەو ماڵەکەی میر گەڕاینەوە. یەڤگینی ئەسپەکە لە گالیسکەکە ببەستە. لە کۆگاکە گالیسکەکەیەکی دیکەی کۆن هەیە. لەیادمە کەی میر لە سەفەرە بازرگانییە دروورو درێژەکانیدا وەلاوەی ناو بەکاری نەدەهێنا(یۆریس،تۆ گاجووتێکی لێ ببەستە! نیکۆلا تۆش دەست بەبارکردن بکە!). دیمتری، هۆدیمتری، ئاگات لە کانتۆرەکە بێت، هەڵی بگرەو بەخۆی و شتەکانی ناوییەوە بەقیتی لەنێو عارەبانەکە دای بنێ! میخائیل، گەرەکە تەختە خەوەکە هەڵبووەشێنەوە! هەرشتەو بەکاتی خۆی، ئەوەتا سوودمان لە گالیسکە کۆنەکەش وەرگرت! دیمتری، ئەی تۆ نەبوویت، ئەو رۆژەی بە ئازووقەوە لە تاران گەڕامەوە، گالیسکەی دووەمت لێ خوڕی؟! تۆش یۆری ئاگات لە ئاوێنەکە بێت. جنادی، دەی تۆش کورسییە گرانبەهاکان لەسەرخۆ لەنێو گالیسکەکە دابنێ! یەڤگینی، دیمتری، یۆریس، نیکۆلا، یووری، جنادی، میخائیل! تۆو تۆو تۆ! ژاوەژاوێکی توند چنگی لەلانەو بانەی بێدەنگی گیرکرد، غەڵبەغەڵبێك هێور نابێتەوە. لەبەر رووناکی فانۆسەکان و مەشخەڵەکان زۆربەی کەلوپەلی ماڵەکە بۆ ناو دوو گالیسکەکە گوێزرانەوە، تەنها شتی کۆن و بێ کەڵك مانەوە، هەروەها پەلەوەرو ئاژەڵەکانیش. نیکۆلا وتی: لە لادێدا لەگەڵ باوکی پەلەوەری بەخێو کردووە. یەڤگینی ئاژەڵەکانی دایە پێش و ئەوانی تریش ئەو شتەی لەماڵەکەدا بەکەڵك دەهات هەڵیان

گرت. هێی میر، خەنی لەخۆت ماڵەکەت تەنها شتوومەکی کۆنی لێ ماوە! سامان و کەل و پەلی ماڵەکەت وا بۆلات دێن! بەڵام ئەم زبرو بەرەڵڵایانە وا تێدەگەن کە من ماڵی موسڵمانێك دەدزم، کە لەترسی کوشتن هەڵاتوون و خۆیان رزگار کردووە! نا..، نیکۆلا، سابلاخ گوندە رووسییە دوورەکەی تۆ نیە. ئەوەتا پەلەوەرەکانی میر عەلی بە مراوی و قەل و مریشکەوە لەترسان لە کوچەکانی سابلاخ هەڵدێن، و پەرش و بڵاو دەبنەوە. خۆشی لە کەسێکی برسی و دانیشتووی شارۆچکەکەمان پەلەوەرێکیان لێ راو دەکات! ئەم رووسانە گوێڕایەڵن و وەك ئەوەی ئەمە فەرمانێکی سەربازی بێت، ئەرکە کە جێبەجێ دەکەن، نەخێر ئەمە کاری شەرابە ئارەزوو بزوێنەکەیە!..

ئەسمەر، ئەی پێم نەوتیت ئێمە پێویستمان بەشەراب دەبێت؟.. بێگومان ئێستا پەژارە هەناوی هەڵدەکۆڵێت، سەروەت و سامانیش ئۆقرەی لەمیر بڕیوە. ئەو ماوەیەش کەبەسەر رۆیشتنەکەمدا تێپەڕیوە هی ئەوەیە ببێتە پاساوی ئەو بیرکردنەوەیە کەمن لەیەکێك لە کۆڵانە نادیارو بەترس ئاوسەکان کوژرابێتم. هەموو شتێ ون بوو، کەچی هاڕەهاڕی دوو گالیسکەکەو دەنگی پێی ئاژەڵەکان ئەوخەڵکانە بێدار دەکاتەوە کە لە ماڵەکانیاندا لەترسان خۆیان قەتیس کردووە، لەپەنجەرەو کون وکەلەبەرەوە دەست بە فانۆس سەرەتاتکێیانە. وا نزیك بووینەوە ئەسمەر دەبینم لەبەر دەرگا وەستاوەو لەو تاریکییەدا چاو دەگێڕێت، لەمن و لەسەرچاوەی دەنگە دەنگەکە دەگەڕێت! هۆ دایکی منداڵان هێور بەرەوە، من هێشتا زیندووم و ماوم! بچۆ ژوورەوەو دڵنیای بکەوە، کە... نەخێر، رەنگە یەکێ لەمانەی لەگەڵمدان لەنیازەکەمان بگات، ئەوسا راستییەکە دەردەکەوێت و هەموومان بەرەو دۆزەخ دەچین! ئەو دەمەی لەداگرتنی کەل و پەلەکان دەبنەوە شەرابەکەتان پێدەگات! نا، مەیان بەنە ژوورەوە، ئێمە خۆمان ئەوە دەکەین، هەر لەبەر دەرگاکە دایان بنێن و ئیدی بەسە، من بەم دوو سندوقەوە دەچمە ژوورەوە، تا گیانی شەریکەکەمیان پێ بخەمەوە بەری، ئینجا بەرەو کۆگاکە شۆڕ دەبمەوە.

هەموومان روحمان بەبەردا هاتەوە، رووسەکان بەو شەرابە کۆنەی دەستیان کەوت، میر بە سامانەکەی و هەموو کەل و پەلی ماڵەکەی، فاتمە بە خشڵەکانی و کەرەسەی چێشتخانەکەی، ئەسمەر بەسەلامەتی گەڕانەوەی من، من لەخۆشی ئەوەی کردبووم،

پیرەمێردو پیرێژنەش بە تەختەخەوەکانیان، منداڵەکان بەگردوکۆیی هاوتەمەنەکانیان و گەمەکردنیان، تەنها رەزا نەبێت.. رووحی لەدەستی براکەی و مافی براکەیدا بوو، ئەڵهاو ئارەزووی چەپەڵی هزرو خوێنیان دەکولاند.. لەگوللە تۆپێك دەچوو لە تەقینەوەدا بێت. بۆچی ئاوەزی هەندێ کەس لەسەر بیرۆکەیەك دەگیرسێتەوەو ناتوانێت دەست بەرداری دبێت؟! ئەوە ئارەزوویەکە دەگاتە رادەی شێتی، دۆزەخێکە شەیتان فوو لە ئاگرەکەی دەکات. نەمدەزانی ئاخۆ رەزا شایستەی ئەم نەفرەتەیە، یان هی ئەوەیە بنیادەم بەزەیی پێدابێتەوە؟!.

❊ ❊ ❊

خۆشی لەخۆتان رزگارمان بوو، ئێستا رزگاربوونتان لە زەلیلیتان نزیکترە:

قەیسەرو هەموو جەلادو زۆردارو ستەمکارەکان لەدوا هەناسەدان! ئێمە لە سابلاخ سەلماندمان کە لێوەشاوەین، مافی برا یەهودی و نەسرانییەکانمان رەچاو کردووەو کاتی پێویستیش ئەوان مافی ئێمەیان رەچاوکردووە. ئێمە دەست لەناو دەستین و جەماوەریش بەرانبەر هێزی خراپەکارو ستەمکار ئازایەتی خۆی سەلماند. لەسایەی ئەم پێکەوە جۆش سەندنە هەمووان رزگاربوون، تەنها ژمارەیەکی کەم نەبێت کە بڕوایان بەم پێکەوە جۆش سەندنە نییە، یان ئەوانەی رێکەوت بەرەو مەرگ راپێچی کردن، بەڵام ئەوانەی بڕوایان بەیەك دەستی جەماوەر نییە، ئەوا نایانەوێ و لەماڵی خۆیان ماونەتەوەو تووشی تۆڵە لێ سەندنەوەیەکی دوو سەرە بوون.

من گلەیی لە رووسەکان ناکەم، بەڵکو گلەیی لەوانە دەکەم کە لەکاتی مەینەتی و پاشەکشەدا دەست لە رووسەکان دەوەشێنن. ئەمانە ئەفیونی دەمارگیری ئایینی و جوداخوازی بێ هۆشی کردوون. من بۆچوونی خۆم بەوانە دەڵێم(ئێوە شایانی سزا دانن!).

یەکگرتنی گەل لە سابلاخ هاتە دی و بەرانبەر هەردوو لای شەڕکەر خۆی راگرت. پێویستە ئەم یەکڕیزییە بۆ جێبەجێکردنی بیروباوەڕی سۆشیالیستی بەلشەویماندا رەنگ بداتەوە. هەموو دەزانن کە کەم بوونەوەی خۆراك لە شارۆچکەکەمان لە مەترسیەکی کوشندەتر لەخودی جەنگەکە ئاگادار دەکاتەوە.. مەترسی برسێتی.

ئەوەبوو ژمارەیەك لە دانیشتووان كە خودا خۆشی ویستن تا توانای پێشبینی رووداوەكانی ئاییندە بكەن، مەزەندەی ئەم مەترسییەیان كردو خۆراكیان كۆكردەوەو هەڵگرت. گەرەكە یەكەم شت دەست بەم خۆراكەوە بگرین و سۆشیالیستییەكەمان داوامان لێدەكات بەیەكسانی لەنێو خۆماندا دابەشی بكەین. دەستە بەخۆراكەوە بگرن و لەنێو خۆتاندا بەشی بكەن. هەركەسێكیش توانای كڕینی زیاتری لەهەر شوێنێك هەیە، هێشتا خۆراك ماوەو با لە كڕینی پەلە بكات. وەك دەردەكەوێت ئەوەی بەڕێوەیە سەختترو توندترە. بژی سۆشیالیستی، بژی سەركەوتنی گەلان.

كاتێ حەسەن چەخماخ بە پیرەوە هاتنی هاوڕێیان و پێوەندی كردنی زیاتر و زیاتری بە بەلشەوییەكانەوە دی، دڵی كرایەوە، سمێڵەكانی باداو لە دانیشتنەكەیدا لاسایی لینینی كردەوەو بەلەخۆڕادیتنەوە بەخۆی وت:(سۆشیالیستی سەركەوت! هیچ گومانێكی تێدا نەماوە سەركەوت!).

* * *

حەسەن بوزورگ لەو هەورانە راما كە بە قامچی(با) درابوونە بەر، رووی دەمی تێكردن و وتی: (بەنەفرەت بیت! بەنەفرەت بیت! لەم دواییەدا لە بەفری زۆر بێبەشت كردین!). ئەمساڵ شاخەكە پڕ لە بەفر نەبوو، بەڵام ئەمە پەیوەندی بە خوانی نان خواردنەكەوە چییە؟ لەناكاو كوڕی بوزورگ- هاودەمی ژنان و نازڕاگیراو گۆڕانی بەسەرداهات و دەستی بە بیركردنەوە كرد. هەندێ شت لە دەوروبەری خەریكە دەگۆڕێت، ئەوەی لەسەر خوانەكە دەی بینێت، لێیان رادەمێنێت، ئەمە خواردنی هەژارانە. جاران قەت ئەمەی نەدەخوارد، ئاخر هێشتا لە قاسەكەی باوكیدا زێڕ دەدرەوشێتەوە، زێڕ بەگەردنی دایكی و دەستی خوشكەكانی دەدرەوشێتەوە، ئەی كەواتە بۆچی خواردن تا دێت كەم دەكات؟ ئەی چۆن دەستی بگاتە بەنەخوێنی ئەڵماس و بیكاتەوە؟ بۆچی باوكی چوونە دەرەوەی شارۆچكەكەی لێ قەدەغە دەكات، تا وەك دوێنێ و پێرێ نازو فیزو گەورەیی خۆی بەكچانی شارۆچكەكە پیشان بدات؟ ئاخۆ خوشكەكانی عالەم و باری دنیاو جیهان لە قوڕێكی دیكە دروستكراون لە قوڕی ئەو كچانە جیاوازە كە ئەم خۆی پێیان دەگەیەنێت؟!

پرسیار گـەلێکی سـەیرو سـەمەرەن و بـۆژەی دەکـەن، بێگومـان شـتهایەك لـە دەوروبەری خۆی و لـەخودی خۆیـشیدا خەریکـە دەگـۆڕێن. حەسـەن بـوزورگ دەم لـە خواردنە خراپەکە نادات، چونکە لە بینینی روخسارە جوان و خۆر ئاسـاکان و جەسـتە تەڕەکانیان بۆ تیمارکردنی رۆحی لیّ حەرام دەکـریّ، بـەفریش هاوشـانی خـۆراك کـەم دەبێت و لەجیاتی ئەو گوللە تـۆپ دەبارێـت و تـرس لـە روخـساری کەسـوکارەکەی و دانیشتووانی سابلاّخ دەنیشێت. بەلاّم پرسیارە پێداگرەکە لەم رۆژانەدا دڵی دەگوشـێت، دڵ گوشرانەکەی لەبەر کەمی بەفرو کەمی خۆراك نییـە، تۆپبـارانیش نییـە، بـەڵکو خوشکەکانییەتی کە دڵکرمێییەکی کوێرانە بەرانبەریان دەی کوژێت. ئەوەی دەربارەیان دەیزانێت هەر ئەوەیە کە ئەوان لەماڵیّ دەرناچن و خوێندنەوەو نووسینیـشان لـەحوجرە تەراو کردووە، بەلاّم تۆ بڵێیت هەندێ جار بەدزییەوە لەماڵ دەرنەچن؟! ئایا بەڕاستی لە باوکی و ئەم بترازێت، پیاوانی دیکە ناناسن؟ ئەی بیر لە پیاوان ناکەنەوە؟ ئەی خەون بە جەستەی پیاوانەوە نابینن بـەجۆریّ دەسـتیان بەردەسـتی پیـاوان بکـەوێت و لیکیـان هەڵمژن؟ یـان پیـاوان بـە لەزەتـەوە پەنجـەیان بەقژیانـدا هێنـا بێـت و بـەرەو خـوار تامەمکیان و کەفەلّیان؟ دڵکرمێیەکی هاربوو هەناسە بڕکێی پیّ دەخـات، خـۆی لـە جێگەی جەوادو هەمزەو هاوتەمەنەکانی دیکەی دادەنێت و خوشکەکانی دەبنە هـەموو کچە هەرزەکارەکانی سابلاّخ. ئایا ئەمـە رێـی تێدەچـێت؟ نـا..نـا، خوشـکەکانی ئـەم تایبەتمەندن، ئەو بێگومانە لەهەموو کـچانی تـر جیـان، لەهـەموو مێیینـەی دنیـا ئابڕومەندترن. بێگومـان پـەروەردەکردن لـە رەفتـارو بیرکردنـەوەی مرۆڤـدا هۆکـاری یەکلاکەرەوەیـە، ئـیّ ئـەوانیش لەسـەر پاکـژی و ئابڕوومەنـدی و حـەلاّڵ و حـەرام پەروەردەکراون. ئیتر شتێك هەیە پەروەردە هەڵوەشێنێتەوە؟! رەنگە حەزو ئارەزوو ئەمـە بکات، چونکە مرۆڤ گەر جڵەوی حەزەکانی خۆی نـەگرتبا, ئـەوا لـە جەنگـەڵ دەژیـار یاسای جەنگەڵ بەسەر هەموو شتێکدا خۆی دەسەپاند، لیّ کوشتنی حـەزو ئـارەزووش شتێکە تەنها ئەوانە پێی دەگەن، کە خاوەنی توانایەکی بیّ وێنە، ئینجا سێکسیش بـۆ بەردەوامی مرۆڤایەتی پێویستیەکە. بێگومان ئەو نازانێت بیر بکاتەوە، شتەکان تێکەڵ دەکات، تێکەڵکردنی نێوان پاراسـتنی ئـابڕوو و پاراسـتنی قەدەغـەکراو و ژنهێنـان و

سێکسی حەڵاڵ و نێوان شکاندنی تخوبی قەدەغەکراو و سێکسی حەرام. بێگومان زۆربەی ئافرەتان ئابڕووی خۆیان دەپارێزن. بۆ نموونە ئەڵماسی جوولەکە هیچ پیاوێک ناتوانێت دەست بۆ تاڵە قژێکی ببات. ئەی دایکی خۆیان پێش ئەوەی نیگای تێر نەخواردووی سێکس پیسی بکات، باوکی لە ژووری حەرەم دەستی بۆ نەبردووە؟! بەڵام حەسەن بوزورگ ئارامی لێ هەڵگیراوە، بیرۆکەو پرسیاری زۆر تێك ئاڵاون و پێداگیری لێدەکەن. ئەم بیرکردنەوانە وەك بەفراوێك لەمانگی بەفرانباردا بەسەریدا دەڕژێن، یان چون مەنجەڵێك لە چلەی هاویندا دەکوڵێت! ئەو خۆی ئەم بیرۆکانە دروست ناکات، بەڵکو بیرۆکەکان پەلاماری دەدەن و وەك جنۆکەیەکی خۆتێهەڵقورتێنەری بەدگۆڕاو و ئێسك قورس لەناکاو خۆی پیشانی خەڵکی بدات و ترسیان بخاتە بەرو ئاوەزیان تێك بدات و توشی شێتبوونیان بکات، بیرکردنەوەکانی ئاوهای پێدەکەن، بیرکردنەوەیەکی لینج و پێوەلکاوەو ناتوانێت لەخۆی دووریان بخاتەوە، هاوکات وەك چۆن هەندێ خەڵك توانیویانە ئەوە بکەن، ئەم ناتوانێت حەزەکانی خۆی خەفە بکات.. بلیمەتی نێو بلیمەتانە، کەواتە هەمیشە ئەوە لەگوێنەو ڕەنگە خوشکەکانی نەتوانن وەك ئەم ئارەزووی بیرکردنەوەی قەدەغەکراو خەفە بکەن، ڕەنگە بیر لە ڕەگەزەکەی دیکە بکەنەوە... ڕاپەڕینی حەز، مەیل بۆشتێ کە خودا لەریزی حەرامەکاندا دای ناوەو لەهەمان کاتدا وای لێکردووە کە خۆشترین شتی دنیا بێت. تووڕەییەك سەری لێ هەڵدا. ڕەنگە خوشکەکانی لە خەیاڵی خۆیاندا بە پیاوان ئاشنا بن و تەماشای ئەندامی زاوزێی نێرینە بکەن، هەروەك ئەم بەخەیاڵ لەگەڵ کچە جوانەکاندا دەیکات. ڕەنگە خوشکەکانی گەمە بە ئەندامی زاوزێی خۆ بکەن هەروەك ئەم دەیکات، ئەمە بکەن و وێنەی پیاوێك بەخەیاڵ ئامادە کبەن.

چۆن ڕاستییەکە بزانێت؟! بۆ ئەم ڕاستییە هیچ ڕێگەیەك نییە، بەڵام پاڵنەرێکی بەهێز بەرەو ژوورەکەیان ڕاپێچی کردو بەبێ مۆڵەت وەرگرتن چووە ژوورەوە. ئاخۆ پێش ئەوەی ئەم بێتە ژوورەوە لەناو خۆیاندا باسی چیان کردووە؟ ئەی بۆچی کە ئەمیان دی، بێدەنگ بوون و هەر یەکەیان خۆی بەنەخشکردن یان چنین خەریك کرد، یان کتێبێکی بەدەستەوە گرت؟! ئەم کتێبە هەرزان بەهاو نەفرینانە بەزۆری باسی سەرکێشی پیاوان

لەگەڵ ئافرەتاندا دەکەن. ئەی بۆچی باوکیان فێری خوێنـدەواری کـردن و بـەزۆری لـەم کتێبە نەفرینانەیان بۆ دێنێت و گەڕانی سـەر شـەقامەکانی لـێ قەدەغـەکردن؟ ئـەو کتێبەی هەڵگرت کە جیهانی خوشکی دەی خوێندەوە، کتێبێك بوو بە زمانی فارسی و دانەیەك بوو لە شانامەی فیردەوسـی، داسـتانی قارەمانـەکان و شـاکان. ئایـا جیهـان یەکێك لە قارەمانەکانی ئەم داستانە دەکاتە سوارچاکی خەونەکانی؟ ئەی ئـەوانی تـر، باری و دنیا و عالەم؟! ئەرێ بۆچی ئەم ناوە لێکچووانە یان لێ ناون، هـەموویان یـەك واتایان هەیەو مانای (ئەم دایکە زەوییەمان)ە؟! ناو گەلێکن هەموویان هێمان بۆ ئـەم زەوییـــە کـــە دەمـــان گرێتـــە خـــۆی، ئێمـــە تێکـــڕای مرۆڤایـــەتی، بـــەڵام ناوەکـــان هەڵخەڵەتێنەرن، دەی ئەوەی ئێستا بەلایەوە گرنگە، ئەوەیە کە ئاسوودە بێـت وئێـشی ئەو ددانەی نێوسەری نەك نێو دەمی، هێور بکاتەوە. چۆن دەست پێ بکات و باسی چی بکات؟ ئاخۆ ڕێگەیەك بۆ ئەم زانینە هەس؟ ئایا بە قسەی خواسایی دەست پێ بکـات، بە پرسیار گەلێ کە پەیوەندی بەوەوە نەبێت کە ئەم دەیەوێت؟ ئەوان خەریکی ئەو شتە بوون کە بەدەستیانەوە بـوو، هـەموو کـچە کـوردی ئازەربێجـانین، ئەسمـەر ئامـاڵ و چاوگەورەو ڕەش، قژ قەترانی. پرسی:

- ئەرێ ئێوە هەندێ جار هەست بە بێزاری ناکەن؟

باری کە هەودای نەخشکردنەکەی لەدوا چنین ڕادەکێشا خۆبەخشانە وەڵامی دایەوە:

- براکەم، بەکەمی، هەرخودا بێزارو وەڕس نابێت.

بەبێ پێشەکی پرسی:

- ئەی بیر لە پیاوان ناکەنەوە؟ باسیان ناکەن؟

ئەمە بێ چاوەڕوویی و قسە لەڕووییە! چۆن زات دەکەیت وا بڵێیت، بەڵکو ئەم هێزە زۆرداریـیەت لەکوێوە هێناو وەك هەورە تریشقە بەسـەر خۆشـکەکانتیدا دەدەیـت؟ تـۆ بەشتی قەدەغەکراو قسەیان لەگەڵ دەکەیت و دەش زانیت ئەوە حـەزبزوێن و ویـستراوە، قەدەغەکراوی ویستراو برێ جار بنیادەم تووشی شێتبوون دەکات، خۆ ئەگەر ئاوها بەرەو ڕووی تۆ بووبوونایەتەوەو بەسەرتدا بیان سەپاندبا، ڕەنگە تووشی توورەیی و هەڵـچوون بووبایت. نا! تۆ وەك ئەوان لەشەرمان ڕەنگت هەڵنەدەبزڕکا، سەر ڕوومەتەکانت سـوور

هەڵنەدەگەڕا. ئەوەی تۆ باسی دەکەیت ئەوان باسی ناکەن، ئینجا بەم زەردەخەنە شاراوەی دواییان کە شەرم و شڵەژان دەردەبڕێت، تا بەستەزمانانە! لە بینینی پیاوان بێبەشن! ئەمە ناسوودەت دەکات، بەڵام ئەم رەنگ هەڵبزڕکانەی روخساری هەرچواریان، چوار دنیای جیاواز. ئاخۆ ئەمە بەرەنجامی ئەم بێبەشبوونەیان لەهاوتوخمەکەی تۆ، یان ئەنجامی بەدخۆراکییە، ئەوخۆراکەی کە بەردەوام لەکەمی دەدات؟!

باری کە لە هەموویان گەورەترەو خەریکە بەرەو قەیرەیی دەچێت و تەمەنی خۆی لەبست دەدات، پرسی:

- مەبەستت لەکام پیاوە؟ تۆ و باوکم، یان ئەو پیاوانەی کەمێردیان پێدەکەین؟

- مەبەستم هەموو پیاوانە بەگشتی، رەگەزەکەی تر.

بەخۆ پارێزییەکی سەرنج راکێشەوە، جارێکی دی دەستیان بە پێکەنین کردەوە، جیهان وتی:

- لە کون و کەلەبەری پەنجەرەوە دەیان بینین و ئەوان ئێمە نابینن و ...

- جیهان، ئەی چی دیکە؟

باری خەریك بوو توورە دەبوو، وتی:

- حەسەن، بێگومان تۆ شێت بویت، ئەگینا ئەم پرسیارانەت نەدەکرد!

- خوشکم، ئەوە تەنها حەزی زانینە.

بەنیمچە بێزارییەکەوە وتی:

- تۆ دەزانیت ئێمە بۆ کوڕانی مامەکانمان دانراوین، بەڵام تۆ گەر گومانت لێمان هەیە، ئەوە دڵنیابە ئێمە کاری نابڕووبەر ناکەین. براکەم، ئەوە بزانە گەر کچ بیهەوێ کاری ناشایستە بکات، هەر دەیکات، ئیدی گەر لەنێو قەڵایەکی سەخت، یان دوورگەیەکی دابڕاوی نێو دەریاچەیەکی هەڵچووش دای بنێن.

دنیا قسەکەی پێ بڕی:

- باری، ئیتر بەسە. حەسەن خۆشی دەوێین و دەیەوێت لێمان دڵنیا بێت.

- نا دنیا، حەسە گومانمان لێدەکات، ئەمەش وا دەگەیەنێت کە خۆی کاری حەرام و نارەوا دەکات، ئیدی وا دەزانێت هەموو ئافرەتان وەك ئەوانەن کە لەگەڵیدا بەشداری شوورەییەکە دەکەن.

حەسەن بوزورگ بێدەنگ بوو، لە ژوورەکەی خوشکەکانی هاتە دەرەوە. کە هاتە ژوورەوە، حەزی زانینەکەی دڕندەیەك بوو چڕنوکی لەهەناوی گیرەکرد، بەڵام کە چووە دەرەوە شەرمەزاری دڕندەیەکی تر بوو پارچە پارچەی دەکرد.

پرسیار وەك مێکوتی دان ئێشە سەری دەکوتێتەوە.

کەواتە بۆچی باوکم بەمێردتان نادات و ئێوەو منیش پێکەوە ئاسوودە ناکات؟ ئەی کەی دەستم لەبەنەخوێنەکەی ئەڵماس گیر دەبێت؟ تاکەی ئەم دەرچوونەم بۆلای کانییەکە لێ قەدەغە دەکرێ؟ ئەی ئەم قرچۆکی و دەست بەخواردن گرتنەوەیە؟ کەواتە ئەی زێڕ هەموو هەویاکان ناهێنێتەدی و لە نەبوو خۆراك دروست ناکات؟ تۆ بڵێیت باوکم ئەم رەنگ زەردییەی سەر روخساری دایکم و خوشکەکانم و هەموومان نەبینێت، بۆیەیەکی زەردی وا جگە لە پرسیارە شڵەژێنەرەکەی کە دەربارەی پیاوان لێی کردن، یان دەربارەی خۆراك، هیچ شتێکی تر نای سڕێتەوە.

لەوساوە لەچوونە سەرکانی دابڕاو، دەستی بە بیرکردنەوە کردووە... بێگومان بیرکردنەوە مرۆڤ دەگۆڕێت...، ئەویش گۆڕاوە! گەرەکە باوکی ئەم ماڵە لەرەنگ زەردی رزگار بکات، نەك بەزێڕ، بەڵکو بەخۆراك!

* * *

سەرکردە رووسەکە بۆ بنکەکەی خۆی لە کەنیسە بانگی کردم و بەتوندی قسەی لەگەڵدا کردم. خۆ ئەگەر لە ئاشکرابوونی کارەکەم خۆم نەپاراستبار لە تووڕەکردنی خۆم لانەدایە، ئەوا پێکەنینەکەم تەنگەتاوی دەکرد و دەبوو بە گوللەتۆپێك و لەنێوانماندا دەتەقییەوەو هەموو شتێکی دەوروبەری وێران دەکرد.

- خواجە شلۆمۆکەتانی، تۆ لەم شارۆچکەیەدا پیاوێکی پشتت پێ دەبەسترێت، ئیدی دەربارەی کاروباری نێوان تایەفەکەتان و ئێمە بێت، یان لەنێو تایفەکەی خۆتاندا، بۆیە دەبێت تۆ خەڵکی دیکە چاوت لێبکەن، ئەفسووس هەواڵمان

پێگەیشتووە، کە ڕەفتارێکت زیان بەناوبانگ و کەسێتیت دەگەیەنێت و لە تۆ ناوەشێتەوە، هەرکەسێك ئەو پایە و کەسێتییەی تۆی هەبێت،ماڵی خەڵکی تاڵان ناکات و هەلی هەڵاتنی خاوەنەکانیان ناقۆزێتەوە، با ئەوانە موسڵمانیش بن.

پێکەنینە کوشندەکەم قووت دایەوە وتم:

- گەورەم، بەد حاڵی بوونێك لە ئارادایە.

- بەد حاڵی بوون کامەیە، تۆ کەلوپەلی ماڵێك تاڵان بکەیت، کە خاوەنەکەی چۆڵی کردووەو تۆش بۆ ماڵەکەی خۆتی ببەیت؟

- بەڵکو ئەو کەلوپەلانەم لە ترسی تاڵانکردن بۆ ماڵەکەی خۆم گواستۆتەوە.

وتی:

- کەواتە گەر بەڵگەیەکی ڕاستەقینەت بەدەستەوەیە، ڕوونی بکەنەوە.

- ئەم ماڵە ماڵی شەریك و هاوکارەکەمەو هاوڕێی منداڵیمە، چووم سەرم لە ماڵەکەی دا تا دڵنیا بم، کەچی بینیم ماڵەکە چۆڵکراوە، لەوە ترسام کە شتوومەکەکانی ناوی تاڵان بکرێت، بۆیە بۆ پاراستنی تا خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە، بۆ ماڵەکەی خۆمم گواستەوە.

- چۆن بڕوا بەم قسەیەت بکەم؟!

- گەورەم، گەر ویستت سۆراغی ماڵی هاوکارەکەم بکە، لە هەر کەسێك بپرسیت بۆ ماڵەکە دەتبات.

کەمێك داما، ئینجا وتی:

- پێیان نەوتوویت، بۆ کوێ هەڵاتووە؟

- گەر پێیان وتبام، بۆ دڵنیابوون لەخۆی و خانەوادەکەی، بۆ ماڵەکەی نەدەچووم!

بە پەنجەکانی لەسەر مێزەکەی دا، ئینجا وتی:

- ئەگەر ئەم حەکایەتی تاڵانکردنەکە وەك باستکرد وابێت، کەواتە تۆ شایستەی ئەرك و بەرپرسیارێتییەکەتیت. شلۆمۆ بڕۆ، لە سەربردەکەت دەکۆڵمەوە!

ئایا بەو درۆیەی کە لەگەڵ سەرکردە ڕووسەکە کردم، گوناهێکم کردووە؟!

نا ،نەخێر ئایینەکەمان لەهەر ئەرکێکدا کە بکەرەکەی یان یەکێکی تر بخاتە مەترسییەوە ئەوەی بۆ ڕەوا کردووە.

* * *

ڕەزا عەلی غایلەکانی ڕاوی دەکەن و دەی کرۆژن، ئینجا خۆیشی خودی خۆی ڕاودەکات و ڕادەستی شەیتانگەلێکی دەکات، کە نازانن بەزەیی چییە، دواجار دەبێتە نیمچە مرۆڤ و نیمچە شەیتان. لە مەژگیدا جگە لە فاتمەی ڕووتو قووتو ئەندامەمکانی ئەم ژنە و غایلە گەلێك چەقەکەی خودی ئەم ژنەیە و هیچی تر نییە. ئەو بەندی ماڵێکە کە ماڵی خۆی نییە...، فاتمەش لە ماڵێکی نامۆ لەگەڵێدایە. دوژمنەکەی و ئەم ژنەی بۆ چرکەیەك ئەم ماڵە جێناهێڵن. نە دارمازوو و نە دار بەڕوو و نە کانی و سەرچاوە، نە ڕووبەری فراوانی سروشتی شاخاوی زەرد و سەوزو قاوەیی و سوور و خۆڵەمێشی ڕەنگاو ڕەنگ. فاتمە لەهەر بەشێك لەم بەشانە دەبینێت. ئەو ڕۆژانەی کە بۆ دەرەوەی شارۆچکەکە دەچوو، بە چیلکەیەکی وشکەوبووی لە دارەکە کەوتوو، لە خۆڵەکەی وەردەداو لە خەیاڵی خۆی خەرمانەیەکی دروست دەکرد، فاتمەش هەسارەیەکی ئاسمان بوو بە خەرمانەیەك دەورە درابوو، ئەم غایلانە بەدرێژایی ڕۆژەکان و هەفتەکان دەیان برژاند و دەیان خوارد، ئینجا یەقیان دەدایەوەو بەتوانای توانداری شەیتان دووبارە دروستیان دەکردەوەو ئەمجارە بیزۆکەکانی سامناکترو دڕندانەتر دەبوون. لە دەرگاکەیان دەداو بۆنان خواردن بانگیان دەکرد بێتە خوارێ، بەڵام ئەو برسی نەبوو بە فاتمە تێر بوو بوو، بێبەشبوونی لەو دڵی تێك دەئالا کە بۆ نهۆمی یەکەم دەهاتە خوارێ، بۆ نان خواردن نەدەهات، بەڵکو تەنها بۆ بینینی فاتمە دەهاتە خوارێ...، بیری لێدەکردەوەو بەو خەیاڵەی لە مێشکیدا دەخولایەوە، ئاوی دەهاتەوە، لە ماڵە جورلەکەدا حەڵقەی دانیشتنی نان خۆر چەند فراوانە... هەموو بە وریاییەوە نان دەخۆن و قسە دەکەن لە ترسی ئەوەی نەبادا مەترسییەك دەرگایان پێبگرێت و لە ناخافڵدا ڕووبەڕووی مردن ببنەوە. باوکی لە سەڵمان سەربردەکەی خۆی و سەرکردە ڕووسەکە دەگێڕێتەوە و پێدەکەنێت! ئەم نەفرینە گاڵتەو سوعبەت دەکات و برا گێلەکەیشی لە قاقای پێکەنین دەدات، ئەمیش لە توونی دۆزەخەکەیدا گێنگڵ دەدات، دەبرژێت و

دەکولێت، تا ئەو رادەیەی ئەمیش دەکرێت لە پاڵ خواردنەکاندا لەسەر خوانەکە دابنرێت، بەڵام بەڕاستی گەر بخرێتە پاڵ خواردنەکان ئەوا کەسیان دەمی لێنادەن، چونکە بێگومان ئەم خواردنانە پیس دەکات، چونکە ئەوە گۆشتی بەرازە...، بەلکو شەیتانێکی نەفرەت لێکراوە، قاپی خواردنەکان و فاتمەش لەبەر چاوی زۆرن و دواییان نایات. داوی نیگای بەرەو خەیاڵەکانی رای دەکێشێت و دەست بە داکەندنی جلەکانی دەکات، لەبری ئەوەی خواردن بخوات، بە تارەزووە شێتانەکەی قەپاڵ لەم دەدات. کەس ئاگای لە تەماشاکردنەکەی نییە، تەنانەت فاتمەش هەست بەم تەماشاکردنەی ناکات. خۆ ئەگەر رووی بدایەو لەپڕ چاوی ئامبازی بووبا، ئەوا دەستبەجێ وەك ئەوەی زەردەواڵەیەك پێوەی دابێت، نیگای لێ لادەدا، ئەمە کۆلاژدمە، ئەژدیهایەکە و ژەهرەکەی کوشندەیە. سەری سوڕماوە. بۆچی ئەوەندە رقی لێیەتی و مێردەکەی خۆش دەوێت، ئێ خۆ ئەم لەو نەفرینە منداڵترەو لەویش قۆزترو ئێسك سووکترە؟! ئایا لە بنەڕەتدا جوانییەك لە براکەمدا هەیە تا وات لێ بکات بەڕادەی پەرستن خۆتی پێوە ببەستیت، هۆ پەرستراوی من؟! کەواتە رەنگە ئەو دەمە لەسەر جێگەن، عەشقی ئەندامێکی دیاریکراوی بێت و هەموو شەوێك گیرۆدەی خۆیت دەکات، دە ئەندامەکەی منیش تاقی بکەوە، سوێند بەجوانییە بکوژەکەت، ئەگەر تامی ئەو شتەی من بکەیت وات لێدەکەم واز لەمێردەکەت و ئاینەکەت و منداڵەکانت و هەموو دنیا بێنیت و تەنها بە منەوە بنووسێیت! نا... نا، رەزا شتەکە لای ئەم دەبەنگانە وەك تۆ بۆی دەچیت وانییەو شتێکی ترە. ئەم ژنەیان هەر لە منداڵییەوە راهێناوە کە مێردکردن رێزگرتنەو مێردیش چون خودایە، تەنانەت ئەگەر نەزۆك و پیاوەتیشی نەبێت، یان قێزەون و ناشیرین بێت، نابێت لەو زیاتر ژنەکە تەماشای کەسی دیکە بکات، تەنانەت بەیەك تەماشاکردنی ژنی مێرد دار بۆ پیاوی دیکە، بەلای ئەوانەوە ناپاکییە.لەبێ یەغبالی تۆ فاتمەش جۆرێکە لەوانەی بەهەموو بوونێکییەوە دڵسۆزی مێردەکەیەتی، هەروەها لەبێ شانسی تۆش ئەو ژنەی کە من یەك بەیەك ئەندامەکانیم دیتووەو گیرۆدەی بووم لەو ژنانە نییە کە ناپاکی ژن و مێردایەتی بە فڕکردنی قومە ئاوێك بزانن و داکاسرێن، لەوانەش نییە لە حەرام و قەدەغەکراوی بەلەزەت نەپرینگێنەوە، هەر لەبێ

تالحی تۆ فاتمە نەکەوتۆتە داوی شەیتانەوە، مرۆڤێکی لە بابەت تۆ نییە و شەیتان ئەو غایلانەی لەروحیدا نەچاندووە کە پێی دەوترێت بێ ویژدانی. دووکەڵ لە لوتییەوە دەرچوو، هەش بە سەرت رەزا، گەر هەر ئاوها بێنیتەوە و ببیتە نێچیری غایلە و ئەم بێ بەشییە درێژخایەنانە، ئەوا هیچ جیاوازییەکت لەگەڵ هەر پەککەوتەو دەستەوسان و ترسنۆکێکدا نابێت و بێگومان هۆشیشت لەدەست دەدەیت! دەپرسێت (کەواتە ئەی چی بکەم؟!)، شەیتان بەدەنگێکی کرووزانەوە و شێتانە وەڵامی دەداتەوە (هەڵی بگرە و بیبە، بەزۆر لە مێردەکەی زەوتی بکەو بیبە، با سەری مێردەکەی و دنیا لەبەرد بدات!). مێردەکەی، ئەو کەسەیە، کە وەك داهێنانەکانی خەیاڵی تۆی لەگەڵ دەکات، بەڵام ئەو بەڕاستی نەك بە خەیاڵ هەموو شتێکی لەگەڵ دا کردووەو چێژی لێ وەرگرتووە، تا سێ منداڵی کوڕی لێ بووە. ئەوەشی بە خەیاڵدا هات کە خەڵکی لەو بڕوایەدان کە کوڕخستنەوە واتای دەسەڵاتداری مێردە لەکاتی جووتبوونی لەگەڵ ژنەکەیدا، بۆیە شێت و هاربوو و ئاگری تێبەربوو. بەبێ دەنگی دزەی کردو بە نەردەوانەکەدا بۆ ژوورەکەی خۆی لە نهۆمی دووەم سەرکەوت. چووە ژوورەوەو بە مستەکۆڵە دەستی بە لێدانی دیوارەکە کرد. لە شەودا ئەم دیوارە تەنها جیاکەرەوەیەکە لەنێوان ئەم و فاتمەو غەنیمەکەیدا. ئەم ئابڕوومەندەو پەرستراو و پارێزراوە لەودیو ئەم دیوارە هەر وەك تازە لەدایك بووبێت، دەبێتە سۆزانییەکی رووت و قووت و پیاوێکی بۆ حەڵاڵکراویشی لەگەڵدایە و بۆی هەیە بە ئارەزووی خۆی هەموو شتێکی لەگەڵدا بکات، هەر لەبەر ئەوەی مەلایەکی مێزەر بەسەر و دوو پیاوی شایەت و بە ئامادەبوونی بەخێوکەرو خودانی هەردوولا چەند وشەکیان وتووەو فاتیحایەکیان خوێندووە. دەبا منیش پێی بڵێم (تۆم لە خۆم مارەکرد) ئیدی چۆن دەبەنگ و هیچ و پووچەکە هەڵیدەلووشێت، منیش هەڵیدەلووشم. پاش کەمێك هەناسەبڕکێی دەگاتە من، هەناسەبڕکێی لەزەتێکی هاربوو لەپشت ئەم دیوارەوە. هەندێکجار هاوارێکی خنکاو جلەوی لەدەست دەردەکات و رادەی تێر نەخواردوویی سێکس و لەزەتەکەی زیاد دەکات و بەرانبەر پیاوەکە ئەم شەرم و ئابڕووی نامێنێت. سۆزانییەکی حەڵاڵ بەناوی ئەفسانەی ژن و مێردایەتی تەنها پیاوێك دەستی بەسەردا دەگرێت؟ ئێ ئەگەر خەڵکی

ئەمەی ناویێ با سەری لەبەرد بدات و وازی لێ بهێنێت! سبەینێ ئەمەی پێدەڵێم...!
زۆری لێدەکەم تا لێی جیا ببێتەوە، تفێك لە فەساڵی ترسنۆکی و بێبەشی دەکەم.
ترسنۆکی و بێبەشی..! دوو وشەی هاو واتای یەك ناون، یان دوو شتن و ئەنجامی یەك
واتان! ئا ئەوەتا سەردەکەون و ژوورەکە دەیان گرێتە خۆی و نهێنییەکان و
رووتبوونەوەکان کۆ دەکاتەوە، دەرگای ژوورەکە لەسەر خۆیان دادەخەن. ئەم یەهوودییە
بۆچی ژوورەکەی منی بەتەنیشت ژووری سۆزانییە پەرستراوەکە و نێرەوسە غەنمیەکەوە
هەڵبژارد؟ ئاخۆ هەر لەبەر ئەوەی ئازاری من زیاد بکات، ئەم دیوارە دەم نەوەستراو
نهێنی دەرخەرەی خستە نێوانمانەوە، کە هەرچەندە لێی نزیك دەبمەوە، سووتان و
شێتبوونەکەم پتر دەبێت، ئاگرێکە جگە لە ئاوی ئەو بەهیچ شتێك دانامرێتەوە،
شێتبوونێکە هیچ شتێ چارەی ناکات لەوەی ئاوی خۆم لەهەناویدا بەتاڵ بکەمەوە. ئەم
هیچ و پووچە ئارهای لەگەڵدا دەکات، چاوچنۆك و تەماحکارە، هیچ پاشماوەیەك بۆ برا
ئازار زەدەکەی ناهێڵێتەوە، ئەی تۆ هۆ پەرستراوەکەم لەو خواردنە بێزار نابییت، کە
هەموو شەوێ بێ ئەوەی بیگۆڕیت، دەیخۆیت؟! ئەی واز لەو (شۆربا)یە ناهێنیت کە
کۆن بووەو ماوەتەوە، تا حەزت بچێتە سەر خواردنێکی دی، بەڵکو بەنەختێ ئاشکرا تر
حەز بە دەستێکی تر بکەیت کە بەسەر مەمکەکانتدا بێت و بچێت، ئارەزووت بۆ
دەمێکی تر، لێوێکی تر ناچێت، کە لە پرچتەوە تا بن پێیەکانت تەی بکات و هەر
خانەیەك لە خانەکانی جەستە جوانەکەت بلێسێتەوەو لە عاست هەردوو کۆپانە
وشترەکە هەڵوەستە بکات و زمان بخاتە نێو هەردوو شفرەی ئەم وشترە خۆشەویستەوە؟!
ئایا رۆژێك بەخیاڵتدا هاتووە کاسەکەت لەگەڵ دلۆپە ئاوی پیاوەکەتدا بگونجێت، ئایا
کاسەکە بۆ دلۆپاندنەکە بچووکە، یان تەنگەبەرە؟! ئایا ئێشت پێدەگات یان هەستی
پێ ناکەیت؟ ئایا هەموو شتێکی نێوانتان بەیەك دەکات، یا هیچ گونجانیك کۆتان
ناکاتەوە؟! ئایا کوندەکەی لەچاڵەکەتدا بەتاڵ دەکاتەوەو دەگەڕێتەوە، یان وەك یاساکان
لە کتێبەکاندا باسیان کردووە هەردوو ئاوەکە دەگەنە یەکتر؟! ئەرێ من پرسیاری چی
دەکەم، ئەوەتا گوێم لەدەنگی مڵچەی ماچەکانێتی، یان رەنگە دەنگی ماچەکانی تۆ بن
لەو دیوی ئەم دیوارە ستەمکارەوە دەی بیستم؟! ئەی ئێستا جلەکانت لەبەرخۆ

دانەکەندووە؟! رووتییش بەتەنیشت منەوە کافرێکی بێ ئیمانـە. ئـەو کـافرە براکـەم و پەرستراوەکەمەو توورەم دەداتە نێو هەڵمی خەیاڵێکی سووتێنەرەوە؟! واگوێم لە هەناسە هەڵکێشان و هەناسە بڕکێ و هاوارە! بەسە! بەسە! بـەو خودایـە، گـەر خـوێنی هـەر سێکمان رژاوە، گەرەکە لێتی زەوت بکەم. ئـەوە سـوێندم خـوارد، مـن رەزا نـەبم گـەر سبەینێ ئەمە نەکەم، هۆ فاتمە، هۆ میری بەراز، من و ئێوەو سبەینێ....!

* * *

ئێمە لەهەناوی مێردەزمەکەدا بووین.. مێردەزمەیـەکی ترسـناک و چـەل و مـل و کۆتایی نادیار.. مەرگ کۆتایی کۆتاییەکانە، کەس متمانەی بـەم کۆتاییـە نییـە. لـە دوکانەکاندا خەریکە خۆراك نەمێنێت، مەزراکانی دەرەوەی شارۆچکەکە وشـك بـوون، زۆربەی خەڵك بۆ کارکردن دەرنەدەچوون.

ئەوانەی پێشبینییەکانی منیان لەگوێگرت، یـان بەهۆشمەنـدی خۆیـان پێـشبینی ئەوەیان کرد کەچـی روودەدات، هـەر لەسـەرتاوە خۆراکیـان هـەڵگرت و لەمەترسـی برسێتی رزگار بوون، بەڵام ئەوانەی بێ دەرامـەت بـوون و بێکـەس بـوون، یـان کەسـی خێرەومەندی هەبووە یان نەبوو، هەروەها ئەوانەی بڕوایان بە جادووی زێڕو توانـای زێـڕ هەبوو، گوایا دەتوانێت شیری باڵندەیان بۆ بەدەست بێنێت، بەهەموو شێوازێك دەستیان کرد بە گەڕان بەدوای خۆراکـدا، تەنانـەت دەوڵەمەنـدە قرچـۆك و رژدەکـانی سـابلاخ بەدەستی کراوەوە لەهەوڵی وەدەستهێنانی پاروە نان بوون. ئەوانە رۆژانێکی رەش بـوون و چون خەڵووز لە یادەوەریدا تۆمارێکی تەڵخیان نەخش کردو ناسڕێنەوە. ئـەو شـەوە شوومـەش چووە ریزی دووورودرێژی شـەوە رەشـەکان و لەوەبوو کۆتایی بە ژیـانی هـەموو ئەوانە بێنێت، کە لەماڵی ئێمە بوون.

پەنا هێنانی خانەوادەی میری هاوکارو شەریکم بۆ لای خۆمانم بەو پەڕی شاردنەوەو نهێنییەکی تەاوەوە دەوردا.کەسیان لەماڵەوە دەرنەچـوون و لـەدەرەوە خۆیـان پیـشانی کەس نەدا. پیاوان و ژنان لە شوێنێکی ماڵەکەدا دادەنیشتن و ئەم مێردەزمـە چـەل و ملەیان بەقسەو باس بەسەر دەبرد. وەك جاران میرو باوکی و من پێکەوە دانیشتین. لـەو شەوەدا بەدەنگی نزم و لەبەر رووناکی فانۆسێکی کز دەربارەی ئەو تاقەشتەی کە قسەی

هـەموو خـەڵکی بـوو، ئـەویش مـەینـەتی سـابلاخ بـوو، گفتوگۆمـان دەکـرد. لـەپڕ بێدەنگییـەك بـاڵی کێشا، هـەمـوومان گوێمـان هەڵخست و گوێچکەمان هـەموو چرپەیەکی دەبیست. هەستکردنێکی نوێ بوو، ئەمەش رووداوە ترسنـاکەکانی سـابلاخ لەناخماندا رواندبووی. لەناکاو دەنگی پێییەك هات کە بەنەردەوانەکەدا شۆڕ دەبووەوە. نیگامان ئامێرانە بەرەو سەرچاوەی دەنگەکە ئاراستە بوو. ئەمە دەنگی پێی رەزا بـوو، پەلە بوو، بێزارو شێت بوو، هەودای قسەکانمانی پچری و بۆلای خـۆی رایکێشاین. رەزا دادەبەزێت و جووڵانەوەکەی نا ئاساییە. کە روخساری لەبەر تیشکە زەردەکـە، سیمای ترسناك و هەڵقرچاوو تۆورەو ئاڵۆز بوو. چاوەکانی بەرووی براکەیدا زەق بـوو بوونـەوەو وەك تیرێکی هاوێژراو، یان وەك کاتێکی بە بەرەوە نەماو بەرەو میر هات.

بەواق ورمایی بیرکردنەوەمان وەستا، رەزا بە پەلەکردنێکی شێتانە دەهاتە خـوارێ، بینیم چنگ لە ناقرگەی میر گیر دەکات و بەسەریا هاوار دەکات:

- فاتمەم دەوێ! فاتمەم دەوێ!

بۆ ئەوەی خۆی لێ رزگار بکات بەرەو خۆی رایکێشا، بۆ فریاکـەوتنی هاوکارەکـەم راپەڕیم. بێگومان رەزا شێت بووە، بەڵکو هەموو شتێك لەو چرکەیەدا شێت بووبـوو... زۆر لەسیمای میرەوە نزیك بووم، ئاڵۆزی تێگەیـشتن و نیـشانەی پرسـیارێکی گـەورە و گێلانەی ئەوتۆ کە لەهیچ شـتێ تێنـەگات، بەسـەر روخـسارییەوە بـوو. دوای ئـەوەی ناقرگەیم لە چنگی رەزای برای رەها کرد، پەشۆکابوو و لەهیچ حـاڵی نـەدەبوو، ئـەوی تریش هاواری دەکرد:

- ئەی هیچ و پووچ، واز لە فاتمە بێنەو لەمنی مارەکە!

من لە ئامادە باشیدا بـووم! مـیر لـە ململانێـی گـەردارێکی هەڵـچوودا بـوو و تێنەدەگەیشت. وا قوڕمانێکی کوشندە حۆلی کردبـوو، دەی گرمانـدو رەزای لەشـوێنی خۆی پەك خستبوو، خۆیشی پەکی کەوتبوو:

- هەی سەگ، دەتهەوێ چی بکەم؟!

- فاتمەم دەوێ! ئیتر لـێ بێبەشـبوونیم بەسـە، تـۆ هـەموو شـەوێ لەکانیاوەکـەی دەخۆیتەوە!

زیاتر خۆم ئامادەکرد، میرو باوکیش لەئامادە باشیدا بوون.

بەمیری هەڵچووم وت:

- میر، وادیارە براکەت شێتبووە!

بەڵام میر ئیتر هۆشی لەدەست دابوو، وەك ئەوەی بـرینی سـووکایەتی پێکردنەکـەی نەوتی لەبەر بڕوات و ئاگری تێبەردرابێت، وەك ئەم جەنگە تێکشکێنەرە گڕی گرت. بە جنێودان و چاوگێڕان لەشتێك چنگی لەبراکەی گیر کـردو براکەشـی لـەهاواری خـۆی نەدەکەوت:

- تەڵاقی بدە، من شارەزای هەر خانەیـەك لەخانـەکانی جەسـتەیم، بـەم چـاوانەم هەموو ئەندامەکانی جەستەیم دیوە، بەڵام هەرتۆ لـەزەت لەهـەمووی دەکـەیت، ئـیتر ئەمە بەسە! بێ بەشبوونم لە تاقە ئافرەتێك بەسە، کەدەی پەرستم!

میر دەبێتە سەگێکی هار:

- باوکی سەلمان، ئەم هیچ و پووچە چی دەڵێت، چەقۆیەکم بۆ بێنـە! دەمانـچەیەك بهێنە! بەزاتی خودا دەی کوژم و لەگەڵ ئەویشدا داوێن پیسەکەش دەکوژم!

- میر، براکەت وڕێنە دەکات! گومانی تێدا نییە براکەت شێت بووە! سوێند دەخۆم ڕەزا شێت بووە!

بەڵام ڕەزا هاوار دەات:

- ئەی سەگینە، ئەوە دوورە! شێت نەبوومو فاتمەش داوێن پیس نییە! ئەگەر داوێـن پیس بوایە، ئەوا بێ ئەوەی ئەم کەم ئاوەزە بزانێت، دەستم پێی دەگەیشت. با ئێستا لێی جیا ببێتەوەو بەمنی بدات!

- باوکی سەلمان، دەمانچەکەتم بـۆ بهێنـە، سـوێندم خـواردووە ئـەم سـەگە قـەت لەدەستم ڕزگاری نابێت!

- ڕەزا، لەماڵەکەم بچۆ دەرەوە، بەڵام تۆم میر عاقڵ بەو بیر لە منداڵەکانی خۆت و منداڵەکانی من و دانیشتووانی ئەم ماڵە بکەوەو مەبە هۆی لەنێوچـوونی هـەموومان باوکی محەمەد!

- باوکی سەلمان، هەر ئێستا دەمانچەکەم بۆ بێنە، با تێکڕای دنیا بسووتێت..

لەرەزام خوری:

- لەماڵەکەم بچۆ دەرەوە: رەزا لەم ماڵە بچۆ دەرەوەو جارێکی تر بۆ ئەم ماڵە نەگەڕێیتەوە!

دەرگاکەم کردەوە، بینم ملکەچی دەنوێنێت، بەڕاستی شێت بوو بوو.بەراکردن رۆیشت و هەرهاواری دەکرد:

- هەواڵەکە بەرووسەکان دەگەیەنم! هەواڵ بەرووسەکان دەدەم! هەواڵەکە دەگەیەنمە رووسەکان!

گریانی فاتمە ئاگری لە بنیادەم بەردەدا، ئەسمەر لە ئامێزی کردو هەوڵی دەدا هێوری بکاتەوە، بەڵام بێسوود بوو. من و ئەسمەر دەمانزانی فاتمە بێ تاوانە، ئەویش بە قورسترین سوێند، سوێندی دەخوارد:

- بەزاتی خوداو بە پێغەمبەر، بەسەری منداڵەکانم محەمەدو ئەحمەدو حەمید، ئەم شێتە درۆ دەکات، سوێند بەخودا دەخۆم ئەو تاڵە موویەکی سەرمی نەدیوە، سوێند دەخۆم شوێنێکی شاراوەی ژێر جلەکانی نەدیوە، هۆمیر، خودا ئاگادارە لەتۆ بەولاوە خۆم و بیرکردنەوەو هەستم بەکەسی دیکە نەبەخشیوە...

رۆژگار قسەکە دەبڕێت، وەك ئەوەی گاڵتەی بە شتەکان بێت، ئەم زەردەخەنە کاڵەی تۆ لەسەر روخساری دەنیشێت:

- فاتمە سوێندی خواردو نازانێت، کە رەزا درۆ ناکات، ئەی ئەگەر زانیبای کە نیگای رەزا بەراستی لە(شەوی گەرماوەکە)، کە بوو بەمایەی مەینەتی و نەخۆشییە درێژخایەنەکەی، راوی کردووەو بەهەموو خانەیەکی جەستەیدا رۆچووە، ئەو دەمەش سوێندی بەدرۆ دەخوارد؟

وەڵامی رۆژگارم نەدایەوە، من مژوولی گوێگرتن بووم لەباوکی سەلمان، کە بەتانی گێڕانەوەی چیرۆکەکەدا دەچوو:

(دوای پێنج یان شەش خولەك گوێمان لەدەنگی تەقەیەك بوو، دەنگدانەوەی تەقەکە گەیشتە نێوسەری هەڵچوو و پەشۆکاومان. میر دوای دوو دڵێیەکی دوورو درێژ بڕوای بەبێ تاوانی هاوسەرە سەلارو چاو بە فرمێسکەکەی کرد، لەناخەوە لێی خۆش

بوو بەڵام هێشتا شتێکی بەرانبەری بەداپۆشراوی هێشتەوە، وەك ئەوەی ئەو پەڵە شوورەییەی کە بەزۆرداری و ناڕەوا بەهۆی براکەیەوە پێوەی لکابوو، پەڵەیەکە قێزەونەو ناسڕێتەوە. لەو شەوەدا سەربازی سەرمای مانگی ئادار میر جێگەی نووستنەکەی بۆ دەرەوەی ژوورەکە گواستەوە. دەبوو خوێنێك بڕژێت تا شوێنەواری ئەم پەڵەیەی سەر فاتمەی بێ تاوان و بەستەزمان بشتواتەوە. نازانم ئایا لە بەخت یارییەوە بوو، یان لەبێ بەختی بوو کە دەبێ دەسبەجێ ئەمە رووبدات. لەبەیانی رۆژی دوایی لەکەنێس دەگەڕامەوە هەندێ سەربازی رووس کە لەسەر هەندێ کۆڵان دانیشتبوون، بانگیان کردم و وتیان:

- شلۆمۆ، لەدووری سەد مەترێك لێرەوە، لاشەی لاوێکی موسوڵمان کەوتووە، بیبە با هاوڕێکانت بینێژن.

رووم کردە ئەو شوێنەی پەنجەنوومایان کرد. بینیم رەزا بەبێ گیان لەسەر زەوییەکە راکشاوە. روخساری بەهی شێتێك دەچوو، کە هێشتاخەون بە شتهایەکەوە ببینێت، کە نەیتوانیوە بەدەستیان بێنێت، چونکە لێی حەرام و قەدەغەکراون. خستمە سەر شانم و بەرەو ماڵ بردم. لەدەرگاکە چوومە ژوورەوە هەناسە بڕکێم پێکەوتبوو. میر کە چاوی پێکەوت هاوکات شادمان و خەمبار بوو.

- خۆزگە وازت لێدەهێنام خۆم بیکوژم، تا لەشەرەفی شەهیدبوون بێبەشی بکەم.

بەدڵدانەوەوە وتم:

- جاکێ وتوویەتی براکەت بەشەهیدی مرد؟ئایا لەپێناو خودادا خۆی بەخت کردووە؟ لەپای سابلاخدا جەنگاوە؟ئایا ئەم جەنگە هەستی بزواندووەو جولاندوویەتی؟

میر بەگریانی دایکی و رۆڵەرۆی باوکی ماوەیەکی زۆر داما.

- باوکی سەلمان، فریێ بدە بەر سەگ، یان خۆت ناشتنی لە ئەستۆ بگرە!

وتم:

- نا، میر.. براکەت ئاگای لەخۆی نەبوو، شەیتان ختۆکەی دا، یان تووشی جۆرە شێتبوونێك بوو بوو، هەر چۆنێك بێت، گەر شایانی سزا بێت، هیچ سزایەك لەم سزایە گەورەتر نییە.

پرسی:

- نیازی چیت هەیە بیکەیت؟

- دەی شۆین و کفنی دەکەین و خۆم بۆ مزگەوت دەیبەم، بانوێژی لەسەر بکرێ و بەپێی دەستووری ئیسلام مەلاکە ناشتنی لە ئەستۆ بگرێت. با باوك و دایکیشی بۆ دواجار بیبینن و مالئاوایی لێبکەن!

پێش ئەوەی بۆ مزگەوت بیبەم، تکام لەمیر کرد:

- پشت بەخودای بەخشندەو بە بەزەیی خۆت ببەستەو لە براکەت خۆش بە، هاوکارم ئەمە دوا هەلە بۆتۆ!

رووی خۆی وەرگێرا، بێگومان برێ جار مرۆڤ لەچاکە خوازیدا دەستەوەستانە، ئەم رق و کینەیە، ئەم توورەییە کوشندەیە هەر لەمرۆڤ لەلاوازیی مرۆڤ دەوەشێتەوە، وتی:

- خودا تۆلە وەسێنێکی گەورەیە، ئەگەر یەکێکی تریش نابرووی پایەمالّ بکرایە، هەروەك ئەم رەزا سەگە بەمنی کرد، ئەوسا تای تەرازووی تۆلەسەندنەوەو گەورەیی توانا بەسەر لێبووردەیی و بەزەییدا قورستر دەبوو، ئێستا وامن لە فاتمە خۆش بووم، بەلاّم ئەمە کە بێزم نایات پێی بلّێم برا، بەزاتی خودا تا رۆژی پەسلاّن لێی خۆش نابم!

ئەم جەنگە نەفرەتییە زۆر لایەنی هاوکارەکەم و هاورێی منداڵیمی بۆ ئاشکرا کردم، کە لێی بێ ئاگا بووم و مەترسیداریش بوو!

هاوکارو شەریکەکەم هەلگری ئەم هەموو کینەو رقە رەشەیە!

لەگەلّ ئەوەشدا....

# کایەی شەشەم

بەگوێرەی ڕووداوەکان خەمباری وشەیەکی چکۆلەیە. ئەم تاریکییە کۆتاییەکەی دیار نییە.هەرچەند بڕوایەکی پتەوم هەیە، بەڵام وام لێهاتووە ئاواتەخوازی مەرگ بم. تاقە چرکەی حەسانەوەم ئەو کاتەیە کە لەگەڵ منداڵەکان دادەنیشم، یان لەگەڵ ئەسمەردا دەم و دوو دەکەم، ئەوەش بەکەمی ڕوودەدات. ناحومی بچووک خەریکە زمانی دەپژێت، ئیستیری بچووکیش بەیارمەتی عارەبانەی پێچکەدارو ڕەوڕەوە پێڕۆکە بووە. دانیشتنی شەوانە بوون بەشەوانی گازاندەو بێزاری دەربڕین. ئەم جارە مانەوەی رووس درێژەی نەکێشا، دوای ئەوەی بەفرو بارانێکی زۆر لە سابلاغ بارین و مایەوە، لەپڕ بارانێك لە جۆرێکی تر بەسەریدا باری.. بارانی ئاگرو مەرگ و کاولکاری.

میر عەلی بەترسەوە وتی:

- وادیارە تورکەکان هۆشیان لەدەست داوە، بێ ئەوەی جیاوازی لەنێوان هیچ شتێکدا بکەن، کوێرانە شارۆچکەکە تۆپباران دەکەن.

بەتەوسەوە وتم:

- گەرەکە بەنزیك بوونەوەو هاتنی سوپای موسڵمانەکان کەیفساز بیت.

وتی:

- باوکی سەلمان، ئەمێستا دانی پێدا دەنێم،ئەوەی تۆ وتت ڕاست بوو، لەجەنگدا موسڵمان، یان گاور نییە، هەردوو لایەنی شەڕکەر بەرەو هەڵدێرمان دەبەن.

بێدەنگ بووم، ئینجا وەك ئەوەی خۆم بدوێنم، هەمە هەمێکم کرد:

- هەموو ئەمانە روو دەدەن و ئێمەش بێلایەنین، لەگەڵ هیچ کەسێکدا بانگی شەڕمان هەڵنەداوە، نەبووین بەلایەنگری هیچ لایەك لەدوو شەڕکەرەکە، بەڵام ئەوان وەك بەردە بازێك بۆ سوپاکانیان بەکارمان دەهێنن، بێ گوێدانە تاکارو بە پێچەوانەی یاساو دابەکان بەرانبەرمان تاوان دەکەن. ئەمەیان دەمان کوژێت و ئەویان دەتان کوژێت، هەردوو لایەن هەر دەسووتێنن و کاولکاری دەکەن و وێران دەکەن. برسێتیش سەرباری هەموو وا لە سابلاخ نزیك بووەوە دەبینین چی بەسەر شارۆچکە داماوەکەمان دێت.

- وا دەبینم چی بەسەر دێت، ئایا هیچ ماوە لەمە تاڵترو ناخۆشتر بەسەری بێت؟

- ئەمە!

دەنگدانەوەی تەقینەوەیەکی نزیك گوێچکەی کەڕکردین، دیوارەکانی خانووەکە لەرینەوەو ئافرەتەکان قیژەیەکی ترساویان لێهەستا. منداڵەکان ترس وشکی کردن و هەریەکەیان خۆی خستە باوەشی یەکێك لە گەورەکان. شتێك لێرە روویدا و هەر ئەوەندەی دووری سێبەرەکانمان لێمانەوە دوور بوو. ئەوە دەنگی مێیینەیەکەو چوون ئاژەڵێك دەلوورێنێت.دەنگ و زەناکە نزیك ماڵەکەمان تا دێت توندتر دەبێت و لای ماڵی عەزریا زێرنگەرەوە دێت. هەر چەندە یەك لە دوای یەك تەقینەوە بوو، بەڵام من هەر چوومە دەرەوەو ئەوەندەی نەمابوو زرمەم لێهەستێنن، ماڵی زێرنگەرەکە لەنێو چرکەدا ئەو لایەی کە رووی لە ماڵی ئێمە بوو، بوو بە نیمچە وێرانە، ئەو رووکارەیشی کە لە شان ماڵەکەی ئێمە بوو هێشتا ژوورێکی بەپێوە بوو. ماڵێك بەنیوە میوەیەك دەچوو کەڵبەی دڕندەیەك نیوەکەی تری هەڵکۆڵی بێت، نیوە جەستەیەك، نیوە شتێك. دەنگی ئەڵماس لوورەیەکە، لوورەیەکی ناحاڵی، لێ واتای شتێکی لە ترس و کارەسات گەورەتری تێدایە. دڕم بە دانیشتوانی گەرەکەکە و ئەو تەماشاکارانەدا، کە کۆبووبوونەوە. چوومە ژوورەوە، ئەڵماس وەك فێ لێهاتوویەك جەستەی رەق بوو بوو، بەڵام لەسەر پێیەکانی وەستابوو. سیمای تەواو گۆڕابوو، نە خۆ بادانێك، نە خۆ بەزلزانینێك، نە لاف لێدانێك، تەواو وەك گیاندارێکی بێ زمان و نوقمی نێو ترس بوو بوو. ئاوەز لەدەست چوویەك لە شێوەی شێتێکدا. چاوەکانی ئەبڵەق و تێك شکاو بوون. زارێکی

چوون دەرگای ئەشکەوت کراوەو هاوارێکی ئاژەڵانەی تێـك شـکان دەربـڕ. دەسـتەکانی ئاماژە بۆ شوێنێکی بەشە رووخاوەکەی ماڵەکە دەکەن، دەبوو بکەومە خۆ، دەم و دەست بانگی هەندێك لە پیاوانی گەرەکەکەم کرد، کە لـەوێ گردبووبوونـەوە، دەسـتمان بـە لابردنی دارو پەردوو کرد، لێرە لەم شوێنە کە دەستە لەرزۆکەکانی ئـەڵماس لـەمیانی هاوارە شێتانە و بێ بڕانەوەکەی ئاماژەی بۆ دەکەن. هەسـتێك دایگـرتم، وامزانـی کـە هەموو ئەم دارو پەردووە بەسەر دڵ و شانی مندا کەوتوون، قورس بـوو، تەنانـەت لـە قوڕقوشمیش قورستر بوون. ئەم بەردە بەسەریەکدا کەوتووانە بەسەر شتێکدا کەوتوون و کەڵەکە بوون لای ئەڵماس ئازیزە، بێگومان ئەو شتە مرۆڤە، رەنگە باوکی بێت، تاقـە کەسێکە لە ژیانیدا، ئەم هەموو بەردە لەسەر شانی من کەڵەکە بوون و رۆژ بە رۆژیش پتر دەبن و ئەمێستا گەیشتوونەتە ئەوپەڕی و وایان لێهاتووە لە هەموو قورسایی دنیـا قورسترن و خەریکە هەموو کوردی دنیا کە بە بەهێزی ناسراون، بۆیان نەجوولێت. هەر بەردێکی دارو پەردووەکە لادەبەین دەبێتە سەرباری قورسایی شانم و لەژێریدا دەنرکێنم و دەست لە زەوی گیردەکەم و بۆنی باروت و مەرگی لێدەکـەم وا مـەرگ وردە وردە لـە شێوەی پیاوێکدا دەردەکەوێت... عەزریای زێڕنگەر، یەکەم جار دەستی، ئینجـا سـەری، ئینجا پاشماوەی جەستەی.

- مەی جوڵێننەوە!

لەگەڵ هاواری شێتانەی ئەڵماسدا هاوارم کرد. بە نیمـچە وشـەیەك دەی لووراند، گەر هەستمان لێ راگرتبا دەردەکەوت وشەکە (باوکە!)یە. منیش بە بێـدەنگی هـاوارم دەکرد و دەم پرسی (ئایا ژیانی تێدا ماوە؟! هۆ خودایە لـە پێنـاو ئـەم بەسـتەزمانەدا ژیانی پێ ببەخشەوە!). من دەمزانی گـەر مـردن هـات، ئیـدی پاڕانـەوە بـێ سـوودە. هەستمان لە سینگی پیاوە راگرت، گوێمان هەڵخست، عەزریا زێڕەنگەر گیـانی تێـدا نەمابوو: ئەمە چارەنووسی خۆی و دەوێتەکەیەتی! کە هەڵمگرت لە تۆ پەڵە پەڕێیـەك دەچوو لە ئاسن دروسـت کرابێـت. ئـەڵماس تـەواو شـێت بـوو بـوو، وەك رەشـەبایەك هەڵیکردو بـەرەو رووم هـات، هـەر ئەوەنـدە پـێم گەیـشت وەك سـەگێکی هـار بـوو

نینۆکەکانی لێگیر کردم، بۆ چرکەیەك زمـانی کرایـەوە هـاواریکرد (مەیـەڵێ بـاوکم بدزێـت! ئەو باوکم دەدزێت!).

بۆ یەکەمجارە ئاوها هێزم لەبەر دەبڕێت، لەوەبوو بەسەر زەویدا بکەوم. قورساییەکان وا لەسەر شانم کەڵەکە بوون و خەریکن پەکم دەخەن، رووبـەڕووی ئـەم بـارە قورسـانە بوومەوە، بە دەنگێکی کزو خەمینەوە داوام کرد:

- ئەم بەستەزمانەم لێ دوور بخەنەوە و قومێك ئاوی بدەنێ!

حەسەن بوزورگی لاو یەکێك بوو لەوانەی باوەشی لێـداو هەوڵێـدا دووری بخاتـەوە. وەك گەردەلوولێك بەرەنگاری دەکرد و خۆی لە دەسـتی رادەپـسکاند، مـن مردووەکـەم هەڵگرتبوو، ئەی خودایە، لە چارەت نووسیوم کە دەبێت من هـەر مـردوو هـەڵبگرم؟! ئاخۆ تا ئەم جەنگە نەفرینە دەبڕێتەوە دەبێت چەند مردووی دیکە بـەکۆڵ هـەڵبگرم؟! ئاە خودایە بۆچی کردمت (بەگۆڕ هەڵگەن)ی ئەم جەنگە؟! ئاخر سابلاخ چ تـاوانیکی کردووە تا تووشی ئەم سزا تاڵە بکەیت؟!بەم بارە قورسە مرۆڤەوە بۆ ماڵی خۆمان وەڕێ کەوتم و لوورەی شێتانەی ئەڵماس و تەقینـەوەی تـۆپ دوامـان کـەوتبوون و تـۆقین و ترسانی ئامادەبووان و کەسانی ماڵەکەمان و میوانەکانمان سەرباربوون. بە ئەسمەرم وت گەرەکە کاری پیاوەکە جێبەجێ بکەین، پێش ئەوەی عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان بێنـە ناو سابلاخەوە دەبێت بینێژین، وەك هەموو جارێك لێم پاڕایەوە کە نەچـمە دەرەوە، مـیر بە جەختەوە وتی:

- تۆ شێتیت!

فەرمانم بەوانە دا، کە لە ماڵەکەدا بەتەمەن، گەورە بوون:

- بیشۆن و کفنی بکەن، وا من دەڕۆم دەزەلام کۆدەکەمەوە.

لە ماوەی سەعاتێك کەمتر هەموو شتێك ئامادەبوو، گۆڕسـتانەکە لەولایـەوە دوور بوو کە هەموو جارێك عوسمانییەکان لێوەی دەهاتن. پاڕامەوە کە خودا ئەو ماوەیـەمان پێ بدات، تا کاری پیاوە مردووەکە پێش گەیشتنی عوسمانییـەکان، جێبـەجێ بکـەین. دەنگی تۆپ و لوورەی شێتانەی ئەڵماس دوامان کەوتبوون (باوکمیـان دزی! باوکمیـان لێ دزیم!). لەبەر خۆوە وتم: (خۆزگە ئەم بەستەزمانەش لەگـەڵ باوکیـدا مردبـا! یـان

خۆی لەپێناویدا کوشتبا، ئاخر بە مردنی ئەو ئازیزترین شتی لەدەست چوو، بەڵکو هەموو شتێکی لەدەست چووا). دووبارە پرسیم (ئایا بەم کۆست کەوتنە بێدار دەبێتەوە؟!)، هەروەها پرسیمەوە (ئایا عەزریا زێرنگەر کەسێکی هەیە بەدرێژایی ساڵەکە نوێژ و نزای ئاسوودەی مروو- قەودیشی بۆ بخوێنێت؟) دەستی خۆم لە خۆڵی گۆڕەکە تەکاند، دیاربوو وەڵامی پرسیارەکان سەخت و دژوار بوون، بڕیارم دا خۆم بۆ مردووەکە قەدیش بخوێنم، لەهەمان کاتدا بڕیارم دا کە کچە هەتیوو بەستەزمانەکە لای خۆمان داڵدە بدەم. ماڵی زێرنگەر زۆربەی بوو بوو بە کەلاوە و شتێکی وای نەمابوو ئەویش بڕووخێت، دەرگایەکی نەمابوو تا بیپارێزێت. خەڵکی بێ بەزەییانە پەلاماری ماڵەکەی زێڕەنگەری مردوویان دەداو کەلوپەلیان لێ دەبرد، لە کۆگای خۆراک دەگەڕان کە کەوتبووە ژێر دارو پەردووەوە، بەڵام ئەڵماس بە دەم داواکانمانەوە نەهات تا داڵدەی بدەین، لە ژوورەکەی خۆیدا کە نەرووخابوو، دەستی لەشیشی پەنجەرەکە گیر دەکرد، ئەو ترسە شێتانەیەش سەر رووخساری بەرنەدەدا، بەڵکو ترسە تێکشکێنەرەکە لەسەری مایەوەو بە چنگە بەهێزەکەی پتر تێکی دەشکاند. هەر کەسێك لێی نزیك بکەوتایەوە، ئەم دەکشایەوە، لووت بەرزییەکەی کاتی هۆشمەندییەکەی گۆڕاو بوو بە شێتی، هاوارەکەشی بوو بە بێدەنگییەکی سەخت و لاملی... بەیارمەتی ئەسمەرو قەشەنگ هەوڵمان دا بۆماڵی خۆمانی ببەین، تەنانەت لە ئەنجامی راکێش و بکێشدا خەریك بوو شیشەکانی پەنجەرەکە لە بێخەوە هەڵبکەنرێن، هەموومان بەکۆمەکی خەڵکێکی زۆری گەرەکەکە زۆرمان لێدەکرد و بەرەو ماڵی خۆمان پەلکێشمان دەکرد، کەچی خۆی دەرباز دەکرد و دەگەڕایەوە و لە چاوپرووکانێکدا ون دەبوو. زۆربەی هۆش و گۆشی بۆ جەستەی گوێزرایەوەو بوو بەهێزو ترسێکی گەورە، بەڵام تارماییەك لە لووت بەرزی و پنتێك لە ئاوەزی دروست لە ئەڵماسی سەرکێش و لەخۆرازی بوو هەر مابوون، هەر کاتێك بەزۆرو ناچارکردن شێتییەکەی لێ دوور بخرایەتەوە، ئەوا دەگەڕایەوە بۆ دۆخی ئاسایی خۆی. ئێستا بۆتە نیمچە شێتێك و لە نیمچە کەلاوەیەك دەژیا، نە دەرگایەکی هەبوو بیپارێزێت، نە پەرژینێك، کەلاوەیەك هیچ پیرۆزییەکی نەبوو و بەڕووی هەرکەسێکدا کراوەبوو،

کەلاوەیەك نە ئارامی تێدابوو، نە خۆراك، لەم سەرەگێژکێیەی نێو ترس و لەرزی سابلاخدا کچە بەنازەکە بوو بە نیمچە شێتێکی دەربەدەرو هەڕەشەلێکراو مەترسییەکی بێ ئەندازە.

عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان بۆ جاری سێیەم هاتنە نێو سابلاخەوە، بەڵام داستانی دانیشتوانی شارۆچکەکە لەسایەی ڕێنماییەکانی حەسەن چەخماخ و بانگەوازەکانی منەوە، منی بەندەی بێدەسەڵات، یان بەپێی پێویستبوونی بارودۆخەکەوە بووبێت، ئەو دەستانە کۆت و بەندکران کە ئەڵهای خەنە (خوێنی مرۆڤ) بوون. لەپشت یەکڕیزی خەڵکەکەوە کوشتاری بەکۆمەڵ وەستێنرا، ژمارەی کوشتنی جوولەکە و نەسرانی شارۆچکەکەش بوو بە تاك و تەراو لە شوێنە تاریك و چۆڵ و دوورە دەستەکان تێناپەڕی. مەترسی لەهەموولاوە دەوری ئەڵماسی دا، کاتێك لە دالدەدانی لە مالی خۆمان بێ ئومێد بووین، بڕیارم دا بۆ لای پوورەکانی بچم.

بەیەك دەنگ و بە کۆمەڵ یەك تاقە بۆچوونی زۆر دارانەیان هەبوو، وتیان:

- ئەم کچەتیوە لەوەتەی لەدایك بووە هەر شوومە، دایکی بەسەر ئەمەوە چوو، ئەوەتا سەری باوکەکەشی خوارد، کە خۆشی دەویست و لەبری خودا دەیپەرست.

بەناقایلییەوە، وتم:

- خودا بناسن!ئاخر چۆن وادەڵێن، بەستەزمانە بەهۆی مردنی باوکییەوە عەقڵیشی لەدەستداوە! شوومی ڕاستەقینە ئەم جەنگەیە، جەنگەکە باوکی کوشت و گیانی خەڵکێکی زۆر درووێنە دەکات. دەربارەی دایکیشی ئەوە ویستی خودای گەورە بووە، ئێ زۆر ئافرەتی دووگیان کاتی منداڵ بوون دەمرن!

بەڵێ ئەی باوکی سەلمان، لەکۆتاییدا توانیت پوورەکانی قایل بکەیت تا بێن و لەگەڵ خۆیاندا بیبەن، بەڵام هەوڵەکانیان وەك هەوڵەکەی تۆ سەری نەگرت، ئەڵماس هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی لەشوێنی مردنی باوکی بمێنێتەوە. لەدوای ڕووداوەکە لەهەمان ئەو شوێنەی کە باوکی تێیدا(دزرا) دەبینرا، وا لەسەر دارو پەردووەکان دانیشتووە، قەشەنگ خواردن و خواردنەوەی بۆ دەبردو بەدزییەوە لە شوێنێکی دیار بۆی دادەنا، ئیدی تا ئەی بینیایە وا خواردنەکەی دۆزییەوەو بەهەڵپەروە دەستی

بەخواردنی کرد، حەشارگەکەی جێ نەدەهێشت. ئیدی قەشەنگ بۆ ماڵ دەگەڕایەوەو دوای ماوەیەك دەهاتەوە تا قاپە بەتاڵەکان بباتەوە، ئەڵماس لەسەر چاوەی خواردن و خواردنەوەکەی نەدەپرسی، یان لەخۆی نەدەپرسی، تۆش ناوبەناو هەر لەدوور را چاودێریت دەکرد، کە بەم شێوە تازەیەی دەت بینی ئازارەکانت زۆرتر دەبوون. ئەرێ بەراستی ئەم کچە کڵۆڵە ئەو هەرزەکارەیە کە پێش ماوەیەك لەمەوبەر ئەڵماسێکی لە خۆرازی و لووت بەرزبوو؟

هەی نەفرەتی خودا لە جەنگ!

* * *

حەسەن چەخماخ...

نە پیاوە نەخۆشەکە دەمرێت و نە شۆڕشی گەل لە رووسیا جێگیر دەبێت!، بەڵام ئێمە بوونی خۆمان سەلماندو زۆری پێ ناچێت خۆری سۆسیالیستی بەسەر هەموو گەلانی رووسیاو هەردوو بەری ئازەربێجان هەڵدێت. بەلشەفی بەرەو سەرکەوتن بەڕێوەیە، لەگەڵ ئەوەی هێزە کۆنەخوازو پارتە نەتەوەیی و ئیسلامییەکان بانگەوازی کۆمەککردنی عوسمانییەکان دەکەن، یان دەچنە پاڵیان، بەڵام دوو پیاوەکە لەسەرتاسەری جیهان کاردەکەن.

هاوڕێیان، ئێمە کەمێك پێشکات، رەنگە پێش شوێنیش بکەوین. ئەمڕۆ سابڵاخ رووبەڕووی یەکێك لە بەرەنجامە ترسناکەکانی ئەم جەنگە قێزەونە دەبێتەوە. دیاردەی برسێتی لە شارۆچکە کڵۆڵەکەماندا بەئاشکرا دەرکەوتووە. خەڵکی برسین، دوکانەکان خاڵین، رەنگ زەردی لەسەر رووخسارەکان نیشتووە، ئێسکی خەڵکی دوای ئەوەی بەزو گۆشتیان توانەوە بە ئاشکرا دیارە، زۆربەی دانیشتوانی سابڵاخ کەڕێ دەکەن لەبرسان وەك سەرخۆش لارەلاریانە.

دەست بەو خۆراکەوە بگرن کە هەتانە، بۆ دەرەوەی سابڵاخ بڕۆن و بەدوای خۆراکدا بگەڕێن و تا دەتوانن کۆی بکەنەوە، با کەمیش بێت و چەندیش پارەی تێدەچێت، پارەی هەموومان یەکە و خۆراکیشمان یەك خۆراکە، گەرەکە بەهانای کەم دەرامەت و هەژاران و ئەوانەوە بچین کە جەنگەکە نەیهێشتووە پڕ بەسکی خۆیان بخۆن.

وەك وتم سەرکەوتنی یەکڕیزی جەماوەرمان بەسەر بێگانەی تینووی خوێن وەدەست هێنا، با ئێستا بەرەنگاری دوژمنە گەورەکەمان... برسێتی ببینەوە! با بەگوێرەی توانا جڵەوی تەکانە یەك لەدوای یەکەکانی برسێتی بگرینەوە.

سەرکەوتنی سەرەتاو کۆتایی هەر بۆ گەلانە!

❊ ❊ ❊

دوو خولیا دەکەونە سەر حەسەن بوزورگ، دوو خەم دەی پسێنن، ئەمێستا گەیشتن بە ئەڵماس و ترازاندنی (دۆخینەکەی). زۆر هاسان بووە، بەڵام ئەوەی شتەکەی قورس و دژوار کردووە، خۆراگرتنە بەرانبەر برسێتییە زۆردارەکە. ئیدی حەسەن بوزورگ لەدەست دەرچوو، ئەو گۆڕاوە وای لێهاتووە دەزانێت کە ئەم سندوقە پڕ لە زێڕانە هەرگیز ناتوانن کولێرەیەك پەیدا بکەن، هەستی بەبێ بڕستی دەکرد. ئاخر ئەو ڕۆژانە ڕۆیشتن تازگی دەیگرت دەی خوارد، تێریی ڕووالەتی و بنەمای نازراگیاوی و لووت بەرزییەکەی بوو، تێری دەخوارد و ئینجا بۆ جێبەجێکردنی شاڵاوەکانی دەچووە دەرەوە، ئێستا زگی زەرد هەڵگەڕاوە و قۆڕەقۆڕیتی، ڕەنگە لە بەخت باشی ئەم بێت کە چوونی بۆ دەرەوەی شارۆچکەکەی لێ قەدەغەکراوە. بیری لەوە کردەوە ئاخۆ خوشکەکانی لە ژوورەکەی خۆیاندا چی بکەن، بێگومان وەك چۆن برسێتی خۆیان بۆ پیاوان دەشارنەوە، ئاوهاش برسێتی سك دەشارنەوە، یان ڕەنگە بە چپە باسی هەردوو برسێتییەکە بکەن. گەر لە دابی ئەم کۆمەڵەدا پیاو مەترسی بێت، ئەوا خۆراك مافێکی ڕەوایە و لێ بێبەشبوونی تاوانە، لە خۆی پرسی (ترازاندنی بە نەخوێن)ی ئەڵماس گەر چەند ڕۆژێك یان مانگێك یان دووسێ مانگ بخایەنێت، ئایا تا ئەو دەمە ئەم دەمێنێت؟

خۆ ئەگەر ژیاو هەموو کۆسپەکانی تەخت کرد، ئەوە بێگومان ئەڵماس دەبێتە یەکەم کچێك لە بێداریدا نەك لە خەوندا، بەدەستی دێنێت. ئایا بێ هێزی و بێ بڕستی بواری دەدەن تا تەنگ بە ئەڵماس هەڵچنێت و بەسەرکەوتوویی و پیاوەتییەوە بگەڕێتەوە، یان یەکەم ئەزموونی ڕاستەقینەی بەرانبەر دەسەڵاتی برسێتییە زۆردارەکە مایە پووچ دەبێت؟!

نەخێر، گەرەکە باوکی چارەسەرێك بدۆزێتەوە. قایلی بکات کە زێڕ شیری چۆلەکە بەدەست دێنێت، تەنانەت مانگیش بەدەست دێنێت، کەچی ئەوەتا ئەم زێڕە وەك خۆڵ بەسەر یەکدا کەڵەکەبوون، ئەم خۆڵە چ سوودێکی هەس، چونکە ناتوانێت لەتە نانێکی وشك، یان تەنانەت توێکڵە پیازێك پەیدا بکات.

لە ژیانیدا بۆ یەکەمجار لەم باوکە هەڵگەڕایەوە، بۆ یەکەم جاریش هەستیکرد کە هەڵخەڵەتاوە. راستییەکانیش وردە وردە لەبەرچاوی ئاشکرا دەبوون و رووبەڕووی دەبوونەوە، گەر خۆ پەرستییەکەی و گەر برسێتییەکەی، گەر حەزی دەست بەسەرداگرتنی ئەڵماس و ئەگەر خۆشەویستی خوشکەکانی و دایکی نەبوونایە، ئەوا هەستی بەم راستیانە نەدەکرد. ئای باوکە! ئایا ئەم شلۆمۆ کەتانییە جوولەکەیەی دراوسێمان دەبینیت؟ ئەو لێزانترین کەسی دنیایە، کاتێك خۆراکی کۆ دەکردەوە تەنانەت هەندێك کەس پێیان دەوت شێت، بەڵام ئەو داوای لەو کەسانە دەکرد کە وەك ئەو بکەن. ئەوەی بەگوێی کرد ئەمێستا لەماڵەکەی خۆی پاڵی لێداوەتەوەو باکی بەخواردن نییە، نە لە برسێتی دەترسێت، نە لاواز بوون و نە وشکبوونەوەی گەدە تامردن. ئەوانەی پێیان دەوت شێت، ئەوانەی بڕوایان بەهێزو ئەفسوونی زێڕ هەبوو، وا ئێستا لە برسان لاکەی سەریان دێت و رووبەڕووی هەڕەشەی مردن دەبنەوە.

باوکە، دانی پێدا بنێ، کە ئێمەین شێت! لەگەڵ ئەوەشدا رەنگە هێشتا کات بەبەریبەوە مابێت. گالیسکەکەت ئامادە بکەو کیسە زێڕەکان هەڵبگرەو بە پارەکەت قوربانیمان بۆ بدە! بەرەو باشوور بۆ ئەسفەهان بڕۆ، یان گەر توانیت بەرەو رۆژهەڵات بۆ تاران بڕۆ و ئەم کانزا زەردو تووڕەهاتە بە بژێوی ژیان بگۆڕەوە...! دەی باوکە، لەپێناو کچەکانت و دایکم، لەپێناو خۆت و من دا نانێك با بەدە ئەوەندەی جارانیش بێت، جا چییە؟! ئەی تۆش وەك من نابینیت، ئەی هەر وا بەم شێتییە دەمێنیەوە؟! سوێند بەگیانی دایکم و باری و جیهان و دنیا و عالەم، بەگیانی هەر هەموومان سوێندت دەدەم. بڕۆ و خۆراکمان بۆ پەیدا بکە، ئەگینا ئێمە دەوڵەمەند نیین، بەڵکو هەژارگەلێکین برسێتی لە رەگ و ریشەوە دەرمان دەهێنێت!

دوای دوو دڵییەك رازی بوو، دیقەتی دا گوڵە پشکوتووەکان لە قۆناغی پەژموردەبیدان، دڵی نەرم بوو، بەزەیی هاتنەوەی بە ئێمەو بەخودی خۆی بەسەر بڕوابوونی بە پارەو خۆشەویستی زۆری بۆ پارە زاڵ بوو. هەفتەیەك خۆی بزرکرد، ئەو ماوەیە هەر نزامان بۆی دەکرد، کاتێك گەڕایەوە بە گالیسکەیەکی نیوە بەتاڵەوە هاتەوە، هەندێك پێویستی و چەند تەنەکەیەك بوو، کە تاهی برسێتییە کوشندەکەی نەدەشکاند.

- ئەمە چییە؟!

هەناسەیەکی گەرمی وای هەڵکێشا خەریك بوو گڕەکەی گالیسکەکە و ئەوەی لەناویدایە بسووتێنێت، بێزار و شەکەت و برسی و ماندوو بوو:

- بە عارەبانەیەکی پڕەوە گەڕامەوە، هەر ئەوەتا ئەسپەکان دەیان توانی رای بکێشن، لە دەروازەی شارۆچکەکە داگیرکەران دەسیتان بەسەر زۆرەبەیدا گرت و لەمە زیاتریان بۆ نەهێشتینەوە!

دایکم بە تووڕەییەو وتی:

- ئێمە بە گۆرانی و هەلهەلە پێشوازیمان کردن، ئەوەتا ئەوان خۆراکەکەمان داگیر دەکەن و لە برسان دەمان کوژن، کەواتە جیاوازی نێوان ئەمان و رووسەکان چییە؟

باوکم وتی: ئەوان بە گوللە دەمانکوژن و ئەمانیش بژێومان لێ زەوت دەکەن، ئەی نەفرەتی خودا لەهەردوو لایان.

بە غەمگینییەوە وتم:

- ئەگەر دەستمان پێوە گرتبا ئەوا بەشی مانگێك یان دوو مانگمانی دەکرد.

دەستبەجێ بیرۆکەیەکم بۆ هات و پێم وت:

- بۆچی پێش ئەوەی کار لەکار بترازێت، جارێکی تریش ناچیتەوە؟

وتی:

- سوودی چییە؟ پارەکەمانیش تەواو دەبێت و (هەریسەکە)ش عوسمانی و ئەڵمانی دەیخۆن!

تۆ بڵێیت لەکۆتاییدا بەسەر برسێتیدا زاڵ بین، ئەوسا تاقیکردنەوەکە لەگەڵ ئەڵماسدا بەلێهاتوویی کەڵە پیاوێکەوە جێبەجێ بکەم؟

نەفرەت لە برسێتی و ئەوەی برسێتی هێنا!

*** 

رۆژگار بە هەناسە سوارییەوە لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو، بەرۆژی نیوەڕۆ بە بەرچاوی خەڵکی سابلاخەوە، ژمارەیەك لە پیاوەکانی مورتەزا حاجی زادە لە دەرگاکەیان دا، لە من پشوسوارتر بوون، لە شەڕ گەڕابوونەوە. مورتەزا بێ پێچ و پەناو شاردنەوە بردنییە ژوورەوە، سەردەمی وریایی و شاردنەوە بەسەر چوو بوو تەنانەت گوڵیش ئێستا ئازادانە هەموو شتێکی دەبینی و دەبیست.

لەدەموچاوی رووتەڵەکان شەڕو خراپەکاری دەباری، بەڵام مورتەزا وەك پێغەمبەرێك پێشبینی پێشهاتێکی خراپ بکات، بەڵام دەبێ‌ت ئەو شەڕە چی بێت؟ لە ژوورەوە بەرووخسارێکی مۆن و ترشەوە بەتوندی لێی پرسین؟

- قسە بکەن! وەلی هیچ و پووچ ئەمجارە چی کردووە؟!

یەکێك لە رووتەڵەکان وتی:

- لایەنگرەکانی هەولێاندا ئاگر لە هەندێك کێڵگەو باخت بەربدەن!

یەکێکی تر وتی:

- ئاگرەکە یەك پارچە گەنمی سووتاند و توانیمان ئاگرەکە لە دەغڵ و دان و باخەکانی تر بکوژێنینەوە.

سێیەم وتی:

- چوارمان لە پیاوەکانی کوشت، دووانیش لە ئێمە بریندار بوون!

مورتەزا حاجی زادە ماوەیەکی زۆر داما، ئینجا سەری بەرزکردەوەو هەمە هەمێکی کرد:

- گێلەی شێت! ئەوەی دیواری لە شووشە بێت، بەرد بۆ خەڵکی ناهاوێژێت! ئێوە دەزانن کە دەتوانین دە ئەوەندە تۆڵەی لێ بکەینەوە، ئێ جگە لە کەمێك نەوت و چەند تەڵە شقارەتەیەك زیاتری تێناچێت، بەڵام ئێمە لەو هۆشمەندترو زیرەکترین، بۆیە

چاوەڕێی ئەو چرکە ساتە دەکەین تا جەنگێك لە بابەت ئەوەی رووس و تورکەکان هەڵبگیرسێنین، کە چۆن دانیشتوانی سابلاخ گیرۆدەی بوون، دەی ئێستا بەرەو نان خواردن و شەراب!

رووی کردە سندوقی دارینی گەورەو کووڕ و کردییەوە، دەستی بەدەرهێنانی کیسە زێڕ کرد و بەسەر پیاوەکانیدا دابەشی کردو وتی:

- دەزانم گەر روو بکەنە باشوور یان رۆژهەڵات، دەتوانن خۆراکتان دەست بکەوێت، بەڵام ئەوەی پێویستتانە زێڕە، ئەم پارەیە لەنێو خۆتاندا دابەشی بکەن. کاتێکیش ئازووقەی (رۆژی ئاگرکەوتنەوەکە)تان کۆتایی هات، ئەو ئازووقەیەی بەم پارەیە دەیکڕن بیخۆن، ئەم پارەیە بەدرێژایی رۆژانی قاتوقڕی و برسێتی و تەنانەت تا هاتنی چرکەساتی رووبەڕووبوونەوەکە بە پشتیوانی خودا نزیکە، بەشی خۆراکی خۆتان و برادەرانتان دەکات. ئەمەش کیسەیەکی تەواوە بۆ شێری چیای سەردەستەتان و ئەوی دیکە بۆ جێگرەکەی. هەر کاتێك پێویستی کرد وەرن بۆ لام، چونکە ئێوە شایانی هەموو چاکەیەکن، بەڵام لە ئاست دوژمنەکانتان چاو مەنووقێنن و پیلانەکانیان پووچەڵ بکەنەوەو تیرەکانی براکەم بەرەو کەوانەکەی بگێڕنەوە، ئیدی خودا پشتیوانمان بێت.

کە جێی هێشتن بە هەڵپەوە نانیان دەخوارد و کەف و لیك بەدەمیاندا دەهاتە خوارێ. لەدەمیانەوە جۆرە دەنگێکی کێوییانەو مڕەمڕێك دەردەچوو، لە مڕەمڕی گیاندارێکی زۆر برسی دەچوو ئیدی لە بیرکردنەوە کیناوی و ژەهراوییەکانیدا رۆچوو.

شوێنەواری قامچی هێشتا بە پشتمەوە دیارە، خوێڕیترین ئافریدەی خودا بەو قامچیانە لێی دەدام، هێشتا خەت خەتۆکەی کۆنەزامی شوێن قامچییەکان بە پشتمەوەن و بەقووڵایی ئەفس بەرزیدا رۆدەچن و دەبنە چاڵێك کە جگە لە گۆشتی بۆگەنی تۆ هۆ وەلی، هیچ شتێکی تر پڕی ناکاتەوە! ئاخر ناچارت کردم چۆك دابدەم، لەکاتێکدا جگە لە خودا بۆ کەسێکی تر چۆك دانادەم، کردمت بە ئەسپ و کەر، کەچی خودای گەورە بە مرۆڤی هەموو مرۆڤێکی دروستکردووە، ئاوها لە فەرمانی خودا دەرچوویت و سووکایەتیت بە ئابڕووی مرۆڤ کرد. زەبرێکی کوشندەم لێدایت،

چونکە دەمزانی بەر لەخودا پارەو سامان و رواڵەتبازی دەپەرستیت. تۆ پەڵەگـەنمێك یان باخێکم دەسووتێنیت ئەمەش ناگاتە نرخی تاقە مەترێك لە کۆگا بـە کەلوپـەل و خۆراك ئاخنراوەکەت؟! تۆ سووتاندت و مـن ئاگرم لەدڵت بەردا، هیچ خراپەیەکم لەگەڵ برسییەکانی سابڵاخدا نەکردووە. هۆ وەلی، چونکە زانیم تۆ ئەوەی قۆرخت کـرووە مـن بە بام دا، ئەی هیچ و پووچترین بوونەوەر، ئەوەی تۆ بـۆ پارەدارەکـانی سـابڵاخ هـەڵت گرتبوو، تا دوا پارچە زێڕیان لەدەست دەربکەیت و بیانگەیەنیتە ریـزی برسـییەکان و لەکۆتاییدا لەگەڵ ئەواندا بمرن، وا لە سـایەی منـەوە وەك دڵـت بـوو بـە خۆڵەکـەوە، گەرەکە خەونەکەت پووچەڵ بکەمەوە، کاتێك سەر دێتە سەر راستی، ئەوکاتەی خـودا خۆت و پێوە بەستراوەکانت تووڕ دەداتە باوەشی ئەنکیرو مونکیرەوە، بە پشتیوانی خـودا هەمووتان بەرەو دۆزەخ دەچن، ئەوسا هەموو غایلە قێزەونـەکانت پووچـەڵ دەکەمـەوە. کەواتە با جەنگی غەوارەکان کۆتایی بێت، ئەوسا بە ئاشکرا جەنگەکـەمان، جـەنگی ئێمەی کە پێمان دەڵـێن بـرا، دەسـت پێدەکـەین. رووسـەکان و عوسمانییـەکان چـەند لەیەکەوە دوورن، ئێمە یـەکجار لـەوە زیـاتر لەیـەك دووریـن، سـەری هـەڵبڕی و بـە دەنگێکی بەرز پرسی:

- هاوڕێیان، وانییە؟!

(هاوڕێیان) شڵەژان و خواردنەکەیان دایە لاوەو بەدەم جوینی ئەوەی ناو دەمیانـەوە، پرسییان:

- گەورەمان، مەبەستت چییە؟

بە جەختەوە وتی:

- سەرکەوتن بۆ ئێمەیە، نەك بۆ وەلی ستەمکارو نەفرین.

هەموو بەیەك دەنگ وتیان:

- بە پشتیوانی خودا گەورەم! ستەمکاران و ئەو خڵت و خاش و لەبرسـا مردووانـە لە سێبەری ئەو ستەمکارانەوە هەڵدەگەڕێینەوە، رزگاریان نابێت!

قسەی ئەم رووتەڵانە لەگەڵ قسەکانی حەسەن چەخماخ و هەوادارانی جیاوازییەکیان نەبوو، شێوازی جێبەجێکردنیشی بەقەد تاڵە موویەك لەهی ئەوان لای نەدەدا، ئەوەندە

هەبوو مورتەزاو پیاوەکانی شەڕێکی تایبەتی و تاقەکەسییان بەرپا کردبوو، بەڵام چەخماخ و هاوڕێکانی پێیان وابوو لەپێناوهەمووانداا دەجەنگن و رووسیاو ئازەربێجانیش لەو چوارچێوەیەدان و جەنگەکەشیان لە ئایندەدا دەبێتەخودانی هەزار پێیەك و دەوری دنیا دەدات، تا ملکەچی رێنماییەکانی خۆی بکات، رێنمایی (چاکەخوازییەك)ی راستگۆیانە.

*** 

ناوی ناجی باریزات بوو، کە بینیم جلێکی ژنە خێڵەبیا بانەکانی لەبەرکردبوو، وەك ئەوەی دواهەناسە بدات لەبەر دەرگای کەنیسەکە کەوتبوو. پرچ سووررو دەموچاو کونجرین، هەرزەکارێك لە تەمەنی شانزەساڵیدا بوو، بە هەموو ئەو زمانانەی دەمزانی دوواندم، ئەو بەشێوازی جوولەکەکانی بەغدایی وەڵامی دامەوە، ئەو سەردەمە تاقە وشەیەکی عارەبیم نەدەزانی، دەرگای کەنیسەکەم کردەوە و بە چوار دەوری خۆمدا هەڵم رووانی، کاتێك کەسێکی نامۆو لایدە نەکەوتە بەرچاوم، بردمە ژوورەوە. ئاماژەی بۆ کردم کە برسی و تینووە، لەوەی کە لە دۆڵابی کەنیسەکە هەبوو، خواردن و خواردنەوەم پێدا، نوێژکەران گردبوونەوە، یۆنا ئاغاسی ماوەیەك لە بەغدا مابووەوە و بەباشی ئاخاوتنی جوولەکەکان فێر بووبوو. ئیدی ئەوەی لاوە جوولەکەکە دەی وت بۆمانی وەرگێڕا، ئەوەی ئەو وتی ئازار بەخش بوو، بەڵام لەپشت قسەکانەوە بۆنی ئومێدێك دەهات. لەبەغدا عوسمانییەکان دوای ئەوەی یەدەگی تەمەن گەورەکانیان بەدەستەوە نەما، دەستیان کردووە بەگرتنی قوتابی قوتابخانەکان بۆ سەربازی. لە باشوور شەڕی ئینگلیزەکان دەکەن، ئینگلیزەکانیش بەهەنگاوی خێرا بەرەو بەغدا دەیەن، ئەوانەی بەرەو باکوور دەیان گوازنەوە، ئەوا مەودایەکی زۆر بەرەو بەرەی شەڕ بەسەرماو سۆڵە گڕەی گەرما بەپێ دەڕۆن. زۆر کەس بۆیان رێکەوت وهەڵاتن و گەڕانەوە، بەڵام ئەوانەی ئەوەیان بۆ رێ نەکەوت، عوسمانییەکان وەك زرێیەکی مرۆیی زیندووبۆ پاراستنی سوپاکەیان لە ئاگری تۆپی رووسەکان، بەکاریان دێنن وپێش خۆیانیان دەدەن و دەسبەجێ تیادەچن. ناجی باریزاتیش خۆی دەکاتە مردوو لەگەڵ سەدان کوژراودا لەدەروازەی شارۆچکەکە دەکەوێت. کە سوپای عوسمانییەکان دوور دەکەوێتەوە،

هەستاوەو جلەکانی گۆڕیوەو ئەم جلەی لەبەر کردووە. هێشتا لەعێراق بووە ئـەم جلـەی دەستکەوتووە، تا بۆی رێکبکەوێت و هەوڵی هەڵاتن بدات، ئیدی لەبەری بکات و بەرەو بەغدا بگەڕێتەوە، بەڵام، بەختی نەی هێناوەو ئەو هەلەی بـۆ هەڵنەکـەوتووە، چـونکە سەرکردەکانی چاویان لەسەری بووە. هەنگاوەکانی پێچاوەتەوەو گۆڕانی ئاووهـەوا هـەر لەسەرمای سەخت و خۆری سووتێنەر هێڵەیان پێکردووەو نەنانی دەست کـەوتووەو نـە ئاو، چونکە عوسمانییەکان لەرێگەی خۆیاندا هەرچی شتێك بۆ خواردن بشێت، ئینجـا لە شارو لەدەرەوەی شار، لە کێڵگـەو بـاخ، هـەموویان لەخـەڵکی داگیرکـردووە، یـان دزیویانە. ناجی باریزات بەتاقی تەنیا لە دەورووبەری سابلاخ لەچاوی هێزە داگیرکەرەکان خۆی شاردۆتەوە، لە هەندێك باخی نزیکدا برێ میوەی خـواردوە، هەنـدێکجاریش لـێ براوە ئەو خواردنانە بخوات، کە ئاژەڵ دەیخۆن. دواجار بـەختی دەیهێنێـت و دوای ئـەوەی چەندین جار لە تەقەکردنی سوپا رزگاری دەبێت، دەگاتە سابلاخ. ئەو زمـانی براـوو و زمانی تایەفەکەی خۆی نەدەزانی، ئیّ قسەکردنیش بە ئاماژە تووشی مەترسی دەکات. دەسووڕێتەوەو خۆی ناخاتە بەرچاو، تا لـە رووکـاری پێـشەوەی کەنیـسەکە ناونیـشانە عیبرییەکە دەبینێت، بەهەر جۆرێکە لە تاریکی خۆی حەشار دەدات، ئینجا بەیانی زوو بەشەکەتی بۆ کەنیسەکە دەگەڕێتەوە، خۆی بکێش دەکات، تا دەگاتە دەرگاکـەو بـەبێ شنگی پاڵ دەکەوێت، کە چاوم پێی کەوت لەدوا هەناسەدا بوو، لەبەر دەرگـای مـاڵی خودا دا کە پیاو چاکان و خودا پەرستان رووی تێدەکـەن، ململانێـی لەگـەڵ مردنـدا دەکرد.

خەمەکانم پتر بوون، کەچی دەرووی ئومێد لە دڵی ئەو خەمانەدا کڵاو رۆژنەیـەکی کردەوەو تیشکێکی لاوازی لە رووناکی دەهێنایـە ژوورەوە. بـیرم لـەوە کـردەوە کـە لاوە جوولەکە بەغدایییەکە بێنمە ریزی ئەوانەی لە ماڵەکەماندا بوون، کەچی دیواری زمان دیوارێکە بەلێدانی پاچی دەست و بازوویەکی بەهێز نەبێت ناڕووخێـت، کەچـی ئێمـە دەست و بازوومان لاواز بوو، بۆیە یەکێکم هەڵبژارد کە پێـشتر هەرەسـی بـەو دیـوارە هێنابوو. یۆنا ئاگاسی، تۆ خۆت و پیرێژنەکەت لە ماڵەکەدا هەر هەردووکتانن، بەهۆی

زمانەکەتەوە دەتوانیت ئەم لاوە بەغداییە بدوێنیت و گوێشی لـێ بگریـت، بـۆ مـاڵی خۆتانی ببەو من بژێوی ژیانی ئەوو تۆو پیرێژنەکەشت دابین دەکەم.

بەڵێ، خۆراك لە شارۆچکەکەو ماڵەکەی تۆش لـەکزی داوە، بـەڵام ماڵەکـەی مـن هێشتا پڕە لە خێروفـەڕ، ئیـدی بـەهۆی نـاجی باریزاتـەوە، یـان بـەبێ ئـەویش تـۆو پیرێژنەکەت لەو خێرو فەڕەتان بەردەکەوێت! بەرەو ماڵ گەڕامەوە، هەندێك هەواڵم پـێ بوو کە بۆنی ئومێدیان لێدەهات (جەنگەکە بەرەو کۆتایی دەڕوات!) بەڕاستتە؟!

بێگومان لەو قسەیە پەلەم کرد. دەبـوو پـێش ئـەوەی بگەینـە کـەناری ئـارامی، دەریاگەلێکی دیکە لەخوێن و ترسی کوشندە بڕین...

هەندێك کارەساتی وا ببینین، تەنانەت سەری منداڵی نێو بێشکەش سپی بکات.

* * *

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەماڵی بوزورگ خـۆراك کـەم دەبـووەوە، بـە ئـاوەژووی زێـڕ کـە بەهاکەی وەك نرخی خۆڵی لێهات، خۆراك بوو بە پارەیەکی دەگمەن و دەبوو پارێزگاری بکەیت و دەستی پێوە بگریت و بە نـەرمی و وریاییـەوە مامەڵـەی لەگەڵـدا بکـەیت! حەسەن بوزورگ پێش چارەنووس دەکەوێت و هەوڵ دەدات لە ئـەڵماس نزیـك ببێتـەوە. ئیدی ئەم لـە تێریـدا خـواردن هەڵناهێنێتـەوە، بـەڵام ئافرەتیـشی گەرەکـە. هـەموو مێیینەی سابلاخ لەبەرچاوی ون بوون و تەنها ئەڵماس مایـەوە، لـە تاریکیـدا بـۆ لای دێـت و چـاوی لێییـە کـە چـۆن خواردنەکـەی شـلۆمۆی جوولەکـە بـە هەڵپـەوە هەڵدەلووشێت، ئەرێ خۆراك لەماڵی ئەم جوولەکەیە هەر نەبڕا؟ چۆن دەبڕێـت ئـەوێك هەموو دانیشتووانی سابلاخ دەزانن گەنجینەیەکی زێـڕی لـەپای کۆکردنـەوەی خـۆراك توانەوە؟ ئەی هەندێك کەس بە شێتییان نەدەزانی و هەندێکی تـریش تۆمـەتی قـۆرخ کردنی خۆراکیان نەدەدایە پاڵ؟ کەچی وا ئێستا بەخۆڕایی دەی بەخـشێت. دوو خێزانـی گەورە لە ماڵەکەیدان و لەدەرەوەی ماڵەکەشی کۆمەڵە خێزانێك لەم ئازووقەیەیان بـە بەخشندەییەوە دەدرێتێ. ئەوانەی بە کۆکردنەوەو هەڵگرتنی خۆراك تۆمەتباریان دەکرد، هیچ و پووچن، کـە گوایـا لـەکاتی پێویـستدا بـەدە ئەوەنـدەی نرخەکـەی خـۆی دەی فرۆشێتەوە! ئەوەتا ئەڵماس لە خواردنەکەی دەخوات و بێگومـان لەمەسـەلەکەش بـێ

ئاگایە. بیری کردەوەو هاوکات سڵی دەکردەوە و لێی بەگومان بوو، سڵی دەکردەوە کە لەدەرگای شلۆمۆ کەتانی بدات و پێی بێژێت(ئێمەش برسیمانەو لەکۆگاکانت خۆراکمان بدەرێ، تا لە برسان نەمرین، لەو پارەیەی هەمانە چەندت دەوێت، دەت دەینێ!) ڕەنگە شلۆمۆ کەتانی بەدەم داواکەیەوە بێت و خواردنی پێ بدات، بەڵام بێگومان پارە وەرناگرێت. کەواتە ئەمە دەبێتە سواڵکردن. ڕەوشت ڕێگەی نەدا خورادن سواڵ بکات.

وتی: گەرەکە پێش تەواو بوونی ئەو خۆراکە کەمەی کە باوکم هێنای، بەنەخوێنەکەی بترازێنم. دەبوو یەکەم جار کارێکی وابکات تا بڕوای پێ هەبێت و لێی نەترسێت، بەڵکو دەبێت لێی دڵنیا بێت، گەر توانیبای بیکات بە دۆستی خۆی، ئەوە خۆشترین داواکارییە، ئەو لە هونەری خۆنزیک کردنەوە لە ئافرەت لێزانە، بەڵام دۆخەکەی ئەڵماس لەبار نییە. ئاخۆ هێشتا لەخۆڕازیبوونەکەی لەژێر ئەم تەمی ترسەشدا هەرماوەو خۆی مەلاس داوە؟! یان کەللە ڕەقی و لووت بەرزییەکەی لەگەڵ ئەم واق وڕمانە نیمچە هێمنییەیدا تێپەڕیوە؟! ئەو وردە وەردە لێی نزیک دەبێتەوەو بەچپە دوو لەگەڵیدا دەدوێت، چپەیەك بەرد دەتوێنێتەوە، قسەیەکی بۆ دەکات ئاسن دەکاتە ئاوێکی زوڵاڵ و لە تاڤگەیەکی ڕوونەوە هەڵدەقوڵێت، ڕیتمی دەنگی ترسەکەی دەکاتە دڵنیایی، بوونی ئەم بە تەنیشتییەوە بەدرێژایی ئەوساتانەی کە لەلایەتی شوێنەواری کارەساتە رووخێنەرەکەی لەبیر دەباتەوە، ڕەنگە لەماوەیەکی تردا ئەم دارو پەردووی ناخی کە لەدارو پەردووی ماڵەکەی دەچێت، پڕ بکاتەوەو چاکی بکاتەوە. چپە دووەکانی بۆ ئەو وەك چپە دووی شەونمە بۆ گوڵ، لێی نزیك دەبێتەوەو بە نەرمی دەی دوێنێت، ئەڵماس چون گیاندارێکی کێوی و سرك لێی دوور دەکەوێتەوە...نا... نا تووتییە جوانەکەم لێم هەڵمەیە! ئەوەتا دیوارەکە بەرت لێدەگرێت، وەك چۆن دیواری قەفەز بەر لە باڵندەی خۆشخوان دەگرێت. هەر وەکو ئەسپی سرك رام دەکرێت، منیش ئاوا رامت دەکەم. ڕۆژ بە ڕۆژ تۆ هۆگری چپەکانم و وشە نەرمەکانم دەبیت، لەگەڵ هەناسە خۆشەکانم کە لە گەردنت دەدەن رادێیت.

رۆژ لەدوای رۆژ بەڵێنەکانی دەباتە سەر. بێ ئومێد نییە، بەڵام پێش چارەنووس و نەمانی خواردن دەکەوێت.تەنها ئامانجی بەنەخوێنەکەیەتی!

ئامانجی هەر بەنەخوێنەکەیەتی! دوای دەوانی هەفتەیەکی سەخت لەرامکردنی هۆگری دەنگی بوو، ئینجا چپەو هەناسەکانی سرپیان دەکرد، تەنانەت وای لێهات ترسەکوشندەکەیشیان رەواندەوە. ئیدی وەك جاران پاشەکشەی نەدەکرد دیوارەکە بەری لێ نە دەگرت. لێی نزیك بووەوە، بەهەڵپەبوو، لە تاریکیدا لێی نزیك دەبووەوە، ریتمی دەنگە بەسۆزەکەی رای دەکێشا، ئەم ریتمە چون خەوڵێ خستنی موگناتیسی بوو، ترسەکەی دەرەوانەوەو دەی خستە دۆخی متبوونەوە، ئیدی وەك ئەسپێکی سرك نەدەترسا. لە نیمچە تاریکییەکەدا وا هەستیکرد کە تارمایی زەردەخەنەیەك نیشتووەتە سەر رووخساری و تارماییەکە دەسمێت و وەك تیلماسکە تیشکێك لە سیمای هەڵدەستێت و دەگاتە ئەم. کەچی هەر کە دەستی بۆ درێژکرد و هەوڵی دا دەستی پێبگەیەنێت، ترسەکەی دووبارە لێ پەیدا بووەوە. لێی کشایەوە، بەڵام ئەمجارە هاواری نەکرد، تەنها کشایەوە دواوە، خۆی بەدیوارەکەوە نووساند... نا... نا، ئەڵماس مەترسە، من نامەوێت ئازارت بدەم! ئای چەند حەزم دەکرد بم توانیبا، باوکت بۆ بهێنمەوە، بەڵام خودا بۆلای خۆی بردییەوە. ئەڵماس ئێمە بنیادەمین، ناتوانین بەرانبەر بە ویستی خوداو چارەنووس هیچ شتێك بکەین... مردنیش!

پرسی (تۆ بڵێیت ئەگەر باوکی دەست بکەوێتەوە، جارێکی دیکە دووبارە بگەرێتەوە سەر لووت بەرزی و کەللە رەقییەکەی؟!) ئەو بارکەی کە تاقە کەسێك بوو خۆشی دەویست. هەستیکرد یەکجار بەزەیی پێدا دێتەوە (راستە من ئافرەت پەرستم و ئافرەتیش خاڵی لاوازی منە، بەڵام من مرۆڤم و پێم پاشتر بوو ئەڵماس هەر لەسەر سەرسەختییەکەی خۆی بمایەتەوە، بەڵام باوکی بمایە و لەگەڵێدا بووایە، بەمەرجێك دەستم لە دۆخینەکەی گیر بووایە، با ئەوسا هەر بێ دایك بووایەو نیمچە شێتیش بووایە، با ژیانێکی ئەفسانەییش بژیایە). ویستی بڵێ وێرانە، کەچی وتی ئەفسانە، بێگومان لەمەشدا راستی وت و پتر سۆزی بۆی جوڵا، ئەوە نیمچە دڵنیاییەك بوو، چونکە دەستی پێ بگات ئەوا بۆ چەند ساتێك بەختەوەری دەکات، رەنگە ئەمە دژوارو

ئالۆزیش بێت، بەڵام بێگومان پێی خۆش دەبێت و خەمە شاراوەکەی نەختێك بیر دەباتەوەو ئەو ترسە نەفرینە دەڕەوێتەوە کە بەسەریدا زاڵ بووە. بەچپەیەکی سۆزناکەوە پێی وت (خۆشەویستم، سبەینێ بۆ لات دێمەوە). پرسیارێکی دیکەی سەیر بەخەیاڵدا هات (تۆ بڵێیت هۆشی ئەوەی هەبێت لەواتای وشەکان بگات؟!). بەڵێ، خۆشەویستم ژوانمان سبەینێیە! بەبێ ئارامی چاوەڕێی سبەینێی کرد، تا بولای ماینە جوان و سرکەکەی بێتەوە، بۆ لای تووتییە بەندکراوەکەی نێو قەفەزی ترس بێتەوە. ئیتر ئەو چاوەڕێی ئەزموونێکی هەنگوینی بۆخودی خۆی نەبوو، بەڵکو زیاتر لە پای ئەڵماسدا بوو، بێگومان ئەڵماسیش چێژی لێ وەردەگرێت. ئەی ئەوە نییە گیاندارو باڵندەو تەنانەت مێروو و گەزندەش کە ئەم ئەزموونە دەکەن، چێژ وەردەگرن؟! تەنانەت هیچ و پووچترین بوونەوەر چێژ دەبینن و ئاوەزیشیان نییە، ئیدی بێ ئەوەی تێری لێ بخوات هەر هەڵپە دەکات. بۆ یەکەمجار بێ ئەوەی گوێبداتە دەوروبەر، شقارتەیەکی لەگەڵ خۆیدا برد و بۆلای چوو، دەنکێ شقارتەی بەرانبەری داگیرساند، ئەڵماس داچڵەکی، ئینجا گوێی لەدەنگی ریتمی قسەکانی بوو و هێور بووەوە. نەختێك لێی نزیك بووەوە، تەڵە شقارتەکە چزەی لە پەنجەی هەستان و ئاهەکەی خەفەکرد. تەڵە شقارتەیەکی دیکەی داگیرساند، بەردەوام وشەنەرمەکانی دەڕژانە نێو رووحییەوە، لەبەر رووناکی ئەو تیشکە زەردەی بەر روخساری کەوت زەردە خەنەیەکی بینی. لێی نزیك بووەوە، نەسڵی کردەوەو نەکشایەوە، ماینە چەمووش و سرکەکە خەریکە لێی دڵنیا دەبێت. دەستی خستە سەرشانی و تەزوویەکی پێدا هات، دوور نەکەوتەوە، بەڵکو وەك پەیکەرێك لە شوێن خۆی وشکبوو. هەستی بە بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی سینگی کرد، تەنانەت ترپەی دڵیشی گەیشتە دەستی. بەردەوام بەسۆزو نەرمی دەی دوواند... وشەکانی ئەفسووناوی بوون، وشەی ئەڤین بوون... قسەگەلێك نزیك لە عەشق. ئەرێ حەسەن بوزورگ تۆ بەزەییت بەم داماوەدا دێتەوە، یان وا خەریکە خۆشت دەوێت؟! تۆ تەنها بە ئارەزوویەکی هەوەسبازانەی ئاژەڵانەوە دەستت پێکرد! نا، هەرچەندە ئەمە یەکەم ئەزموونی راستەقینەتە، بەڵام ئێستا ئارەزووی هەوەسبازی ئاژەڵانە نییە.تۆ وا ئەم یەکەم ئەزموونەت بۆ ئەو تەرخان دەکەیت و سۆزو خۆشەویستی خۆتی پێدەبەخشیت، ئەڵهای

پێدەبەخشێت و دەی بینیت دەکەوێتە سەرووی ئازارەکانی و بوونی، بۆ ئەوەی پێش تۆ بە باڵی لەزەت و لە چرکەساتی بیرچوونەوەی مێردەز مەتاڵەکە لەشەقەی باڵ بدات! تەنهاچرکەیە! کەواتە خۆشەویستم! هۆ خۆشەویستەکەم! سبەینێ وادەی دیدارمانە. هەستیکرد ئەمەی بەراستگۆیی پێدەڵێت. ئیدی چاوەڕێی سبەینێی کرد. لەم دواییەدا ژیانی بوو بوو بەچاوەڕوانی وخۆ نزیك خستنەوە لە ئەڵماس. ژیانی ئێستای کێبڕکێ و ململانێییە لەگەڵ برسێتی و ئەڤین. پەلە بکە، کاتەکەی لە بەرژەوەندی تۆ ناچێتە پێشەوەو خۆراك زوو لەبن دێت و هەندێك شتیش بە ئاوەژووی برسێتی پێشبینی ناکرێت!

دەستی بەختووکەدانی جەستەی ئەڵماس کرد، خۆی بەدەستیەوە داو دڵنیایە، ترس و پاشەکشێی بیرچووەوە. حەسەن بوزورگ هەستی بەوجەستەیە کرد کە بە پۆشاکی لەخۆبایی بوون داپۆشرابوو و هەموو ئارەزوومەندێك سڵی لێ دەکردەوە. جەستەی تەڕوبڕ و تورت بوو. دەستی گرت، ئەمێستا گوێڕایەڵ و کەوی بوو. بەو گوێڕایەڵییەوە بەرەو ژوورەکەی لەگەڵیدا ڕۆیشت، ئەو ژوورەی بوومەلەرزەی دوژمنکارانە وێرانی نەکردبوون لەسەر جێگەکە پاڵی خست و لەبەر ڕووناکی مۆمێك چۆکی بۆ دادا، لەوە دەترسا کە ئەم ڕووناکییە کزە ئاشکرایان بکات، بەڵام بۆنی ناخۆشی جلەکانی ئەڵماس و بۆنی جەستە عارەقاوی و گەڵمە خاوی ترسەکەیان لەبیر بردەوە، کەواتە خواردن و خواردنەوەت دەدەنێ و گوێ بە پاك و خاوێنیت نادەن! هەر خۆی بیانوویەکی بۆ ئەمە دۆزییەوە، ئەوان مەبەستیان پاکڕاگرتنی جەستەی نییە...، ڕەنگە کارەکەرەکەیان هەوڵی پاككردنەوەشی دابێت، بەڵام ئەم بە ترسەوە لێیی دوورکەوتبێتەوەو نەیهێشتبێت توخنی بکەوێت. ئای بەستەزمان! تۆیەك بۆنی عەترسی جەستەت هەموو شەقامەکەی پڕدەکرد، چۆن بەرگەی ئەم بۆنە بۆگەن و پیسە دەگریت؟! من ئێستا جلەکانت بۆ دەگۆڕم، سبەینێش ئاو بۆ هەردووکمان گەرم دەکەم و لەم نیمچە تاریکییەدا پێکەوە خۆمان دەشۆین. لەو دەمەدا هەردووکیان پێکەوە لەسەر جێگەکە بوون، سەری سوڕما وا بەتوندی خۆی پێوە دەنووسێنێت. هەستی بە شانازی بەخۆوەکردن نەکرد، بەڵام سۆزی بەرانبەر ئەڵماس وەك گرێك نەوتی بەسەردا بکرێت

بەرزیۆوە. بەخۆی وت (شتە مەحاڵەکە وا خەریکە دەبێتە راستی!). هەندێك بیرۆکەی تەواو مرۆڤانی کەوتە خەیاڵی، تەنانەت بیری چووەوە کەوا بەرەو جێبەجێکردنی یەکەم ئەزموونی راستەقینە دەڕوات و هەر ئەمیش ئەمەی هێنایەوە یادی. بەڵێ، کارە دوورەدەستەکە وا هاتە دەست، ئەوەی ئێستا دەیکات بە پلەی یەکەم لەپێناو ئەودا دەیکات. ئەڵماس ترسەکەی بیر دەچێتەوەو لە ئامێزی دەگرێت. ئەو لەسەر جێگاکە بووەتەوە بە کچە بەهۆش و سەلارەکەی جاران، بەڵام بەبێ لووت بەرزی و لەخۆبایی بوون. بەجۆرێك خۆی پێوە ئاڵاندووە وەك ئەوەی بیەوێت لەناویدا، لە جەستەیدا ون ببێت و بتوێتەوەو ببێتە شتێك و هەموو کون و کەلەبەرێکی پڕ بکاتەوە. وا ئاوەکەی رژاندە هەناوییەوە، نەك وەك جاران کە راهاتبوو بەدەستەکانی ئەمەی دەکرد. دیقەتیدا ئەڵماس لەوپەڕی جۆش سەندن و بەختەوەریدایە، بۆیە دوو جۆش سەندن لەمەدا ئاوێتەی یەکتر دەبن، لەزەتی سێکس و لەزەتی بەخشندەیی راستەقینە. دڵنیابوو کە لە خودی خۆی شتێکی پێدەبەخشێت، بەڵگەشی ئەوەیە ئەڵماس هێشتا هەر خۆی پێوە ئاڵاندووە، لە جووڵەیدا دیارە کە داوای زیاتری لێدەکات، بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە کە رووخساری سەنگینی و ئارامی لەزەتی لێ نیشتبوو. رەنگە ئەم تاقە کەسێك بێت لەوەتەی ترس نیشتووەتە سەر ئەم سیما جوانەی، ئەم نیگاکردنەی پێ براوە، کە هێور بووەوە لەئاوی لینجاو پاکی کردەوەو جلی پاکی لەبەر کرد، کە لە دۆڵابەکەیدا دۆزییەوە. بەراستگۆیی و وەفادارییەوە ماچی کرد. ئەوان لە دنیایەکی دوور لە دنیای راستەقینە- مێردەزمەکە، دەژیان. ئەڵماس ئێرەتی لە ترسەکانی رەها بوو بوو، حەسەن بوزورگیش برسێتی و هەموو خەمی دنیا کە بارێکی قورسی سەر دڵی بوون، بیر چووەوە. بە دەنگێکی چپەناسا وتی: (سبەینێ بۆ لات دێمەوەو پێکەوە خۆمان دەشۆین...). گومانی نەبوو پێش ئەوەی خۆراك کۆتایی بێت و شتی چاوەڕوان نەکراو بێنە پێشەوە، لە مندالدانی خارێنیدا تۆوێك دەچێنێت.

* * *

لێرە، تا لەم شوێنەدا، هۆ باوکی سەلمان، ئەم زەردەخەنە چکۆلەو تەوسامێزە لەسەر رووخسارت قەتیس دەبێت و گەپ بە هەموو ئەو شتانەی لە دنیادا هەن، دەکات و

لەکن ئەم نوختەیە دەتوێتەوە. تۆ لاپەڕەکانی کتێبی یادەوەری هەڵدەدەیتەوە، کتێبێکی گەورەیەو سەرت بە بانیدا شۆڕ کردۆتەوە، تەنگی پێهەڵدەچنیت، کاتێك لە حەناس لاپەڕەیەکی دیاریکراو هەڵوەستە دەکەیت، هەناسە لەبەرخۆت دەبڕیت، بڕێکجار وشەکان بەترسەوە دەدرەوشێنەوە، هەندێکجار بە خوێن و جارجاریٚ بە کۆست کەوتن، جاری واش هەیە بەهەمموو ئەمانە، خۆ بڕێکجار دەبێتە مێکوتێك و تێکڕای بوونت دەکوتێتەوە، گاڤێکیش چوون دووربینێك شتی ترسناك دەردەخات، ئایا لە جەنگی سابلاخدا جگە لە کارێژکردنی ترس و تۆقین شتێکی تر هەس، ئەریٚ شتێك ماوە بە خوێن ڕەنگ نەکرابێت و کۆستیش ڕەشپۆش و پرسە باری نەکردبێت؟! دەپرسم و هاوکات گوێم لێتە وا هەموو ئەمانە دەگێڕیتەوە، ئەریٚ ئەم هەموو گریانەت لەکوێوە بۆهات؟! ئەم جەستەیەو ئەم باڵا بەرزە کە بە قورسایی دنیا بارکراوە، چۆن نەچەمایەوە؟! لەکاتێکدا بە شانازی و سەربەرزییەوە دەڵێیت (من شلۆمۆ کوردم، من کوردێکی سەر سەختم، وەك چیاکانی کوردستان پتەوم، سەختم وەك درەختەکانی ئازەربێجان)، بەڵام تۆ مرۆڤێکی بڕوادارو ئایین پەروەریت، لێوان لێویت لە سۆزی چاکەخوازی، کە گەیشتیتە تەمەنی بالّق بوون دووجار گریایت، پێم سەیرە کە چۆن ئەم دوو دژەت پێکەوە کۆکردەوە؟! هەناسە هەڵدەکێشیت و لەسەر گێڕانەوەکەت بەردەوام دەبیت، بەڕاستی هەر وەك ئەوەی کتێبێکی چاپکراو بخوێنیتەوە، نەگۆڕانی بەسەردا بێنێت نە ئاڵوگۆڕی پیٚ بکەیت، دووبارەی دەکەیتەوەو ناو بەناو بەربای گوێمی دەدەیت، بەڵام ئا لێرە چارەت گرژ دەکەیت و غەمی متبووی ناخت لەناکاو بۆ رووخسارت سەر دەکات. زەردەخەنەکە ون دەبێت و ڕەنگ هەڵبزرکان جێگەی دەگرێتەوە. وشەکان پچڕ پچڕ و لێك هەڵبڕاون، بەڵام هەموو مانایەك دەردەبڕن. کەواتە بوارم بدەریٚ، با لەم ڕێگە سەختەدا هەرکاتێك کەندو کۆسپ و تەڵەت هاتە پێش، پشوویەکت بدەمیٚ.

لەو ڕۆژەدا لە کەنیسە دوا کەوتم، ئەوەبوو هەر لەسەرەتای مانگەکەوە تەوراتمان دابەشکرد و خوێندمانەوە. هەروەها دوعای ئاسوودەییمان بۆ مردووەکانمان خوێند! ئای مردووانی تایەفە بچووکەکەی سابلاخمان چەند زۆرن!

نوێژکەران چوونە دەرەوە، من بەتەنها مامــەوە و خــەریکی تۆمــارکردنی بودجــەی مانگی رابردووی کەنیسە بووم، ئیــدی هــەر لــە داهــات و خــەرجکردن و تــا دەگاتــە بەخشین، دیقەتم دا خەرج کردنەکان لەگەڵ داهاتەکان رێك نەدەهاتنــەوە. هەنــدێکجار کاتێکی زۆرم بەدەستەوەیە کەچی ئەم هەڵانە هەر روو دەدەن. ماوەیەك تێپەڕی و مــن و مێر بۆ نووسینگەی بازرگانییەکەمان نەرۆیشتبووین. شتومەکی چــینی و جلوبــەرگ و شتی دەگمەن کۆتاییان هات! خەڵکیش وەك چۆن بەدوای کانزایەکی بەنرخدا بگــەڕێن، ئاوها بەدوای خۆراکدا دەگەڕان و بــە رۆژی نیــوەڕۆ بــە مــۆمی داگیرســاوەوە بەدوایــدا عەوداڵ بوون. مێر لەگەڵ ئافرەتەکاندا لە ماڵــەوە دادەنیــشت و لەگــەڵ منداڵەکانــدا گەمەی دەکردو لەگەڵ باوك و دایکی و فاتمەدا قسەی دەکرد، منیش لێرە لە کەنیــسە بەدوای هەڵەی ژمێریای و خەرج و داهاتدا دەگەڕام. شتێکی خواسایییە، منێك هــەموو خــەمی ســابلاخم لــەخۆم بــارکردووە، قەیــدی چییە بــا بــەدوای هەڵەشــدا بگــەڕێم! وردەکارییەکانی نادیار ناخوێنمەوە، لێ دەزانم هێشتا لــەناو مەشــکەی ئــەم نادیــارەدا کارەسات ماوە و کۆتایی نەهاتووە. شەڕە داسەپێنراوەکە هێشتا داوای روحی زۆرترمــان لێدەکات.خەمەکانم خەریکە زەینم کوێر دەکەن و ئاه و هەناسەی گەرم و پڕ لە هەڵمی غەم بەسەر ئاوێنەی روحمدا دەپژێنن و بێگەردییەکەی تــەڵخ دەکــەن. مــن مانــدووم و ئەوەی روودەدات شەکەتم دەکات، بێ ئەوەی بمەوێت قوربانییەکان لەکۆتی خــۆم دەنــێم. کاتێك دێمە نێو کەنیسەکەوەو ئەوسا دەریش دەچم روو دەکەمە خودای گــەورە تــا ئــەم نەفرەتەمان لەسەر هەڵبگرێت. من ئاوها دەکەم و هەمو رۆڵــەکانی ســابلاخیش شــان بەشانی من هەروا دەکەن، کەچی دادێ نادات، ویستی خودا وابوو کە بــەردەوام بەســەر سابلاخدا نەفرەت ببارێت، هەروەها خودا ویستی کە ماوەی سەعاتێك یان زیاتر بەدوای هەڵەی ژمێریارییەکەدا بگەڕێم. نەمدەزانی کە هەڵەکە لــە بودجەکــەی ئــەمڕۆدا لــە هەڵەکانی تر جیاوازە. زنجیری سەعاتەکەم راکێشا و سەعاتەکەم لــە گیرفــانم دەرهێنــا. ئەوە چییە؟ کات بەخێرایی بــەرەو نیــوەڕۆ دەڕوات، بێگومــان ئێــستا لــە ماڵــەوە لــە نیگەرانی مندان و شێت بوون. مــێر لــە دانیــشتین بــە تــەنها و لــەنێو منداڵــەکان و ئافرەتەکان وەڕس و بێزار بوو بوو. پەلەم کرد، جگــە لــە گەیــشتنی ماڵــەوە بــیرم لــە

هیچی دیکە نەدەکردەوە، دەرگاکەم کردەوە. هەموو چاوەڕێی من بوون، سەلمان و سەیون و مریەم لە حەوشەکە منداڵەکانی میریـان جێهێـشت و بـەراکردن هاتنـە باوەشـەوەو خۆیان پێمەوە نووساند. ئـەی کـوا نـاحوم؟ ئـەی کـوا ئیـستیری بـچووك کـە بـەدوای منداڵەکاندا بەساتمەدان دەهات تا لەگەڵ ئەواندا خـۆی بخاتـە ئامێزمـەوە؟ ئـەرێ بـۆ پرسیار دەکەم و بە پەرۆش و نیگەرانییەوە چاو دەگێڕم؟! وازم لە منداڵەکان هێناو رووم کردە ژوورەکەی ئیستیر. ژوورەکە چۆڵ و هۆڵـە، لـەناکاو وەك ئـەوەی خـەوتبم، ئینجـا بەترس و پەشۆکاوییەوە لە خەو رابم، هەستم بەشـتێکی سـەیرو نـامۆکرد. ئیـدی وەك ئەوەی جنۆکە دەستی لێ وەشاندبم و تووشـی شـێتبوونی کـردبم، بەهاوارکردنـەوە لـە ژوورەکەی ئیستیر هاتمە دەرەوە:

- کوا ئیستیر؟ کوا ناحوم؟ کوا ئیستیری بچووك؟

قەشەنگ زمانی بەسترا، وەك ئەوەی لە دەمی گرکانێك نزیك بێتەوە، کە گڕاو فـڕێ بدات، لێم نزیك بووەوە:

- گەورەم، چۆتە دەرەوە!

دوای ئەوە نیوە بێهۆش بووبووم، وەناگا هاتمەوە:

- کەی و بۆکوێ؟

میر هاتە نێو قسەکانەوەو بانگی کرد:

- شلۆمۆ، ئەوە چی روویداوە؟ ئەی تۆ خۆتیش ناچیتە دەرەوە؟ ئەی خـەڵکی ناچـنە دەرەوە؟

وەك ئەوەی هەر گوێم لە میر نەبووبێت، بەنیوە ئاگاییەوە دووبارەم کردەوە:

- قەشەنگ پێم بڵێ خاتوونت کەی لەماڵەوە دەرچووەو بۆ کوێ چووە؟!

داماوە بە دەنگێکی پچڕ پچڕ و ترسەوە وتی:

- بەیانی دوو سەعاتێك دوای دەرچـوونی تـۆ، جلـەکانی لەبـەر کـردو وتـی ئـیتر حەوسەڵەی قەتیسبوونی ماڵەوەم نەماوە، هـەردوو منداڵەکـە دەبـەم تـا هەناسـەیەك هەڵبکێشم...!

خورپەیەك بە دڵمداهات، ئافرەتە هەواڵدەرەکەم هاتەوە یاد، نا، بەڵکو شتێك بەرووونی بە دڵمدا هات و کسپەی لە دڵمەوە هێنا، ڕەنگە ئەمە شڵەژان بێت، دەشێت لە ئاکامی ئەو کارەسات و بۆسانەوە بێت، کە لە هەموو شوێنێك خۆیان مەڵاس داوە، ڕەنگە ئەمەش هەر غایلەو ختورەیەك بێت. ئاخر هێشتا هەست بە قورسایی لاشەی بێ تاوانەکانی سەر شانم دەکەم، حاخام ناحوم... ئاخۆ ئێستا ئێوە لەکوێ بن هۆ هەردو جگەرگۆشەکەم، ئەی ئەو کەسەی ناوی ناحومت لێ نراوە تۆ لەکوێیت؟! دڵم گوشرا.

- هەر ئێستا دەڕۆم و بەدوایاندا دەگەڕێم.!

کۆمەڵێك دەنگ وتیان:

- نان بخۆ، ئینجا بڕۆ!

پێم داگرت:

- نا، هەر ئێستا دەڕۆم!

میر وتی:

- کەواتا بەبێ من دوو پێت لەمماڵە دەرناچێت!

ئەسمەر وەك پیشەی هەمیشەیی بەتکاکردنەوە وتی:

- کەواتە نان بخۆن و بڕۆن.

خەریك بوو ئاوەزم لەدەست بدەم، وەڵامیم دایەوە:

- وتم دەڕۆم، واتا دەڕۆم. گەر میر نان ناخوات با لەگەڵمدا بێت، ئێوە نانی خۆتان بخۆن و چاوەڕێی هاتنەوەی ئێمە مەکەن.

من و میر عەلی لە ماڵ دەرچووین. بەسەر سوڕمان و واق وڕماییەوە تێی دەڕوانیم. قەت ئاوها بەم بێزارییە نەی دی بووم، ئاخر ئەو منی وا ناسیبوو کە دارمازوویەکی سەختم. کاتێك لە ماڵ دەرچووین سێ بەشی هۆش و ئاوەزم لەدەستدابوو. ڕێگەکەم هەڵەکرد و ناچاربوو لێم بپرسێت کەرووەو کوێ دەڕۆین. هۆشی خۆم گردکردەوەو هەوڵمدا بیرکردنەوەی خۆم ڕێك بخەمەوە، لەپڕ بڕیارم دا کە سەرەتا روو بکەینە ماڵە باوانی، ئەمەش ئەگەری یەکەمە و زۆر جار گەر لە ماڵ دەربچێت سەر لەوان دەدات. خۆ من باخەکەم لێ قەدەغەکردوە، بەڵام بۆچی پێیەکانم ڕێ ناگرن، ئەوە من چیمە؟!

بێگومان ئەم دوو دڵپیە نیشانەی ترسە، ترسی ئەوەی مەزندەکەم دەرنەچێت، خۆ ئەگەر ئیستیرو منداڵەکان لەوێ نەدۆزمەوە هاوار بە ماڵم، هاوار بۆ ژیانی لەمەولام، میر لێی پرسیم کە چیمە، وتم ئەوە خوت خوتەیەکی شوومەو لەوساوە گەیشتمە ماڵەوەو زانیم کە ئیستیرو منداڵەکان چوونەتە دەرەوە، دەستی بە هەڵکۆڵینی هەموو بوونم کردووە. میر عەلی بەشێتی زانیم، کاتێك گەیشتینە ماڵی مەتتیا هۆگۆنەو کچەکەی و دوو نەوەکەیمان لەوێ نەدی، تۆمەتەکەی میر بۆم بوو بە راستییەکی تەواو، باوکی شڵەژا، بەڵام لەگەڵ میردا هەوڵی هێورکردنەوەیان دام و وتی:

- منیش لەگەڵتان دێم، تا لە ئیستیر و منداڵەکان بگەڕێین.

بەڵام دایکی بێ سێ و دوو قسەیەکی کرد، کە گەوجییەکەی ئیستیری بیرخستمەوە...

- ئەوە ئێوە چیتانە، دانیشتنی ماڵەوە هەناسەی سوار کردووە، لەگەڵ منداڵەکاندا دەرچووە تا بای باڵێك بدات. بێگومان ئێستا بۆ ماڵ گەڕاوەتەوەو لەوێ دەیان بیننەوە.

دۆخەکە هی ئەوە نەبوو دایکەکە لەگەڵ کچەکەیدا بەراورد بکەم هەردوو پیاوەکە پێشنیاریان کرد کە بەرەو ماڵ بزڕین، بەڵکو ئێمە ئیستیرو منداڵەکان گەڕابنەوە، پێشنیارێکی لەبارە، بەڵام تەنگەتاوییەکەی من لە ناخمەوە تەشەنە دەکات. هەمیشە لەجۆرە دۆخەدا نادیار لەمیانەی بێزارییەوە تیلماسکە رووناکییەك لە ئومێد دەهێڵێتەوە، کە منداڵەکان و ئیستیرم لە ماڵی باپیریان نەدۆزییەوە بەمەش ئومێدی یەکەمم لەگەڵ ئاوەزمدا لەدەست چوو. ئەی ئەگەر گریمانەی دووەمیش بەهیچ دەرچوو بەتایبەتی وا کات بێ بەزەییانە تێدەپەڕێت؟ لەگەڵ ئەوەشدا ملم بۆ پێشنیارەکەیان کەچ کردو هەر لەخودا دەپاڕامەوە. پاڕانەوەیەك لەگەڵیدا دڵم دەکەوتە لەرزین. هەمیشە ئەوەم زانیوە گەر کارەساتێك رووبدات، ئەوا دوعاو پاڕانەوە هەموو دنیا دادی نادات. ئیدی زاناو حاخامەکانمان وایان فێرکردووین، شتگەلێ لە بوونمدا دەیان رووژاندم و شێتیان دەکردم، هەوڵم دا ئەم شێتییە یاخییە لە رەگەوە دەرهێنم، ئەگەر لە ماڵەوە دیتبام نایا لە سۆنگەی ئەوەی ژیانی خۆی و منداڵەکانی خستۆتە مەترسییەوەو ئەو هەموو تەنگژەیەی بۆ دروست کردووم، سزام دەدا؟ ئاخۆ بەو بۆنەیەوە

سوپاسی خودام دەکرد کە بەسەلامەتی گەڕاندوونییەوە، لێم دەبووری؟ هێ رۆڵەکەم ناحوم چەند پەرۆشم لە ئامێزت بکەم؟ ئەی تۆ هێ ئیستیری بچووکم چەند ئەڵهای ماچی روومەتە سوورەکانت دەکەم کە هەندێك جار پیسیشیان دەکەیت؟ خۆزگە ئەم خەونەم دەهاتە دی. هێ ئیستیر، بەڵێنم داوە کە لەسەر ئەوەی بەخۆت و منداڵەکان و بە هەموو ماڵەکەت کرووە، سزات نەدەم، گەر ئێستا لەوێ بتدۆزمەوە، سزات نادەم. خودایە، تۆ ئاگادار بە کە نیازم وایە ئەمە بکەم و ئەوەی بێنمەوە یاد کە مەترسی لە دەرەوە لە بۆسەدایە، ئاگاداریشی بکەمەوە نەچێتە دەرەوە تا بروات بۆ...

بەڵێ باوکی سەلمان، وا رووخسارت هەڵدەبزرکێت و دەنگت دەنووسێت. چەندین جارە ئەم حەکایەتە بێزاز دەکەیتەوە؟!

دەپرسم ئاخۆ بۆ چرکەیەك لە ژیانت جیابووەتەوە؟! ئایا بیرەوەرییەکانی سابلاخ بەرۆکیان بەرداویت، لەکاتێکدا تۆ لە بەغدا ئاو دەستی ئینگلیزو هندییەکانت پاك دەکردەوە، خۆ تۆ لە سابلاخ بازرگانێك بوویت و ناوبانگی باشت لەپێش خۆتەوە دەڕۆیشت و خەڵکی رێزیان دەگرتیت؟ ئەو دەمەی تۆ لە هیندستان بەدوای ئەوەدا دەگەڕایت کە دەوڵەمەندییە لەدەست چووەکەت بەدەست بێنیتەوە، دوای ئەوەی لە بەغدا دەرکرایت، تۆ لە تاران لە هەوڵی ئەوەدا بوویت بۆ بەغدا بگەڕێیتەوە، تا سامانەکەت دەست بکەوێتەوە، تۆ لە رەمات سەردەمی پیری و دوا قۆناغەکانی تەمەنت تێدا بەسەر دەبرد؟! ئەوانە بیرەوەریگەلێکن وەك خاڵی کوتراوی سەرجەستەتن، چون نیشانەیەکی زگماك، وەك خاڵی کوتراو، شتهایەکن تا ناو گۆڕ لەگەڵ بنیادەمدان. ئای چ دەردو ئازارێکە! کەواتە لێم گەڕێ با جارێکی دیکە بەرەو ناو دەمی ئەو بیرەوەرییە پێکداچووە پڕگڕاوە شۆڕت بکەمەوە.

بەڵێ، باخەکە!

ئایا رێی تێدەچێت دوو منداڵەکەی بۆ باخەکە بردبێت؟!

بەرەو مەترسی مەرگی پەلاماردەر، بۆ شوێنی قەدەغە کراو و پڕ مەترسی دەرەوەی شارۆچکەکە؟ دوو هۆکاری کاولکەر ململانێت لەگەڵ دەکەن؟ شێتییەك چۆن گایەکی هەڵچوو لەپەت رەها بێت، ترسێك لە حەناس هەموو ئەو وزەیەی کە لە هەڵچوونی

شێتییەوە پەیدا دەبێت، هەڵوەستەت کرد. ویستت بڕۆیت، کەچی لە شوێنی خۆت وشك بوویت، گەرووت وشك بوو، داوای ئاوت کرد، دوای ئاوخواردنەوە شێتییەکە دامرکایەوە، خەریك بوو بەدوو پیاوەکە بڵێیت (بمگرن!) لەراستیدا پێت وتن (وازم لێ بێنن!) ئەوان لە ترسی ئەوەی بکەویت، گرتبوویانیت. ڕەنگە لە ترسی ئەوەش بووبێت کە لە تفەنگی شێتبوونەکەتەوە گوللەیەکی گڕدار بەرەو باخەکە بتەقێنێت!

- بەرەو باخەکە! بێگومان ئەو شێتە بۆ باخەکە چووە!

ئەسمەر وەك هەموو جارێك لێت پاڕایەوە، بەڵام ئێستا لە ترسان هەڵدەلەرزی.

- تۆ لە بەرەبەیانەوە هیچت نەخواردووە، هاوکارەکەشت نیوەڕۆژی نەکردووە، ڕەنگە خەزووریشت هێشتا نانی نەخواردبێت، نیوەڕۆژە بکەن، ئینجا بڕۆن. بە قوربانت بم بەبێ نان خواردن مەڕۆ!

بەدەنگێکی تێکشاو و لاوازەوە وتم:

- تا منداڵەکانم و ئیستێر نەدۆزمەوە هیچ ناخۆم!

لاوازییەکەت بەری لە شێتییەکەت گرت، شێتییەکەشت غایلەکانتی دوور دەخستەوە. لەوساتەدا هاوەسەنگیت سەیرترین شت بوو، دوو پیاوەکەش لە ترسی جڵەو لەدەستدانت، یان لە ترسی بیرکردنەوەکانت گرتبوویانیت. بەم جۆرە هەرسێکتان بەرەو باخەکە کەوتنە ڕێ. ئەوە دوا ئەگەرە، دوا ئومێدەو ئەم ڕێگەیەش کەبەرەو دەرەوەی شارۆچکەکە دەڕوات، پڕکەندو کۆسپ و پێچاوپێچ و نیمچە چۆڵەوانییە، سەربازانی عوسمانی چەکدارن و لەتخووبی ئاوەدانییەکە دەسوڕێنەوەو ئێشك دەگرن.

ئەوە باخەکانە، ئا ئەمەش باخەکەی تۆیە و لەدوور رادیارە، لێرە، لەم شوێنەدا قسەکەم پێ دەبڕیست، ڕەنگ هەڵبزڕاکاو ڕووخسار تێکشکاو، لەفکران ڕۆچوو، لەبەرخۆوە بڵمە بڵم دەکەیت، دەنگت نزمتر دەکەیت، تا دەبێتە چپە دوو، لێ بەریتمێکی یەکلاکەرەوە دەڵێیت:

- چیرۆکە ڕاستەقینەکە لێرەوە دەست پێدەکات، ئیدی نە ڕۆژگارو نە تۆ مافی گێڕانەوەتان نییە، ئێوە جگە لە شایەتحاڵ و گوێگرێك پتر نین، من خاوەن مافم، منم لەگەڵ ئەزموون و ئازارەکەم ژیاوم.

لەگەڵ ئەوساتانەدا ژیـام و ئەمیـستاش لەگەڵیـانـدا دەژیـم، وەك دەیـان و سـەدان چرکەو سەعات کە نامرن و نابنـە تـەنها بیرەوەرییـەك بگێڕرینـەوە، بـەڵکو ئەوانـە هەڵوەستە گـەلێکن و لـەبیرم ناچـنەوە و لـە هـەموو چـرکەیەکدا زینـدوو دەبنـەوەو هەناسەدەدەن و لە قووڵایی خۆیاندا قەتیسم دەکـەن. ئـەوەتا ئـەو رابـردووە بەهـەموو وردەکاری و هەست و بیرو ئازارەکانییەوە دەبێتە ئێستا.

من ئێستا وا لەگەڵ ئەو کاتەی ناو باخەکە دەژیم، جار لەدوای جار نەختە هیوایەك شێتی و هۆشم دەسمێت، فێڵ لە هەستە رەش هەڵگەراوەکەم دەکات، هەستی راپـەڕیوم لەنێو پێچەکانی بارە قورسەکەمدا، هەست و هۆشی پێشبینی کەرم بە کارەسات حـۆڵ دەکات، من واخەریکە دەنگ هەڵبڕم و هاواری بێزاری بکەم و پێش روودانی کارەسـات و کۆستکەوتنەکان بکەوم. دەڵێم پێش روودانـی کارەسـات و کۆسـتکەوتنەکان، ئـاخر لەوەتەی بێگانەکان بەهەردوو لایان دەستیان بە راکێش و بکێشمان کردووە، بێجگە لە کارەسات هیچ شتێکی تر لە ئارادا نەماوە!، بەڵام خۆپەرستی سنووری بۆ نییـە، بۆیـە کۆستکەوتن و کارەسات چەند پلەیەکیان هەیە، هەرچەندە هەموویان لەیـەك دەچـن، لەگەڵ ئەوەی من جەستەو لاشەی ساردەوەبووی ئازیزانم بەشان هەڵگرت و بۆ هیـچیان فرمێسکم نەرشت. چاوانم بوون بە دوو کوێرەکانی و وشـکیان کـرد، هەسـتم بـوو بـە بەراوێك و هەڵچوون و شێتییەکەمی فێنك دەکردەوە. ئێستا وا لە ئامێزی سروشتداین، سروشتێك کە رۆژێك لە رۆژان دڵڕفێن و جوان بوو. باخەکە کە هێمـای بەخـشندەیی و جوانی بوو، ئەمیـستا وەك چۆڵەوانییـەك خۆی نیشاندەدات و مـەترسی تێـدا نیـشتەجێ بووەو هەر هەنگاوێك بە قووڵایی چاڵێکی سامنـاکدا رۆ دەچێت،... ئینجا دەنگی هاوارە گێلانەکەی دێت...

ئا ئەوە سێ پەڕۆکۆنی مرۆیین و لەژێر درەختێك کەوتوون، پەڕۆکۆنێکی گەورەو دوو پەڕۆکۆنی بچووك، هەموو خلتانی خوێنن و لە پەڕۆی بێ نوێژی دەچـن. هاوارەکـە وەك رەشەبا هـەڵیکرد، وەك گـەردەلوولێکی لـوول خـواردوو لەدەسـت دوو پیاوەکـە خـۆم راپسکاند، بەسەر پەڕۆکۆنە خۆشەویستەکاندا نوشتامەوە! نـاحوم! نیـستیری بـچووك! دایکتان! ئاخۆ کەسێکتان هەناسەی تێـدا مـاوە، ورد وری ژیـان، رۆح؟! دەسـتەکانیانم

بەرز کردەوە، ئینجا دەستم لێ بەردان و شلَپ کەوتن، تەنها پـەڕۆ کـۆنن، زۆرتـر خـۆم بەسەریاندا نوشتاندەوە، گوێم نا بەسینگی یەك لەدوای یەکیان، هەناسە بڕکێمەو هیچ ناژنەوم، نەترپەی دڵ و نەهەناسەیەك، ئەریّ من بۆچی وادەکەم، ئـاخر هـەموویان وەك بەرخ سەربڕراون؟! هاوارو فیغانەکەم نابڕێتەوە، ئیدی ئەو شلۆمۆ کەتانییە نەبووم، کە لەوەتەی خۆم ناسیوەتەوە، نەمزانیوە گریان چییە، وەك ئـازیز مردەیـەك دلّدانـەوە رەت بکاتەوە، لە سەڵای گریانم دا، فرمێسکەکەم تێکەڵی خوێنی جگەرگۆشەکانم بوو. لەپڕ بوو بە سەردولکەدادەرێك لە پرسەدا شین بگێرێت... چۆن شین و شەپۆڕێك!

ئەی خودایە! چۆن قایل بوویت؟ چۆن قەبووڵت کرد؟ سێ ئەندام لـە جەسـتەم، لـە دڵم، جەرگ و گورچیلەم خەڵتانی خـوێن بـن؟! ئایـا دڵێکـت بـۆ هێـشتوومەتەوە تـا برینەکان سارێژ بکات؟ خۆم دەپارێزیت و بە ئازیزترین کەسم کۆستم دەخەیت؟! ئیـدی دوای ناحوم و ئیستیری بچووك و دایکە کاڵفام و گێلەکەیان من چ سـوودێکم هـەس؟! هۆ ناحوم، ئەی رووناکی دیدەم، چۆن لەژێر خاك بتشارمەوەو کرم بتخـوات؟ ئـاخر تـا دوێنیّ دنیات بۆ پڕوئاوەدان دەکردمەوەو لەگەڵ خوشـك و براکانتـدا بـەراکردن بـۆ لام دەهاتیت و خۆت بە قاچەکانمەوە دە ئاڵاند و هەموو خەمی سەرشانم لەو ساتەدا سـووك دەبوو. باوکە خۆشت دەوێم؟ بە زمانێکی تازە گڕوگاڵ کردوو لـێم دەپرسـیت، ئـەی تـۆ بەچاوی روح نام بینیت کە چۆن خۆشەویستییەکەت کوشـتمی و ئەمێـستا لەبـەردەمم راکشاویت، نە قسە دەکەیت، نە تووڕە دەبیت، نـە پێدەکـەنیت و نـە دەجووڵێیتـەوە؟! بەڵێ، هۆ جگەرگۆشـەکەم خۆشمویـستیت. لەوسـاوە کـە بـە نـاوی پیـاو چـاکەخوازو راستگۆکەوە ناوم نایت، بەدوو جۆرە خۆشەویستی خۆشمویستیت، لەوساوە تـەنها کـوڕم نەبوویت، لەبەرچاوم لەمە زیاتر بوویت، ئەوم لەتۆدا دەبینی و روحم دەکەوتە شنەشـن، تەسەللام دەهات و پێیم دەوت، بەم روحەم دەوت (حاخـام نـاحوم نـەمردووە، کوڕەکـەم لەودا بەرجەستە بووەو لە ماڵەکەمدا دەژی!). ئەوەتا هەردووکیان کۆچیان کرد، پیـاوە خواپەرست و راستگۆکە و منداڵەکە کە بەناوی ئەوەوە ناونراوەو بەشێکە لەخودی خۆم! ناحوم! هاوارێك خەریکە لەگەڵیدا روحم دەردەچـێت تـا بگاتـە روحـی کیژۆڵەکـە لـە ئاسمان. تۆ هۆ ئیستیری بچووك و بـێ تـاوان و بێگـەرد لـە هـەموو گوناهێـك! تاقـە

گوناهی تۆ شادمانی منداڵێك بوو كە لە دنیای ستەمكاریدا كەس بەزەیی بە منداڵیدا نایەتەوە! تۆ گاگۆڵكەت دەكرد، تەنانەت فێری رۆیشتنیش نەبووبوویت، زمانت نەپژابوو، زارت بە وشەی ناشیرین و خراپەكاری پیس نەبوو بوو، نە قسەیەكی خراپ و نەباسێكی بۆش و بەتاڵ، تەنها شتێك كە فێری بووبوویت وتنی وشەی (باوكە)بوو، ئەو وشە شیرینەی كە لە تاریكترین ساتدا خەمەكانمی دەڕەواندەوە، بۆ چركەیەك، خولەكێك باری قورسی سەرشانمی سووكدەكرد، ئەوەی لەبیرم دەبردەوە كە هەموو دنیا لەسەر شانی منە، ئەوەتا لەبەردەمم راكشاویت و لەنێو خوێنی خۆتدا مەلە دەكەیت، ترس لە چاوەكانتدا مەبیوە، وا بۆتم لێك نان، من داوای فریاد رەسێك دەكەم و بەرگەی هاواركردن ناگرم! ئاخۆ ئێستا روحەكەت لە كوێ بێت هۆ دڵە سەر براوەكەم؟! ئایا ئەم روحە چون چۆری شیر سپییانە بەرەو بەهەشت دەڕۆن، یان وەك هەندێك دەربارەی رۆحی كوژراو و غەدرلێكراوان دەڵێن گوایا بەسەرگەردانی دەمێننەوەو ئازار دەكێشن، یان ئێوە هەردووكتان ناحوم و تۆ هەر لە گۆڕەكانتان دەمێننەوە تا بۆ ماوەی ساڵێك نزای قەدیشتان بۆ بخوێنم و روحتان لەو گوناهانە پاك بكەمەوە كە نەتانكردووە، تا لەدنیا نوێیەكەتاندا ئاسوودە بن؟!، بەڵام تۆ هۆدایكی دوو جگەرگۆشەكەم، بێگومان روحی تۆ ئاتاجی ئەو قەدیشەیە، تا ئەوگوناهانەی بەبێ ویستی خۆت، بەدەستی گێلی و دەبەنگی كراوە، بشواتەوە، ئایا تۆیەك وا بەمردوویی لەبەردەممدا راكشاویت، لێپرسینەوەت لەگەڵدا بكەم؟ ئایا گوناهی كوشتنی دوو منداڵە خۆشەویستەكە بخەمە ئەستۆی تۆ، لەكاتێكدا لێپرسەرەوە هەر خودا خۆیەتی؟ من بەڵێنم بەخۆم دابوو كە تامردن لێت خۆش نەبم، بەڵام ئەفسووس وا مردنی تۆ دەست پێشخەری كردو تۆ شایانی لێبوردن و لێخۆشبوونیت، وا لەبەردەممدا سارد بوویتەوەو هێشتا لە هەرەتی لاوێتیدایت و دوو منداڵی كلۆڵت لێكەوتەوەو هێشتا نەگەیشتوویتە تەمەنی بالق بوون. هێشتا عەقڵت كامڵ نەبوو بوو، بەڵام رۆژێ هەردەهات، گەر ژیابایت تا پشتت كوڕ دەبووەوە چاوانت كز دەبوون و گۆچانت بەدەستەوە دەگرت، ئەوسا عەقڵت هەر كامڵ دەبوو (قەدیش) و ئەم نزاو پاڕانەوەیەی من ئاخۆ بەشی چەند مردوو كبات كەوا بۆ گیانی باوكی ئەڵماس دەستم بەخوێندنی

کرد؟ ئەی لەو نوێژو پاڕانەوەیەمان چەندی بۆ گیـانی مردووکـانی سـابلاخ لـێ زیـاد دەبێت کە لەوەتەی ژیانی ئاسوودەتان لێ شواندو کردتان بـە شـین و شـەپۆڕ و خـەم و کۆستکەوتن، چونکە پێتان خستە نێو ولاتەکەمان و وەك مـاڵێکی بـۆ دزو خوێنرێـژان حەڵاڵ کراو پەلامارتان دا؟!

هەردوو پیاوەکە بەبێ دەنگی دەگریان، یەکێکیان بۆ دوێتەکەی و هەردوو نەوەکەی، ئەوی دیکەش پێدەچێت بۆ من بگری، منی لاڵ و سەرسەخت وەك درەختی مازووی چیا، دەتوێمەوەو دەبمە شلەیەکی گەرم و خۆم خۆم دەسووتێنم. ئـاخۆ کاتەکـە وەك دابـارینی فرمێسکەکانم و بوونی تواوەم دەڕوات، یـان وەك دڵـی بکـوژان رەق و وەسـتاوە؟ دەبـوو هەست بە کات بکەم تا بواری ئـەوەم هـەبێت جگـەر گۆشـەکانم بـە خـاك بـسپێرم و سروتەکە شایانیـان بێت، تا بتوانم بلاوی بکەمەوە دە زەلامێك گرد بکەمەوە، بۆ ئـەوەی بتوانم لەسەر گۆڕە هەڵکەندراوەکانی ئەم لاشە ئازیزانە (قەدیش) بخوێنم، ئەم جەسـتە بەنرخانە! ئای چەندین گۆڕ لە قووڵایی خودی خۆمدا خۆشەویـستانم لـێ ون دەکـەن و دەشارنەوە؟

(هەردوو ئیستیر) و (هەردووناحوم) دوا کارەسات و زیرەکی نێو زیرەکان. ئەم دڵـە کە چەند شانازیت بـەهێزو خۆراگرییـەوەی دەکـرد چـی لێهـات؟ یـان ئـەمیش بـوو بەگۆڕستانی خۆشەویستان و ئازیزانم؟ ئەو گۆڕانە تەنها جەسـتەکانیان تێدایـە، بـەلام روحەکان هی پەروەرێنی خۆیانن و بۆلای خۆی بردنییەوە، ئیدی بەویـستی خـۆی چـیان لێدەکات دەیکات. چاوەکانم بەخوڕ رۆندکیان باراند، ئینجا چکیان کرد، چاوەکان هـەر وا بەوشك کردوویی مانـەوە، تـا لـە تـالان و برۆکـەدا ئەسـەر خـۆی کـردە قوربـانی جولەکەکانی بەغدا، چونکە لەوێ لە پێچەکانی مەرگدا بەدوای مندا دەگـەڕا، ئیـدی لەو رۆژەدا دووبارە چاوەکانم فرمێسکیان تێدا ژیایەوەو بەهەموو هێزێکییەوە هـەڵقولا، کاتێکیش فرمێسك وەستا خوێن بەربوونی دڵ جێگەی گرتەوە، ئیـدی خۆنوشـتاندنەوەم لە چاوان ون دەکات. خۆشەویستانم لەوێ رادەکشێن و خەرمانەیەك لـە غـەم دەوریـان دەدات و جێیان ناهێڵێت و تا مردن لەگەڵیاندا کۆم دەکاتـەوە، ئـای لـە خۆشـی ئـەو چرکەساتە!

## کایەی حەوتەم تا سیانزەیەم و قاتوقڕی سابڵاخ

من هیچ بەدەستم، ملم نایە مەترسییەکانەوەو دڵم نەلەرزی، خۆشەویستان و دۆستانم یەك لەدوای یەك ناشتن، دڵ لە جیاتی ڕۆندکێن چاو خوێن دەدەڵێنێت. دەکەوم و هەڵدەستمەوە، ئەمڕۆ ماڵناواییم لە سێ ئازیزو جگەر گۆشەکرد، پاشماوەی خۆڵی گۆڕەکانم لە دەستەکانم تەکاند و بەرەو ماڵ گەڕامەوە، برادەرانم هاوکاری ناشتنەکەیان کرد، کاتێك بیرم لە گریانە بێ بڕانەوەکەی ئەسمەرو منداڵە خەمبارەکان بۆ براو خوشکەکەیان کردەوە، بێدەنگ بووم و بیرم کردەوە، نەخێر! من هیچم بەدەست نییە. ڕەنگە دوو منداڵەکە و ئیستر خەونێك بووبن و لە خەونێکی خۆشدا ئەسمەر پێشکەشی کردبن، ئینجا خودا ویستی لەنێوان هەردوو دەستمدا هەڵیان بگرێت و بۆ لای خۆی بیان باتەوە، من وڕێنە دەکەم! وا کارەساتەکانم زۆر بوون، لێ ئەمە کارەساتی منە، کارەساتێك بەقەد هەموو دنیا، وڕێنەیەك لە وێنەی وڕێنەکانی دنیا، مێر بێدەنگە. براکانم و دۆستانم لەدوای ڕێ و ڕەسمی سەر قەبران، سەرووتی کەنیسەیان بۆ ماڵی ئێمە گواستەوە، تا بواری ئەوەم بۆ هەڵبخەن ماوەی حەوت ڕۆژەکە لە پرسە دابنیشم.

کە گەیشتینە ماڵەوە سێ لە ئازیزترین کەسانی خێزانەکە کەمیان کردبوو. ئەسمەر بەخەمێکی قووڵەوە ئامێزی بۆ گرتمەوەو عەسری چاوەکانی چون باران دابارین، لەکۆتاییدا وەك ئەوەی گلەیی لە خۆی بکات و هاوکات داوای لێبوردن بکات، بە هەنسکەوە وتی:

- هەوڵم نەدا ڕێگە لە خوالێخۆشبوو بگرم تا نەچێتە دەرەوە بۆ ئەوەم بوو پتر کێشە بۆ تۆ دروست نەبێت!

سەرم بادا و هەناسەیەکم هەڵکێشا، لەکاتێکدا گریان بینی گرتبوو، وتی:

- بۆ ئەمە چۆن لەخۆم خۆش دەبم؟ دەبوو ڕێگەم لێ گرتبا، ئیدی خوای دەکرد پارچە پارچەی دەکردم!

خۆم ڕاگرت و لەبەر خۆوە بڵمێکم کرد:

- ئەسمەر لەسەر شتێك کە ویستی خودای لەسەر بووە، لۆمەی خۆت مەکە!

لەسەڵای گریانی داو وتی:

- ویستم بەختەوەرت بکەم، بەڵام لە ئەنجامدا ئێش و ئازارم بۆ هێنایت، باوکی سەلمان، پێم بێژە چۆن خەمەکانت لێ دوور بخەمەوە؟

لەگەڵ دەنگ و زرمەی تۆپەکاندا کە لە دوورەوە دەهات وڕە وڕێکم کرد:

- ئەسمەر، ئازاری خۆت مەدە، خودا ئەم بەڵایەی بۆ ناردووین، هەر ئەوە داویتی و هەر ئەویش بردییەوە، دەبا ناوی خودامان بە پیرۆزی لەبیر بێت.

ڕووسەکان خەریکە نزیك دەبنەوە و سبەینێ دەگەن، دوێنێ نوێژیان نەکرد، خودا مەیلی لێ بوو کە پێش گەیشتنی ئەوان ناحوم و هەردوو ئیستیر بنێژم، کە سبەینێ ڕووسەکان دەگەنەجێ هەر ئەوەندە پشوویەك بدەن، بۆ لام دێن و لە دانیشتنی پرسەکەم هەڵمدەستێنن و لە ماڵەکەی خۆم دەرم دەکەن و بۆ دەرەوەی شارۆچکەکە دەم بەن، بۆ نزیك باخی کۆستکەوتنەکە، یان بۆ نزیك گۆڕستانەکەم دەبەن. لەوێ دادگایەکی سەربازی بۆ دادگایی کردنم ساز دەکەن و بەغایەن تۆمەتبارم دەکەن، لێیان دەپرسم گوناهم چییە دەڵێن: (تۆ لە ماڵەکەی خۆتدا موسڵمانەکان دەشاریتەوەو داڵدەیان دەدەیت و داوات لە هەموو جوولەکەی سابلاخیش کردووە کە لە ماڵەکانی خۆیاندا موسڵمانان حەشار بدەن، بۆیە تۆ بە خیانەتی تۆمەتبار دەکرێیت و دادگای سەربازی بەناوی خاوەن شکۆ ئیمپراتۆر نیکۆلای دووەم بڕیاری دا لە سێدارەت بدات و لە شەرەفی مردن بەگوللە باران کردن بێبەشت بکات. ئیدی بەرەو قەنارە پەلکێش دەکرێم و سەرم دەخرێتە نێو کیسەیەکی ڕەش و تاریکی هەتا هەتایی دەورم دەتەنێت، پەتەکە فشار

دەخاتە سەر بینە قاقام و گەردنم، گەواهی بۆ تاك و تەنهایی خودا دەدەم، پێش ئەوەی دوا هەناسە بدەم یادی خۆشەویستانم دەکەمەوە، ئینجا خۆم ئامادەی مردن دەکەم، کەچی لەناکاو دام دەگرن و غایەنییەتییەکەم بۆ قارەمانێتییەك دەگۆڕێت کە شایانی میدالیای مرۆڤایەتییە، چونکە جیاوازی لەنێوان مرۆڤێك و مرۆڤێکی دیکەدا نییە، ئێ منیش ئەم میتۆدەم بە بڕوایەکی ڕەهاوە جێبەجێ کردووە. ئا ئەوە میدیالیاکەیەو تا دوا هەناسەم دەیپارێزم، بەڵام بۆچی هەردوو منداڵەکەم و ئیستیر بکوژرێن؟! ئەی بۆچی کوشتنی بێ تاوانان لە سابلاخی بێوەی و داماو هەر بەردەوام بێت؟ ڕەنگە ئەم پرسیارەم ئەوەندە لە بۆش کردبێت سوابێت، هەروەها دانیشتوانی ئەم شارۆچکەیە ئەوەندە ئەم پرسیارەیان کردووە زمانیان کول بووەو وەڵامێکی دروستیان دەست نەکەوتووە...

لەوە دەترسام کە شەڕی بەرپابوو ڕێگە لە نوێژکەران بگرێت و لەکاتی نوێژەکاندا نەگەنە ماڵی ئێمە، کەچی خۆشەویستییان بۆ من مەزەندەکەیان پووچەڵ کردمەوە و ئەم ترسەمیان ڕەواندەوە. فاتمە لە ئامادەکردن و پێشکەشکردنی کێك و چای و قاوە بە میوانانی نوێژکەر بۆ گیانی مردووە تازەکانمان، یارمەتی ئەسمەر و قەشەنگی دەدا، شەوو ڕۆژ خەمی ئەڵماسی کلۆڵم بوو، بە ئەسمەر وت:

- ئەسمەر، ئەڵماس لەبیر مەکە، با قەشەنگ لەکاتی خۆیدا خواردنی بۆ ببات و وەك جاران لە شوێنی خۆی دای بنێت.

بیر لە عەزریا زێڕنگەری باوکی دەکەمەوە، بیر لە حاخام ناحوم دەکەمەوە، بیر لە هەموو کوژراوەکانی سابلاخ دەکەمەوە، هەموو بەبێ تاوان کوژران، بەبێ هۆلە ناخافڵدا مردن. لەهەموو ئایینەکان و لەهەموو تەمەن و هەموو ڕەگەزێك یەك لەدوای یەك نار کۆدەبنەوەو لەیادەوریمدا قەرەباڵغییەك دروست دەکەن، ئەمانە دو وشت کۆیان دەکاتەوە، ڕۆڵەی سابلاخن ودووەم هیچ گوناهێکیان نەکردووە، ڕوویان تێدەکەم و نوێژی مردوو (قەدیش)یان بۆ دەکەم، چۆن ئەمانە لەمەودای بینینی چاو بوون بەشوێنەوار؟ پرسیارێکی سامناکەو وەك قەمە هزرم دەسمێت و کونی دەکات، جەستە دەکەوێتە لەرزین و نیگام ئامبازی منداڵەکان دەبێت، دەیان بینم لەگەڵ کوڕەکانی

هاوکارەکەم وازی دەکەن، بەڵام نازانم ئاخۆ بەڕاستی لە کۆستەکەمان تێگەیشتوون، یان پرسەکەمان و نان دان بە و نوێژکەرانەی کە بەدرێژایی هەفتەی پرسەکە لە ماڵی ئێمە کۆبوونەتەوە، بە ئاهەنگێك وەك ئاهەنگی جەنگ و کاولکارییەکەی دەزانن، ئاهەنگێکی دووبارە بووەوە، بە خەمێکی قووڵ و نادیار کە بڕێکجار بۆیان دەبێتە مایەی خۆشی، بەڵام سەلمان ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی حەوت ڕۆژەی پرسەکە من دەبینێت وا لەگەڵ باوك و دایکی ئیستیرو براو خوشکەکانی لەسەر زەوی دانیشتووم و جلەکانم ناگۆڕم و ریشم ناتاشم و خۆم ناشۆم، دەبینێت نوێژکەران بۆ لای من دێن و من بۆ کەنیسە ناچم، بەترسەوە بۆ لام دێت و کۆمەڵێك پرسیاری جۆراو جۆری پێیە، ئیدی لەجیاتی براو خوشکەکەی و کوڕەکانی میر لێم دەپرسێت:

- بۆچی خەڵکی دێن و لێرە نوێژ دەکەن؟ بۆچی لە ماڵەوە دەرناچیت و شوێنەکەی خۆت بەرنادەیت و هەر لەسەر زەوی دادەنیشیت؟ بۆچی ریشت ناتاشیت؟ بۆ جلەکانت ناگۆڕیت و...؟

دوودڵە، زات دەداتە بەرخۆی و لەسەر پرسیارکردن دەڕوات:

- ئایا ئیتر ناحوم و ئیستیری بچووك و دایکیان ناگەڕێنەوە؟ ئەی بۆچی دایکم و هەموو ژنەکان هەموو کاتێك هەر دەگرین؟!

دەزانم ئەو شتێك دەزانێت، وا گەورە بووەو لە باوەشی ئەم جەنگەدا چاوی کردۆتەوەو وەڵامێکی وەرنەگرتووە، وەڵامێك نزیك لە ئەفسانە، دەبوو بەچەشنێك قسەی بۆ بکەم وەك چۆن پیاو قسە بۆ پیاو دەکات، هەرچەندە هێشتا تەمەنی بچووەکە با ئەم شتانە بە خوشك و برا بچووکەکەی و کوڕەکانی میریش بڵێت، چونکە ئەوان بەچاوی خۆیان مردنیان بینیوە، چەندین جار لە شێوەی جەستەی ساردەوە بوو بینیویانە من بە کۆڵ و لەسەرشان هەڵمگرتوون، بە سەلمانم وت:

- هەموو ئەوانەی دەیان بینیت لەپێناو خوشك و براکەت و ئیستیرە.

بەدەنگێکی ناسك پرسی:

- ئەوەی بەسەر ئەواندا هاتووە، چییە؟

بە دەنگێکی خنکاوەوە وتم:

- کوڕەکەم، ئەوان مـردن، مـردووش ناگەڕێتـەوە...، وەك ڕەزاو عـەزریا زێڕنگـەرو حاخام ناحوم.

- باوە، چۆن مردن؟!

- کوڕەکەم، سەربازی بێگانەو غەوارە کوشتیانن!

- ئەی شتێکیان کردبوو، بۆیە سەربازی بێگانە کوشتنیان؟!

- نەخێر کوڕەکەم، هیچ شتێکیان نەکردبوو کە شایەنی سزا بێت.

- ئەگەر شتێکیان نەکردبێت کە شایەنی سزا بێت، ئیتر لەبەرچی کوشتیانن؟!

بێدەنگی کردم، من هەمان ئەم پرسـیارە لـەخۆم دەکـەم و ڕۆڵـەکانی سـابلاخیش ڕۆژانە ئەم پرسیارە دەکەن، بەڵام وەڵامێکمان دەست ناکەوێت.

- کوڕەکەم، خۆزگە دەمزانی، بەڵام منیش وەك تۆ لە خۆم دەپرسـم: بۆچـی ژنێکـی جحێڵ و دوو منداڵ دەکوژن، هەر لەبەر ئـەوەی بـۆ هـەوا گۆڕینێـك بـۆ باخەکـەمان چوون؟!

ئاواتەخواز بووم بەوەندە پرسیارەی کە کردی دابکەوێت و وازم لێ بهێنێـت، کەچـی کەمێك بیری کردەوەو لێی پرسیم:

- ئەی ئێمە سەربازمان نییە تا لەسەرمان بکەنەوەو بێگانە لێرە دەربکەن؟!

وتم:

- سەربازەکانمان لە تارانن، هیچ سەربازێك لە سابلاخ نییە، تا لەسەرمان بکەنەوە.

سەلمان لە پرسیارکردن بەردەوام بوو:

- ئەی بۆچی لە تارانەوە نایەن تا بمانپارێزن؟

- چونکە ئەوان ئەگەر بـۆ پاراسـتنی ئێمـە بـێن، گەرەکـە لەگـەڵ بێگانەکانـدا بجەنگێن، ئێ شای ئێمەش ئەوەی گەرەك نییە.

بە ناقایلییەوە وتی:

- بۆچی گەرەکی نییە؟ ئەی ئەرکی ئەو پاراستنی ئێمەو نیشتمان نییە؟!

پرسیارەکانی سەلمان زیرەکانەن، لێ ئالۆزن. پێم وت:

- رۆڵەکەم، شتەکە وا ئاسان نییە، گەر شا سەربازەکانی بۆ پاراستنی ئێمە رەوانە بکات، ئەوا جەنگەکە سەرتاسەری ئێران دەتەنێت، ئەوسا لێ دەبڕێت پارێزگاری هەموو خەڵکی ئێران بکات و شەڕی دوو دەوڵەتی مەزنیش بکات، کە هەردووکیان دۆستی ئێرانن و...

- باوکە، ئەی ئیتر؟

- هەندێك شت هەن تۆ تێی ناگەیت، هەروەها ئێمەی گەورەش لێی تێناگەین، بەهەرحاڵ هیچ شتێك بەبێ ویستی خودای میهرەبان روونادات!

- سەلمان لەم پێچ و دەورەیە راما، ئینجا لێی پرسیم:

- ئایا ئەمە وا دەگەیەنێت کە بیانییەکان ناحوم و ئیستیری بچووك و دایکیانیان کوشت، چونکە خودا ئەوەی ویستووە؟

ئەمە ئاسانترین وەڵام و چارەسەرە...، ئەی بۆ هەر لەسەرەتاوە رێگاکەم قەدبڕ نەکردو بە سەلمان بڵێم (خودا بۆلای خۆی هەڵی بژاردن، چونکە ئەوەی ویستووە) و ئیدی واز بێنم و خۆم لەم پێچ و بەدەورەیە دوور بخەمەوە، کە سەلمانی کوڕە گەورەم تووشی کردم؟!

سەرم بادا، شەپۆلێکی سەختی غەم هەناسەمی گرت و هەوڵم دا بەر لە خنکانی دەنگم بگرم:

- بەڵێ کوڕەکەم، بەڵێ، چونکە هیچ شتێك بەبێ ویستی خودای گەورە روونادات!

بەڕاکردن رۆیشت، خۆم هاویشتە نێو ململانێی خەمێکی تازەوە، جڵەوم بۆ هزرە شێتبووەکەم شۆڕکرد. نەخێر! خۆم تووشی لەرێ لادان نەکردووە، ئەی خودا خۆی رێی چاکەو خراپەی بۆ دەست نیشان نەکردووین تا یەکێکیان هەڵبژێرین؟ ئێ بۆیە منیش بەپێچ و دەورە وەڵامی دوا پرسیاری سەلمانم دایەوە. بەمەش خودا سەربەستی هەڵبژاردنی پێ داوین، ئەگەر ئیستیریش لەگەڵ دوو ئازیزە بچکۆلەکەدا دانیشتنی ماڵەوەی هەڵبژاردبا، ئەوە ئێستا من لە پرسەکەیان دانەدەنیشتم! هەردوو منداڵەکەش ئێستا ماڵەکەیان لێ ئاوەدان دەکردم و بەشداری گەمەی منداڵەکانی تریان دەکرد، (چێژی منداڵی) نەك (شادمانی غەم).

سەرەڕای هەموو ئەمانە و بۆ هەزارەمین جار دەڵێم بۆچی ئەفرەتی ئەم جەنگە بیانییەو ستەمکارییە بەتایبەتی بەسەر ئێمەوە لەنگەری گرت؟! بەڵێ... بۆچی بەتایبەتی ئێمە؟!

بێدەنگ بە! ئێستا لەجیاتی کفرکردن پێویستە داوای بەزەیی بۆ گیانی مردووەکان بکەیت، هەروەها بۆ خۆت و زیندووەکانی سابلاخیش داوای بەزەیی خودا بکەیت؟!

*** 

سەردانی ڕۆژانە وەك نوێژی خەوتنان بوو بە ئەرك، حەسەن بوزورگ لەنزیك نیمچە کەلاوەکەی ئەڵماس لە تاریکیدا چاوەڕێ دەکات، چاوەڕێی دەرفەتێك و گەیشتنی خواردن دەکات. دەی بینێت ئەویش وەك ئەم خووی بەمەوە گرتووە. قاپەکە هەڵدەگرێت، ئینجا دەست بەلووشکردنی خواردنەکە دەکات، تا لە خواردنەکە نەبێتەوە لێی نزیك نابێتەوە، تاریکی باڵ بەسەر ژووره نیمچە رووخاوەکەیدا دەکێشێت، لەمیانەی رووناکی فانۆسەکانی شەقامەکەوە کە لە پەنجەرەکەوە دەگاتە نێو ژوورەکە دەی بینێت، دەنگی مڵچە و تەقەی کەوچکەکە کە بەر قاپەکە دەکەوێت دەگاتە ئەم و دەی بیسێت، دەیەوێت زوو تەواو بێت تا بۆ لای بێت، خواردنەکە دەی ورووژێنێت، لەشوێن خۆیەوە بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن خۆراك لەماڵی ئەم شلۆمۆ کەتانی جوولەکەیە کۆتایی نایات، خۆ جگە لە کەسانی خانەوادەکەی خۆی خواردن بەخانەوادەی هاوکارەکەیشی دەدات کە لەماڵەکەیدا نیشتەجێ بوون، خواردن بە خەڵکێکی زۆری سابلاخ و ئەڵماسی خۆشەویستیشی دەدات، ئەرێ چۆن کۆتایی نایات؟! ئایا ئەو لەجیاتی خودا خواردن دروست دەکات؟! تۆ بڵێیت ئامێرێکی ئەفسووناوی هەبێت و هەر گاوێ داوای خۆراکی لێ بکات بۆی ئامادە بکات؟! نەخێر، ئەو وەك هەر مرۆڤێك، بینادەمێکی خواساییە، بەڵام ئەو بەچاوی ئاوەز پێشبینی لە دایکبوونی ئەو ڕووداوانەی دەکرد کە هێشتا لە مندالدانی نادیاردا بوون و پێشبینی ئەنجامەکانیشیانی دەکرد، بۆیە سامانەکەی خۆیکردە قوربانی خەڵکێکی زۆر، باوکی ئەم تەنها زێڕ دەبینێت و جگە لە زێڕ بڕوای بە هیچی تر نییە. ئایا کاتێك ئەو نەختە خۆراکەی کەماوەو کۆتایی دێت، ئەم و خێزانکەی زێڕ بخۆن؟! هەمان پرسیارەکانی پێشوو باوکیان قایل کرد، هەر کە

عوسمانییەکان پێش دوا هەڵاتنیان جێگیر بوون، جارێکی دیکە لە دەرفەتێکدا سەفەر بکات، ئەم لەگەڵیدا نەچوو، چونکە ئەلماس پێویستی پێیەتی و ئەمیش پێوستی بەوە. باوکی وەك هەموو جارێك بەخۆی و بەوەی سوپای عوسمانی بۆیان هێشتبووەوە، گەڕایەوە. حەسەن بوزورگ هەموو شەوێك لە ماڵەوە دەردەچێت، لە ماڵەوە لێی دەپرسن (بۆ کوێ دەڕۆیت؟) بیانووی چوونە لای هاوڕێ هەرزەکارەکانی هاوتەمەنی دێنێتەوە. پێی دەڵێن رووسەکان هاتوونەتە نێو سابلاخەوەو ترسیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە، بەڵام ئەم کەی گوێی بە جەنگ داوە؟ بێگومان ئەلماس ئێستا لەنان خواردن بۆتەوە، ئەو بێدەنگییەی کە باڵی کێشاوە جگە لە ئحم ئحمی تێرخواردن هیچی دیکە ناگەیەنێت. نا... ناکرێت ئەلماس بووبێتە ئاژەڵ، ئەو هێشتا ئەو مرۆڤەیە کە لەوەتەی تووشی کارەساتە گەورەکە بووە، نایەوێت لە شوێنی کۆستکەوتنەکە دوور بکەوێتەوە، ئەو تەنها بە کاریگەری کارەساتەکەوە نووساوە، بەڵام ئەم وا وردە وردە لە شوێنی گرمەکە لەقی دەکات، بە هەنگاوی وریایی چووە پێشەوە، وای لێهاتبوو گەر هەموو دنیا ببێتە تاریکییەکی ئەنگوستە چاویش ئەو شوێنەکەی دەدۆزییەوەو جیای دەکردەوە، تەنانەت ئەگەر نابیناش بووایە هەر دەچووەوە سەری، کە گەیشتە ژوورەکەی ئەلماس، مۆمەکەی داگیرساند، دەی بینێت و دڵی دەست بەلێدان دەکات، سەیرە! ئەمە خۆشەویستییە، نەك بەزەیی هاتنەوە، ئیدی ئەویش چوون گیاندارێکی سرك و ترساو لێی دوور ناکەوێتەوە، بەڵکو لەسەر رووخسارە تۆقیوەکەی خەندەیەك دیارە، کە دەی بینێت لەبری ئەوەی لێی رابکات، ترسی دەموچاوی دەڕەوێتەوە، ئیدی هەر ئەوەندە نزیك دەبووەوە، ئامێزی بۆ واڵا دەکرد، باوەشی لێدەداو خۆی پێدا هەڵدەسوو و چێژی لێ وەردەگرت، رەنگە لەوەتەی لەدایك بووە هەستی بەلەزەتی وا نەکردبێت، بەچپە دوو پێی دەڵێت (ئەلماس، هۆ خۆشەویستەکەم! دەمت بۆنی ساردیی خواردنی لێدێت، با بەر لەوەی ببینە یەك جەستە پێویستە خۆمان بشۆین!). ئیدی ئاو گەرم کردن و خۆشتن لەناو تەشت و جل گۆڕین لەلای بوون بەسرووتی پیرۆزی نوێژکردن. ئەو پیسی و پاشماوەی خواردنەی بە جەستەیەوە بوون بەدەستەکانی خۆی پاکی دەکردنەوە، کێ بڕوای بەمە دەکرد؟!، بەڵام ئەمە زۆر ناخایەنێت و نیگەرانییەکە هەر لە ئارادایە، ئاخر

ئەگـەر یـەکێك لـەپڕ هەڵبکوتێتـە سـەریان، ئـەوە لـە گوینـە، بـەڵام شارۆچـکەکە بەکارەساتی خۆیەوە سەرقاڵە، ئەی شلۆمۆ کەتانی ئەگەر بیری لەوە کـردەوە کـە لێـی دڵنیا بێت، بێگومـان گەر ئەمە بکات، بەرۆژی نیوەڕۆ دێت، ئەو مرۆڤێکـی بـڕوادارەو گومـان بۆ خۆی پەیدا ناکات، بەڵکو ئەو هەرگیز ڕێگە بەخۆی نادات لەتاریکییـەکی ناوهادا بە تەنها لەگەڵ مێینەیەکدا بێت، تەنانەت ئەگەر فانۆسیشی پێ بێـت ئەمـە ناکات، ئەمێستا ئەو لە ماڵەکەی خۆی دەرناچـێت و پرسـەی بـۆ ژنەکـەی و هـەردوو منداڵەکەی داناوە. لەو دەمەیدا خەریکی شتنی ئەو جلانە بوو کە ئەڵماس لەبەر خۆی دای کەندبوون، ئەگەری ترسێك خستیبە سەربیرکردنەوە، ئەی ئەگەر یـەکێك وەك ئـەم هەڵبکوتێتە ناو ژوورەکەی ئەڵماسەوە، چی ڕوودەدات؟ نا...نـا، وا مانگێـك تێپـەڕیوەو شتێکی لەجۆرە ڕووی نەداوە، ئێ ئەو تەنافەی کە بـۆ هەڵخـستنی جلـەکانی ئـەڵماس رایەڵی کردووە، لە شوێنێکە ناکەوێتە بەرچاوی کـەس، ڕاسـتە ئـەو شـوێنە هـەتاری بەرناکەوێت و چەند ڕۆژێکی دەوێت تا جلەکانی وشك دەبنەوە، لێ ئەڵماس جلوبـەرگی زۆری لە دۆلابەکەیدا هەیە، کە لە ڕۆژانی خـۆش و گـوزەرانی بـۆی ماوەتـەوە کاتێـك لەگەڵ باوکیدا بوو، خۆ ئەگەر دیقەتی بدات، دیارە دەڵێت ئەڵماس هـەر خـۆی ئەمـە دەکات و پێویستییەکانی خۆی دەزانێت، ئەو تەنها بـای کارەسـاتەکە لێیـداوەو شـێت نییە، بەڵێ ئەڵماس تۆ شێت نیت. ئێستا وا لەسرووتی پاك و خاوێن کردنەوە بووینەوەو نۆرەی پێکەوە یەکگرتنمانە. ئەرێ ئەو یەکەم ڕۆژانەت لەیادە، کە لێم دەترسایت و لێم دوور دەکەوتیتەوە؟ ئێستا دۆخەکـە چـەند گـۆڕاوە! ئـەوەتا بەشـادمانییەوە بـەرەو لام رادەکەیت و بەچپە ناوم دەبەیت و بەچپە ناوت دەبەم. نەخێر، ئەڵماس تـۆ هۆشمەنـدیت و بەم زووانە دەگەڕێیتەوە بۆ دۆخی جارانت و لەخۆبایی بوون و لـووت بەرزییەکـەتیش نامێنێت. دەستی بەزگیدا هێناو دڵنیابوو کە ئەم سکە مەلۆتکەیەکی لەتۆوی ئـەمی تێدایە، (ئەڵماس، تۆ دووگیانیت؟! ئایا خوێنی بێ نوێژیت لـەکاتی خۆیـدا دێـت؟!)، بەڵام ئەگەر ئەو سکیشی پڕ کردبێت، هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە بزانێت، ئـەرێ خـۆی دەزانێـت؟ لێـی ورد بـووەوە، لەبـەر تیـشکی زەردی مۆمەکـە سـوورایيەکی بەسـەر ڕوومەتەکانییەوە دی. سەرنجی دا ئەوە نزیکەی مانگێکە توخنی دەکـەوێت، بـەڵام بـێ

نوێژی لێ نەبینیوە، کەواتە؟! دڵی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی کەوتە ترپەترپ، بەخۆوەی نووساندو گوشی. کەواتە دوور لەچاوی هەمووو دنیا دەبمە باوك؟! دەبا دنیا هەر پێکدا بدەن، ئەوان بەدەستی رق و کینە دەمرن و من ژیان بەرهەم دێنم و دروستی دەکەم، کوڕی بوزورگ کام ژیان دروست دەکەیت؟! هەستێك وەك ئاوی کانییەکەی دەرەوەی سابلاخ لێوان لێوی کرد. سەرباری تاریکی و مەرگ و مەترسی برسێتی کوشندە، گەشبین بوو. بۆ یەکەم جار بە پەرۆشێکی راستەقینەوە بیری لە جەنگەکە کردەوە، بیری لە کارلکاری جەنگەکە کردەوە، بۆ یەکەمجار نەفرەتی لە جەنگ کردو هیڤیدار بوو کۆتایی بێت و ژیان بەسەر مردندا زاڵبێت.

*** 

ئەم جەنگە کەی کۆتایی دێت؟

پرسیارێك بوو لە هەمووو سووچێکی جیهان دەکرا. ئەگەر دەستاڕی شەڕەکە لە گەڕدا بووایە، یان نا، ئەوا لە سابلاخ لەسەر زۆربەی زمانە شەکەت و کۆستکەوتووەکان دەگەڕا. مورتەزا حاجی زادە پرسی (ئەم جەنگە کەی کۆتایی دێت؟) دەشی وت: (تا بتوانم بەسەر وەلی کاڵفام و دەست و پەیوەندەکەیدا زاڵ بم؟!) وەلی برایشی پرسی (کەی ئەم جەنگە کۆتایی دێت، تا مورتەزای هیچ و پووچ بکەم بە پەندێك مێژوو باسی بکات و منداڵان لە حوجرە و قوتابخانەکانیاندا فێری ببن؟!). فەرمانی بەدەست و پەیوەندەکانی دا کە مەزارو باخ و ئەوەی ماڵ و سەروەتی براکەیەتی بەپێی دەرفەت بسووتێنن. پیاوەکانی مورتەزاش لە ئامادە باشیدابوون و ئاگرەکەیان دەکوژاندەوەو مورتەزایان لە کردەوەکانی براکەی ئاگادار دەکردەوە. مورتەزا پیاوی زۆرتری چەکدار دەکرد و بۆ ساتی یەکلاکردنەوە خۆی ئامادە دەکرد. حەسەن چەخماخ لەگەڵ پرسیارکەراندا پرسی (ئەم جەنگە کەی کۆتایی دێت؟!) ئومێدی بە هەوادارانی دەبەخشی و بڕوایانی بە رووسیا جێگیر دەکردو ئەو هیوایەشی دەخواست کە سابلاخ و هەمووو ئازەربێجانی ئێران بچنە پاڵ دەوڵەتی بەلشەفی دایك، هەروەها بۆ دوای تەواو بوونی جەنگەکە، دڵبەندی خواستی دادپەروەری و یەکسانی و سۆشیالیستی دەکردن، جاتا هاتنە دی ئەو خواستە گەرەکە هەروەك چۆن دالدەی جوولەکە و

نەسرانییەکانیان داوە، تاوهاش خۆراك لەنێو خۆیاندا بەش بكەن و هەر شوێنێك خواردنی لێیە بیهێنن.

رۆژگاری لێزان ماوەیەکی زۆر هەناسەبڕکێی کرد، ئینجا لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکە رۆیشت و وتی: گەرچی جەنگەکە بۆ ماوەی چەند مانگێکی دوورو درێژی دیکە، یان تەنانەت بۆ ماوەی چەند ساڵێك درێژەی کێشا و رێگەی پڕ لە مەترسی و لەوتاو بە رەنگی سووری خوێن و رەشی پرسەداری دەبڕی، دوای ئەوەی خەڵکی بیریان چووبووەوە جارێکی دیکە باسی ژنە هەواڵدەرەکە بکەن. ئەمجارە زۆر کەس لە شێوەی دەڵەدیوێك دەیان بینی لە هاچەی کۆڵانەکاندا دانیشتووە و خواردنێکی لەبەردەمدایە کە لاشەی مرۆڤە، حەسەن بوزورگ لە رێگەی رۆیشتنی بۆ لای ئەڵماس، ژنەکەی بینی، حەسەن ملی نابووە دەریایەکی تاریکییەوە و لەهەموو لایەکیشەوە گرمەی تۆپ دەهات و بەم لاو بەولایدا گێزەی گوولـلە دەهـا، لەناکاو لەبەردەمیدا رووناکییەکی بەهێز درەوشایەوە و لە قووڵایی ئەم تیشکەوە ژنە هەواڵدەرەکە بە لەنجەو گۆرانییەوە دەرکەوت. وەك مانگی چواردە کە بە خەرمانە دەورە درابێت، لێی نزیك بووەوە. بەدەمییەوە پێکەنی و بەدەنگێکی کز وەك ئەوەی لە قووڵایی گۆڕەوە بێت، بەچپە وتی: نەگۆڕ یەقت دەداتەوەو نە هەتیوەکەش دەتبینێت و دەتناسێت، بەڵام ئەو بێ باوکە بەدرێژایی تەمەن هەر خەونت پێوە دەبینێت. هەموو جەستەی کەوتە لەرزین و لێی پرسی: مەبەستت ئەڵماسی خۆشەویست و کوڕەکەمە؟! (هەی سۆزانی شوومی شەوان روونی بکەرەوە؟)، بەڵام رووناکییە نادیارەکە (سۆزانی شەوان) لەنێو تاریکییە رەشەکەدا، توایەوەو ون بوو.

حەسەن بوزورگ ترسا. بۆ ئەوەی بەسەر ترس و رەشبینییەکەیدا زاڵ بێت و لە ئامێزی ئەڵماسدا لەبیریان بکات، پێی پەلەی هەڵگرت. ئەو دڵنیایە کە منداڵدانی ئەڵماس کوڕەکەی ئەمی تێدایە، بەڵام دەبێت ئەوە راست بێت کە پێش ئەوەی ئەم منداڵەکە ببینێت، بمرێت؟!

ئەوەی لە رێگە بینی و گوێی لێ بوو سەیر بوو، بەڵام لەوە سەیرتر ئەوەیە کە لە دنیادا روو دەدات، لەوەش و لەمەیش سەیرتر ئەوەیە کە لە سبەینێ بێ ئاگایە و

نایزانێت. یان دوای سەعاتێك چی روودەدات، ئایا وەك هەموو شەوێك بەسەلامەتی بەرەو ماڵی خۆمان بگەڕێمەوە، ئەی ئەگەر بەسەلامەتی گەڕامەوە، ئاخۆ باوكم و دایكم و هەموو خوشكەكانم وەك جاران بەبێ ئەوەی یەكێكیان لێ كەم بووبێتەوە، دەبینمەوە؟ بەسەلامەتی بێ ئەوەی تووكێ لەسەری، نینۆكێكی لێ كەم بووبێتەوە؟!

عاشقێكی سەراسیمە بوو، ئەمێستا ئەڤینەكەی تەنها بۆ ئەڵماس نەبوو، بەڵكو لەم نیمچە كەلاوەیەوە سۆزی بەرەو ماڵەگەورە دەرژیی، ماڵێك بە هەموو ئەوانەی تێیدان سایەبانێكەو بە باڵە ناسكەكانی سێبەری لێدەكەن.

نە گوللە باران دەبڕایەوەو نە تۆپ باران، سیمفۆنیای ترسەو نە هێور دەبێتەوەو نە ماندوو دەبێت. خەڵكی لە سابلاخ خەو ناچێتە چاویان، بێدەنگن و بیر دەكەنەوە، یان باسی زیادبوونی ترسەكانیان دەكەن و نوقلانەی ئەوە لێدەدەن كە سبەینێ چی پێشان دەدات، تۆ بڵێیت چارەنووس چی لە هەگبەكەیدا بۆ هەڵگرتبن، هەگبەیەكی پڕ، یان بەدگۆڕاوەكە هێشتا بەوەوە ناوەستێت كە تا ئێستا لەم هەگبەیە دەری هێناوە؟

ئێستا ترسە گەورەكە بووەتە برسێتی، خەڵكی تانهۆ لەسەر ئەوە ژیاون كە لە ماڵەكانی خۆیاندا هەڵیانگرتبوو، یان بەگوێرەی توانا لە دەرەوەی سابلاخ هێنابوویان. ئەوەی هەڵگیرابوو وا ئێستا كۆتایی دێت و لەگەڵ گەرمبوونی شەڕەكە لە دەوروبەری سابلاخ چوونە دەرەوەش بوو بە كاری نەكردنی، رێگاوبان گیران و بوون بە مەترسی، بەڵكو كەسی پێدا نەدەرژیشت و بوو بە مەیدانی كوشتارو بەلاشەی هەردوو لا چێنراو. ئیدی سەربازگەو تۆپخانەو خۆ تەقەتكردن و نەخۆشخانەی گەڕۆك لە هەموو شوێنێك بوون. سابلاخ بۆ دانیشتوانەكەی خۆی بوو بە زیندان و گۆڕ. سابلاخ بوو بە تەڵەیەك بۆ سابلاخییەكان و راوچی داگیركەری غەوارە نابوویانەوە...

باوكی سەلمان وتی:

(خۆراك لەماڵەكەی مندا زۆر بوو، ئایینددم خوێنددوەو كۆگاكانم پڕ لە خۆراك كرد، بەڵام ئالیك بوو بە كێشەو خەریكە خواردنی خۆمان لەگەڵ پەلەوەرەكاندا بەش بكەین).

بە ئەسمەرم وت:

- با بەپەلە هەندێك لە گوێرەکەکان سەر ببڕین و بۆ زستان بیانکەین بە قاورمــە، تا کێشەی کەمبوونەوەی ئالیکی ئاژەڵەکان سووك بکەین.

وتی:

- هێشتا مانگێکی دیکەمان ماوە تا کەش روو لە ساردی بکات.

میری هاوکارو شەریکم وتی:

- لەیادم نەماوە کە تۆ کاتێك کەلوپەلی ماڵەکەمانت بۆ ئێرە گواستەوە، ئـالیکی ئاژەڵەکان و دانەوێڵەی پەلەوەرەکانت هێنا بێت، هێشتا کۆگای خـۆراکی گیانـدارەکان پڕە.

بـە گالیـسکەکەم بـە نێـو تۆپبـاران و گوللـەدا بـە پەلـە بـۆ ئـەوێ ڕۆیـشتم، تەماشامکرد دەرگاکە لەسەر پشتە. چی ببینم؟ ماڵەکە بووبوو بە تەویلەیەکی گەورەو ئاوەستی رووسەکان. کەسم تێیـدا نـەبینی، بـەڵام بێگومـان رووسـەکان بـەخۆیان و ئەسپەکانیانەوە لە ژوورەوەن. بە پلیکانەکەدا بەرەو کۆگای ئالیکەکان شـۆڕ بوومــەوە، بە کلیل دەرگاکەم کردەوە دیقەتم دا پڕە لە باوەشە گزرە و کیـسە دانەوێڵـەی پەلـەوەر. کەواتە داگیرکەران نەیاندزیوەتەوە! گالیسکەکەم پڕکرد و دەرگای کۆگاکـەم داخـست. بێگومان ئاتاجی هەمووی دەبین، چونکە کۆتایی مـەینەتییەکە وەك تراویلکە دیارە.

میر بە شادمانییەوە وتی:

- بـەپێی ئـەوەی هێناوتـە وای دەبیـنم کـە ماڵەکـەمان وەك چـۆن لــە ڕۆژی (گواستنەوەکە) جێتهێشتوە وەك خۆی ماوە.

پێکەنیم و وتم:

- بەڵام وای لێهاتووە بەکەڵکی دانیشتنی مرۆڤ نایات، داگیرکەران کردوویانـە بـە گەوڕێکی گەورەو ئاو دەستی بنیادەم و ئاژەڵ!

میر جنێوی بە رووسەکان داو نەفرەتی لێکردن:

- ئەوان چەند سوودیان لە ئێمە بینی، کەچی ئێمە جگە لـە مـەرگ و کاولکـاری هیچمان لێیان دەست نەکەوت!

بەپەلە وتم:

- ئەوان سوودیان لێ وەرگرتین و ئێمەش سوودمان لێ وەرگرتن، پاشان جەنگەکە کردنی بەدڕندە، هەموو شەڕکەرەکان دڕندەن! هەر هەموویان!

- ئاخر بۆ بەتایبەتی ئێمە؟ پەلاماری وڵاتەکەمان دەدەن و ئەتکمان دەکەن و بێ تاوانەکانمان دەکوژن؟

بە ئازارەوە گازاندەم کرد و وتم:

- ئەوەندە ئەم پرسیارەمان کرد، تا زمانمان کول بوو، کەچی وەڵامێکمان دەست نەکەوت قایلمان بکات. پێش هەموو کەسێك من مافی خۆمە شەوو رۆژ تووك و نەفرەتیان لێ بکەم. تەماشای ریشەکەم بکە، کە بۆ پرسەی جگەرگۆشەکانم بەرم داوتەوە. وەك دەبینی عەسری چاوەکانم وشك نەبوون و گەیشتۆتە دڵم و بەردەوام دەگری.

ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە، ئینجا ورەورێکی کرد:

- ئێمەش سەرباری هەموو ئەمانەین، بارگرانییەکی زۆرمان خستۆتە سەرتان، لەماڵەکەتان دانیشتووین و خواردنەکەتان دەخۆین، لەکاتێ دا دانیشتوانی سابلاخ هیچ خۆراکێکیان دەست ناکەوێت! ئێ تۆش پێم دەڵێیت کەماڵەکەم بەکەڵکی دانیشتنی مرۆڤ نەماوە؟!

دەستم خستە سەر شانی و وتم:

- هاوکارو هاوبەشم، گوێ مەدەرێ و مەگەڕێوە سەر ئەم قسەیە. ماڵەکەمان ماڵی ئێوەیەو خواردنەکەمانیش هەر هی ئێوەیە. ئاژاوەکە هێشتا لە هەڕەتدایەو پەلە لەشت مەکە. هەمورومان لەو ئاسمانە خودایەکی بەخشندەمان هەیە!

بە غەمگینی و بێ ئومێدییەوە ورەورێکی کرد:

- لەکاتی تەنگانەدا پەنامان هەر ئەوە.

* * *

مانگێك تێپەڕی و شەڕو کوشتار تادەهات گەرمتر دەبوو، هەردوولا لە شارۆچکەکە ئۆقرە ناگرن، تا ناچار دەبن و جێی دەهێڵن. دەورو بەری سابلاخ دەسووتێت و بە ئاگر تەنراوە، ترس و برسێتی دەی سووتێنێت. ئێستا لەناوەوەو دەرەوەی شارۆچکەکە شتێکی ئەوتۆ نەماوە. مەرگ لەهەموو شوێنێ لە بۆسەدایە. مرۆڤ

خواردن دەخوات تا ترسەکەی بەردەوام بێت و کارەساتەکانی بەردەوام بێت و کوشتاری بەردەوام بێت. سەرکەوتووەکان کەمینەیەکی بچووکن و پێشبینی نادیاریان کرد و خودا خۆشیویستن و سامانی دانیێ. ئەوانە دەوڵەمەندی لێزان بوون و ژیانی خۆیان بە پارە کڕییەوە، بەڵام لێزانی دادی هەژارانی نەدا، هەروەها زێڕیش دادی ئەوانەی نەدا کە پەردەیەکیان بەسەر چاوی خۆیاندا داو نەیان توانی رووداوەکانی ئایندە ببینن. ئەمانە تەنها لووتی خۆیان دەبینی و درەوشانەوەی کانزا زەردەکە چاوی کوێرکردن. دوای ئەوەی کار لەکار ترازا بە ئاگاهاتنەوەو سکیان قۆڕەی دەهات. لە شتێك دەگەڕان تا سکیان بێدەنگ بکەن، بەڵام جگە لە سەگ و پشیلەی بەرەڵڵا هیچیان نەدۆزییەوە، ئەوانەش تەنها لەسەر گوفەکی خودا پێداوەکان ملۆمۆیان دەکرد. باڵندە لەکەمییان داو فڕین. ئەوەی توانیبای کۆترێك، تەنانەت قەلەڕەشێك، یان هەندێك چۆلەکە راو بکات، بەختەوەر بوو. لە ماڵەکانی سابلاخ سەگ و پشیلە یەك لەدوای یەك ون دەبوون، خۆ ئەوەی لە ماڵەکەیدا مشك هەبوویایە بەتێروتەسەل دادەنرا، چونکە سەگ و پشیلەو مشك لە ماڵەکاندا نەمان- زووبەزوو قڕیان کرد- لە سابلاخدا گیاندارێك لە کۆڵانەکاندا نەدەبینراو لە هیچ شوێنێك جریوەی چۆلەکە و خوێندنی باڵندەیەك نەدەبیسترا... تەنها دەنگی تەقینەوەو دەنگی گولله بێ برانەوە دەبیسترا، وەك هەموو جارێك هەژارەکان یەکەم کەس بوون کە جەنگەکە چرنوکی برسێتی زۆرداری لەگۆشتیان گیرکرد.

برسییەکان دەستیان بە پاڕانەوە کرد، تووك و نەفرەتیان لە خراپەکاران دەکرد، خۆیان بە ئومێدێکەوە دەبەست، بەڵام برسێتی بەهاوارەوە بانگی دەکردن (ئا ئەوەتە لەناو خۆتاندایە! ئەگەر بە هاوارمەوە بێن، بەهاواری خۆتانەوە دەچن). هەوڵدەدەن چاوی لێ بپۆشن، لێ ئەو بەڕوویاندا دان چیڕەکاتەوەو هاوار دەکات (هایهوو! ئەگەر بەخواردن بێدەنگم نەکەن، ئەوا پاچ و خاکەنازەکانم وێرانتان دەکەن و لەسزا تاقانەکەم... مەرگ رزگار نابن!).

برسییەکان ئەوەی بە کەڵکی خواردن هات خواردیان، تەنانەت ئەوەی دڵ نەی دەبرد و نەدەخورا، بەتامەزرۆیی و هەڵپەوە وەك بەلەزەتترین داوەت لووش دەکرا، ئینجا لەچاو

پرووکانێکدا جگە لە دارو بەردو ئاسن هیچ نەما، تەنانەت پێستەشیان کولاندو خواردیان. برسێتی جەژنی خۆی بەبێ موبالاتی کردو سەلماندی کە زۆربەی دانیشتووانی سابلاخ هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ مرۆڤی دیکەی هەموو جیهان نییە و دۆخی ئەمرۆیان هەر وەك هەمان دۆخی دوێنێی دووره بەدرێژایی سەردەمەکان و لەم ئەزموونەدا نە خۆشەویستی و خزمایەتی دەمێنێت و نە دۆستایەتی، تەنانەت دایکایەتی و باوکایەتیش نامێنن و تەنها (من) لە کێبڕکێی مانەوەدا دەمێنێت، خەڵکی لە دەمامك رووت دەبنەوەو دەبنە دڕندەیەکی تێکشکێنەر. کەمینەیەکی کەم و دەگمەن کە روحی پاکی بەرەو ریزی (مرۆڤی راست و دروست) بەرزی دەکاتەوەو بە جێگیری و خۆڕاگری لەسەر لوتکەی چیای مرۆڤینی جێگیر دەبێت و حەز لە بڕیاری دڕندانە و بانگەوازی خۆپەرستی ناکات و هاوارە ترسێنەرەکەی لە بنی چڵپاوەوە بەرز دەبێتەوەو دەگاتە ئەو خودایەی کە هەموو دانیشتوانی سابلاخ بڕوایان پێیەتی، بەلام لە چرکەساتی یەکلاکەرەوەدا لە بیری دەکەن، تاشەڕی تاقە کەسی تەسکی خۆیان بکەن، ئەمەش لەپای ئەوەی لەسەر کەوڵی هەموو شتێك و هەموو مرۆڤێك بەزیندوویتی بێننەوە. حەسەن چەخماخ دووبارە داوای لە هاوڕێیانی کرد کە دەست بە خۆراکەوە بگرن و پارووی ژیان لەنێو خۆیاندا بەش بکەن. شلۆمۆ کەتانی لەسەر مینبەری کەنیسە داوای لە تایفەکەی خۆی کرد کە کۆمەکی یەکتر بکەن...، ئەوەی وتی ئەمەبوو (خۆڕاگری ئەمڕۆ بەرانبەر ئەم دوژمنە لەناوبەرەو دابەشکردنی پاروو لەناو یەکتریدا دوو ئەرکی ئایینی و خودا پەرستین) ساکارییەکەی و بێ فیزییەکەی رێگەی نەدا وەك نموونە باسی خۆی بکات، بەلام گوێگرەکانی دەیانزانی ئەو جگە لە چوارده کەسەکەی ماڵی خۆی و ئەڵماس و ناجی یاریزانی جوولەکەی عێراقی، خەڵکی زۆری دیکەیشی بە نهێنی دەژیاندو دڵنیابور کە بانگەشەکانی لەنێو تایفەکەی و خەڵکی دیکەشدا بەرهەمی هەبووە. ئەمێستا دەستاری جەنگەکە بەوپەڕی خێرایی دەسووڕایەوە و جەستەو رۆحی دەهاڕی. دەستوپێوەندەکانی مورتەزا حاجی زادە خۆیان دەخستە مەترسییەوەو دێهاتەکانی خۆیان جێدەهێشت و ملیان دەنایە بەرەکانی شەڕەوەو ئەوەی لەتوانایاندا بوو لە خۆراك و لە پیاو دەیانکڕی و بۆ مورتەزاو کەسوکاری خۆیان

دەیانهێنا. لەپای وەدەست هێنانی خۆراك رۆژان و شەوانی دوورو درێژ رێگەیان دەبـڕی، بەڵام وەلی لەو خۆراکەی دەخوارد کە لە کۆگای دیکە بـۆ خـۆی و بـۆ پیاوەکـانی دای نابوو. بۆ ئەو گەنجینە زۆرە دەسووتاو ئاخی هەڵدەکێشا کە ئاگر هـەڵی لووشـی). دەی وت (گەرەکە ئەم ئاگرە مورتەزاو خێزانەکەی و ئەوەی هەیەتی بسووتێنێت!) هەرچەندە شەڕەکە تا دەهات توندتر دەبوو، بەڵام پیاوەکـانی لـە سـووتاندنی مـەزراو باخـەکانی مورتەزا بەردەوام بوون. وەلی حاجی زادە ئەگەر کۆگا خواردنەکـەی نەسـووتایە، ئـەوا دەیتوانی بەرانبەر بە زێڕ دەوڵەمەنـدەکانی شارۆچـکەکە لـە نموونـەی وەك خانـەوادەی بوزورگ لە مردن رزگار بکات، ئەگەر ئەو کۆگایـە بمایـە، دەیتـوانی غایلـەی ئەوانـە بکاتە ئەو راستییە کە لە توانای کانزا زەردەکەدا هەیـە لـە هـەموو قـات و قڕییـەك بیانپارێزێت و لە مردن رزگاریـان بکـات، کەچـی مورتـەزای (تاوانبـار) کۆگاکـەی سووتاندو دڵی داخ کرد و پارەو سامانی دەوڵەمەندەکانیشی کردە بتێکی بـێ کـەڵك و تووڕەهات، هەر ئەوەندەت دەزانی کەژاوەی مردوو ناشتن لە سەرتاسـەری شارۆچـکەکە رووی لە گۆڕستان دەکرد. لە رێگەی بەرەو دوا ئارامگەی قوربانیـانی برسـێتی لـەنێو مردوونێژەکانیش قوربانی لێدەکەوتەوە و دەمردن. خەڵکی چـون سـەرخۆش بـەلارە لار خۆیان بکێش دەکردو دەڕۆیشتن. برسێتی پاشماوەی مرۆڤبوون و بینادەم بوونی لـێ زەوت کردبوون و ئیدی زگ بەتاڵی و مرۆڤبوون بوو بوونە دوو شتی هۆشـبەر. وایـان لێهـات ئیشتیایان چووە سەر مردووەکانی خۆیان. ئیدی لەژێر باڵی تاریکیدا لەکوێ برایـەك ، یان مێردێك یان خزمێك لەژێر خاك بوایە، ئەو ئازیز مردووانە لە گڵە تەڕەکە دەنیشتن و بەنینۆك خۆڵەکەیان لادەبرد، ئینجا مردووەکانی خۆیان دەردەهێنـاو پارچەپارچـەیان دەکردو وەك داوەتێکی چەور لوشیان دەکرد، تا بۆ ماوەیەك لە ژیاندا بمێننەوە تا ئەوەی بەختی هەیە داوەتێکی مرۆیی دیکەی بـۆ هەڵدەکـەوێت. ئـەوان بـۆ خۆشەویـستان و ئازیزانیان لە کرم لەپێشترن، بەڵکو ئەوان لە بۆگـەنبوون و رزیـن دەیانپـارێزن و لـە دەسەڵاتی کرمی قێزەون رزگاریان دەکەن و لە هەناوی خۆیاندا ونیان دەکـەن، چـونکە لەوێ، لە هەناوی زیندووەکاندا گۆڕیچکەیەکی لـەبارو شـایان هەیـە. بـەش بـەحاڵی گۆشتخۆرەکانیش، ئەوا خۆشەویستانیان، شەهیدانی برسێتی، دوای ئـەوەی تێکـەڵیان

دەبن و دەبنە بەشێك لەوان، هەلی ئەوەیان بۆ دەڕەخسێنن کە توانـاو هێزێکیـان تێـدا بێت، تا بۆیان غەمگین بـن، سـەرباری ئەمـەش پرسـەیەکی شـایانیان بـۆ دادەنـێن. ئەمێستا ئەمانی زیندوو هاوکات گوڕیچەو غەم و خاوەن چاکەن، بە نـەمانی کوشـتار برسێتی نامێنێت و هەڵپەکردنیش بۆ خواردنی گۆشتی مردوو نامێنێت، کۆمەڵێك لە برسییانی ئازیز مردوو لەنێو خۆیاندا کەوتنە کێـشە، هەریەکـە و داوای خاوەنـدارێتی لاشەکان و مافی خواردنی دەکات. ئەوەبوو ژنێك بۆی دەرکـەوت کـە ژنـە دراوسـێکەی هەوڵی خواردنی مێردەکەی داوەو نیازی وابووە لە گۆڕ دەری بهێنێت و بیڕفێنێت. ئیدی دەمەقاڵێ دەکەوێتە نێوانیان. سەرکەوتنیش بۆ لاواز و بـێ بڕسـتە، ئـەوەبوو هـەردوو ژنەکە کەوتن و مردن. کەسوکاری هەردوو ژنە هاتن و لەسەر ئەوەی مافی کێیـەو کـێ لەپێشترە کێشە کەوتە نێوانیانەوە، ئەوە وروژێنرا، کە (ئایا ئەو دوو ژنـە لـە وەسـیەتدا لاشەکانیان بە کێ داوە؟). گرفتێکی یاساییە، بەبیری یاسا دانەرانـدا نـەهاتووە باسـی ئەم کێشەیە بکەن، ئیدی چارەسەرێکیان بۆ نەدۆزییەوە، کەچی یاسای ئێستا هەر وەك هەمیشەش وابووە، بەگشتی خەریکی ساختەکارییە و یاسای جەنگەڵە، بووە بە یاسـای مانەوە بۆ بەهێزەو دەق ئەمە ئەو یاسایەیە کە لە سابلاخ پیادە دەکرێـت، بـەهێز ئـەو کەسە بوو کە لە هەموو بەهایەکی مرۆڤبوون شۆرابێتەوە و کەڵبەی خۆپەرسـتی چـیڕ بکاتەوەو لاشە لەدوای لاشە بخوات، بەڵکو لەپای ئـەوەی خـۆی بمێنێتـەوە ئـەوی تـری دەکوشت. ژنێك دیقەتی کوڕەکەی خۆی دا وا لەگەڵ برسێتیدا ململانێ دەکـات، پـێش ئەوەی دوا هەناسە بدات، ئارامی لێ هەڵگیراو ناقرگەی هەڵهێنا، رووخساری ئەو ژنـە گۆڕاو بوو بەرووخساری دەڵەدێوێکی خەڵەفاو، کامی کـامی هاتـەوەو لیـك بەدەمیـدا هاتە خوارێ، ئینجا بە چەقۆیەك کەوتە گیان (جگەرگۆشـە)کـەی و پارچـە پارچـەی کردو گوڵمە گوڵمە خستییە نێو مەنجەڵێکی مسی گەورەوەو ئاوەکەی لەسەر ئاگرێکی گڕهاتە کوڵ. مێردە نەخۆشەکەی کە ئەویش برسی بوو، بـۆنی گۆشـتەکەی کـرد کـە لەسەر ئاگر دەکوڵا، شێتی لە خانەکانی جەستەیدا ورووژان، هێزێکی کتوپڕ و هار بـوو کەوتە سەری، سەرباری لاوازی و نەخۆشییەکەی هەستایە سـەر پـێ و بـەدەنگی بـەرز بانگی کرد:

- ئەریّ سەفییە، بۆنی گۆشتی کوڵاو دەکەم! گۆشتت لە کویّ هیّناوە سەفییە؟!
سەفییە بەدەنگی دەڵەدیۆیکی دڕندەو زبر، وەڵامی دایەوە:
- هەی خەڵەفاو، ئەمە گۆشتی سەرمەدە! هەی شیّتە سەرمەدی کوڕمان!
پیاوەکە چرکەیەك تەزی، دەنگی لە گەروویدا قەتیس بوو، بە غەمگینی گریاو ئەمەش هاتە سەر خەمەکانی دیکەی، وتی:
- سەرمەد؟! کوڕە ئازیزەکەمان؟! سەرمەد مردو جەستەی ئازیزی لەسەر ئاگر دەکوڵیّت؟ ئەریّ ژنەکە گوناه نییە وات لەم کوڕە تاقانەیەمان کردووە؟!
دەنگی زیاتر زبرو رەق بوو، وەك ئەژدیهایەکی ژەهردار فیشکاندی:
- هەی خەرەفاو بیّدەنگ بە، هەی شیّتە! ئەی ئەوە حەرام و ناڕەوا نییە کە زیندوویەك مردوویەکی لەبەر دەستدا بیّت و نەی خوات و بمریّت؟ ئەی ئەوەت نەبیستووە کە زیندوو لە مردوو لەپیّشترە؟
وا دەرکەوت کە قایل بووە، بەریتمیّکی تیّکەڵ لە غەم و حەزکردن لە گۆشت وتی:
- کەواتە بەپەلە پارچەیەك گۆشتم لە سەرمەدی ئازیز بۆ بیّنە، تا بەرەنگاری برسیّتیە هاربووەکەم ببمەوە.
سەفییە بەدەنگیّکی گڤەئاسای وەك وڕە وڕی جنۆکە لە قاقای پیّکەنینی دا:
- ئەی من نەموت تۆ شیّت و خەڵەفاویت؟ دەتەویّت من بە گۆشتی کوڕە جگەرگۆشەکەم تیّرت بکەم، هەی گەمژە؟!
دووبارە بیّ هیّزی دایگرتەوەو بەدەنگیّکی کزو واق وڕمانەوە وتی:
- سەفییە، ئەی سەرمەد کوڕو جگەرگۆشەی منیش نییە؟!
جاریّکی دیکە سەفییە پیّکەنینیّکی شەیتان ئاسا پیّکەنی و دەستی بە هەلوشینی گۆشتی کوڵاوی مردووە ئازیزەکە کرد:
- نەخیّر هەی شیّت و شوور! تۆ هەموو تەمەنت هەر بەگەمژەیی ژیایت، بەڵام بەر لەوەی بمریت با راستییەکەی بزانیت! سەرمەد کوڕی تۆ نییە! سەرمەد کوڕی خۆشەنگی خۆشەویستە، کە پیّش چەند رۆژیّك ژنە تاوانبارەکەی لاشەکەی خواردو لووشی کرد...

مێردە جارێکی دی هەورە تریشقەکە لێی دایەوە، نەی دەویست باوەڕ بکات، برسێتییەکە تووڕەییەکەی دامرکانەوە، دەنگی پڕ پاڕانەوەی لێ دەتکا، بەکزییەوە وتی:

- کەواتە تۆ داوێن پیسیت. سزای داوێن پیسیش کوشتنە. گەر توانای هەستانم هەبوایە و هێز خیانەتی لێ نەکردبام، هەر ئێستا هەڵدەستام و دەم کوشتیت. لەکاتێکدا من ناتوانم ئەوە بکەم، کەواتە پارچە گۆشتێکی سەرمەد بکە بەخێری خۆت، ئیدی هەر کەسێك باوکی بووە گرنگ نییە.

ژنە پارچەیەکی دیکەی لە گۆشتی سەرمەد هەڵگرت و بەهەڵپەی دڕندەیەکی برسی و شێتییەوە دەستی بەجوینی کرد. وشەکان بە شێوەیەکی سامناك لە دەمی دەردەپەڕین و هەرچی خۆپەرستی و خراپەکارییەك هەیە تیایاندا کۆبووەوە:

- هایهوو! هایهوو! هەی خەڵەفاوی ناو خەڵەفاوان، پارچەیەك لە گۆشتی سەرمەدت بدەمێ، تا چەند رۆژی دیکە ژیانت پێ ببەخشێتەوە؟ هەی شێتە، ئەی دوای تەواو بوونی گۆشتی سەرمەد چی بخۆم؟ هەی کەم عەقڵ دەی دوا هەناسەت بدە! تا من لەزەت لە ژیان بکەم...

سابلاخ زۆری لەم دۆزەخانە بینی. زۆر جار برسێتی پێش ئەوەی جەستەی لووش بکات، مرۆڤبوونی مرۆڤی لووش دەکرد، دەرکەوت کە سامناکی خراپەکاری و خۆپەرستی مرۆڤ لە سنوورێکدا کۆتاییان نایەت، بەڵام ریزپەڕ هەمیشە هەر هەیەو لە پاڵ ئەم دیمەنە ترسناکانەدا قوربانیدان و قارەمانێتیش دەرکەوتن و سەلماندیان کە چاکەخوازی لەگەڵ ئەوەی کەمە، هێشتا هەری ماوەو ئەوەش تروسکاییەکەو وەك مافێکی رەوا وەك نازناوی (مرۆڤ دۆستی) بەهەندێك کەس بەخشرا.

❊ ❊ ❊

لەکاتێکدا لە گێژاوی برسێتی بێ بڕستیدا لەتری دەدا، لەوەتەی برسێتی تووشی ئەم کەسە کەمینانە بوو بوو، بەسۆزو ئەڵهایەکی سۆفییانەوە لە ماڵەوە دزەی دەکردو بۆکن ئەڵماس دەچوو. سەیر لەوەدا بوو تا ئەم دواییە هەستی بەم چاکە خوازییەی خۆی نەکردبوو، بە وتەی - ئەڵماس ئەی خۆشەویستم!- بەرەو رووی دەچێت و تامێزی

لێ دەدات و بەشەوق و حەزێکەوە کە لە پەرستن دەچێت، بەخۆوەی دەنووسێنێت: تۆ دڵت لای خواردنی دراوسێییە و منیش لە جۆشی هەرزەکاریدام.

بڕێکجار کە دەی بینی وا نان دەخوات لە برسان لێوەکانی خۆی بە زمان دەلەستەوە. ئایا نانی لەگەڵدا بخوات؟ ئەڵماس بەتاسووقەوە خواردنەکە لرف دەکات. جاران تا لە نان خواردن دەبووەوە چاوەڕێی دەکرد، بەلاّم ئاوها نەی دی بوو. بێگومان ئەمە هی بێزووکردنە! هێی حەسەن، بێگومان کۆرپەلەکەت لەوێ، لەناو ئەو سکە راکشاوەو خۆراك وەردەگرێت! نەخێر ئەڵماس لەو خواردنە بێبەش ناکەم کە لەگەڵ کوڕەکەمدا بەشی دەکات! هێی ئەڵماس! خەڵکی منداڵی خۆیان دەخۆن، بەلاّم من ئامادەم بمرم تا ئەم کۆرپەلەیە لەدایك ببێت و رووناکی ژیان ببینێت، بەلاّم ئەڵماس ئەوەی تۆ دەتەوێت من ناتوانم بیکەم، خۆشەویستم من نەخۆشم، نە خۆشییەکەم دەردێکە لە هەموو دەردان ترسناکترە، دەردەکەم دەردی برسێتییە، لەنێوان ماڵەکەی ئێمە و ئەم نیمچە ماڵەی تۆدا، پیاوێك لەگەڵ ئەو خەڵکانەی بەخێویان دەکات، بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە لەتێریدا دەڕژێنەوە، بەڵێ! دەڕشێتەوەو لەگەڵیدا پیاو و ئافرەت و منداڵ، لە جوولەکە و موسڵمان، رەنگە نەسرانیش، دەڕژێنەوە، هێی خۆشەویستم تەنانەت تۆش لە خواردنی ئەم پیاوە دەخۆیت، بەلاّم باوکم چاوی کوێر بوو بوو، ئەم ساتەی نەدەبینی و هیچ گوێی پێ نەدەدا، ئەوەبوو هێشتا کڕینی خۆراك بەبەرییەوە مابوو، من هانم دا ،ئەو بەچەند مانگێکی ژیان قەرزاری منە، بەلاّم ئێستا ئەو و دایکم و خوشکەکانم لە برسان چەماونەتەوەو بەپێوە خۆیان بۆ راناگیرێت، قۆڕەی سکیان دێت و چاوەڕێی مردن دەکەن. نا ئەڵماس، نایەڵم بمرن! لەخودی خۆیدا ریژدان و جوامێرییەکی دزێییەوە کە لەوەو پێش هەستی پێنەکردبوون، ئەو تەنها هەرزەکارێکی ژن پەرست بوو، جگە لەناو گەلی خۆی و ترازانی بە نە خوێنی ئاوەڵکراسی کچان هیچی تری لا گرنگ نەبوو، ئەمێستا بۆتە عاشق و پیاو و بەرپرس و باوك! ئەو دەمەی باوکت لە ژیاندا بوو ترست دەخستە دڵی هەموو پیاوانەوە، کەللە رەقێك بوویت هەمووان بەخراپەکاریان دەزانیت، ئێستا لەگەڵ بێ ئاگایی و ترسەکەتیش، ناسکترین و پڕ لە خۆشەویستیترین کەسیت، تا ئەوەتا لەوەتەی کۆستت بە باوکت کەوتووە، تاڤگەیەکی خۆشەویستی قەتیس بووت

تێدا هەڵدەقوڵێت. هێی خۆشەویست، هەست دەکەیت منیش تووشی پەتاکەی تۆ بووم؟ لووتت لە دەمم نزیك مەخەوە، بۆنی برسێتی بۆگەنە و بەرگەی ناگیرێت! کەچی تۆ ئەم دەمە ماچ دەکەیت و لەتۆ وایە بۆنی میسك و عەتری لێدێت. ئەڵماس، گەر لە چارەم نووسرابێت کە ئەم کوڕەم نەبینم، ئەوا لە کەس مەترسەو بە ئاشکرا بڵێ ئەمە کوڕی حەسەن بوزورگە! لەو دەمەیدا ئەم راسپاردەکانی پێدەوت ئەڵماس رووخساری تەڵخ و گرژبوو. بێگومان ئەو دەیناسێت و خۆشیدەوێت و ئاواتی مانەوەیەتی. ئەڵماس دەستی خستە سەردەمی و بێدەنگی کرد، ئینجا دڵۆپێك کەوتە سەر دەستی و دڵۆپێکی دیکەی بەدواداهات. دەستی بەدەموچاویدا بەرەو چاوی هەڵخزاو فرمێسکەکانی سڕی. کێ دەڵێت ئەڵماس هۆشی لەدەستداوە، شان بەشان برسێتییەکەی ئەڵماس بەخۆوەی گوشی، هەڵپەیەکی پڕ لە هەستی مرۆڤینی، خەریك بوو بەو گۆشینە روحی دەربچێت. گەر من بمرم کێ جلوبەرگ و جەستە ناسکەکەی بۆ دەشوات؟ دراوسێ خواردنی بۆ دێنن، بەڵام لە پاکراگرتن و ئەو سەرمایەی بەڕێوەیە ناپرسن، سەرما نەفرەتی سێیەمی دوای جەنگ و برسێتی! وای شت زۆرن کە مرۆڤ دەکوژن! لەناکاو هەستی بە تەزوویەکی سارد کرد. ئەرێ زستان هات یان ئەمە لەرزی سەرەمەرگە؟! هەستی بە خەمێکی زۆرکردو نەیویست لە ئامێزی ئەڵماسدا بمرێت، بۆیە خۆی لێ دەرباز کرد و ماچێکی کرد، هەر وەك چۆن هاتبوو ئاوها بەلارە لار بەرەو ماڵ گەڕایەوە.

رۆژێکی قورس تێپەڕی و رۆژێکی دیکەی بەدواداهات. شەڕەکە تا دێت گەرمتر دەبێت، برسێتی زیاد دەکات، مردن زیاد دەکات، هەناسەی سارد زۆر دەبن، بێ هێزی پەرە دەسەنێت و مەرگ نزیك دەبێتەوە.

- باوکە، ئەمە دوا دەرفەتمانە، کیسەیەك زێڕ ببەو بۆ لای شلۆمۆ کەتانی دراوسێمان بڕۆ و هەندێك خۆراکی لێ بکڕە!

باوکی بە نا بەدڵییەوە دەڵێت:

- کوڕم شێت بوویت؟! من کاری وابکەم؟!هەی شێتە سواڵی خواردن بکەم؟!

- باوکە، تۆی دەی کڕیت.

- تۆ لەو باوەڕەدایت کە خەڵکی لە رۆژی باراندا ناخورە بەکار نەهێنن؟

- باوکە، ئەمە لەپێناو دایکم و خوشکەکانمدا بکە!

وەك ئەوەی دوا هەناسە بدات دەڵێت:

- مردنمان باشترە لەوەی ئاوها خۆم بچووك بکەمەوە.

لەدەمە دادڕاوەکەی برسێتیدا مرۆڤبوونی خۆی دۆزییەوە، چونکە زۆر کەس گۆڕان و بوون بە دڕندەیەکی تێکشکێنەر و بەدگۆڕاو، ئەو مرۆڤێکەو خۆشەویستی و بەخشندەیی و قوربانیدان دەزانێت، بۆ لای خوشکەکانی چوو، ئێستا لەم ژوورەیاندا بێبەشی و نامرادییان بەتەواوی دەرکەوتبوو! جگە لە ناڵە و نرکە کە بەشێك لە ڕۆحی لێ دەتکێتەوە، هیچ ئاژەنەڤێت.

(من برسیمە!)، (لەتە نانێکم دەوێ!)، (نامەوێت بمرم!) ، (هۆ خەڵکینە ژیانم پێ ببەخشنەوە!) ، جیهان و باری و دنیاو عالەم! باوکم بەم ئاوانە بانگی دەکردن، دایکم وەك ئێوە زەبوون بووە، منیش گەر بزانن دوای چەند مانگێکی دی دەبمە باوك. لەپای دایکی و خوشکەکانی ئازاری دەکێشا، گەرەکە بژیت، بژیت بۆ ئەوەی ئەمان و خۆیشی کوڕەکەی ببینن، تەنانەت باوکە گەمژە و بە سامان لەخۆباییەکەیشی هەر دەبێت بژی. دراوسێ جوولەکەکەی هاتەوە یاد، ئەو خواردنە خۆشانەی هاتەوە یاد کە لەو ماڵەدا دەدرێن و دەخورێن. لە حەژمەت بێ هێزی و برسێتی هەناسەی سوار بوو بوو، بەڵام بە جەختەوە لەبەر خۆوە وتی:

- خواردنتان بۆ دێنم، لە برسان نامرن! بۆ ئێوەو باوکم خواردن دێنم!

سەرخۆشێکە دەڕوات و بەلادا دێت، لە گیانەلادایە و هەناسە بڕکێیەتی، خەریکە ڕوحی دەردەچێت، بەڵام ڕوح دەرچوونەکە لە چاوەڕوانی دەیهێڵێتەوە، بەرەو ژوورەکەی باوکی دزەی کرد، دەمانچەکەی لە کیفەکەی دەرهێناو لە گیرفانی شاردییەوە، خۆی بکێش کرد، ئەڵماس بەگیانی تۆ خواردن بۆ کەسوکارەکەم پەیدا دەکەم، بەو پاشماوەی هێزەی کە مابووی بەرەو سەربان سەرکەوت.

* * *

هەر گرمەی تۆپ دەهات کە چەند مانگێك بوو نەدەبڕایەوە، بە ئەسمەرم وت:

- خوردنەکەمان بۆ ئامادە بکە، بێگومان میوانەکان برسییانە!

بیرم لەو کەسانە دەکردەوە کە ڕۆیشتن و دەڕۆن، بیرم لە زیندووەکان لە خۆشەویستە کۆچکردووەکان و بەو دۆخەی کە بەسەر سابلاخدا هاتبوو، کردەوە، ئەم شارۆچکە خۆشە، کێ لەو بڕوایدابوو کە مەینەتییەکەی بگاتە ئەو رادەیەی ببێتە حەشارگەی گۆشتی مرۆڤ خۆر؟! تاشە بەردێکی قورسی دیکە کەوتە سەر تاشە بەردەکەڵەکە بووەکانی سەر شانم. بریا دەمتوانی نانی هەموو ئەم برسییانە بدەم...! کاشکێ دەمتوانی بەر لەم مردنە قێزەونە بگرم، لێ ئازووقەی ماڵەکەم لەو ساوە سابلاخ بۆتە بخۆری خواردنی پیس و گەنیو لەکزی داوەو سەرقاپەکەی بەجۆرێك داخراوە، سەری منداڵی شیرەخۆرە سپی دەکات. ئای بارەکە چەند قورسە! لەو خۆراکەی کە لەم ماڵەدا هەیە دەمێکی چەند زۆر لێی دەخوات! گەر ئەم خواردنە پێش کۆتایی هاتنی ئەم جەنگە نەفرینە کۆتایی بێت، ئەوا دوو سەرمایە لەدەست دەدەین، پارەو خۆراك. ئای ئەسمەر گەر بزانیت کە سەرمایەکە کۆتایی هاتووە...! دەمی سێ ئازیزی لەدەست چووم کەوتەوە بیر، کە ئیدی بەشداری ئەم خواردنەمان ناکەن، هاوکات سیمای ترسناکی شەیتان لەبەر چاوم قوت بووەوەو کەڵبەکانی جیڕ دەکردەوە. گوێم لە دەنگی بوو کە پێی دەوتم (سوپاسم بکە، چونکە لە ئازووقەی سێ کەس رزگارم کردیت!) بە پەشۆکاوی راپەڕیم و نەفرەتم لێکرد (شەرمەزار بیت! شەرمەزار بیت هەی شەیتان!)، نەفرەتم لە رووس و عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان و شاو ئینگلیز و هەموو خراپەکارانی دنیا کرد. سفرە و خوان راخران و پرسەری لە هەموو جۆرە خواردنێك کرا. فەرمووم لە میوانەکانم میر عەلی و خێزانکەی کرد. ئەندامانی خێزانەکەی خۆمیش بەدەوری سفرەکەدا کۆبوونەوە. لە پڕ دەنگێکی کز، بەڵام بەهەڕەشەوە لەسەر بانەوە بەر گوێمان کەوت:

- دەستتان لە خواردنەکە هەڵبگرن، هەر کەسێك دەستی بۆ ببات بەم دەمانچەیە دەیکوژم.

دەستەکان کشانەوە نیگاکان بەرەو سەرێ بەرز بوونەوە. ئەوە حەسەن بوزورگی لاو بوو لەوێ، دەمانچەکەی لەسەر پێیە، دەست و پەنجەی هەر ئەوەتا توانای گرتنی دەمانچەکەیان هەیە، هەوڵدەدات سێرە بگرێت، بەڵام لەنێو دەستەکانیدا سەما دەکات، ململانێ دەکات و چوون سەرخۆشێك کە قەرابەیەکی تەواو عارەقی

خواردبێتەوە، بەلادا دێت. لەو چرکەساتە کتوپڕەدا هەموومان لاڵ بووین، چرکەساتەکە تێپەڕی و بانگیم کرد:

- رۆڵە، وەرە خوارەوە. هەموو خواردنەکە لە پێشتدایە! خۆی بە پلیکانەکانەوە گرت و بە هەناسەبڕکێ و لارەلار شۆڕ بووەوە. لەگەڵ نزیك بوونەوەیدا ترسی ئەوەم لێ دەنیشت کە نەگاتە خواردنەکە، هەمووان بە بەزەییەکی خەمینەوە کەوتنە چپە چپ. حەسەن بوزورگی لاوو نازراگیراو، بارێك و لاواز بووەو بەلادا دێت و لەبەر بێهێزی ئاگای لەخۆ نییە و رەنگی مردوو لەرووخساری نیشتووە، دەمانچەکە لەگەڵ خۆیدا بێدەنگە و هەڵدەلەرزێت، قەت ئەم مرۆڤە زیندوو نییە و یەکجار لە ژیانەوە دوورەو لە مردنەوە زۆر نزیکە، نەفرەتم لە خۆم و رووداوەکان کرد، چۆن بیرم لە هاوسێ نزیکەکانم نەکردۆتەوە؟!

- رۆڵە بخۆ!

بەدەنگێکی نیوە لەسەرخۆ چوو وتی:

- تا کەسوکارەکەم ئاهێکیان وەبەر نەیەتەوە، ناخۆم، ئەم خواردنە هەمووی بۆماڵی خۆمان دەبەم.

هەوڵی دا بارەش لە سفرەکە بدات، لەپڕ بەلادا هات و دەمانچەکە لە دەستی بەربووەوە...! کەوت و چاوی ئەبڵەق بوو، دەستیم گرت، دەستی زۆر ساردبوو، بانگم کرد:

- رۆڵە خواردنت دەوێت، بەڵێنت دەدەمێ کە کەسوکارەکەشت تا ئەم مەینەتییە کۆتایی دێت، لەم خواردنە بخۆن!

پاروویەکم هەڵگرت و بەدەمییەوەیم کرد، بەوپەڕی ئەو هێزەی تێیدا مابوو جووی، هەوڵیدا قووتی بدات... نەیتوانی، پاروەکە لە گەرووی گیربوو و دوا هەناسەی دا... رام وەشاند...، هەستی تێدا نەبوو، گوێم بەسینگییەوە نا... دڵی لێی نەدەدا... هەناسەی نەبوو...، لاوە بەستەزمانەکە مرد! حەسەن بوزورگی ناز راگیراو لە برسان دوا هەناسەی دا! بۆ هەزارەمین جار نەفرەتم لە خۆم کرد، دەنگیم لەو دنیاوە ژنەوت و بەهەمووانم وت:

- واز لە خواردنەکە بێنن! سوێندم خواردووە کە نابێت کەسێکمان دەست بۆ ئەم خواردنە ببات!

هیچ پێویستی بە داواکردن و سوێندەکەت نەدەکرد، واق ورمان هەموویانی وشك کرد، پاشان کە لەمردنی دڵنیا بوون، ترس و بڵمە بڵمێك منداڵەکانی گرتەوەو ژنەکان دەستیان بەگریان کرد و پیاوەکانیش وشك بوون. تۆ خۆت وتەنی دڵت (ژەنگ) گرتبووی و نەگەریایت.

هەستت بە قورسایی و سەرسەختی و مەرگ کرد و هاتیتەوە سەرخۆت، ئیدی راپەڕیت و سینییەکی پڕت هەڵگرت و قەشەنگیش سینی دووەمی هەڵگرت، کاتت بەفیڕۆ نەداو بەپێی توانا خواردنی سووکت هەڵبژاردو ئەو خواردنانەت وەلاوە نا کە زیان بە گەدەی خاڵی دەگەیەنن، بە قەشەنگت وت:

- دوام کەوە!

هەموو نیگای پڕ لە پرسیارەوە تێیان روانیم، وتم:

- هەر لە ئێستاوە تا خودا دەرورییەك دەکاتەوە، خانەوادەی بوزورگ لە خواردنەکەمان بەشدار دەبن.

- ئەسمەر پرسی:

- ئەی لاشەی کوڕەکەیان، کە لەبەردەممانە؟!

بە جەختەوە وتم:

- گەرەکە یەکەم جار لە مردن رزگاریان بکەین.

رۆیشتم و قەشەنگ دوام کەوت.

* * *

دەرگای ماڵی بوزورگ درزێکی تێکەوتبوو، لە پشت دەرگاکەوە داوای چوونە ژوورەوەم کرد. دەنگی لاوازی باوکەکە وەڵامی دایەوە (فەرموو).

کە خواردنەکەی بینی هەوڵی دا توورە بێت، بێهێزی دەستبەجێ تووڕەییەکەی دامرکاندەوەو بەوەندە وازی هێنا:

- بێگومان کوڕه نەفرینەکە ئەمەی کردوە، حەسەن پێویستە سزایەکی تونـدت بدەم.

بەداوای لێبوردنەوە وتم:

- دراوسێ مافی لەسەر دراوسێ هەیە، ئێوەش دراوسێ و کەسی منن، تـاخودا دەررویەك دەکاتەوە ئێوە میوانی منن!

خواردنەکەمان دانار بەبێ چاوەڕێکردن من و قەشەنگ گەڕاینەوە، بە ئەسمەرم وت:

- دۆخی هاوسێکەمان لەوپەڕی خراپیدایە.

پرسی:

- ئەی کوڕە مردووەکەیان؟

- خێزانی بوزورگ گەر بە مردنی کوڕەکەیان بزانن، کەسێکیان بەزینـدوویی لـێ دەرناچێت!

پرسی:

- ئەی چی بکەین؟

- لە ژوورێکی بەتاڵ دای دەنێین تا خواردنەکە هێزێکیان وەبـەر دێنێتـەوە، ئەوسـا دەتوانن رووبەڕووی کۆستکەوتنەکە ببنەوە. ئەسمەر بە خەمەوە ئاخێکی هەڵکێشا، وەك ئەوەی خۆی بدوێنێت وتی:

- لەو ساوە داگیرکەری غەوارە هاتوون، دەڵێی عیزرائیل لە سابلاّخ نیشتەجێ بووە، هیچ ماڵێك نەماوە سەردانی نەکات، کەی بێگانە دەڕۆن تا عیـزرائیلیش لەگەڵیانـدا بڕوات؟!

ئێوارە دووبارە لەگەڵ قەشەنگدا خواردنمان بۆ مـاڵی بـوزورگ بـرد، ئـەم خواردنـە تایبەت بوو، ئەسمـەرم راسـپارد کـە خـواردنی سـوکیان بـۆ لـێ بنێـت، هەسـتم بـە بووژانەوەیەکی تەواوی باوکەکەکرد، کەمێك بێ بڕستییەکەی نەماو لووت بەرزییەکەی سەری بەرزکردەوە:

- ئەمە چییە؟ وا جاریّ خواردنەکەتانمان قبوولّ کرد، بەلاّم شلۆمۆ خێر پێیّ کردنەکەت قبوولّ ناکەین، تۆ کە هەر لەسەر خزمەتکردنمان سووریت ئیّ هەتا کەی؟ ئینجا ئەی دراوسیّ هەموو شتێك بە نرخی خۆی.

سەرەڕای ئەو سووکایەتییەی کە وەك خەنجەر دلّی سمیم، وتم:

- تۆ بە خودایە! دراوسیّ مافی لەسەر دراوسێیە، ئەی پێغەمبەرەکەتان رای نەسپاردووە، کەبە دەنگ حەوتەمین دراوسێشەوە بچین.

قسەکەی پیّ بڕیم:

- کوڕەکە رۆیشت و نەگەڕایەوە، نازانم چی بلّێم، سوێندم خواردبوو هەر کە بگەڕێتەوە سزای بدەم، بەلاّم وا ئێستا بۆی نیگەرانم.

غەمێکی تر بێدەنگی کردم، ئایا پێی بلّێت کە کوڕە تاقانە و بەنازەکەت مردووەو وا لە ژوورێك لە ژوورەکانی مالّەکەی مندا راکشاوە؟! هەی کلّۆلّ خۆتان، تۆو دایکی و خوشکەکانی، بێگومان ئەم شەو دەزانن، بەلاّم باوکی سەلمان، لێیان گەڕیّ، با جاریّ شام بکەن. بەشوێن خۆمدا گەڕامەوەو قەشەگ وەك سێبەر دوام کەوت و لێی پرسیم:

- گەورەم، بۆ هەوالّی مردنی کوڕەکەیانت پیّ رانەگەیاندن؟!

- جاریّ ئێمە لە برسێتی رزگارمان کردوون، تا بەهەوالّی کۆستکەوتن بیان کوژین؟

- بەلاّم...

قسەکەم پیّ بڕی و وتم:

- قەشەنگ، من دەزانم ئەم شەو لای ئێمە نامێنێتەوە، هەر دوای نانی شێوان بۆیان دەنێرمەوە.

چۆن؟! ئەم بارە گرانە تازەیە کەوتە سەر گردۆکەی بارە کەلّەکەبووەکانی سەر شانم، من هیچ و پووچترین خەلّقەندەی خودام گەر بەدەستی راست خواردنیان بدەمیّ و بەدەستی چەپ زەبری گوشتنیان لیّ بووەشێنم.

بە میریم وت:

- میر! لاشەکەی حەسەن هەڵبگرە و بۆ کەسوکاری بیبەوە و ئەوەی روویدا پێیان بڵێ!

تەماشایەکی ناقایلانەی کردم و لەوە بوو پێمداهەڵشاخێت، وتی:

- تۆ خواردنیان بۆ دەبەیت و منیش کوڕە مردووەکەیان بۆ ببمەوە؟! چ بێ نرخ و چەپەڵێکیت!

بەسەریدا هاوارم کرد:

- میر،خۆت دەزانیت کە من وانیم! ئەوەش دەزانیت لەم دواییەدا سەرشانم چەند بە هەڵگرتنی خۆشەویستان و برادەران قورس بووە، تەنانەت ڕەزای براشتم بە مردوویی بە شان هەڵگرت و هێنامەوە!

بە ناقایلییەوە دەنگی بەرز کردەوە:

- بەرانبەر من ناوی مەهێنە، نەفرەتی خودای لێبێت!

- میر، ئەی جگەر گۆشەکانم؟! ئەی تۆ خۆت شایەتحاڵی ئەوە نەبوویت؟! ئەی ئەم ریشەی هێشتوومەتەوە ئەوەت ناهێنێتەوە یاد، کە هێشتا بۆیان پرسەبارم؟!

هاوکارو هاوپشکەکەم بێدەنگ بوو و لە فکران ڕاچوو، تەڵخییەك کەوتە سەر رووخساری، دواجار زانیم کە لەمیانەی پرسیارکردنەوە قایل بووە:

- تۆ دڵنیایت کەئەوان بەرانبەر کۆستکەوتنەکە خۆ رادەگرن؟

وتم:

- خودا یارمەتیان بدات، بیرت نەچێت سەعاتێك دوای نانی شێوان ئاگاداریان بکەوە با لە گۆڕستان نەی نێژن، با ئێرەتی لە شوێنێکی ئارام و چەپ گۆڕێکی بۆ هەڵبکەنن و لە گۆشت خۆری مرۆڤ بیپارێزن، تا ئەو دەمەی خودا دەروویەك دەکاتەوە!

بە بڵمە بڵمێك خۆی و سابڵاخی دواند:

- ئای سابڵاخ چییان پێکردیت! ماڵێك لە ماڵەکانت نەماوە مەینەتی رووی تێ نەکردبێت، سەرباری هەمووی خەڵکەکەتیان ناچار کردووە ببنە درندەو لاشەی مردووەکانی خۆیان بخۆن، بەڵام چاکەی تۆ هاوکارو هاوبەشم هەرگیز بەسەر ئێمەوە بیر ناکرێت!

وا ئەم لاوە كلۆڵە هەڵدەگرم و بۆ كەسوكاری دەیبەمەوە، با منیش لە سایەی تۆوە پاداشتێكی گەورەم دەست بكەوێت.

بە غەمگینییەوە وتم:

- دوای شامكردن پێیان بێژە ئەو لە پێناو ئەواندا خۆی كردە قوربانی، با لاشەكەی لە مردووخۆرەكانی سابلاخ بپارێزن!

*** 

هەستی كرد كەشتێك لەخودی خۆیدا ون بووە. لەراستیدا دووشتە، بەڵام ئەمەی دواییان گەنج و تەڕوبڕ بوو، ئەم لە پێچ و پەنای تاریكیدا لێی دەگەڕێت...، شتێك ون بووەو دیار نییە... شتێك مەزن وەك باوكی، وەك دڵی، وەك روحی، بۆچی نایات بۆ لای؟ ئەی خۆشەویستی روح تۆ لە كوێیت؟ بە سەعات، بە خولەك، بە چركە، هەموو شەوێك ژووانەكەی دەزانی! دوای ئەوەی خواردنەكەی دەخوارد كە لە شوێنی دیاری كراوی خۆی چاوەڕێی دەكرد، ئینجا حەسەن دەهات! دەهات و دنیا ئەنگوستە چاوەكەی لەنێو جەرگەی ئەم تاریكییە رووناك دەكردەوە و چڕی تاریكییەكە دەڕەوییەوەو ئەمی لێ هەڵدەهات، ئەو هۆشی لەدەست نەدابوو، لەم چركەساتانەدا دەبوو بە هۆشمەندترین مرۆڤی دنیا، ئەوێك پێش ئەوەی لە قووڵایی ئەم بێ ئاگایی و شڵەژانەدا خۆی قەتیس بكات، بەخۆ هەڵنان و لووت بەرزییەكەی هۆشمەند نەبوو، بەڵكو لە چركەساتەكانی بەیەك گەیشتنیان لەو (لوتكەی خۆ بەزلزانین)ەی دەهاتە خوارێ و ئیدی بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەموو دنیا دەژیا و بۆ عەقڵێك دەگەڕایەوە كە رۆژێك لە رۆژان لە ژیانیدا نەی بووە، ئەمە كوڕەكەیەتی و لە هەناویدایە و هەستی پێ دەكات، هەموو ئەم هەستكردنە سەیرانەی بە خەیاڵدا هات و هێشتا لە تاوەرو قەڵاكەیدا خۆی تەقەت كردووە، بەڵام حەسەنی خۆشەویست و باوكی ئەوەی ناو هەناوی بۆ لە كاتی خۆیدا نەهات؟ شڵەژا، ئاخۆ ئەمیش لەدەست دەدات؟! نەی ویست بڕوا بكات، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو وەڵامەكەی وەك ئەو تەقینەوەیەی كە باوكی دزی و ماڵەكەی رووخاندو وای لێكرد كە خەڵكی بەشێتی دابنێن، گەیشتە گوێچكەكانی، وەك بۆردوومانێك لە هەوادا بتەقێتەوە قیژەیەكی ترسناك لە ماڵی بزورگ بەرزبووەوە، (حەسەن!حەسەن!)

ئەمە هاوارو قیژەیەکی شوومە! کەواتە دڵەکەی لەگەڵ... لەدەست دا... نا، هۆشی لە دەست نادات. ئەو تەنها خۆی لە سامناکی ئەم دنیایە دەپارێزێت، کە جگە لە کوشتن و مەرگ هیچی تر نازانێت، لەگەڵ گریاوەکانی ئەوێ گریا! لەبەر خۆوە ناوی حەسەنی هێنا، دەستێکی بە سکی خۆیدا هێنا، بەرهەمی خۆشەویستی لەوێ جێگیر بووەو لەنێو قۆزاخەکەی خۆیدا ئارام و ئاسوودەیە، ئەو مەلۆتکەیەی کە رای سپارد ئاگای لێی بێت، ئەو باوکە ئازیزە وەك ئەوەی هەستی کردبێت کە کوڕەکەی بەبێ باوکی لە دایك دەبێت، بۆیە بەردەوام رای دەسپارد کە باوکی ئاشکرا بکات.

حەسەن! هاوارو شین و شەپۆڕ لەوێ بەرز دەبێتەوە و لە ناخی ئەمدا بەهێزتر دەبێت، پرچ و روومەتەکانی خۆی دەڕنێتەوە و سینگ دەکوتێت. دێت و دەچێت... دەگریت! هێڵنجی دێت و لەوەیە ئەوەی لە هەناویدایە بێتە دەرەوە. وا لەناو گۆمیلکەی رشانەوەکەدا لە مەلۆتکە هەرە بچووکەکە دەگەڕێت، کە لەناو منداڵدانیدا نوستووە، ئاخر ئەو لەوێ لە تاریکیدا دەگەڕێت، کوا تەڵە شقارتەکان، ئەی کوا مۆمەکە کە دەیهێنان و فانۆسەکەی پێدەکرد؟ ئەوە خۆیەتی! ئەوە تەڵە شقارتەکانە! توانی فانۆسەکە پێ بکات، ئەوە رژانەوەکەیەتی لەژێر پێیەکانی، نەك کۆرپەلەکە، تەزوویەك بە هەموو جەستەیدا دێت، دەست بە قۆڵ و باسکی خۆیدا دێنێت، دەست بەسەر مەمکەکانی و بەسەر زگیدا دێنێت، دەستی بەرەو خوار شۆڕ دەکاتەوە، دووبارە بەرزی دەکاتەوە. ئا کوڕەکەی لێرەیە، کوڕەکەی حەسەن لێرەیە، ئەو کوڕەی کە بۆی باس دەکرد! تۆ بڵێیت لەگەڵ رژانەوەکەدا بەر بووبێتەوە؟ ئەی ئەم دڵ هەڵشێوانە چییە؟! چۆڕێك ئاو! چۆڕێك ئاو! قیژەو شین و شەپۆڕ و حەسەن، حەسەن، لەوێ نابڕێتەوە! تۆ بڵێی ئیدی بەڕاستی بۆ لای نەیات؟ ئەی کێ لە ئامێزی بگرێت؟ کێ ئەم تەزووە ساردو ترسناکە لەسەری و لە جەستەی بێدەنگ بکات...، ئا ئەم گەرداوە هەڵچووە؟! ئیتر کێ بە (خۆشەویستەکەم) بانگی بکات. ئەی کوا کوڕەکەی، تۆ بڵێی بەبێ دەنگی لەوێ راکشابێت، یان لەگەڵ خواردندا، یان لەگەڵ رشانەوەکەدا بەربووەوە؟ لەبەر چییە نازانێت؟ بۆچی شتەکانی لێ تێکەولێکە دەبێت؟ لە دەرێ بارانە، باران! ئاسمان دەگری ئەمیش دەگری. سەرما؟ بۆچی دووبارە هەموو شتێکی لێ گەورە دەکرێتەوە؟ بۆچی

هەست دەکات کە خەمەکەی و تووڕەییەکەی و بێبەشییەکەی زیاد دەکەن؟ ئەریّ بۆچی هەست بە شتهایەکی سەیر دەکات وەك ئەوەی لەناو جەستەیدا لە دۆخی مت بووندا بووبن و ئێستا راپەڕن؟! حەسەن! حەسەن! قیژەو شین و شەپۆر لە هەموو شوێنێك بەرز دەبێتەوە، بارانە. هەر دەنگی تۆپباران دێت، ئەو دەنگەی کە ماڵەکەی رووخاند و باوکی کوشت، رەنگە خۆشەویستەکەشی کوشتبێت، تۆپباران ئەمیشی کوشت، نەفس بەرزی و هۆشمەندی کەسێتی و فیززلیشی کوشت. گۆمیلکەیەك رشانەوەی تر! ترس، خەم. بەدوای مەلۆتکەکەیدا گەڕا. ئەو رشانەوەیە بخۆرەوە...! دووبارە قووتی بدەوە! تا لەدایك دەبێت لە هەناوی خۆتدا بیپارێزە! دەی لەویّ بێنەوە! بە توندی دەستی بەزگی خۆیەوە گرت! وەك باوکت رۆیشت تۆ مەڕۆ، تۆ مەڕۆ. وەك چۆن باپیرت کۆچی کرد، تۆ کۆچ مەکە! چرنوکی سەرما تیژەو لە ئێسقان دەچەقێت، بەڵام نایەڵم بگاتە تۆ. دات دەپۆشم! دات دەپۆشم! خۆی بە فەرروویەکی خوری پێچایەوە و لەسەر ئەمیشەوە پەتۆیەکی بەخۆیدا دا. بەرەنگاری خەم و ترس و هێڵنج دان و هەموو تاریکی ناخی خۆی کرد، خۆشەویستم ئیتر نایەیت؟ ئەی بۆچی دەگرین و ناوی تۆ دەهێنن؟ سبەینیّ وەرەو لە ئامێزم بگرە، وەرە با پێکەوە جلەکان و خۆمان بشۆین! دەی وەرە...، بارێشکی داو خۆی رادەستی مردنە بچکۆلەکە کرد، بۆ ماوەیەك لە ترس و سامناکی رزگاری کرد، لە رۆژەکانی دواییدا سەرماو سۆڵە بەتوندی دەستی پێکرد. ئەڵماس بۆ قەڵا بەرزەکەی دیوار و شوورەی زیاتری دروست کرد و خۆی لەناویدا تەقەت کرد، کەچی دەستی درێژی سەرما هەر پێی گەیشت، دەنگی شین و زاری لە ماڵی بوزورگ درێژتر بووەوە، هاوارو رۆ رۆ و ناوبردنی حەسەن گوێیەکانی کەڕکرد، لە قووڵایی ناخییەوە زانی کە ئەوی لەدەستداوە، ئیدی نایاتەوە، هەرگیز نایاتەوە، بەهێزترین شتێك گۆڕانی کتوپڕی جەستەیی و هەستە نادیارەکەی بوو، ئیدی تێکڕای هەستی ناسکی راپەڕین. گشت شتێك بە هەڵپەوە چون دەرزی کونیان دەکرد، هێلنجدان، شڵەژان، بۆنگەلیّ بەگڕ ئەم هەستە وەئاگاهاتووانەدا دەچوون. لەمیانەی گێژاوەکەیدا تارەزووی دەچووە سەر هەندێك شت. دیوارەکانی دەکڕاند و ئەو تۆزو توێکڵەی لەدیوارەکان بەردەبوونەوە، دەی خواردن. ئاخۆ شێتبوونەکەی بووە راستی؟ نا...نا، لەگەڵ تێکەڵبوونی شتەکانیش

ئەم هێشتا دەتوانێت بیر بکاتەوە، دەستی بە سکیدا هێنا، ئا ئەمە کوڕەکەی خۆشەویستە لە دەست چووەکەیەتی! کوڕەکەی هێشتا لەوێ ڕاکشاوەو لەگەڵ ڕشانەوەدا هەڵی نەهێناوەتەوە، ئاخر ئەو ڕای سپاردووە کە ئاگای لێ بێت و بە ساغی و تەندروستەوە لێی بیێتەوەو ناوی باوکی ئاشکرا بکات. هاوکات بێزو و بەزۆر شتەوە دەکات و دەیەوێت بڕشێتەوە، وا ڕۆژی شەممە هات و لە ماڵی هاوسێکەیەوە بۆنی چێشتێك ئارەزووی خواردنی بزواند، بە خەیاڵ بۆنەکەی ناسییەوە، ئەوە بۆنی (بە تەنوور کولاندن)ە، مریشکی بە برنج و تەماتە و هێل ئاخنراوەو هەر لە ڕۆژی هەینییەوە لەسەر ئاگرێکی کز دانراوە، تا نیوەڕۆی شەممە بخورێت.

بێگومان ئەمڕۆ شەممەیە، ئەوسی بزوا، ئەمە هەمووی تامەزرۆیی مریشکێکی سوورەوە کراوە کە بەو هەموو شتە ئاخنراوە و ڕۆنێکی سوورباوی لێ دەتکێتەوە. پاڵنەرێکی بەهێز بۆ ئەوێی پەلکێش کرد، بۆ ماڵی شلۆمۆی باوکی سەلمان. بینی دەرگاکە درزێکی تێکەوتووە، گوێی هەڵخست، بە هێمنییەکی هۆشمەدانەو ئاوەزێکی دروست ڕەفتاری کرد و لەسەرخۆ و بە وریاییەکی زۆرەوە دەرگاکەی کردەوە، دیسان گوێی هەڵخست و کەسێك لەو نزیکەوە نەبوو، بە لەز بەرەو ئاراستەی بۆنی چێشتەکە ڕۆیشت، تەماشای کرد سێ مەنجەڵ لەلایەکی سەرگیراوی حەوشەکە لەسەر کوانوون. بەپەلە بۆی چوو. بە چمکی کراسەکەی مەنجەڵەکەی هەڵگرت و وەك پڵنگە مێییەکی دڕندەو برسی بەشوێن خۆیدا گەڕایەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو بەخۆو مەنجەڵەکەوە لە پاڵ خانووە رووخاکەی لەسەر دارو پەردووەکە دانیشت، بەتامەزرۆییەوە لیك بەدەمیدا هاتە خوارێ. سەرقاپی مەنجەڵەکەی کە جەمسەرەکانی بە هەویر گیرابوو، هەڵدایەوە. هەڵمێکی تێکەڵ لە بۆنێکی خۆش، کە نەیتوانی خۆی لەبەری ڕابگرێت، بەگژیدا هات، هەرچەندە چێشتەکە یەکجار گەرم بوو، بەڵام ئەم وەك کەسێك لە برسان لە بەرەبەری مردندا بێت، دەستی خستە ناو مەنجەڵەکەو بە هەڵپە دەستی بەخواردن کرد.

باوکی سەلمان زەردەخەنە ڕاستەقینەو هاوکات گاڵتەئامێزەکەی دەی گرێت و دەڵێت:

- ئەسمەر بە پەشۆکاوی و واق وڕمانەوە بۆ لام هات و رووخساری شەرم دایگرتبوو، بەجۆرێك خەریك بوو بە زەوی بڵێت (درز ببەو قووتم بدە) بەچپە پێی وتم:

- باوکی سەلمان، بەقوربانت بم چی بە میوانەکان بڵێین؟ خۆ یەکێك لە مەنجەڵەکان دیار نییە!

من وەك ئەو خۆم بەشەرمەزاری لای میوانەکان نەدەزانی. دەکرێت میر و خانەوادەکەی تێ بگەیەنرێت، ئێ با ئەوان چێشتی نێو تەنور بخۆن و ئێمەش هەرچییەك خودا داوێتی لە شتی نەکوڵاو دەخۆین، وەك پەنیرو هەنگوین و شتی دیکە، بەڵام من سەیرم پێهات و خوت خوتەم پێکەوت، ماڵی بوزورگ بەشداری خواردنەکەمان دەکەن، ئەڵماس لەکاتی خۆیدا خواردنی بۆ دەچێت، ئێ کەسیش زات ناکات بێتە ژوورەوە.

- دەرگاکە کرابۆوەوە؟

- ئێستاش هەرکراوەیە.

پرسیم:

- خواردنتان بۆ ئەو داماوە بردووە؟

ئەسمەر بە شڵەژاوییەوە وتی:

- چاوەڕێم کرد خواردنەکە تێبکەین، ئینجا ژەمەکەی بۆ بنێرم...

شتێك خەیاڵمی بەرەو ئەڵماس برد، بە پەلە لە ماڵ دەرچووم و رووم کردە نیمچە کەلاوەکەی، کە نزیك بوومەوە بینیم و خۆم لە چاوی شاردەوە، لەسەر دارو پەردووی ژوورە رووخاوەکە دانیشتبوو مەنجەڵەکە لەپێشی بوو و بە هەڵپەوە مریشکەکەی لووش دەکرد، واقم وڕما. رەفتاری ئەڵماس بەوەی دەکرد کە مانگێك بێت هیچی نەخواردبێت، بێ ئەوەی هەستم پێ بکات بە پەلە گەڕامەوە، بیری سەیر سەیر بە مێشکمدا هات. تەزوویەکی ساردم پێدا هات، هەندێك راستی و گریمانە دەربارەی ئەڵماس باری قورسی سەرشانمی زیاتر کرد. بۆچی ئەڵماس ئەمە دەکات، لە کاتێکدا من خەمی ئەوەمە رۆژانە تێر بخوات؟ ئەی بۆچی وەك یەکێك تامی خواردنی نەکردبێت، ئاوها بە هەڵپەوە ئەم خواردنە دەخوات؟ ئاخۆ بەرانبەر ئەم داماوە توانیومە ئەرکی خۆم بەجێبهێنم؟ ئایا خواردن بە تەنها لە سەرماو بەفرو خەڵکی غەوارە دەیپارێزێت؟ لە حەناس وشەی

غەوارە هەڵوەستەم کرد، کێ گرەنتی ئەوە دەدات کە غەوارە و بێگانە هەڵیان نەکوتاوەتە سەری، خۆ کاولەکەی لە بەردەم هەرکەسێکدا ئاوەڵایە؟! دەرگایەکی نییە پێوە بدرێت و بیپارێزێت! ترس و گومانێکی زۆر دایگرتم، کە چوومە ماڵەوە دەربارەی ئەمە قسەم لەگەڵ ئەسمەردا کرد:

- کچەکە بەشێوەیەکی سەیر رەفتار دەکات.

ئەسمەر داما، من وتم:

- راستە لەوەتەی باوکی کوژراوە شڵەژاوەو واقی وڕماوە، بەڵام شێت نەبوو...، ئەم دۆخەی ئێستای وای لێدەکات کە تووشی...

- باوکی سەلمان، تووشی چی ببێت؟

- ئەسمەر، دەست درێژی بکرێتە سەرو کچێنییەکەی...، هەروەها دەترسم...

بە پەشۆکاوییەوە پرسی:

- باوکی منداڵان لە چی؟

- لەوەی کە بێزوو دەکات.

- مەبەستت ئەوەیە، کە دووگیانە؟

- ئەو شوێنەی ئەو لێی دەژی لە غەوارە و لایەنای پارێزێت، ئێ ئەمە سەربازێکە، رێبوارێکی رەوتەنییە، یان تەنانەت یەکێك لە دراوسێکانە.

بەدەنگێکی ناسك هاوکات پڕ لە ترس وتی:

- قەشەنگ پێی وتم گوایا کاتێك خواردنەکەی بۆ داناوە بینیویەتی رشاوەتەوە، هەروەها بینیویەتی دیوارەکانی کڕاندووەو توێکڵ و گەردەکەی خواردووە، هەموو ئەمانەش لەم دواییەدا بووە، ئەوەشی بیرکەوتەوە کە قەشەنگ وتویەتی گوایا دراوسێ مردووەکەمانی دیوە لە نزیك ماڵەکەی سوڕاوەتەوە، چەندین جار بینیویەتی وەك ئەوەی نیازی ئەوەی هەبێت بۆ لای ئەڵماس بچێتە ژوورەوە.

زۆر تووڕە بووم، خوێنم هەڵچوو، وتم:

- ئەسمەر، بۆچی لەمە ئاگادارت نەکردمەوە؟

بەرتیمێکی قووڵی لێبوردنەوە وتی:

- ئەمویست بە ئەڵماسەوە سەرقاڵت بکەم، خۆت هەزار کێشە و دەردەسەریت هەیە.

هەڵچووم و دووبارە تووڕە بووم، پتر لە خۆم تووڕە بووم، نەك لە دنیا. زۆر لە گوینە ترسەکانم لە جێگەی خۆیاندا بن و ئەو داماوە دەست درێژی کرابێتە سەر، کەواتە من بیرم لەوە دەکردەوە کە کێشەی ئەو تەنها بە خواردن چارەسەر بکەم، ئەو خواردنەی لەوساوە بووم بە بانگهێشتکەری و داوای کڕینی دەکەم و بوو بە گەورەترین خولیام.

- ئەسەر دەبوو کچەکەمان پاراستبا، دەبوو بەزۆریش بووایە بۆ ئێرەمان هێنابا، بەڵام ئێمە دوای کۆچی دوایی باوکی وازمان لێهێنا تا لەسەر شەقام بژی، بەوەش گوناهێکمان کرد، کە لێخۆشبوونی نییە.

بەسۆزو گلەییەوە وتی:

- باوکی سەلمان، تۆ لەسەرووی توانای خۆتەوە، خۆت باردەکەیت.

بەتووڕەیی و جەختەوە وتم:

- بەراستی من گوناهێکم لەسەرووی توانای خۆم هەڵگرتووە، چونکە ئەم کچە بەستەزمانەم بەرەڵڵا کرد، تا بکەوێتە بەر بەزەیی شەقام و مەترسییە زۆرەکانی.

پرسی:

- ئەی ئێستا گەرەکتە چی بکەیت؟

- ئەمجارە هەر دەیهێنم، تەنانەت ئەگەر چنگ لە دیواری گریانیش* گیر بکات، هەر دەیهێنم.

---

* دیواری گریان: شوێنی گریان، پاشماوەی دیواری پەیکەرەکەی حەزرەتی سلێمانە لەشاری قودس. جووڵەکەکان سەردانی دەکەن و لەپاڵیدا دەگرین(وەرگێڕ).

# کۆتایی گەشتەکە

زستان زوو هات و باران لەگەڵ تۆپ باراندا باری، لـە مـاوەی چـەند هەفتەیـەکی کەمدا هەردوولای شەڕکەر چەندین جار شارۆچکەکەیان دەستاو دەست کرد، ئیدی وەك پێڵاوێکی لێهات بۆ ئەوە دروست کرابێت، کە رووسەکان دای بکەنن و عوسمانییـەکان لەپێی بکەن، ئینجا ئەمان دای بکەنن و دووبارە رووسەکان لەپێی بکـەن، ئیـدی بـەم ئاوهایە ئەمە بەردەوام بوو تا دەرکەوت کە سـوپای عوسمانییـەکان تێکـشکاوە و دوور خراوەتەوەو لاقەکانی هەزار پێیەکە براوەتەوە، ئیدی وا کرژ بووەتەوە لە جەسـتەی پـتری نەماوەو تەنها رووسەکان لە سابلاخ مانەوە، میر پێی وتم:

- وا دەردەکەوێت دۆخەکە هێـور بووبێتـەوەو ئیـدی رووسـەکانیش موسـڵمانەکان نەکوژن. کاتی ئەوە هاتووە خانووەکەمان چاك بکەینەوەو پاکی بکەینەوەو بگەڕێینەوە ناوی، هاوکارم، ئێمە بارگرانییەکی زۆرمان خستە سەر ئێوە.

زەردەخەنەیەکم نواندو وتم:

- میر، پەلە مەکە و چاودێری بکە، هێشتا جەنگەکە کۆتایی نەهاتووە، دەربـارەی شەڕو کوشتاری یەکتریش هەرچەندە ئێستا لە سابلاخ کپ بووەتەوە، بەڵام لە شـوێنانی تر هێشتا لەوپەڕی گەرمیدایە و ملیۆنان کەس برسێتی قڕی دەکات. بـاوکی محەمـەد، تۆ دەڵێی گوێت لە هەواڵەکان نییە؟!

میر بێدەنگ بوو، سکی ئەڵماسی داوماویش وردە وردە بەرز دەبـووەوەو بـە ئاشـکرا دیار بوو کە دووگیانە، نهێنییەکە و دەیشارێتەوە، جگە لە رۆژگاری شایەتحاڵ و خۆی و ئەو پیاوەی کە کەتنەکەی کردووە، کەسی دیکە نایزانێت. لەسەر بێدەنگییەکەی سوور بوو هاوکات بە خۆشەویستی و سۆزەوە ئەو زگە بەرزەوەبووەی لـە ئـامێز گرتبـوو. لـە

یەکێك لە ڕۆژەکانی مانگی ڕەزبەر رووسەکان لەناو سابلاغ حاویج و هاربوون، سەربازەکانیان سترانیان دەچڕی و سەمایان دەکرد، ئەوەندەی دەستیان کەوتبوو عارەقیان خواردبۆوە و هەندێکیان سەرخۆش بوون، لەدواییدا دەڕابەی هەموو دوکانەکان و شوێنە بازرگانییەکانیان شکاند و هەرچییەکیان تێدابوو خستیانە بەردەستی دانیشتوانی سابلاخ، میر دڵگران بوو، پێی وتم:

- خەڵکی پەلاماری کۆگاکانمان دەدەن، تیایاندا هەیە کڕیاری خۆمانن، نەفرەتی خودا لە رووسەکان، هەر بەوەوە نەوەستان کۆمەڵکوژی بکەن، وا سامانیشمان حەڵاڵ دەکەن!

پێم وت:

- من جگە لە باخەکە و ئەم خانووەو شتەکانی ناوی هیچی ترم نەماوە...، تۆ لە خۆش بەختیدا سامانەکەت رزگار کردو کە دنیاش هێور بووەوە تۆش دەتوانیت سەر لەنوێ دەست پێ بکەیتەوە.

باوەشی لێدام و بە زمانێکی سوپاسگوزارییەوە وتی:

- من بە سامان و ژیان قەرزاری تۆم، گەر تۆ نەبوویتایە نە سامانم بۆ دەما و نە ژیان. چەند ئاواتەخوازم ئەم جەنگە کۆتایی بێت و لەکوێ وەستابووین، هەر لەوێوە دووبارە پێکەوە دەست پێ بکەینەوە.

ئەم زەردەخەنە نەفرینە لە کۆکڵم نابێتەوەو بڕێکجار ئاشکرام دەکات و دووبارە ڕەنگی هەڵبزڕکاندم و گاڵتە ئامێزانە کەوتە سەر رووخسارم:

- باوکی محەمەد، چاوەڕێ بکە چاوەڕێ! گەر لە چارەمان نووسرابێت، کە کۆتایی ئەم جەنگە ببینین، لەکوێوە دەست پێبکەین؟ میر، هەموو شتێك گۆڕاوە، لە هەموو شوێنێك خەڵکی هەژارو برسین. دەوڵەتە گەورەکان خۆیان برسین، رووسیا بۆتە بەلشەفی و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دوا هەناسە دەدات و لەسەرە مەرگدایە، ئینجا من وای دەبینم هێشتا باو و تۆزی زیاتر هەڵدەکات. باوکی محەمەد، ئەی پێم نەوتیت چاوەڕێ بکە.

بەواق وڕماوییەوە پرسی:

- هاوکارو شەریکم، مەبەستت چییە؟ تۆ دەم ترسێنیت و لێت تێناگەم، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ هەرچییەکەت وتووە هاتۆتە دی، تۆ دەڵێی پێغەمبەری غەیب زانیت.

بە جەختەوە وتم:

- بڕوام پێ بکە من هەر ئەوە دەزانم کە خەڵکیش دەیزانن، بەلام من هێشتا گومانی ئەوەم هەیە، کە گەرداوی سامناک و ئالۆز بەڕێوەیە، باوکی محەمەد چاوەڕێ بکە تا ئەو دەمەی گەرداوەکە لێمان تێدەپەڕێت و رووخساری خۆیمان بۆ دەردەخات.

رووداوی گەورە لە دەوروبەرمان روو دەدەن، لە ئاسۆی دوور و نزیک شەڕی توندو کوشتاری ترسناکە، بەفرێکی زۆر لە سابلاخ دەبارێت، کەچی ئاگر لە دڵی دانیشتوانەکەیدا نێڵە نێڵێەتی، ئاگری ئازیز مردە و ئاگری رق و ئاگری پەرۆش و تووڕەیی و زۆرشتی دیکە...، ئەم ئاگرە لە یادەوەری زۆر کەسدا هەر دەمێنێت و ناکوژێتەوە، مەگەر خودی یادەوەرییەکە خۆی لە پێچەکانی مەرگدا بکوژێتەوە. ئاگری ئومێد لە دڵی حەسەن چەخماخدا دەئایساو لێوان لێوی دەکرد لە چوست و چالاکی و دەستی لە پەیوەندی کردن بەهاوڕێی نزیك و دوورەکانی هەڵنەدەگرت. بەلشەفییەکان سۆڤێتییەکان لەتەورێز دروست کرد، کەچی رووداوە ترسناکەکانی دەوروبەر واسان لە خۆی و لە هاوڕێکانی کرد سەریان سوڕ بمێنێت. ئەو رووداوانە زۆر بەخێرایی بەدوای یەکدا دەهاتن، هەواڵی کوشتاری ترسناك کە عوسمانییەکان و رووسەکان وەك یەك دەیان کرد دەگەیشتنە گوێی خەڵك، هەروەها بڵاوبوونەوەی برسێتی وەك پەتایەکی کوشندە لە هەموو شوێنێك دەنگی دەدایەوە، ئەو رووداوانە وەك ئەفسانە گەلێك دەگێڕدرانەوە. گوایا یەکێك وتبووی (تەنانەت ئەگەر موسڵمان بەلشەفیش بێت، ئەوە پێش هەر شتێك موسڵمانە). چەخماخ و هاوڕێیانە بەم قسەیە دەماریان جووت دەبێت. مەیلی موسڵمانەکانی ئازەربێجان بەلای عوسمانییەکان و پەرەسەندنی هەستی نەتەوەیی ئیسلامیانە بۆ ئەمە پاساوێك بوو. ئیدی ئەمە بۆ چەخماخ بوو بە بیانوویەك، دەیوت: (بەهۆی هەستی نەتەوەیی هەرزان بەهاوە واز لەبیروباوەڕی خۆم ناهێنم). هەروەها گوێ بەگوێی خەڵکێکی زۆر لە کوردانی سابلاخ دەی وت (ئێمە کوردین و ئازەری نین، هەرچەندە چارەنووسمان وابوو کە شارۆچکەکەمان لەم شوێنەدا

هەڵبکەوێت، تا بەکارەساتی ئەم جەنگە چەپەڵە گرفتارمان بکات. سەرباری ڕووداوە کارەساتبارەکان ئاگری ڕق و کینە لە دڵی هەردوو براو کوڕانی حاجی زادە، ڕقی تایبەتی برا بەرانبەر برا وەك برینێکی دەم کراوە چون دەمی گڕکان دەئایسا... ئاگرێکی داگیرساو لە بنەوە دەگەشایەوەو خەریك بوو گڕکانەکە یەق بکاتەوە. ڕقێك بوو لە هەموو ئەو ڕووداوانەی لە دەوروبەر ڕوویان دەدا گەورەتر بوو، تەنانەت لە کوشتنی ملیۆنان کەسی ئەم جەنگەش گەورەتر بوو، لەو هەزاران ئافرەت و پیرەمێرد و زارۆکە بێ تاوانانەی کە سەربڕان و تاوانێکیان نەکردبوو، بەجۆرێك لە برسێتییە کوشندەکەش گەورەتربوو، لەم جەنگەدا جێگەی شەرمی خەڵك دەرکەوت، دەمامکی سەر ڕووی مرۆڤ کەوتە خوارەوەو ڕووخساری ڕاستەقینەی دەرکەوت. مورتەزا حاجی زادە بەدرێژایی ڕۆژو مانگ هەر دەی پرسی و بیری نەدەچووەوە (ئەوە منم ناچار دەکرێم لەسەر چوار پەل بڕۆم؟! منم دەکرێم بە کەری گێرەو چاوم دەبەسترێتەوەو بەدەوری دەستاڕی ئاشەکەدا دەسوڕێمەوەو بە قامچی لە پشتم دەدرێ و ئالیکی ئاژەڵم دەدرێتێ؟! ئەوە منم هەی کەری گێلێ، هەی گێلی ناو گێلان، هۆ وەلی حاجی زادە؟!). وەلیش لەخۆی دەپرسێت (ئایا ئەوە منم کە لە ناخاڧڵدا سامانەکەم دەسووتێنرێت و سامانیش بەشێکە لە ڕوح؟ سامان هێزە، سامان ناوبانگ و دەسەڵاتە؟!)، (ئەرێ ئەوە منم؟!)، (من)ی کلیلی ئەم دنیایە، کێشەی ئەم جیهانە، کێشەی کەللە پووتەکان، کێشەی ئەو شێتانەی کە تووشی ئارەزووی تاوان بوون، کلیلەکە تەنها بیانوویەکە، دەسکەلایەکە، پەڵپێکە، یان تەونی جاڵجاڵۆکەیە، بەڵام ئاکامەکەی ئاگرو خوێن و کاولکارییە.

بەفر لە ڕێگاوبانەکان بەسەریەکدا کەڵەکە دەبێت، بەڵام ئاگر دڵی خەڵکی دەسووتێنێت، سۆبە جەستەی پڕ لە خەم و پەرۆش گەرم دادەنێت. گوڵ دەیزانی کە شووەکەی هێشتا بە ئاگری جەنگ و ململانێی براکەی دەسووتێت و سەرچاوەکەشی ئارەزووی بێبەشبوونە لە دەسەڵات، لێ دەسەڵات لە سابلاخ بەدەست بێگانە و برسێتییەوە، ئەمێستا بەرۆژی ڕووناك هامۆشۆی دەکەن، پیاوکوژو ڕێگرو ڕووتەڵە لە دەرەوەی سابلاخ بۆ لای دێن، دەنگیان دەگاتە گوێچکەی و بە ئاشکرا بانگی جەنگ و سووتاندن و تاڵان و بڕۆ و کوشتن هەڵدەدەن، مورتەزا جارێك تەماحی ئەوەی نەبوو کە

چارەنووسی شارۆچکە داماوەکە لە ئەستۆ بگرێت، چونکە ئاژاوە شتەکەی یەکلایی کردبۆوە. هەرچەند بیری دەکەوتەوە بەرچاوی تاریك دەبوو، دەستی لە پشتی خۆی دەداو ئاوەزی دەشێوا، لە ناخیدا شەیتانێك دەنگی بەرز دەکردەوەو داوای ئازارپێگەیاندنی وەلی و لەنێوبردنی سامانەکەی دەکرد، بەڵکو داوای تۆڵەسەندنەوەی لە وەلی خۆی دەکرد، بەجۆرێك ئەگەر دوا پەنجەی پەلی برا نەفرینەکەی نەبڕێتەوە داناکەوێت. لە کپی شەودا کە پێکەوە لەگەڵ گوڵ لەسەر جێگەی ژن و مێردایەتی بوون، گوڵ بە مورتەزا دەڵێت:

- ئەرێ باوکی منداڵانم، هەتاکەی ئەم شەڕە تایبەتییە دەکەیت؟!ئیدی بەس نەبێت، وا لە دەوروبەرمان دەریای خوێن شەپۆل دەدات و ئێمەش برسێتی هەڕەشەمان لێدەکات؟!

مورتەزا دەستی ژنەکەی دەگرێت و بەسەر پشتی خۆیدا دەیهێنێت و بە ئازارەوە دەڵێت:

- گوڵ، تا ئەم شوێن برینانە سارێژ دەبن!

بە کەسەرو ئێشەوە گوڵ دەڵێت:

- کەس وەك من لە دەردو ئازارەکەت تێناگات، بەڵام بازنەکە بۆ شەو کۆتایی نییە...، ڕەنگە هەموومان لەناو هەناوی خۆیدا قووت بدات.

- تا وەلی لەم دنیایە نەسڕێتەوە، من چاو لێك نانێم.

- ئاخر ئەویش هەمان شت بە تۆ دەڵێت و هەردووکتان نیازی لەنێو بردنی یەکترتان هەیە.

- گوڵ، کەوابوو پێکەوە دەمرین و پێکەوە دەنێژرێن.

گوڵ ڕاست بووەوەو لەسەر جێگەکە دانیشت، بەپاڕانەوە بەچپە پێی وت:

- ئەی منداڵەکانت، ئەی من، ئەی هاوڕێ وخزمەکانت، ئەی دانیشتوانی ساباڵاخ کە پێویستیان بە تۆیە؟ باوکی منداڵانم، تەماشا بکەو بزانە بەرەو کوێ لێژبووینەتەوە... ئاخر تۆ لەگەڵ کێدا هەڵسوکەوت دەکەیت و کێ هاموشۆی

ماڵەکەت دەکات. دەست و پێوەندەکانی ئەو وەك پیاوەکانی تۆ لە سووتاندن و کوشتن و تاڵانکردنی ئەوی تر کۆڵ نادەن، ئەی ئەوەمان بەس نەبێت کە بێگانەکان پێمان دەکەن؟

مەرتەزا پشتی لە گوڵ کردو دوای چرکەیەك دەستی بە پرخە پرخ کرد. لەولاوە دانیشتوانی سابڵاخ ئازاریان بەدەست نەفرەتێکی دیکەوە دەکێشا، کە بوو بووە سەرباری نەفرەتەکانی دیکە، شەڕی هەردوو کوڕی حاجی زادە کە لەدەرەوەو ناوەوەی شارۆچکەکە بەرپا بوو بوو، مەزراو باخی خەڵکی سووتاند و ئەوەندەی تر کاولکاری لە سابڵاخ زیاد کرد. شەڕی پێوەبەستراوانی وەلی و پیاوەکانی مورتەزا لە شەقام و کۆڵانەکانی شارۆچکەکە دەستی پێکرد، ئەسمەر پێی وتم:

- باوکی سەلمان، ئیدی دەرچوونی بەیانیانی زووت بێ مەترسی نابێت، لە ماڵ بمێنەوە، چونکە کە دەڕۆیت تا دەگەڕێیتەوە هۆشم لای خۆم نامێنێت.

زەردەخەنە تاڵەکەت نیشتەوە سەر رووخسارت، لەراستیدا یەکجار تاڵ بوو، ئازاری لێ دەتکا، هەوڵتدا بیشاریتەوە، لەبەر خۆوە وتت:

- بەرپرسیارێتییەکی گەورەیان لە ئەستۆ ناوم و تا دوا هەناسەم هەر هەڵیدەگرم. دایکی منداڵان، خۆ تۆ باش دەزانیت کە من ئەرکێکی پیرۆزم لەسەرە. گەرەکە بەیانی و عەسرو خەوتنان تا کۆتایی ساڵەکە نزای ئاسوودەیی مردوو (قەدیش) بۆ روحی خۆشەویستانم بخوێنم.

فانۆسەکەت هەڵدەگرت و ملت دەنایە بەفرەکەوە، لاقەکانت تا سەرووی چۆکەکانت لە بەفر نوقم دەبوون. لەوساوە کە بەفر پێیەکانتی بردو پاشەڕۆی ئاژەڵەکانی ناو گەوڕەکە رزگاری کردیت، پتر پارێزگاری پێیەکانت دەکردو چەند گۆرەوییەکی خوریت لەپێ دەکردو پێڵاوەکانیشت دادەپۆشی، بەڵام کاتێك دەگەیشتیتە کەنیسە سەرما بردوو دەبوویت. بەفرەکەت لە جلەکانت دەتەکاندو سۆباکەت لەنێوان هەردوو لاقت دادەنا، هەروەك چۆن ئێستا وادەکەیت و نیو سەدە دەگەڕێییتەوە دواوە، بەڵام دڵ گەرم نابێتەوەو خوێنێك فشار دەکات گەرمایی تێدا نییە. خەم زۆرن، برینی دڵ زۆرن و زۆر شتیش هەن، کە ئەسمەر نایانزانێت، تەنانەت ئەم کەنیسەیەش کە جاران پڕبوو لە هامۆشۆکەرانی و لە نوێژکەران جمەی دەهات و ئەو دەمە لەبەر زۆری نوێژکەران

پێویستی بە سۆبەش نەبوو، بەڵام ئێستا چۆڵ و خاڵی بوو، بەجۆرێك ئەو دە پیاوەش کە وابەستەی نوێژی بە کۆمەڵ و خوێندنی قەدیش بوون، بەزۆری دەمی تۆ نەبووایە، نەدەهاتن، بەڵکو بە هەزار دەردەسەری ئینجا نوێژکەرێك یان دووان دەهاتن. سوپاسی خودا دەکەیت و ئەوە بەزەیی خودایە بە تۆ و مردووە خۆشەویستەکانتی دەکات، نا هۆکاری کەمبوونەوەی نوێژکەران وازهێنانی جوولەکەکانی سابلاخ نەبوو لە ئایینەکەیان، بەڵکو ئەوە سابلاخ بوو لەوان چۆڵ دەبوو. تەنانەت هەر سێ براکەت بارودۆخی شوێنی لەدایکبوون ناچاری کردن هەڵبێن و بڕیاری ڕۆیشتن بەرەو ئەسفەهان بۆ لای خاڵۆانیان بدەن. لەسەر جێگەی خەوتن شەوێك ئەسمەر بە نیگەرانی بینیتی، ئیدی وەك ئەوەی دڕك لەژێرتدا بێت گێنگڵت دەدا. ئەسمەر خەم دایگرت، چونکە هیچ شتێکی تۆ لەو تێنەدەپەڕی. هەروەك خۆت هەمیشە دەڵێیت خودا لە ئاسمان دەتپارێزێت و ئەسمەریش لەسەر زەوی.

- باوکی سەلمان، بیر لەچی دەکەیتەوە؟!

هەناسەیەکم هەڵکێشاو وتم:

- ئەسمەر، شتهایەکی زۆر، دایکی منداڵان شتهایەکی زۆر!

وەك هەمیشە لێم پاڕایەوە:

- باوکی سەلمان، دڵی خۆتم بۆ بکەوەو هەرچی خەمێکت هەیە بیڕێژە دڵی منەوە. من هەموو بوونم بۆ تۆ گوێیە.

چی بڵێم و چی نەڵێم، من لەسەر شاردنەوەی خەمەکانم ڕاهاتووم. شتەکانی ناخم چون ڕووبارێکی هەڵچوو بوون، نەك بە ئاو، بەڵکو بە خەمی ژەهراویی کوشندە، پێم وت:

- سابلاخ خەریکە جوولەکەی تێدا نەمێنێت، ئەو جوولەکەی کە لە کارەساتی شارۆچکەکە ڕزگاری بووە، وا خەریکە جێی دەهێڵێت. وەك ئەوەی ڕاستییەکی سەلمێنراو بڵێت، وتی:

- باوکی سەلمان، ئەوە ئەوپەڕی هۆشمەندییە.

خۆم لە قسەکەی بواردو وتم:

- تەنانەت هەر سێ براکەم بڕیاران داوە بە خاووخێزانەوە بەرەو ئەسفەهان بـۆ لای خالۆیانم بڕۆن.

بە پەرۆش و هاوکات بە تکاوە وتی:

- با ئێمەش بەرەو عێراق بۆ لای کەسوکاری من بڕۆین.

جارێکی دیکە خۆم لە قسەکەی بواردو وەك ئەوەی خواردنێکی ژەهراوی لـە گـەدەم هەڵێنمەوە، لەسەر هەڵهێنانەوەی خەمەکانم بەردەوام بووم:

- ئەسمەر، خۆراك کۆتایی دێت و پارەش لەگەڵیدا کۆتایی دێت.

ئەسمەر پەرۆشییە کتوپڕەکەی خۆی لەبیر چووەوەو بە گازاندەوە وتی:

- میوانەکانمان لە خۆمـان زۆرترن، سەرباری ئـەوانیش خانـەوادەی بـزورگ و زۆری تریش.

گلەییم لێکرد:

- ئەرێ ئەسمەر ئەوە تۆی وا دەڵێیت؟! نەکەی، تەنانەت بیریش لەمە بکەیتەوە!خودا رای سپاردووین رێزی میوان بگرین و بەهانای خەڵکی برسییەوە بچین، ئەوەی دەیکەین ئاکارێکە لە ئاکارەکانی مرۆڤ. خۆشی لەو کەسەی کە خۆی رزگارکردووە، هـەزار جـار خۆشی لەو کەسەی کە بەپێی توانا چەند کەسێکی رزگار کردووە!

- بەڵام خواردن کۆتایی دێت، تەنانەت لە تەورێزیش خۆراك نەماوە...

بەسوور بوونەوە وتم:

- ئەسمەر، تا تاقە نانێکمان بمێنێت هەموو ئەم خەڵکانە لەگەڵماندا بەشی دەکەن.

بەترسەوە وتی:

- ئەی ئەگەر دوا نانیش نەما؟

رووسەکان بەکەلوپەلی دانیشتوان خۆیان بەخشندەییان دەنواند. ئـەوان بانگـەوازی سۆشیالیستیان دەکردو لافی دابینکردنی خۆراکیان بۆ خەڵکی ناوچە داگیرکردووەکـانی خۆیان لێدەدا، بەڵام لەراستیدا ئـەوان بۆخیـان خواردنیـان نـەبوو. سـەرباری هـەموو ئەمانە لایەنە شەڕکەرەکان لەسەر کوشتارو کۆمەڵکوژی و کاولکاری سوور بوون، لەم تاریکییەدا جگە لە رووناکی خودا هیچی دیکەم نەدەبینی، بەچپەدوو وتم:

- خودا مەیلی لەچی بێت، دەبێت ببێت. ئەسەر نبوو وشتە بدە دەستی خودا.

لەگەڵ ئەوەشدا گوێم لە ئاوەزی خۆم بوو بێزاری دەردەبڕی، دەپاڕایەوە، بە بێدەنگی دەیوت: (ماندوو بووم! ماندوو بووم!).

* * *

چاوی گریاوی ئاسمان رووبەرێکی فراوانی بە فرمێسکی ساردو وەك چۆڕی شیر سپی رەنگکرد. رووبەرێکی فراوانی زۆر سپی، بەڵام بە رووبارێك خوێنی زارۆك و پیرو ئافرەت لەوتاو، هەزاران مرۆڤ لە ماڵەکانی خۆیانـدا وەك مێگـەل سـەربڕان، رق وکینـە بـاڵا دەستە، ترس و لەرز زریانێکە و هێلە بە ملیۆنەها کەس دەکات، هەستی خـەڵێکێکی زۆر گڕ دەگرێت، شۆڕش بەرپا دەبن، پارت و گرووپی هەمەجۆر تەنانەت لـە سـابڵاخی داماریش دڵی کەس راناگرن، جۆش و خرۆشی جۆراوجۆر لاوی هەرزەکار هان دەدەن. زۆر کەس ماندووبوونی خۆیان ئاشکرا دەکەن، ماندوو بوونێك هزری شلۆمۆ بەشـێوەی رازو چپەدوو رای دەگەیەنێت و نایەوێت بـەدرۆی بخاتـەوە، یـان نکـۆڵی لـێ بکـات، بـەڵام نهێنییەکە لای خۆی دێڵێتەوەو نایدرکێنێت، هەموو ئەم دنیایەی بەسەر شانی خۆیـدا داوە، لەمـەوبەر ئایندەی وەك کتێبێکی کراوە دەخوێنەوە، کتێبەکەشی وا کۆتایی دێت، بـەڵام کتێبەکـە کۆتـایی نـەبوو، بـاوکی سـەلمان دڵنیـا بـوو کـە ئـەو لـە هـەموو مەینەتەیـیەکدا تا کۆتایی خۆی رادەگرێت و دواجار بەرەو بنیاتنانی ئایندە، بـۆ ئێـرە سابڵاخی زێدە دەگەڕێتەوە. ئەوا ساڵی ١٩١٨ هات و هێشتا پێکـدادان لـە ئارادایـە، کتێبەکەش داخراوە، بەڵام حەکایەتەکە هێشتا کۆتایی نەهاتووە.

بەلشەفی، مانشبێگی، خۆراگران، پارێزەران، دادپەروەری، سۆشیالیستی، شـیوعی، ئیسلامییەکان، هەوادارانی رووس، لایەنگرانی عوسمانلی، جـەنگ، تـرس، برسێتـی، کوشتار، هەڵاتن و سابڵاخیش وا دانیشتوانەکەی خۆی جێی دەهێڵن، تەنانەت براکانیش رۆیشتن ئەو لەسەر پەیمانی خـۆی مـاوەو سەرپەرشـتی ئـەو دەسـتەبژێرەی جوولەکـەی شارۆچکەکە دەکات کە ماونەتـەوە. هێـشتا هـەموو بەیانییـەك دەرگـای کەنیـسەکە دەکاتەوەو چاوی بە ژمارەیەکی کەمی جوولەکەی شارۆچکەکە دەکـەوێت، کـە هێـشتا خۆیان بەخاك و خۆڵی زێـدو بـاوان و سـەردەمی منـداڵی و هـەرزەکاری بەسـتۆتەوە.

سـابلاخی خۆشەویـست و بـە زۆردارەکـی گیرۆدەبـوو، لـە مـاڵـەوە خێزانەکـەی خـۆی میوانەکان، خۆراکیش وا بە ئاشکرا لەکەمی دەدات، چونکە جگە لە خودای زیندوو و بەردەوام، هیچ شتێك بەردەوام نابێت، ئەمجار رادەسـپێرم دەسـت بەخۆراکـەوە بگرێـت، قسەو باسەکانی لەگەڵ میر دەربارەی رووداوەکان بـوو، مـیر هەمیـشە مـەیلی بـەلای عوسمانییەکاندا دەچوو، تەنانەت پاساوی بۆ ئەو تاوانانـەش دەهێنایـەوە، کـە سـوپای عوسمانی کردبوویان. سەرباری ئەوەش رژێمی رووسـیای شـیوعی دەسـەڵاتی کوشـتاری لەوە ترسناکتری پیادە دەکرد، بەڵام بـاوکی سـەلمان لـە دەوروبـەری خـۆی لـە ئـاژاوەو پاشاگەردانی پتری نەدەبینی، ئاژاوەیەك مێژوونووسـەکانیش لـەدوا رۆژدا لـە حـەناس لابردنـی ئەمومــژی ســەر رووداوە راســتییەکان دەستەوەســتان دەبــن، تەنانــەت لەدەستنیـــشانکردنی رووداوی ئـــەو ســـەردەمەو مێژووەکـــەی و هۆکارەکـــانی و وردەکارییەکانی سەرکەوتوو نابن. ئیدی باسەکە دەربارەی رووداوی ساڵانی جەنگەکـە و مانگەکانی ئاخر و ئۆخری بەتایبەتی لەسەر ئەم ناوچەیە بوو لەگەڵ جیاوازی گونجان و نەگونجانی زۆر، رەنگی دابووەوە.

لە مانگی نەورۆزدا هەواڵ هات گوایا موسڵمانەکانی باخۆ ترسیان لێ نیـشتووە و بەکۆمەڵ لە پایتەختی ئازەربێجان هەڵدێن. لەکاتێکدا ئەم ترسە لەوپەڕی دابوو، لەناو ماڵەکەی باوکی سەلمانەوە هاوارێکی سامناك و لەجۆرێکی تـر بیـسترا، هاوارەکـە لـە ژوورەکەی ئەڵماسەوە دەهات، بەستەزمانە بەدرێژایی مانگـەکانی دوایـی بەسـۆزێکی زۆرو بەپەرۆشەوە خۆی بەسەر زگەکەیدا دەنوشتاندەوە. ئەمجار بەنیگایەکی سـۆزاییەوە تەماشایەکی فاتمەی کردو وتی:

- پێدەچێت ئەڵماس ژان گرتبێتی.

بەجووتە لێی وەژوور کەوتن و بینیان دەستی بە سکییەوە گرتووەو پـێچ دەخـوات و ترسێکی زۆر لەسەر رووخساری نیشتووە، قەشەنگ بەپەلە رۆیشت تا ئاو گەرم بکات، هاوارەکە لە دەرێی دەرگا داخراوەکە بـەرز بـووەو هـاوارێکی بـەبیری مـنی رۆژگـار دا هێنایەوە کە لـەو هـاوارەی ئـەڵماس دەچـوو کـە ئـەو رۆژەی گوللـە تۆپەکـە بەسـەر ماڵەکەیدا کەوت و باوکی کەوتە ژێر داروپەردووەوەو تا ئەو کاتەی لە کچێکی لـووت

بەرزو لەخۆباییەوە گۆڕاو بوو بە نیمچە مرۆڤێك، یان مرۆڤێکی تۆقیوو هەڵاتوو. هەردوو ئافرەتەکە ئەسمەرو فاتمە لەناو ژوورەکەدا لەپای ژیاندا دەجەنگان. قەشەنگ بەخۆو ئاوە گەرمەکەوە هاتە ژوورەوە و شان بەشانی دوو ئافرەتەکە بەشداری ئەم جەنگە خێرخوازییەی کرد، دەبوو ئەڵماسی هەڵچوو هێور بکرێتەوە، دەبوو ژیانی خۆی و کۆرپەکەی رزگار بکرێت...، ئەڵماس! جەنگ چەند ترسناکە! ئەمەیان لە هەموو شوێنێك بۆ هەموو ئازارێك و بۆ هەر کارەساتێك و کۆستکەوتنێك دەوت و هەمیشە لەسەر زاریان بوو، تەنانەت بۆ منداڵبوونەکەی ئەڵماسیش هەر وایان وت: کەسێك نەیزانی کێ هۆکاری ئەم منداڵبوونە سەیرەی ئەڵماسە. بێگومان جەنگ هاوبەشی راستەوخۆی ئەم هۆکارە بوو. ئەڵماس! خۆشەویستم ئارام ببەوە، هۆ داماوەکە ئارام ببەوە! هۆ...

کێ لەو بارەڕەدا بوو کە ئەمە روو دەدات!

چوومە ماڵەوەو منداڵەکان بە مزگێنی دانەوە پێشوازییان کردم:

ـ ئەڵماس منداڵی دەبێت! ئەڵماس منداڵی دەبێت!

هاوارە جیاوازەکەی پێش من گەیشتبووە ئەوان، هاواری ئێش و ئازار، هاواری ترس لەشتێکی نادیار.

مێر لەوسەری حەوشەکە دانیشتبوو چاوی لە ئاسمان بڕیبوو. وام بۆ دەرکەوت کە بەبێ دەنگی خۆی دەدرێنێت، لام سەیر نەبوو، چونکە ماوەیەك بوو خەڵکی ئەم شارۆچکەیە دەستیان بەخۆ دواندن کردبوو، قسەیان هەڵدەبزرکان و وەك ئەوەی لەگەڵ کەسێکی نەبینراو گفتوگۆ بکەن، دەستیان رادەوەشاند، هەندێکجار قۆڵیان هەڵدەماڵی و لەگەڵ تارماییگەلێ دەبوو بە دەمەقاڵێیان کە بەچاو نەدەبینران. بە هەناسەهەڵکێشانێکەوە پێم وت:

- ئەم داماوە لە ئەنجامدا وا منداڵی دەبێت.

وەك ئەوەی گوێی لە من نەبووبێت، پرسی:

- شلۆمۆ، لە دەرەوە هەواڵی چی هەیە؟

وتم:

- میر، باشتر وایە هەر نەزانیت، هەرچەندە ئێستا رۆژی رووناکە، بەڵام ئاسۆ تەڵخ و تاریکە.

دەنگی هاوارە ترسناکەکە، کە لە ژووری (لەدایك بوون)ەوە دەهات کپ بوو، تەواو کپ بوو، تەنانەت ترسم لێ نیشت کە ئەڵماس دوا هەناسەی دابێت. ئەی کوا دەنگی ئەسمەر، کوا دەنگی فاتمە؟ خۆ ئەگەر ئەڵماس بۆ یەکجاری کپ بووبێتەوە، ئەوا هاوسەری هاوکارەکەم و هاوسەرەکەی من هاواریان لێ بەرز دەبووەوە، نەخێر، ئەڵماس نەمردووە. منی رۆژگاری شایەتحاڵ لە هەموو شوێنێك بووم، من بوونەوەرێکم و لە هەموو جێیەك چاوم هەیە، لەو ژوورە داخراوەشدا چاوم هەبوو. ئەڵماس نەمردووە، بەڵکو منداڵی بووە بۆیە دەنگی هاوارەکەی کز بووە، منداڵەکەش نێرینەیە. دوو ئافرەتەکە شادمان بوون و هاوکات شڵەژابوون، ئێ خۆ هەر یەکێکیان سێ زگی کردووە، ئەی بۆچی منداڵەکە ناگری! ئەسمەر دەستێکی بە پشتیدا داو فاتمەش هەردوو لاقی منداڵەکەی بەتوندی بەرز کردەوەو سەری بەرەو زەوی و ئاراستەی ناوکی شۆڕ کردەوە، بە جووڵەیەکی توند هێنایەوە دۆخی ئاسایی خۆی، ئیدی منداڵەکە دەنگی گریانی بەرز بووەوەو هەواڵی هاتنە ئەم دنیایەی راگەیاند. لەوەبور هەردوو ئافرەتەکە دەست بەقریوە بکەن، لێ هێشتا خەم ماڵەکەی جێنەهێشتبوو، جگە لە ماڵەکە گەڕەکەکەو شارۆچەکەیشی گرتبۆوە باڵی بەسەر بەشێکی زۆری جیهاندا کێشابوو. شادییەکە خەفەکرا، خنکابوو، سەرقاڵی و پەرۆشێك جێگەی گرتبۆوە. مەلۆتکەکە پاکەوەکرا، قومات کرا، هەموو شوێنەکە پاك کرایەوە، ئینجا ئەڵماس لەبێ ئاگاییەکەی دێتەوە سەرخۆ، دەستەکانی دەگێڕێت، سکی بەرزەوەبووی پووکاوەتەوە. کوا زگم؟ کوا کۆرپەکەم؟ ها بیگرە عەزیزم! ئەمە کوڕەکەتە ئازیزم! دەستی پێدا دەهێنێت، وەری دەگرێت و بە جووڵەیەکی زگماکانە بەرەو مەمکەکانی دەیبات (پەنا بەخوا!) فاتمە دەڵێت: (خۆ سەرەڕای شڵەژان و هات و هاوارەکەی ئەمەی کرد!) ئەسمەر وەڵامی دەداتەوە: (پەرژینێکی قایم بێت تۆ تەماشای ئاژەڵەکانی نێو گەوڕەکە بکە...، ئەمە دانایی خودایە). فاتمە بەردەوام دەڵێت: (پەنا بەخوا! پەنا بەخوا!).

ئەڵماس دەست بە جەستەی کۆرپەکەیدا دەهێنێت! لەمیانەی نیوە لەخۆ چوونێکەوە ورەوڕێك دەکات (حەسەن! حەسەن!) وشەیەکی پەرۆشاوییە و بێدەنگی دەسمێت و وتن بێدەنگ دەکات، حەسەن! حەسەن! حەسەن!

حەسەن؟! ئەرێ ئەم حەسەنە کێیە کە ئەڵماس بانگی دەکات، ئەوە کێیە وا بەم هەموو خۆشەویستییە هەڵقوڵاوەو لە دۆخی نیمچە لەخۆ چوون و بێهۆشییەوە ناوی دەبات؟!

شەوەکەی ئەسمەر بەسەرسوڕمانەوە باسی ئەوەی بۆکردم، نیگەران بووم، شەکەتی خەریك بوو رۆدەچووە نێو هەموو خانەکانی جەستەو روحم، ئەمە قورساییەکی دیکەیە کەوتە سەرشانم. قسەکەی ئەسمەر گومانێکی گەورەی لە ناخمدا وەگا هێنا، رەنگە ئەڵماس پەیوەندی لەگەڵ باوکی کۆرپەکەدا هەبووبێت، بێگومان هەروا رەوتەنی دەست درێژی نەکراوەتە سەر، ئەی من، چەند حەزم دەکرد ئەم منداڵە بگرمە خۆم و بایەخ بەخۆی و دایکی بدەم و ناوی بنێم (ناحوم؟!) بە ئەسمەرم وت:

- وەك هەر منداڵێکی جولەکە لە رۆژی هەشتەمیدا خەتەنەی دەکەم!

ئەسمەر وتی:

- ئەم حەسەنە کێیە؟ ئاخۆ ئەڵماس پەیوەندی لەگەڵ حەسەن ناوێکدا هەبووە، ئاخر لەوەتەی منداڵەکەی لێ بۆتەوە، هەر ناوی لەسەر زارێتی؟!

بە جەستە و روحێکی شەکەتەوە هەناسەیەکم هەڵکێشاو پێم وت:

- هەندێك شتمان لە قەشەنگ بیست، لێی دەکۆڵمەوە، رەنگە شتی دیکەمان لێ بشارێتەوە.

خەتەنەکردنەکە خاکییانە بوو ناونانی کۆرپەکەم دواخست، لەراستیدا هەر لە یەکەم ساتەوە ئەڵماس ناوی نابوو بەڵام ناوی ناحوم بۆ چرکە ساتێك لەیادم نەدەچوو.

دوای تێپەڕبوونی نزیکەی چل ساڵ بەسەر ئەم رووداوانەدا ئەمڕۆ ئێمە پتر لە (ناحوم)ێك و (یەهوودا)ی باوکیشمان هەیە، وەك منداڵەکانی مریەم و سەیون، ئەو رۆژە شتی ئازار بەخش گیرۆدەیان کردبووم. بانگی قەشەنگم کردو بە بەرچاوی هەمووانەوە لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا کرد، من دەزانم تۆ چەندین جار باسی حەسەن

بوزورگت کردووەو وتووتە گوایا بەر لەوەی بمرێت، بینیوتـە بـەدەوری (کـەلاوە)کـەی ئەڵماسدا سوڕاوەتەوە. ئەمەش لە شەودا روویداوە، ئەو دەمەی کە خواردنی شێوانت بۆ بردووە، ئەسمەر دەڵێت: کاتێك بۆ هێنانـەوەی قاپـە بەتاڵـەکان دەچـوویت، ماوەیـەکی زۆرت پێ چووەو ون بوویت، قەشەنگ راستم پـێ بێـژە دەربـارەی ئـەوە چـی دەزانیـت؟ ئەوەش بزانە درۆکردن دەربارەی ئەم شتە زۆر هەستیارە تاوانە، ئەمە مەسەلەی ژیـان و مردنە، قەشەنگ دوو جۆرە رەنگ لە رووخسارتدا بەدی دەکرێت، رەنـگ هـەڵبزڕکان و زەردبوونەوەی ترس و سوور هەڵگەڕانی شەرمکردن.

من شلۆمۆ کەتانیم، ئایا بەوە خۆت دەخەڵەتێنیت کـە بتوانیـت بـەرەو ئاراسـتەی راست پاڵم پێوە بنێیت، لەکاتێکدا بـۆ ئـەوەی بگەمـە راسـتییەکەی گەرەکـە بـەرەو ئاراستەی چەپ بڕۆم؟ وەك مەیمون ترمە ترم دەکـات، نەفرینـە زمـانی بەسـترا، خـۆی کرکرد تا بواری شڵەژان و ترس و شەرم بۆ جەستەی خۆش بکات، دەی کچم، قسە بکەو مەترسە!

دەترسیت و شەرمیش دەکەیت؟! پێش ئەوەی زمانت بێتە گۆ جەستەت ئـەوەی وت، من بەڵێنت پێدەدەم کە هیچ ترست نەبێت، بەڵام بۆ بەرژەوەندی راستی باشـتر وایـە واز لە شەرمکردنەکەت بێنیت، هانیم دا، ترساندم، هەڕەشەم لێی کـرد گـەر لەکاتێکـدا راستی نەڵێت، تەنانەت هەڕەشەی فەلاقەکردنیم کرد، ئاگادارم کردەوە کە درۆ نـەکات، قەشەنگ، نەکەی قسـەیەك زیاد یان کەم بکەیت، دەی بڵێ چیت دی؟!

دەرکەوت کە نەفرینە هەموو شەوێك لە مـاڵ دەرچـووەو بیانووەکەشـی هەمیـشە قاپەکان بووە، زۆر جار لە کاتی تۆپبانە ترسناکەکاندا بێ ئـەوەی کـەس بزانێـت دزەی کردووە، ئینجا بە قاپـە بەتاڵـەکانی نـان خـاردنی شـێوانی ئەڵماسـەوە گەڕاوەتـەوە، بڕێکجار چەندین سەعات خۆی ون کردوە. لەدەرەوەی ژوورەکەی ئەڵماس کـە دەڕوانێتـە شەقامەکە، وەستاوە، لەو تاریکییەدا لەنێو ژوورەکە رووناکییەك دیـار بـووە. حەسـەن بوزورگ هەموو شەوێك گەیشتۆتە ئەڵماس، ئەڵماس سڵی لە حەسەن نەکردووە، بەڵکو ئامێزی بۆ کردۆتەوەو پێشوازی لێکـردووە، ئینجـا... قەشـەگ ماوەیـەکی زۆر شـڵەژاو زمانی بەسترا. ئەوەی روویدەدا خەجاڵەتم و پێم شەرمە باسی بکەم! هەی نـەفرین ئـەوە

بەراستتە؟! بۆ گێڕانەوە و قسەکردن شەرم دەکەیت، کەچی شەرمت لە بینینی نەدەکرد؟ شەرم دەکەیت ها... ئێ تۆ شەوانە دەڕۆیشتیت تا ئەوەی ڕووداوەکان ببینیت؟ گەورەم ئەوە خۆ تێهەڵقورتان بوو، کەواتە هەی کچی سەگ قسە بکە!

جلەکانی لەبەر خۆی و ئەڵماس دا دەکەند، ئەو ڕۆژانە کەشەکەی هاوینە بوو، پێکەوە دەنووستن، هەندێکجار پێکەوە خۆیان دەشووشت. ئیدی هەندێك شتیان دەکرد لەڕووم نایات باسی بکەم، هەموو شەوێك هەمان شت بوو، گەورەم هەموو شەوێك!

- هەی نەفرین، تێرت لەو سەیرکردنە نەدەخوارد؟

- سەری بەردایەوە، وتم:

- سوێند دەخۆیت، کە تۆ هەموو ئەمانەت دیوە؟

- بەسەری باوکم سوێند دەخۆم.

- قەشەنگ ، بە کتێبی خودا سوێند بخۆ.

- گەورەم، سوێند دەخۆم ئۆباڵی بەم گەردنەم.

ئاسوودە بووم و هاوکات هەلا هەلا بووم.نهێنییەکە ئاشکرابوو، تاڕادەیەك ڕاستییەك دەرکەوت. حەسەن بوزورگی خوالێخۆشبوو بە ئارەزووی مێبازی ناسرابوو، ئیتر چۆن دوێنێکی بێ پشت و پەنا ناقۆزێتەوە؟

دەربارەی قەشەنگیش بەر لەوەی ئەمیش بێ شووکردن سکی بەرز ببێتەوە، گەرەکە لە دەرفەتێکی نزیکدا مێرد بکات.

* * *

وای لە خەمە زۆرەکانت! هەوڵ دەدەیت بیانشاریتەوە، کەچی لە خرپەی خەودا، لە پەرش و بڵاوی هزرتدا، لە شڵەژانی هەڵسوکەوتتدا ئاشکرات دەکەن، تا ئەمەش خەمێکی تازەیە، چۆن لێی قورتار دەبیت و چی دەکەیت؟

لە منداڵەکە ورد دەبیتەوە، هێشتا سیمای نەخەملیوە، بەڵام تۆ چاوت تیژەو بیری لێدەکەیتەوە کە چۆن گەشە دەکات، گوێت لە ئەڵماسە بە پەرۆش و خۆشەویستییەوە ناوی (حەسەن) دەهێنێت. قەشەگ سوێندی گەورە دەخوات کە پێش مردنی حەسەن هەموو شەوێك بینیوێتی تێك ئاڵاون، ڕاستی گومان ناهێڵێت، لێ دەکرێت میوانە

بچکۆلە نوێییەکەت بێتە ریزی منداڵەکانتەوەو لەژێر چاودێری خۆتدا پەروەردە ببێت، لەگەڵ ئەوەشدا بە تەنیشتەوە ماڵێك خەم بارگەی لێخستووە، ئەو دەمەی حەسەن بوزورگ پێی خستە ماڵەکەتەوەو لە ماڵەکەتدا بەلادا هات و مرد و تارۆژی پەسلان ماڵەکەت جێ ناهێڵێت. ئەو حەسەن بوزورگە لاوە تازە پێگەیشتووەی کە لە هەموو سابلاخدا وا ناسرابوو کە مێبازەو لە ژن پتر خەمێکی دیکەی نییە، ئەلماسیش لەجیاتی خواوەند ناوی ئەو دەبات و ئیدی هەتا هەتایە ناگەڕێتەوە، تۆ دەتوانیت ئەو خەمەی باڵی بەسەر بوزورگدا کێشاوە بڕەوێنیتەوەو نەیهێڵێت. ئەوسا دڵانێکی برینـدار سارێژ دەکەیت و هەندێك تەراییان تێ دەخەیتەوە، ئەسمەر کە پاسەوانی ئاسوودەیتە، پێت دەڵێت:

- باوکی سەلمان، دڵی خۆتم بۆ بکەوە، دەبینم تادێت حاڵت خراپ دەبێت و خەمەکانیشت لە کەس شاراوە نییە.

- ئەسمەر، لەم دۆخە نەفرینەدا کێ دەتوانێت لەم خەمانە هەڵبێت، خەمەکانم زۆرو جۆراوجۆرن، ئەم خەمەی دوایی جێگەی پێ تەنگ کردووم، بەڵام من بڕیاری خۆم داوە، ئەسمەر، ئەم بڕیارە ئازارمان دەدات، رەنگە بەدرێژایی ژیان لەخۆم خۆش نەبم، بەڵام ئەسمەر من لەگەڵ دادپەروەریدام. رەنگە ئەم دادپەروەرییەش هەندێك کەس لەنێو چڵپاوی کارەساتە ترسناکەکە ریشەکێش بکات.

* * *

بەڵێ باوکی حەسەن، ئەمڕۆ دەتوانیت بە پارە خۆراك بکڕیت، بەڵام ئەی ئەو خەمەی باڵی بەسەر ماڵەکەتدا کێشاوە...؟! کارەساتەکە لە ماڵەکەی مندا روویدا. ئەو حەسەنەی خۆی بە قوربانی ئێوەکرد و جێی هێشتن، ویستی خواردنتان بۆ بهێنێت، ئەو مردو ئێوە ژیان، بەڵێ چ دژ یەکێکە! ئێوە دەڵێن لەگەڵ ئەودا ژیان کۆتایی هات. ئەم خەم و کەسەرەی کە بۆ کوڕە تاقانەکەتان بارگەی خستووە، دڵ پارە پارە دەکات، بەڵام حەسەن نەڕۆیشتووە! حەسەن وەچەیەکی خستۆتەوە! هۆ باوکی کۆستکەوتوو! بەڵێ حەسەن نەوەیەکی بۆ خستوویتەوە! هەرچەندە ئەو لە ماڵەکەی مندا گیانی سپارد، بەڵام نەوەکەشت هەر لە ماڵەکەی من چاوی هەڵهێنا. لە ماڵەکەی منەوە مزگێنی ئەیووبت پێگەیشت و هەر لە ماڵەکەی منەوە بانگی مزگێنی ژیانت پێگەیشت. دەزانم

تۆ تێناگەیت، باوەڕ ناکەیت، سەرت سوڕ دەمێنێت، دەشڵەژێیت و وا دەزانیت من وڕێنە دەکەم.

ئەریّ قەت بیستوتە کە شلۆمۆ کەتانی لەجۆرە هەڵوێستانەدا ڕۆژێك لە ڕۆژان وازی لە پەرۆش و سەنگینی و بەهۆڵەوە بوونی خۆی هێنابێت؟! ئایا لەوەتان پرسیوەتەوە کە خوالێخۆشبوو هەموو شەوێك بۆ کویّ دەچوو؟!

قەشەنگی کارەکەرم شایەتحاڵەو پێش ئەوەی دەست بەکتێبی خوادا بدات و سوێندی پیّ بخوات، چیرۆکەکەتان بۆ دەگێڕێتەوە، دەی قەشەنگ، دووبارە حەکایەتەکە بگێڕەوەو وشەیەکی لیّ کەم مەکەرەوە، جارێکی تر رووخساری قەشەنگ لە شەرمان سوور هەڵدەگەڕێت و زمانی تەتەڵە دەکات. دەی قسە بکە، شایەتیدانی تۆ ئەم دڵە خامۆش و پڕ کەسەرانە دەژێنێتەوە.

دایکی کۆرپەکە بەبیّ برانەوە هەر ناوی دێنێت، حەسەن وێردی سەر زمانێتی و منداڵەکەش چون باوکی پەرستراوێتی، قەشەنگ بیانهێنە ژوورەوە، ئاگات لە حەسەنی بچووك بێت و بیپارێزە. وێنەی حەسەن رەشپۆشکراوەو بەقەد دیواری ژووری گەورەکەدا هەڵواسراوە. ئەڵماس بەرەو وێنەکە رایکرد و شێتانە ماچی کرد. ئەڵماس دەگری و بانگ دەکات (حەسەن! حەسەن! حەسەن!) وا کوڕەکەم بۆ هێناویت، هۆ حەسەن! راسپاردەکەتم بیر نەکردووە! ئا ئەمە حەسەنی کوڕتە، هۆ حەسەن!) سەرسامی و واق ورمانێك باڵ بەسەر ژوورەکەدا دەکێشێت و سەردەکات، نیگاکان ئاراستەی دەموچاوی حەسەنی بچووك دەبن و لێی ورد دەبنەوەو فرمێسکی بێدەنگ بەسەر گۆناکاندا دادەبارێن.

دوای ئەوەی ویژدانی خۆم ئاسوودە کردو قورسایی یەکێك لە خەمەکان لەسەر دڵم نەما، ئەسمەر وتی:

- باوکی سەلمان، ئەڵماس و کوڕەکەیمان لەدەست چوو.

خەمێکی تر چنگی لیّ گیرکردم و وتم:

- ئەو دەمەی باوکیمان لەدەست چوو، ئەڵماسمان لەدەست چوو، بەڵام دەربارەی کوڕەکە، ئەسمەر بێگومانم کە حەسەن بوزورگی باوکی بۆ لای کەسوکاری گەڕایەوە.

* * *

ئەمــە چــییەو کــێ لەپــشتییەوەیە، ئــەی چــۆن دەکەوێتــەوە؟ تەنانــەت حەســەن چەخماخیش بوو بە دوو بەشەوە، ئاخۆ هاوکاری دەکات؟ لایەنگرییان دەکات؟ ئایـا بـێ لایەن دەبێت، یان دژایەتییان دەکات؟ بیست و هەشتی ئایارە، لـە بـاخۆ دەنـگ بـەرز دەبێتەوەو لە هەموو جیهان دەنگ دەداتەوە (ئازەربێجـان بەهــەردوو بەشـی بـاکوور و باشوورییەوە دەوڵەتێکی دیموکراسی سەربەخۆیە). کێ لە پشت ئەمەوەیـە؟ ئینگلیـز؟ سۆڤییەت؟ عوسمانییەکان؟ ئازەرییەکان خۆیان؟ کەسێك راستییەکەی نەدەزانی، بـەڵام باسی هەندێك ناو دەکرا، شارۆچکە کۆستکەوتووەکە بەهەندێك دروشم و ئاڵایەك و بـە پارەیەکی نوێ وەگاهات. حەسەن چەخماخ پێی باشبوو چاوەڕێ بکات، بەڵام بەهەوادارنی خۆی وت (ئێمــە سوشیالیــستی بەلــشەڤین و کــوردی ئێــرانین، چــاوەڕێ دەکـەین، تـا تەمومژەکە دەڕەوێتەوە)، بەڵام دانیشتوانی ســابلاخ هــەر ئەوەنــدە رۆژیــان لــێ بــووەوە نارەزاییان دەربڕی، پارە ئازەربایجانییە نوێیەکە لە کاغەزەو چۆن ئەڵماس بـە خـەڵووز بگۆڕنەوە؟!

میر وتی:

- هەرچییەك بن، رووخسارییان هەر ئاشکرا دەبێت، ئەوانـە ساختەچـین و زێڕەکـەی ئێمەیان بەرانبەر کاغەزەکەی خۆیان دەوێت. سوپاسی خـودام کـرد کـە هـیچ زێـڕێکم نەماوە، نە زێڕم ماوەو نە پارەی کاغەزم هەیە، بەپێچەوانەی خـودی خـۆم گلــەیم لای میر کرد:

- هاوکار و هاوبەشم، وا دەبینیت کە ماندووبوون جگـە لـە هەناسـەبڕکێ هیـچی دیکەی بۆ نەهێشتوومەتەوە، ئیدی گوێم لەوە نییە کەی خـۆر هەڵـدێت و کـەی ئـاوا دەبێت؟!

بەڵام ئەوی گیرۆدەی پارە وتی:

- ئاخر سبەینێ چۆن بازرگانی بەم کارەوە بکەین؟ ئایا بەستەیەکی تەواو بەرانبــەر هەر کیسەیەکی بچووك لە زێڕ لەگەڵ خۆماندا ببەین؟

هەموو شتێك لەبەرچاوم لێڵ و تەماوی بوو، بەچپە وتم:

- باوکی محەمەد، با بزانین ئەم سبەینێیە چۆن دەبێت، ئاخۆ تەمەکە دەرەوێتەوە، تا یەکەم جار بەر پێی خۆمان لەم ژیانەدا کە ژیان نییە، ببینین؟

ماندوو بووم! ماندوو بووم! ئەمە بەخۆم دەڵێم و ناگاتە گوێچکەی کەس، ئومێدەوارم کە رووالەتم ئاشکرام نەکات و رووخسارم گومانم بۆ پەیدا نەکات. کەنیسە چۆڵە، یان خەریکە دەبێتە چۆڵەوانی دەرگاکەی دەکەمەوە و دادەنیشم و چاوەڕێ دەکەم، روحی مردووەکانمان دێنمە بەرچاوی خۆم، کە چاوەڕێمانن دوعاو نزای قەدیشیان بۆ بخوێنین، ئازار دەکێشم. دەمێکە دە پیاوەکە کۆنابنەوە، هەموو دەڕۆن لە سابلاخ هەڵدێن، زۆریان چەشت و من لەوان زۆرتم چەشت، ئەرێ ئەوە راستە گوایا هەر کەسێك ولاتی خۆی جێبهێڵێت ترسنۆکە؟ ئەرێ ئەوە راستە هەرکەسێك شوێنی لەدایکبوونی خۆی جێبهێڵێت خائینە؟ من چەند کەللە رەقم! هێشتا خۆم باخاك و خۆڵی سابلاخ و گۆڕستانەکەی سابلاخەوە کە ئارامگای خۆشەویستانمە بەستۆتەوە، تۆ ئەی حاخام میخائیل چاوەڕوانی چیت؟ پێم دەڵێت: (باوکی سەلمان، مادام تۆ لێرەیت، منیش لەگەڵتدام!). پەیکەرەکە دەکەمەوە، لاپەڕەکانی تەوراتی کۆن هەڵدەدەمەوە! پێشبینییەکان لە هەناویدان و لە هەناوی تۆش دان، دەی پێمان بڵێ پێشبینیی رووداوی چی دەکەیت؟ ئاخر روحە بێگەردەکەم وا خەریکە ژەنگ دەگرێت و ئاوێنەکەشم تەڵخ بووە، ئیدی نازانم ئەو ساتەی وا بەرێوەیە چی لەگەڵ خۆیدا حەشار داوە، هەموو دنیا نازانن ئەو ساتە چی ئاشکرا دەکات. بۆچی؟ بۆچی؟ ئەی خودایە ئەم شارۆچکە داماوە چ تاوانێکی کردبوو تا بەجۆرە ئەم زەبرە کوشندەیەی لێ بووەشێنیت؟!

(تاکەی چاوەڕێ دەکەیت؟!) حاخام میخائیل و ئەو نوێژکەرانەی ماونەتەوە ئەم پرسیارە دووبارە دەکەنەوە. بێ سودە، دە پیاو کۆنابنەوە، لەکۆتاییدا هەر کەسەو بە تەنها نوێژ دەکات، نوێژی تاکەکەسی، بێ خوێندنی (قەدیش) بێ وتنی (ئامین-براوامان هێنا)، بێ گدشانەوە، بەڵکو بەشتێك، وەك خەمبارییەك نوێژ دەکەن، ئێمە خەریکە نوێژی بەکۆمەڵ و زۆر ئەرکی دیکە لەدەست دەدەین. ئەفسووس! ئەمێستا ئێمە چۆن بە دەنگ داواکانی مردووەکانمانەوە بچین و درووود و وێرد بۆ رووحیان بخوێنین، تا لە ئاگر دووریان بخاتەوەو لە بەهەشت نزیکیان بکاتەوە؟ هۆ ناحومی جگەر

گۆشەم، تۆ ئیستیری بچووکم، ئایا ئێوە بەڕاستی گوناهێکتان کردبوو شایانی ئەوە بن که بە ئاگری دۆزەخ ئازار بدرێن؟! ئاخر ئێوە کانیاوی پاکی بوون و شادیتان دەخستە دڵی چۆڵ و هۆڵەوە، هەر بۆیە شایانی بەهەشتن. ماندوو بووم! ماندوو بووم!، بەلام ئەمە لای کەس مەدرکێنە، چونکە هەمووان وا تۆیان ناسیوە وەك دارگوێز، وەك داربەڕوو، وەك دارمازوو سەختیت و ماندوو نابیت، لەکاتێکدا نوێژم دەکرد و ئەم غایلانەم بەخەیاڵدا دەهات و لە نوێژەکەم لام دابوو، خودا ببەخشە! خودایە غایلەکانم و خەمەکانم دەم کوژن. لەم ڕۆژانەدا خەڵکی جگە لە پارە بایەخ بەهیچی دیکە نادەن، کاغەز بەرانبەر بە زێڕ، وادێتە بەرپای گوێم کە بای ڕۆژئاوا دەنگی پێکدادانێکی دوور لەگەڵ خۆی دێنێت، بەلام بێگومان دوای چەند ڕۆژێك نزیك دەبێتەوە...، بەلام شەڕی نێوان مورتەزاو وەلی وایلیهات هەموو شتێکی رامالی. ئەو دەنگە دوورە تەقەی عوسمانییەکانە و ئاراستەی سووپای(سوور) دەکرێت، دەبا عوسمانییەکان هەر نەسرانی و جوولەکە بکوژن، بەلام رووسەکان ئێستا بوون بە (پارێزەری مرۆڤایەتی)، ماندوو بووم، ماندبوو بووم! خودایە، جگە لە تۆ ئەمە بە کەسی تر نالێم.

حاخام میخائیل لە خەیاڵەکانم وە ئاگای هێنام، لەپڕ دەرکەوت ڕۆژەکە لەسەرخۆ بەرەو کاتی چێشتەنگاو دەڕوات، چاوێکم بەدەورو بەری خۆمدا گێڕا، کەنیسەکە چۆڵ بوو، ڕوومکردە پەیکەرەکە و تەوراتم ماچکردو دەرگای کەنیسەکەم داخست و ڕۆیشتم.

ئەسمەرو فاتمە لە حەوشەکە دانیشتبوون و قسەیان دەکرد، قەشەگ لەچێشتخانەکە بوو. قەشەگ ماوەیەکی تر هیچ شتێك نامێنێت کە لێی بنێت، چونکە وا خەریکە پارە کۆتایی دێت، هەروەها کۆگای خۆراکیش، بەوەی باشە پێویست بەوە نەماوە خواردن بۆماڵی بوزورگ بنێرین، چونکە باوکەکە لە شوێنی دوورەوە دەیهێنێت. میر لەوسەری حەوشەکە دێت و دەچێت، پیرەمێرد و پیرێژنەکەش خۆیان داوەتە بەر خۆرەکەو چپە چپیانە، بێزاریم لە رووخساری میردا خوێندەوە، بەرەو لای چووم و گلەیی لێکردم.

- شلۆمۆ، وات لێهاتووە دوا دەکەویت و بە تەنها لەگەڵ ئافرەتەکاندا جێم دەهێڵیت!

وتم:

- بیرکردنەوەی تۆ تەنها ئەمە نییە، بەڵکو شتی لەمە زۆر گرنگتر هەیە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە!

بەدەم هەڵسوڕانی تەزبیحەکەیەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا:

- باوکی سەلمان، چی روودەدات؟

- لە ڕێگە بیستم کە عوسمانییەکان گەڕاونەتەوەو بەرەیەکیان رووەو ئێمە کردۆتەوەو بەرەو تەورێز پێشڕەوی دەکەن.

وتی: خۆزگە زوو دەهاتن.

وتم:

- ئەمجارە ناهێڵن جوولەکەیەك، یان نەسرانییەك گیان دەرباز بکات، هێشتا دەستیان بەخوێنی هەزاران ئەرمەنی وشك نەبۆتەوەو کۆمەڵکوژی لە هەموو شوێنێك بەردەوامە و پارەی کاغەزیش بە زێڕ ناگۆڕنەوە، گەنجینەکەیان لە ئەستەمۆڵ هیچی تێدا نییە.

بە بێزارییەوە دەنگی هەڵبڕی:

- کەواتە نەفرەتی خودا لە هەموویان، دەبا سوپای شا بێت و رزگارمان بکات! نازانم ئێمە چین؟ کوردین، ئازەرین، رووسین، عوسمانین؟!نەخێر ئێمە ئێرانین و بڕایەوە، دەبا شای قاجاری لە خەو بێداربێتەوەو هاوڵاتیانی خۆی بپارێزێت!

- میر، ئێمە کوردین و سابلاخین. ئێرە ماڵی ئێمەیە، هاوکارم ئێمە لێرە لە دایك بووین، ئەو رۆژەی من لە تاران بووم و خۆراکم دەکڕی، بیرێکم بۆ هات (بۆچی من لەجیاتی ئەوەی کەسوکارم بۆ تارانی ئارام و ئاسوودە بهێنم، دێم لە تارانەوە خۆراك بۆ سابلاخ دەبەم؟!)، هەر زوو بۆم دەرکەوت گەر وا بکەم من خیانەتی لەخۆم دەکەم، میر، من لامل و سەر سەختم، من کوردم، بەڵام ماندوو بووم و تەنانەت شتێکم نەماوە تا خێزانەکەمی پێ بژێنم، جوولەکەکانی سابلاخ وا جێی دەهێڵن، ئەمڕۆ جگە لە خۆم و سێ پیاوی تر کەسی دیکەم لە کەنیسە نەبینی، رەنگە ئێستا لە بیانوویەك بگەڕێم تا ئەم ماڵەی خۆم بەجێبهێڵم، کە ئەو رۆژگارە بیرۆکەی جێهێشتنیم بە خیانەتی دەزانی، عوسمانییەکان پێشڕەوی دەکەن، ئەوەی لە ڕێگەیاندا بەدڵیان نەبێت دەیکوژن. باوکی

محەمەد، ئێ ئێمەش بە دڵی ئەوان نین، ئیدی ڕۆژێـك دووان، یـان سـێ ڕۆژی بەسـەردا تێناپەڕێت بڕیارێکی بۆ دەردەکەن، میر بڕیارەکەش هەر ئەوەیە (خائینە!) تـای بـاوکی سەلمان چ بڕیارێکی پووچە! ماندوو بووم! ماندوو بووم! ئەی خودایـە، مانـدوو بـووم و لەمە زیاتر ماندووم مەکە!

قەشەنگ بە ڕاکردن بۆ لام هات و بەدەنگی بەرز وتی:

- گەورەم! گەورەم! پیاوێك لە دەرگا وەستاوەو پرسیاری تۆ دەکات، دەڵێت گوایا لـە تارانەوە بەتایبەتی هاتووە، تا چاوی پێت بکەوێت!

ئایا لە تاران یەکێك ماوە منی بیرکەوتبێتەوە، سـابلاخ و ئـەوەی تێیدایـە لـەبیری کەس نەماوە؟

حەزی زانین بیرو خەیاڵمی پچڕاند و بەرەو دەرگا پێمهەڵگرت، پیاوەکەم دی، لـەنیو چرکەدا شێوەی گومانی لادروست کردم، ئینجا گومانەکەم هـەر زوو لـە چـوار سـاڵی لەمەوبەر چڕبووەوە، ترس... شا... سەد قامچی... زینـدان... ڕزگـاربوون. بـەڵێ، بـەڵێ ناسیمەوە، ئەمە خۆیەتی.

- لەبیرت چوومەتەوە؟

- چۆن یەکێك لەبیر دەکەم کە لە مردن ڕزگاری کردووم؟ فەرموو جـەلالی بـەڕێز، فەرموو ڕافزی!

وتی:

بە نهێنی بۆ شتێکی گرنگ هاتووم، بۆیە بە ئۆتۆمبێلی خۆم نەهاتووم بـە نهـێنی بە ئەسپەکەم هاتم.

بانگی قەشەنگم کرد و ئەسپەکەی بۆ تەویلە برد، ئینجا بۆ ژووری میوان فەرمووم لە پیاوەکە کرد، وتم:

- هەر چەندێك لە سابلاخ بمێنیتەوە، تۆ میوانی منیت.

وتی:

- بەڵکو ئەو شتەی بۆی هاتووم پێتی ڕادەگەیەنم و بـەرەو تـاران دەگەڕێمـەوە، بـا شتەکە لەنێوانماندا بە نهێنی بمێنێتەوە.

- تۆ جارێك دەموچاو و پێیەكانت بشۆ و نیوەڕۆژە بكە و پشوویەك بدە، ئینجا بۆ ئەو شتەی پێتە گوێت لێدەگرین.

بە جەختەوە وتی:

- با ئەمانە بە پەلە بكرێن، چونكە من و ئێوەش وەك یەك كاتمان بەدەستەوە نییە،

كاتمان بەدەستەوە نییە؟! خورپەیەك بە دڵمدا هات، ئایا مەبەستی عوسمانییەكانە كە خەریكە نزیك دەبنەوە؟! ئایا لە پای ئەمەدا بە نهێنی لە تارانەوە هاتووەو ئەو ئەركی ماندووبوونەی كێشاوە؟! چاوەڕێ بكە!

وەك دەردەكەوێت داو و تەڵەكەی دەورمان تەنگ بۆتەوەو خەریكە دەمان خنكێنێت، بەڵام ڕێزی میوانە گەورەو پڕ لە نهێنییەكەت بگرە، كە لە تارانەوە هاتووە، حەزی زانین زۆر و ترسیش زۆرترو فشار دەخەنە سەر هەستم، وەك دەردەكەوێت پیاوەكە شڵەژاوەو ئەو نهێنییەی پێیەتی بێگومان گرنگە، بە پەلە نانی خوارد، ئینجا مۆڵەتی خواست كە بە تەنهاو دوو بە دوو لەگەڵمدا بمێنێتەوە، هەردووكمان بە تەنها لە ژووری میوان ماینەوەو دەرگاكەش داخرا، میوانەكە جەختی لەوە كردەوە كە نابێت كەس گوێی لێمان بێت، بەچپە وتی:

- شلۆمۆ، گەورەكە خۆت و كەسوكارت و هەموو جوولەكەكانی سابلاخ بەپەلە لە ماوەی دوو ڕۆژدا شارۆچكەكە جێبهێڵن، ئەگینا...

بەواق وڕمان و پرسیارەوە تێیم ڕووانی:

- بەڕێز پەژارەت كردم، جەلالی بەڕێز، چی بووە؟

پتر دەنگی نزم كرد:

- شا تۆ و جوولەكەكانی سابلاخی بەوە تۆمەتبار كردووە، كە هاوكاری بێگانە دەكەن، بۆیە بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەركردوون، واخەریكە تیمێكی لە سێدارەدان ئامادە دەكات، تیمەكە بۆ جێبەجێكردنی بڕیارەكە بەم زووانە دەگاتە ئێرەو تۆو كەسوكارەكەت لەسەرەووی لیستەكەوەن.

بێدەنگ بووم و سەرم سوڕا، لەسەر قسەكەی ڕۆیشت:

- هەر کە سۆسەم کرد و هەواڵەکەم زانی ئیدی بە پەلە بۆ لات هاتم، تا ئاگادارت بکەمەوە، داوات لێدەکەم لەگەڵ هەموو جوولەکەکانی سابلاخ رابکەن، شلۆمۆ کاتەکە ئەوەندەی بەبەرەوە نەماوە.

کەواتە غەدرم لەم پیاوەکرد، کە چوارساڵ لەمەوبەر تیماری کردم و خواردنی حەڵاڵی بۆ هێنام و لە زیندان رفاندمی، بێدەنگ بووم و جەلال رافزی بەچپەو وریاییەوە دەدوێت:

- شلۆمۆ ئەم یەکتربینینەمان لەبیر خۆت ببەوە، ئەوەش لەبیر خۆت دەربکە، کە من چاوم پێت کەوتووە، هیچ کەسێك بەهاتنی من نازانێت، خۆ ئەگەر کەسێك بەمەی زانی، ئەوا ژیانی خۆم و خێزانەکەم دەکەوێتە مەترسییەوە!

ئامێرانە وتم:

- گەورەم، بۆچی لە پێناو کۆمەڵە خەڵکێکی داماو و بێدەسەڵاتی وەك جوولەکەی سابلاخ، خۆت دەخەیتە مەترسییەوە؟! ئەی دوای (چاکەکەی باوکم) تۆ قەرزی منت نەدایەوە؟

بەدەنگێکی یەکجار نزم و بەچپە وتی:

- شلۆمۆ، رازێکی دیکەت لەلا دەدرکێنم، لەراستیدا من رۆڵەی بنەماڵەیەکی گەورەی جوولەکەی تارانم، لە لاوێدا حەزم لە کچێك کرد کە سەر بە خانەوادەی دەسەڵات بوو، ئێ شلۆمۆ خۆشەویستیش لە ئایین و بیروباوەڕ بەهێزترە، ئیدی بووم بە موسڵمان و ناوی خۆمان نا (جەلال رافزی)، بەڵام وەك دەبینی رەگەزو تیرە کنەی خۆیان هەر دەکەن...

لەناکاو هەموو شتەکان تێکەولێکە بوون، بیر لەچی بکەمەوە و چی بڵێم؟ نەمزانی، بەڵام ئەو دەست پێشخەری کردو وتی:

- کەواتە گەرەکە لە ماوەی دوو رۆژدا سابلاخ جێبهێڵن و پێش ئەوەی ئەحمەد قاجاری پیلانەکەی جێبەجێ بکات، ئێوە دەستپێشخەری بکەن، جارێکی دیکە تکات لێدەکەم ئەم چاوپێکەوتنەمان لەبیر خۆت ببەوەو لە خەیاڵی خۆت بیسڕەوە، بەڵێنم بدەرێ!

دەستی درێژ کرد و بە گەرمی و پێزانینەوە دەستیم گوشی و وتم:

- بەڵێنت پێدەدەم و هەرگیز ئەوە لەبیر ناکەم کە تۆ جارێك ژیانت رزگارکردم و جارێکی تریش ژیانمت لەگەڵ تێکڕای کەسوکارم و رۆڵەکانی تایفەکەمان لە سابلاخ رزگار کرد، ئێمە من و کەسوکارم و جوولەکەکانی سابلاخ بە ژیانمان قەرزای تۆین.

هەستاو وتی:

- ئەمێستا دوای ئەوەی نانم خوارد و پشووم داو ئەسپەکەشم ئالیکی خوارد، گەرەکە پەلە بکەم و بگەڕێمەوە، من ئەو هەموو رێگەیەم بڕیوە تا ئاگادارت بکەمەوە، خۆت مەخافڵێنە و خانەوادەکەت و هاوڕێیانت بۆ کۆچکردن ئامادە بکە، ئیدی بەیانی بێت، یان دوو بەیانی، بە خودات دەسپێرم و هیوای سەلامەتی بۆ هەمووتان دەخوازم.

* * *

بۆ رێ بزری و تێرکردنی حەزی زانینی ئەوانەی لە ماڵەکەدا بوون وتم پیاوەکە برادەرەو بە شارۆچکەکەدا تێپەڕیوەو بیری کەوتومەتەوەو هاتووە چاوی پێم بکەوێت و هەواڵێکم بپرسێت، ئەمەم وت و زاری خۆم بە مۆمێکی سوور مۆر کرد، کەچی کاتەکە دەڕۆیشت و مەترسییەکەش نزیك دەبۆوە، ئاخر چۆن پاساوی پێویستبوونی پەلەکردن بۆ کۆچکردنەکە بهێنمەوە؟ کۆچکردن! وەك خەونێکی ئاجرو باجرە، بەڵام وا کاتی کردنەوەی کەنیسەکە هات و هەرچەندە کەس بۆ نوێژکردن رووی تێناکات. چی بەو خەڵکە کەمەی جوولەکەکانی سابلاخ بڵێم، کە ماونەتەوە؟ رێگاکەم لە ماڵەوە بەرەو کەنیسە هۆکارەکەی بۆ رەخساندم، هەموو دەیانزانی کە عوسمانییەکان وەك رەشەبا لە تەورێز نزیك دەبنەوە و لە رێگەیاندا تووشی هەر (گاور)ێك ببن، دەیپلیشێننەوە، کۆمەڵکوژی ئەرمەنەکان هێشتا مووی جەستە راست دەکاتەوەو تەزوو بە هەموو جەستەیەکی زیندوو دێنێت، پێویستبوونی کۆچکردنم بە حاخام میخائیل راگەیاند، هەروەها هەواڵەکەم بە مەتەتیا هۆگۆنەی خەزووریشم راگەیاند، داوام لە ئاگاسی و هاوسەرەکەی کرد کە لەگەڵ ناجی باریزات خۆیان بۆ کۆچ ئامادە بکەن. ئیدی ئەوەی چاوم پێی کەوت رام سپارد کە هەواڵەکە بگەیەنێتە رۆڵەکانی دیکەی تایفەکە، ئینجا بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

لە ماڵەوە زانیان کە دەبێت پێش گەیشتنی عوسمانییەکان کۆچ بکەین، چونکە ئەم جارە مانەوەمان مانای لەنێوچوونی تایفە بچکۆلەکە بوو لە سابلاخ. هەرچەندە پرسیار زۆر دەکرا، بەڵام من هیچی ترم نەوت، ئەم پەلەکردنــە لــەپای چــی؟ بــەرەوکوێ کــۆچ دەکەین؟ ئای زۆر بڵێی و حەزی زانین چەند زۆرن! من ماندووبووی، لەوەبوو شــەکەتی و نائومێدی چۆکم پێ دابدەن. ئــاخر ئاســان نییــە ماڵەکــەم و هاوکــارو شــەریکەکەم و شارۆچکەکەم و هەرچی لە سابلاخ هەیە جێی بهێڵم! بەنێو گەوڕ و کۆگاکاندا گــەڕام، هیچی وایان تێدا نەمابوو، ئەوەی مابوو بۆ میری هاوکارم جێهێشت، بــێ ســوود دڵــیم دایەوە، بۆ یەکەمجار هەستم بەجوانییە لە رادەبەدەرو ئابڕوومەندییە سەختەکەی فاتیمە کرد، کە دوو سیفەتن بەدەگمــەن لــە ئافرەتێکــدا کۆدەبنــەوە، بێگومــان هاوکارەکــەم بەختەوەرە، سامان و هاوسەرو کــوڕ...، مــن ســامانەکەم لەدەســت داو وا نیــشتمانیش لەدەست دەدەم، بەڵام هێشتا بە ئەسمەرو هەر سێ منداڵەکەم بەختەوەرم، ئــاخۆ رۆژانــی داهاتوو چیان لێ شاردبینەوە؟

کاتێك لەسەر جێگەکەم راکشام، خــەو زڕان لەهــەموو لایەکــەوە ســەری تێکــردم، بیرکردنەوە چون پەنگر بەهەردوو لاسەرمدا دەچزا.

بەڵێ باوکی سەلمان، لە تاریك و روونی شتەکاندا بیانووت دۆزییەوە، لەوپەڕی سەر ئێشەو نیوە ئاگا لەخۆبووندا بەڵگەت پەیدا کرد، دەی لە چارەنووسێکی نادیار هــەڵێ! لەوساوە تووشی ئەم شەکەتییە بوویت، هاوارێکی خنکــاو بــە ناختــدا دەچــێنێت، دەی ئەمە بیانوو و بەڵگەیەکی لەبارە؟ ئەی شوورەیی نییــە هــەر لەســەر ســەر ســەختییە کوردانەکەت سوور بێت و مەترسیش دەوری خۆت و کەسوکارەکەتی لــەم شارۆچــکەیە داماوە دابێت؟ ئاخر زۆربەی جوولەکەی سابلاخ و تەنانەت براکانیشت لە تۆ هۆشمەندتر بوون. ئەوەی ئەوان هەســتیان پێکــرد تــۆی پێــشبینی کــەری ســبەینێ و دوارۆژ نــەت دەبینی، بۆچی ئەوان ئەم مەترسییەیان بینی و تۆ نەت بینی؟ هەر لەبەر ئەوەبوو تۆ وا خۆت قایل کردبوو کە هەڵاتن لە زێدو شوێنی لــەدایکبوون خیانــەتی و ترســنۆکییە؟ ئەی ئەوە نییە وا ئەوان ئێستا خیانەتیت لێدەکەن، هێی کوردی سەر سەخت، ئەمــەش چارەنووسەکەیە، ئەوان ویستیان تۆ رەو بکەیت، فــەرمانڕەواکانی خــۆت و بێگانــەکان

ویستیان تۆ کۆچ بکەیت! وەك ئەوەی هەموو پێکەوە پیلانیان بۆ دانابێت تا زێدی خۆشەویستی خۆت جێ بهێڵیت، شاو عوسمانییەکان و رووسەکان، هەموویان، هەر هەموویان ویستیان ئەم شارۆچکە داماوە کۆستی بکەوێت و تۆش دەبێت هەر بڕۆیت! ئێ تۆ دەسەڵاتی چیت هەیە، وا مەرگ لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی خۆت و خۆشەویستانتی داوە؟! ئەوەتا گولله تۆپ بە ئاشکرا لە لای تەورێزەوە دەبیسترێت. هێی باوکی سەلمان، وا عوسمانی لە باکوورەوە دێن، تیمی جەلادەکانیش لە تارانەوە دێن تا خۆت و کەسوکارت و دۆستانت بکوژن و قڕ بکەن. بە نهێنی و لەسەرخۆ دێن تا قڕکردنەکە لە هەردوولاوە جێبەجێ بکرێت، نەخێر، ئەمە نە بیانووەو نە هەنجەتێکی لەبار! ئەمە ویستی ئەوانە، ویستی فەرمانڕەواکانت و ویستی عوسمانییەکانە. ئەوان بڕیاریانداوە کە دەبێت تۆ و جوولەکەکانی سابڵاخ کۆچ بکەن، ئەی بۆ کوێ دەڕۆیت و روو دەکەیتە کوێ، وا ئاگر بە چواردەورتدا بە هەموو سووتەمەنییە مرۆییەکەیەوە، بە رق و کینەوە، نێڵە نێڵێتی؟! هۆ ئەسمەر، هۆ دایکی منداڵان، مزگێنیت دەدەمێ ئەوان جگە لە عێراق هیچ بوارێکیان بۆ نەهێشتووینەتەوە! مزگێنیت دەدەمێ، چونکە بەرەو تاقە شوێنی ئارام و نزیك لە خۆمان دەڕۆین، بە ئاوارەیی و زەلیلی و ئەوپەڕی هەژاری دەڕۆین! دەڕۆین و کێ دەزانێت چی دێتە ڕێمان، رەنگە لەگەڵ کەسوکارەکەتدا یەك بگرینەوە کە ماوەیەکی زۆرە هەواڵیان نازانین، بە ناچاری و لێبڕاوی دەڕۆین و ئەم ماڵە جێدەهێڵین کە بەدرێژایی ژیانمان تیایدا ژیاین و لەگەڵماندا ژیا، ئەو دیمەنانە جێدەهێڵین کە لە یادەوەریدا هەڵکۆڵراون و لە چاواندا نەخش بوون. ئەو دۆستانەمان جێدەهێڵین کە لە منداڵییەوە هۆگریان بووین و هۆگرمان بوون، خۆشمان ویستن و خۆشیان ویستین، شوێنەوارەکانمان و گۆڕی کۆن و نوێی خۆشەویستانمان جێدەهێڵین، تەسەللاو مایەی دڵدانەوەمان هەر ئەو نەختە خەڵکەی رۆڵەکانی تایفەکەمانە کە لەگەڵماندا کۆچ دەکەن و بەشداری چارەنووسە نادیارەکەمان دەبن. چارەنووسی ئایندەی ئێمە چەند داخراو و سەخت بێت، دەبێتە چارەنووسی ئەوانیش، چارەنووسێك چەند هەوڵبدەین گەردی لەسەر لابدەین، هەر نادیارە، هۆ ئەسمەر، وا ئێمە کۆچ دەکەین، هۆ سەلمان و سەیون و مریەم، ئێمە رەو دەکەین! هۆ میر، هۆ فاتمە، هۆ

منداڵەکانی هاوکار و هاوبەشەکەم، هۆ باوك و دایکی میر، وا ئێمە کۆچ دەکەین، هۆ سابڵاخ و دانیشتوانەکەی وا ئێمە بە ناچاری کۆچ دەکەین. ئەی تێکڕای ئێران وا ئێمە رەو دەکەین، هۆ مردووە ئازیزەکانمان... هۆ باوکە... هۆ دایکە، هۆ حاخام ناحوم، هۆ هەردوو جگەر گۆشەکەم ناحوم و ئیستیری بچووك، هۆ ئیستیری دایکیان، هۆ عەزریای زێرنگەرو هەموو مردووانی سابڵاخ! ئێمە کۆچ دەکەین و بەبێ ویستی خۆمان رەو دەکەین، گەر بەبێ ئەوەی سنورمان تێپەڕاند، ئەوا دەبینە خڵت و خاشێکی ملیۆنان کەس، بەڵام تۆ ئەی شەوە تاریك و درێژەکە کۆتاییت بێت، با رۆژی چارەنووسی سامناك دەربکەوێت. وای لە قورسایی رۆژی چارەنووس!

* * *

خەو نەچووە چاوانت و نەتهێشت ئەسمەریش بنوێت. داماوە دیقەتی دایت پێش باڵندان و پێش کازیوە هەستاویت، هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەدەنگێکی نزم وتی:

- باوکی سەلمان، هەر دڵم لات بوو، ئاخر تۆ بەدرێژایی شەوەکە هەر گێنگڵت داو پێش ئەوەی شەوەکە کۆتایی بێت هەستایت.

کپی و خامۆشی شەوەکە ژاوە ژاو و پێکدادانێکی خەفەکراوی لە هەناوی خۆی هەڵگرتبوو و تێکەڵی بانگی کەڵەشێرەکان دەبوو، بە هێمنی وتم:

- کات بە دەستمانەوە نەماوە و ئیش و کار زۆرە، ئەمەش دوایین رۆژمانە لە سابڵاخ!

ئاخۆ بەختتان دەیهێنێت، تا لە مردنێکی بێگومان هەڵبێن و خۆتان بخەنە باوەشی نادیارەوە؟

بەم دەربڕینی (بەختتان دەیهێنێت)، گاڵتەت هات و وەك نوکەتیەکی بێ تام هاتە بەرچاوت. ئیدی بەرەو ئەرکی گران خۆت راپسکاند و بە ئەسمەرت وت:

- ئەسمەر، جگە لە باوڵی جلوبەرگەکان و خشڵەکانی تۆ پتر هیچی دیکە لەگەڵ خۆمان نابەین.

بە پەلە بۆ کەنیسە چوویت. ئەم غەڵبە غەڵبە چییە وا سابڵاخی گرتۆتەوە؟ ئێ خۆ هێشتا نە عوسمانییەکان گەیشتوون، نە تیمەکەی شا، کە بۆ کوشتنی تۆو کەسوکارت

و رۆڵەکانی تایفەکەت دێن، گەیشتوون. ئەمە دواجارە کە ئەم پەیکەرەی داودی تێدایە، دەبینیت، تۆ بە پاڕانەوە لە خودا لێرە پەروەردە بوویت، دەی چێژ لە بینینی وەربگرە و لە سەیرکردنی هەموو ئەم شتانە تێر بخۆ، کاتێك تەواو بوویت حاخام میخائیل و مەتتیا هۆگۆنەی مامیشت هاتن و وتیان کە حەسەن چەخماخ و هەندێك لە هاوڕێیانیان دیوە شارۆچکەکەیان جێدەهێشت. کەواتە رۆژی پەسلاّن نزیك بۆتەوەو عوسمانییەکان بەڕێوەن، چەخماخ و هەوادارانی لەگەڵ سوپای رووسەکان هەڵدێن، تۆ بڵێی جەلادەکانی شای قاجاری تاوانباریش ئەمڕۆ بگەن؟ گەرەکە دەستوبرد بکەین! دەبێت پەلە بکەین! گەرەکە دەستبەجێ لێرە خۆمان ریشەکێش بکەین و رەو بکەین. پەیکەرەکەم کردەوەو هەر سێ بەشەکەی تەوراتم دەرهێنا. ئەم بەشانەی تەورات لە چارەنووسی نادیارماندا لەگەڵمان دەبن، بەلاّم ئەوانی دی تا ئەو دەمەی خودا خۆی بیەوێت لەنێو دیوارەکەدا بەند دەبن.

پرسیارم لە ئامادەبووان کرد:

- ئاخۆ هەموو ئەوانە لە تایەفەکە لێرە مارنەتەوە، ئامادەی کۆچ کردنن؟

بەڵێنیان دا جارێکی تریش ئاگاداریان بکەنەوە، منیش بەڵێنم پێدان کە لە کاتی رۆیشتنەکە ئاگاداریان بکەم.

کاتێك رووناکی بوونی هەموو شتێکی دەرخست هەریەکەمان بەشێکی تەوراتی لەگەڵ خۆیدا بەرەو ماڵ برد، دەرگای کەنیسە بە کلیلێك داخرا کە بەدرێژایی چەندین گرێساڵ هەر لای من بوو، لەبەر دەرگای کەنیسەکە وەستام و تەوراتم بەدەستەوەبوو، دڵم بۆ خەمی لێکدابڕان کەوتە جۆش و لێدان، بەلاّم چاوەکانم هەر وشك بوون، هەموو شتێك ئاڵۆز بوو تەنها دووری دیدارو ئەم لێکدابڕانە نەبێت.

❊ ❊ ❊

وەك ئەوەی لەسەر پێیەکانی نەمابێت، خۆی بە لاقەکانمەوە نووساندو پێیەکانی ماچ دەکردو دەگریاو دەپاڕایەوە، گەورەم تکات لێدەکەم، مەمبەوە لای کەسوکارم، بۆ هەر شوێنێك بڕۆن لەگەڵتان دێم... گەورەم...، ئاخر چۆن دڵت دێت لە منداڵەکان و خۆتانم بکەیت؟! ئێوە کەسوکاری منن، لەو باوەڕەدایت کە لە دووری ئێوە هەڵ بکەم؟

خاتوونی گەورەم تۆ پێی بڵێ! تکایەکم بۆ بکە، گەورەم، لە خۆتان بێبەشم مەکە! دڵـم تەنگ بوو، توورە بووم، پەنام بۆ خودا برد، قەشەنگ تۆ شێت بوویت؟ تۆ کەسـوکارت هەیەو داوات دەکەنەوە. ئێمە دەڕۆین و نازانین چی روودەدات. قەشـەنگ، ئێمـە ناچـار کراوین، من بەرانبەر کەسوکارت لە تۆ بەرپرسیارم. خۆ ئەگەر لە چارەمان نووسرابێت رزگار ببین و بگەینە ئەو شوێنە دوورەی کە دەمانەوێت، ئیدی ئێمە ساباڵاخ نابینینەوە. پاڕانەوەو گریانەکەی هەر زیاد دەکات و هەڕەشە دەکات (گەر لێرە جێم بهێڵن و بـڕۆن، ئەوا من خۆم دەکـوژم!). تەماشـای ئەسمـەرو منداڵـەکانی کـرد، بینـیم نیگاکانیـان لایەنگری قەشەنگ دەکەن و لەگەڵ ئەودا بە نهێنی دەپاڕێنەوە، تەنانەت میرو فاتمـە و منداڵەکانیان سەریان سوڕمابوو. منیش پێشبڕکێ لەگـەڵ زەمـەن و مەرگـدا دەکـەم، کەچی ئەم نەفرینە خەریکە بـەم رەفتـارەی هـەموو شـتێکمان لـێ تێـك بـدات، لـە کۆتاییدا گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە من بۆ لای کەسوکاری بیبەم، چونکە بڕیـاری یـەك لاکەرەوە بەدەستی باوکێتی، بـە پەلـە پـرووزێ لەگەڵمـدا هـات و گەیـشتینە مـاڵی کەسوکاری، ماڵی کەسوکاری؟ تۆ بڵێ گەوڕ، یان تەویلە، یان زبڵخانـە، کاولێـك بـوو گەر ئاژەڵەکانی منت تێ بکردایە، پێی رازی نەدەبوون و لە ماوەی دوو رۆژدا دەمردن، لەجیاتی ئاژەڵ منداڵی نیمچە رووت لەسەر زەوی دانیشتبوون، لە زۆریـدا رەشـەداڵێك بوون بۆ خۆیان)، بەڵام لە سایەی قەشەنگەوە لـە مـردن رزگاریـان بـوو بـوو. لـەبری گۆشتی بنیادەم خۆراکیان خواردبوو، باوك و دایکـی کـە چـاویان پێکـەوت ترسـێکی کتوپڕیان لێ نیشت، ئەم دوو نەعلەتییە دەڵێی لەگەڵێدا پیلانەکەیان داناوە.

دایکەکە وتی: (کوڕم، ئەمـە وەك کچی خۆتانە و چۆن جێی دەهێڵیـت، وا بەچـاوی خۆت دەیبینیت چۆن حـەجانی لێهـەڵگیراوەو ئـازار دەکێـشێت؟!) بینـیم باوکەکـەش دەڵێت: (شلۆمۆ، بیبە! کاتی ئەو گرانییە گەورەیـە ئێمـە بـەهۆی ئـەوەوە لـە ژیانـدا ماینەوەو وا ئێستا خەریکە تامی ژیان دەزانین، ئاخر ئەگەر ئەویش بدەیتـەوە سـەرمان ئیتر چۆن بژین؟!). ئەی من چی بکەم؟!

بە قەشەنگەوە بۆ ماڵەوە گەڕامەوەو گریانەکـەی بـوو بـە شـادی، بـاوکی و بـراو خوشـکەکانی لەگەڵمانـدا هـاتن و ئەوەنـدەی بۆیـان کـرا لـە ماڵەکـە شـتیان بـرد.

منداڵەکان بە بینینی شادمان بوو، ئەسمەریش دڵی کرایەوە، دانی پیّدا دەنیّم ئەمە گریّیەك بوو لە دڵمدا، بەڵام وا گریّکەش لە دڵم دەرچوو، بەڕاستی ئەو نەفرینە یەکیّك بوو لە ئەندامانی ماڵەکە، بەڵام لە کۆچکردنە پڕ مەترسی و نادیارەکەماندا کە خودا خۆی نەبیّت کەسیّك نەیدەزانی چۆن دەبیّت، قەشەنگ بەرپرسیارێتییەکی قورس بوو لە ئەستۆماندا.

ئەریّ ئەوەم پیّ وتیت کە لەسەرەتای ڕۆژەکانی دەست کورتی و سەغڵەتیمان لە بەغدا قەشەنگم ڕادەستی بازرگانیّکی ناسراوی بەغدام کردو لەلای خۆی کاری پیّکرد و پاشان لە شوفیّریّکی تایبەتی خۆی مارەی بڕی؟، بەڵام قەشەنگ هیچ ڕۆژیّك نەبوو سەردانمان نەکات و ماوەیەك لەگەڵ سەلمان و سەیون و مریەم نەباتە سەر. لەسەر ئەم پەیمان و وەفادارییەی خۆی مایەوە تا دوای ئەوەی منداڵەکانیش خیّزانیان پیّکەوە ناو منداڵیان ختەوە، تا ئەو دەمەی لە بەغدا دەریان کردین، ئەم دیدارانەمان هەر بەردەوام بوو.

وەفاداری قەشەنگ وەفادارییەك بوو هی ئەوەبوو چاوی لیّ بکریّت! ئاە!

❊ ❊ ❊

هۆ مردووانی ناو گۆڕەکان! کیّ دەزانیّت، ڕەنگە پیّش ئەوەی جاریّکی تر گۆڕەکانتان ببینینەوە، ئیّمەش بگەینە ئیّوە!

گۆڕەکان بە هەزاران بوون و جوولەکەی سابڵاخیش پڕ چنگیّك و دوای دوا ماڵئاوایی ئەمانیش ڕۆدەچن و ون دەبن، وا ئیّستا تۆ و دۆستانت بەنیّو گۆڕی خۆشەویستە کۆچ کردووەکاندا دەگەڕێن و دێن و دەچن، هەندێك گۆڕ ڕۆچوون و بڕیّکیان تازەن، خەم و سۆز ململانیّ دەکەن و بەردەوام لە ژێی هەستەوەریی ڕوح دەدەن، تۆ سەرپەرشتی دە پیاوێك دەکەیت و بە هەمووتان دەیەکە تەواو دەکەن و بۆتان هەیە نوێژەکە بکەن و قەدیش بخوێنن.

کات بە بەرییەوە نەماوەو بە هەنگاوی گورج بەرەو مەترسی دەڕوات، مەترسییەکەش دووانن، مەترسییەك (خۆیی)یە و لە تارانەوە و لە خودی شاوە بەڕێوەیە، مەترسیەکیش لە باکوورەوە پیّشڕەوی دەکات. تەرویّز خەریکە دەکەویّتە

دەست عوسمانییەکان کە لەسەرە مەرگدان، خاك و رووسە (گاورەکان)، باوکم و دایکم و باوو باپیرنم! با ئیسك و پرووسکتان لەنێو ئارامگاکانتان ئاسوودە بێت، بەلاّم با روحتان لەو بەرزاییەوە چاودێریمان بکەن و لەم رێگەی هات ونەهاتەماندا داوای بێ وەییمان بۆ بکەن. ناحوم و ناحوم، ئیستیو ئیستیو. بێگانە و غەوارەکان بەسەر روحی ئێوەوە گەیشتنە ئامانجی خۆیان، دە بە ئارامی بنوون!

هەست و سۆزی لە کلّپە سەندندا بوون، کەچی چاوەکانی هەر وشك بوون.کات گەیشتە دوای نیوەڕۆ، کات و شوێنی دیاریکراومان سەعات سێی عەسر لە دەروازەی باشووری سابلاّخە.

* * *

باوەشم لە میردا، ئەسمەریش فاتمەی لە ئامێز گرت، هەر دوو ژنەکە گریان، بەلاّم منداڵەکان ئەبڵەق بووبوون و نەیاندەزانی چ باسە. باوەش لێکدان درێژەی کێشا، باوەش لێکدانی ئەسمەرو فاتمە بە گریان و بە سوێوە بوو. باوەش لێکدانی من و میر گفتوگۆی سالاّنی دوور و درێژ بوو. وەك ئەوەبوو کە چاومان بۆ دنیا هەڵێنا چۆن منداڵەکانمان بەر لە هەر شتێك چاویان بە یەکتر هەڵهێنابێت و وا ئێستا بەزۆری زۆردارەکی لێك دادەبڕێن، لێك دابڕانێکی ناچاری، بێبەشبوونێك لە هەموو ئەو شتانەی فێری بووین و هەستمان پێی کرد، جیابوونەوەیەك لە ئێرانەوە دەست پێدەکات و لە سابلاّخ ون دەبێت، سابلاّخ بە هەموو شتەکانییەوە، بەو کەسانەوەی کە تێیدان...، لێك دابڕانێك لە خودی ژیان. میر کە من پێم وابوو فرمێسك دەرێژێت، وتی:

- لەو باوەڕەدا نەبووم، کە تۆ لە کۆتاییدا کۆڵ دەدەیت!

چاوەکانم چکیان کرد بوو، فرمێسك بوو بوو بە خوێن و لە دڵمەوە سەری دەکرد، وتم:

- میر، من لە هۆڵی خۆمدا نیم، لێ نامەوێت ئەسمەرو ئەو منداڵانەی ماومن، ببینم لەنێو خوێنی خۆیاندا دەگەوزێن، هەروەك چۆن لەوانی تر روویدا.

وتی:

- ئەریٚ شلۆمۆ، تۆ بەجۆرێك قسەدەكەیت، وەك ئەوەی عوسمانییەكان بە مۆمەوە بەدوای جوولەكەكانی سابلاخدا بگەڕێن، تا كۆمەڵكوژییان بكەن!

ڕەنگە ئەمە بەڕاستی ڕوویدات، بەڵام هاوكارو هاوبەشم كاشكیٚ دەتزانی خودی دەسەڵاتدارانی وڵاتەكەمان چییان بۆ ئامادەكرووین.

بەڵێ گەرەكە هاوكارو هاوبەشەكەم لەدوا شت ئاگادار بكەمەوە...، ئەی بۆی نییە كە تاوانبارانی شا، میرو خێزانەكەی بە شلۆمۆ كەتانی و ژن و منداڵەكانی بزانن، ئیٚ خۆ ئەوسا هەموویان تێدا دەچن، كە دەبوو ئێمە لەجیاتی ئەوان تێدا بچین؟! وتم:

- میر، تۆ لەو باوەڕەدایت گەر مانەوەمان لێرە مانای مردنێكی ڕاستەقینە و بیٚ چەندو چوون نەبووایە، من ئاوها ملم دەنایە نێو نادیارێكەوە منداڵەكانم و ئەسمەرو تەنانەت قەشەنگیشم دەخستە مەترسییەوە؟!

میر بێدەنگ بوو و سەرسوڕمانێكم تێدا ورووژاند، نیگای لیٚ گیركردم و بەدوای سەرچاوەی ئەو بێگومانییەی من دا دەگەڕا، كەچی شتێك لە سابلاخ چاوەڕێمانە. نەفرەتی لە عوسمانییەكان كرد كە بوونەتە مایەی لێك دابڕانمان، دڵۆپە عەسرێكی تر لە چاوانی قەتیس بوو و بەدەستی سڕییەوە، بەدەنگێكی خنكاوەوە وتی:

- لەڕاستیدا لێك دابڕانی ئێوە بۆ ئێمە یەكجار لە زەبری جەنگەكە سەختترە بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ماڵەكەتان نیشتەجیٚ بووین و خێزانی هەردوو لامان بوون بە یەك خێزان.

وتم:

- میر، هەر لێرە بمێننەوە، چونكە خانووەكەی خۆتان بە كەڵكی دانیشتن نەماوە.

- شلۆمۆ، ئەم پارەیە وەربگرە!

ڕووی خۆم لیٚ وەرگێڕاو پارەكەم بۆی گەڕاندەوە، میر، نەخێر. من ماڵ و خانووەكەم و هەرچی تێیدایە لەگەڵ باخەكەی سابلاخم بۆ تۆ جێدەهێڵم و دڵم بە تۆ دەسپێرم، بەڵام شەریكی تازیزم پارەكەت وەرناگرم، ڕاستە نە تۆ و نە كەس دەزانێت كە لە بیٚ پارەییدا چەند نابووت بووم، ئەوەی ماومە تەنها دوو لیرەیە لەگەڵ خشڵەكانی ئەسمەر، پێم وتووە كە لە بن جلەكانی و لەسەر سكی بیبەستێت، شتەكانی تریش تەنها باولێكە كە

جلوبەرگی خۆمان و منداڵەکان و قەشەنگی تێدایە. بە پەلە لە غایلەکانم وەئاگا هاتم و وتم:

- پارە زۆری بۆ خەڵکی ئاوارەو دەربەدەر ناشێت، گەر دەسەڵاتدارانی سنووری ئەو وڵاتەی بۆی دەچین ئەم هەموو پارەیەمان پێ ببینن، مافی پەنابەرێتیمان نادەنێ، جگە لەمەش هاوڕێم، لەوەتەی ئەم جەنگە بەرپابووە جەردەو ڕێگریش زۆر بوون. میر، پارەکەت بۆ گیرفانت بگێڕەوە، بەڵکو ڕۆژێك بێت و بەدیداری یەکتر شاد بینەوە.

ئەمێستا هەموو شتێك ئامادەیە، خەریکە روح لەجەستە جیا دەبێتەوە، گالیسکە، تەورات، باولی جلوبەرگەکان، ڕێگای هات و نەهات، وا لەبەر دەرگاین، هەوڵم دا فرمێسك برێژم، بێسوود بوو، چاوەکانم بە هەورێکی بێ باران بەریان گیراوە، بیرم کەوتەوە کە دەبێت میر ئاگادار بکەمەوە. منداڵەکان و قەشەنگ و ئەسمەر بۆ ناو گالیسکەکە سەرکەوتن، خێزانی میر هەموویان لەبەر دەرگاکە وەستاون...، دراوسێکان لە پەنجەرەوە تەماشا دەکەن و تێئاگەن، کەمێك هەڵوەستە دەکەم و دەگەڕێمەوە.

میر لە ئامێز دەگرم و بە گوێچکەیدا دەچرپێنم:

- میر، خۆت و هەموو خێزانەکەت بچنە ژوورەوەو دەرگاکە باش کلیل بدە، لەم ڕۆژانەی وا دێن دەرگاکە لە کەس مەکەوە، ئەگەر پیاوکوژەکانی شا بۆ ئێرە هاتن، بێگومان بەم زووانە دێن، براکەم ئەوسا لە چاوتروکانێکدا هەمووتان لەنێو دەبەن.

تێنەگەیشت وتی:

- باوکی سەلمان، بە ڕوونی قسە بکە، تۆ شتی سەیر دەڵێیت.

- شتێك لە ناخمدا پەلەی ڕۆیشتنی لێدەکردم، وتم:

- شا بۆ لەنێو بردنی ئێمەو هەموو جوولەکەکانی سابلاخ تیمێکی پیاوکوژ دەنێرێت و بەم زووانەش ئەمە جێبەجێ دەکرێت. میر، لێم مەپرسە ئەمەم لەکوێوە زانیوە، گەرنگ ئەوەیە ئاگادار بیت، دوای ئەم شەو کە هیوادارم بەبێ وەی تێپەڕێت، پێویستە هەموو دانیشتوانی سابلاخ بزانن کە جوولەکەکانی سابلاخ بۆ شوێنێکی نادیار ڕەویان کردووە، تا چەتەکانی شا بە نائومێدی و دەستی خاڵییەوە بگەڕێنەوە.

لە پێشەوەی گالیسکەکە جێگەی خۆم گرت، ئینجا قامچیم لە ئەسپەکان راوەشاندو بەخێرایی کەوتینە رێ، هۆ سابڵاخ ماڵئاوا.

* * *

مەترسی لە رۆژهەڵاتەوە دێت و مەترسی لە باکوورەوە بەرێوەیە، کاروانی کالیسکەکان بەرەو باشوور دەڕوات، ئینجا بەرەو رۆژئاوا پێچ دەکاتەوە، تا شەبەردی رەنگاورەنگ، شیو و دۆڵ و هەوراز، گا سەرەوژوورەو گا سەرەو خوار، درەختی گەورەو بەرزو کورتەگیای نەختێك تەنك، لێرە کێ بەهاری لەبیرماوە؟!

بەهار جەژنی خەڵکی ئاسوودەیەو ئێمە چەند لە ئاسوودەیی دوورین؟! ئەوەندە هەیە لەم چرکەساتانەدا ئێمە لە مەترسییەکی دەستەویەخەی راستەقینە دوور دەکەوینەوە، بەرەو قووڵایی نادیارو بەرەو رۆژی ئومێد و ئاوات دەڕۆین، ئەو رۆژەی رەگمان لەم خاکە هەڵکێشرا، ئێمە کۆمەڵە خەڵکێك بووین لەڕووی هەموو مەترسی و کارەساتێك خۆمان راگرت، شەپۆلی ئاگرو مەرگ بەسەرماندا بڵاو ببووەوە، لەو باوەڕەدا بووین وا گەیشتووینەتە نیمچە کۆتایی گەرداوی دەریاکە و ئیدی پالی لێدەدەینەوە و هەناسەیەکمان وەبەر دێتەوە، بەڵام تارماییەکی بەدگۆڕاو لێمان نزیك بووەوەو پەلاماری داین و بە پەشۆکارییەوە لێی هەڵاتین.

کاروانەکە بە رێگەیەکدا دەڕوات دوای کەمێکی تر خۆری لێ ئاوا دەبێت، کاروانێکی گالیسکە تاریکی و نەزانراو قوتیان دەدات، کاروانێك خەون بە کڕینەوەی ژیانی خۆیەوە لە وڵاتێکی تردا دەبینێت. کۆمەڵە خەڵکێك دەسەڵاتدارەکانیان لە خودی دەسەڵاتی خۆیان و جەورو ستەمی بێگانان نەیان پاراستن و تەنها بە جلوبەرگی بەریانەوە هەڵاتن. هۆ سابڵاخی دوورو خۆشەویست تەنها بە جلوبەرگی بەریانەوە، هۆ سابڵاخ ئێمە خۆمانیش بووین بە جلوبەرگ و شڕوشیتاڵ، ئەوەتا شەو بە رەنگی قەلە رەشکە باڵ بەسەر دنیادا دەکێشێت و گالیسکەی هەڵاتووان بەخێرایی بەرەو سنووری

ڕۆژئاوا بەرەو پێشەوە دەڕوات، کۆمەڵە خەڵکێك ناسنامەیان ون کردووەو لەدەستیان چووە... خاکی باب و باپیران بەخێرایی دەپێچنەوەو شەوەکە قووتیان دەدات...، هاکا خاکی وڵاتێکی دیکەی نامۆ قووتی دان، تا ببنە کۆمەڵە خەڵکێکی پەناهەندەو ئاوارەو هەژار!

**کۆتایی**

***

*میدراش: شوێنێکە وەك حوجرەی مزگەوت لەجیاتی قوتابخانەوانەی ئایینی جوولەکەی تێدا دەخوێنرێت

تێبینی: وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە بە ڕەشنووس و پاکنووسەوە لە ١٠/٢/٢٠١٠ - ٢٤/٩/٢٠١٠ی خایاندووە.

## نووسەری ئەم رۆمانە

سەمیر نەقاش ساڵی ١٩٣٨ لە گەڕەکی بەتاوین لە بەغدا لەدایك بووە. لە بنەماڵەیەکی جوولەکەی رەسەنی بەغدایە کە بە خانەوادەی (شەعید) ناسراون و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عەباسییەکان، باپیری سەمیر نەقاش زێڕنگەر بووەو لە هونەری نەخشکردندا شارەزابووەو نازناوی (نەقاش)ی لە باپیرییەوە بۆ ماوەتەوە.

لە ساڵی ١٩٥٣ خێزانی سەمیر نەقاش لە عێراق دەردەکرێن و بەرەو ئیسرائیل کۆچ دەکەن، ئەو دەمە تەمەنی سەمیر پانزە ساڵ بووە. هەر لەو ساڵەدا باوکی کۆچی دوایی دەکات و ئەمیش دڵی بە ئیسرائیلەوە نانووسێت و هەمیشە بە روح وابەستەی بەغدا دەبێت، بەڵام دەرگای گەڕانەوەی لەروو دادەخرێت، بۆیە زۆربەی ژیانی لەنێوان وڵاتانی ئیسرائیل و هیندستان و ئێران بەسەر دەبات تا لە کۆتایی چوار ساڵی ژیانی لە وڵاتی بەریتانیا نیشەجێ دەبێت، ئینجا دوای نەمانی رژێمی بەعس کە لە گەڕانەوە بۆ بەغدا نائومێد دەبێت، بەناچاری بەرەو ئیسرائیل دەگەڕێتەوە، بەڵام دوای دوو مانگ کەمتر لە ٢٠٠٤/٧/٧ لە ئیسرائیل کۆچی دوایی دەکات.

سەمیر نەقاش بەدرێژایی تەمەنی نووسین و بەرهەمەکانی هەر بە زمانی عەرەبی بووە، بۆیە دەڵێت: (عەرەبی زمانی منە، جگە لە عەرەبی زمانی دیکە نازانم، چونکە من لە ئیسرائیل لەنێو قاوغێك دا ژیاوم و کلتووری رۆژئاوا کە لە ئیسرائیل باوە کاری تێنەکردم و زمانەکەی نازانم، خۆ ئەگەر هەوڵبدەم بە زمانی عیبری بنووسم، رەنگە بۆم نەکرێت).

سەمیر نەقاش نووسەرێکە نە لە وڵاتە عەرەبییەکان چانسی بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی هەبووە نە لە ئیسرائیل، بۆیە لەنێوەندی ئەدەبی عەرەبی هەوڵی ون کردنی دراوە، کتێبەکانی لە بازاڕی چاپەمەنی و پێشانگاکانی کتێبدا نەدەبینران، لە

هەموو بەرهەمەکانیشی تەنها یەك رۆمانی بەناو(ئەو رۆژەی دنیا ئاوس بوو و بەری هاویشت) بۆ زمانی عیبری وەرگێڕدرا. ئەمەش وایکردووە کە لە هەموو خەڵات و بەراتێکی ئەدەبی بێبەش بکرێت.

بیرو بۆچوونی سەمیر نەقاش بیرێکی مرۆدۆستییە و لەم بارەوە خۆی دەڵێت: (من هەوڵدەدەم لە نووسینەکانمدا بەگشتی مرۆڤ بم و مرۆڤدۆست بم، بەڵام لەنێو ئەو ژینگەیە دەنووسم کە خۆم دەیناسم).

بەرهەمەکانی سەمیر نەقاش بەزۆری بریتین لە چیرۆك و رۆمان شانۆیی، یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی بەناوی (هەڵە) لە ساڵی ١٩٧١ دا بڵاوکردۆتەوە. دوای ئەوە دوانزە کتێبی چاپکردووەو لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا کەسێتی خۆی ئامادەگی هەیە. لەم بارەوە دەڵێت: (ناکرێت مرۆڤ لە پێستی خۆی بێتە دەردوە، من بە هەموو بوونێکمەوە مرۆڤم و عیراقیم و مێژوویەکی کۆنم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتووە).